# کۆبەرهەمی دکتۆر مستەفا زەڵمی لە شەریعەت و یاسادا

سەرپەرشتیاری پرۆژە
ڕێدار ڕەئوف ئەحمەد

# التبيان لرفع غموض النسخ في القرآن
# نەسخ لە قورئاندا

نووسینی : دکتۆر مصطفی زەڵمی
وەرگێڕانی : عبدالکریم فتاح
پێداچوونەوەی : توفیق کەریم
نەخشەسازی : جمعە صدیق کاکە
نۆرەی چاپ : چاپی یەکەم ۲۰۱۷

نرخی هەر بیست و شەش بەرگ
۲۵۰,۰۰۰ دینار




لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی ( ۷٤٤ ) ساڵی ۲۰۱٦ی پێدراوە

﴿ الٓرۚ كِتَٰبٌ أُحۡكِمَتۡ ءَايَٰتُهُۥ ثُمَّ فُصِّلَتۡ مِن لَّدُنۡ حَكِيمٍ خَبِيرٍ ۝١ ﴾

سورة هود/١

﴿ إِنَّا نَحۡنُ نَزَّلۡنَا ٱلذِّكۡرَ وَإِنَّا لَهُۥ لَحَٰفِظُونَ ۝٩ ﴾

سورة الحجر/٩

﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بِٱلذِّكۡرِ لَمَّا جَآءَهُمۡۖ وَإِنَّهُۥ لَكِتَٰبٌ عَزِيزٞ ۝٤١ لَّا يَأۡتِيهِ ٱلۡبَٰطِلُ مِنۢ بَيۡنِ يَدَيۡهِ وَلَا مِنۡ خَلۡفِهِۦۖ تَنزِيلٞ مِّنۡ حَكِيمٍ حَمِيدٖ ۝٤٢ ﴾

سورة فصلت/٤١–٤٢

## ناوەرۆك

# پێشەکی

مامۆستای پایەبەرز دکتۆر "مصطفی زەڵمی"م لەو کاتەوە ناسی لە کۆلێژی سەدام بۆ مافەکان دەستمان بە وانەوتنەوە کرد، لەوێ من مادەی "المدخل لدراسة الشریعة"م دەوتەوە، پاشان ئەو تەرخانکرا بۆ وتنەوەی مادەی شەریعەت و من سەربەخۆبووم بۆ وتنەوەی یاسای مەدەنی.

پەیوەندیم لەگەڵ ئەم مامۆستا شکۆدارەدا رۆژ لەدوای رۆژ زیادی دەکرد و سەرسام بوونم بە ئەخلاق و زانست و ئیخلاص و یەکلابوونەوەی رۆژ لەدوای رۆژ لە زیادبووندا بوو، وا گومانم دەبرد چاخی فەقیهە مەزنەکان لەمێژساڵە کۆتایی پێهاتووە و بووتە یادگاری، بەڵام بینیم یەکێك لەو فەقیهە مەزنانە لەناو ئێمەدا دەژی و قسەمان لەگەڵ دەکات و قسەی لەگەڵ دەکەین و پرسیاری لێ دەکەین و ئەویش لە زانست و ئەدەبی خۆی بەسەرماندا دادەبارێنێت.

مامۆستای دکتۆر "مصطفی زەڵمی" نوسخەیەك لە دانراوە بەپێزەکەی خۆی پێ بەخشیم «التبیان لرفع غموض النسخ في القرآن»، منیش دەستم بە خوێندنەوەی کرد و بینیم رووبەڕووی زانایەکی وردکاری موجتەهید بوومەتەوە کە بەرگری لە ئیسلام و پاکڕاگرتنی کەلامی خودا لە دژایەتی و بێمانایی لەبەرچاوی خۆی داناوە، مامۆستای پایەبەرز بۆ لێکۆڵینەوەی بابەتەکە دەستی بۆ وردترین باسی قورئان بردووە، باسێك کە چڕترین ئاڵۆزی و زۆرترین لێڵی و تەمومژی تێدایە، بە

هەنگاوی ورد و هێواشی نەخشەبۆکێشراو لە باسەکەدا هەنگاو هەڵدەگرێت، کۆتـایی بە باسەکە ناهێنێت تا هەموو سووچ و تەمومژی بابەتەکە رۆشـن نەکاتـەوە و لـەوێوە راستەقینەی نەسخ بەڕوونی و رۆشنی دەخاتە پێش چاوت.

مامۆستای مەزن بە مانای نەسـخ و ئـەوەی لـە نەسـخ نییـە دەسـتی پێکـردووە، چونکە نەسخ بریتییە لە نەهێڵانی(هەلگرتنی) حوکمێکی شەرعی بـە بەڵگـەی دواتـر، ئەمە بریتییە لە نەسخ بە مانا وردەکەی، بەڵام تایبەتکردنی گشتی و سنووردارکردنی رەهـا و هـەڵواردن(الإسـتثنـاء) و روخسـەت لـەدوای عەزیمـەت لـە هـیچ رێگەیەکـەوە ناچنەوە سەر نەسخ.

مامۆستای مەزن باسی حەڤـدە هـۆی کـردووە کـەزیادەڕەوییان تێـدا کـردووە لـە بۆچوونی نەسخ لە قورئانـدا، بـە هـەمان شـێوە بۆچـوونی هەنـدێك لەوانـەی هێنـاوە پێیانوایـە ئایـەتی شمشـێر (١٤٤) ئایـەتی لـە قورئانـدا نەسـخ کردۆتـەوە و کۆتـایی ئایەتەکـەش سـەرەتاکەی خـۆی نەسـخ کردۆتـەوە، دەڵێـت کـۆی ئایەتـەکانی قورئان(٦٢٠٤) ئایەتن، هەندێك لەوانە پێیان وایە (٥٦٤) ئایەت نەسـخکراوەتەوە واتـە نزیکەی دەیـەکی ئایەتـەکانی قورئـان، ئایا ئـەم بۆچـوونە گونجاوە لەگـەڵ ئـەوەی پێویستە کەلامی خودا پیرۆز و پاك و رێزدار و پایەدار بێت، لەڕاستیدا ئەو کەسانە لـە دەرئەنجامەکانیانـدا بەهەڵەداچـوون کاتێـك دەرگاکـە دەخـە سـەر پشـت لەبـەردەم دوژمنانی ئیسلامدا، ئەوانەی لە نێوان نەسخ و "بداء–دواتر خودا بۆی دەرکـەوتووە" و نێـوان نەسـخ و "الأنسـاء–دواخسـتن" و نێـوان نەسـخی حوکمـەکان و نەسـخی هەواڵ(الأخبار)دا تێکەڵییان لا دروست بووە.

مامۆسـتای مـەزن تـەنها بـە دیـاریکردنی مانـای نەسـخ و مەرجـەکانی نەسـخ و ئاسۆکانی و جۆرەکانییەوە نەوەستاوە، بەڵکو هەموو ئەم بابەت و باسانەی خستۆتە روو بـە خسـتنەڕوویەکی رۆشـنی نـاوازە کـە لـە هـیچ سەرچـاوەیەکی تـر بەردەست ناکەوێت، هەستاوە بە خستنەڕووی ئەو ئایەتانـەی وا گومـان دەبـەن نەسـخکراو بـن، زیاتر لە پەنجا ئایەتی خستۆتەڕوو، بەوەی لە سورەتی "البقـرة"دا هـاتووە دەسـتی

پێکردووه و بەوەی لە سورەتی "الکافرون"دا هاتووه کۆتایی پێ هێناوە، ئەو بەسەر ئەم ئایەتانەی پێیان وایە نەسخکراون لێزمە زانستی خۆی لە فیقه و ئوسولّ و رەوانبێژی و مەنتق و فەلسەفە و زانستی کەلام و ئەوەی خودا بەوی بەخشیوە لە ئیمانێکی راستگۆ و ژیرییەکی رۆشن و غیرەت بۆ ئیسلام و کتێبەکەی خودا -جل جلالە- داباراندووه، گفتوگۆی لەگەڵ ئەوانەدا کردووه وا بانگەشە دەکەن ئەو ئایەتانە نەسخکراوبن و بۆچوونەکەیان لە بناغەوە هەڵدەوەشێنێتەوە و وا لە تۆ دەکات لە کتێبەکە بێیە دەرەوە لەگەڵ ئەوپەڕی دڵنیایی و بەرچاورۆشنی و ئیمانی دامەزراو بۆ کتێبە مەزن و باڵاکەی خودا کە لە دڵی تۆدا جێگەی تایبەتی هەیە و پێویستە لە دڵی هەموو کەسێکی خاوەن ئیماندا ئەو جێگەیە داگیر بکات.

ئەمە سەرنجێکی سەرپێی و ناکاوە لەسەر ئەم دانەرە پایە بەرزە، لە دیدگای منەوە فەتحێکە و خودا دڵی ئەم مامۆستا مەزنە تێکۆشەرە باوەڕدارەی بۆ کردۆتەوە، داوا لە خودا -عز وجل- دەکەم تەندروستی و لەشساغی و تەمەن درێژی پێ ببەخشێت و پارێزگاری لێ بکات وەك خەزنەیەك بۆ زانست و مەشخەڵێکی رۆشن لە گەورە پیاوانی ئیسلام، خودا باشترین سەرپەرشتیار و باشترین وەڵامدەرەوەیە.

دکتۆر

حسن علي الذنون

## هۆكاره پێویستەكان

ئەو پاڵنەرانەی هانیاندام بۆ پێشكەش كردنی ئەم خزمەتە كەمە بە قورئانی پیرۆز لە كاتێكدا من لە قۆناغی پیری و ئەفتادەبیدام و توانای بیركردنەوە و داهێنانم بـەرەو لاوازی چووە زۆرن لەوانە:

یەكەم: پووچەڵكردنەوەی بانگەشەی رۆژهەڵاتناسان، ئەوانەی هەمیشـە خـەریكی دروستكردنی گومان و نیشانەی پرسیاری بانگەشـەبۆكراون لەسـەر نەسـخی قورئـان، ئەمەش بە مەبەستی شێواندنی كۆتا پەیامی خـودایی، لـەو گومانانـەی دەیخەنـە روو بەڵگەهێنانەوەیە بە نەسـخی قورئـان بـەوەی قورئـان وەحـی خـودایی نییـە، چـونكە یاسارێژی بۆ حوكمێك و پاشان سڕینەوەی ئەو حوكمـە و دوای ماوەیـەك گـۆڕینی بـە حوكمێكی تر لە خەسڵەتەكانی ناتـەواوین، و خـوداش پـاك و بێگـەردە لـە ناتـەواوی، بۆیە نەسخ لە قورئاندا-بەپێی بۆچوونی ئەوان- بەڵگەی ئەوەیە قورئـان لـە دانـراوی خودی محەمەدە (ﷺ).

بەشێك لـە زانایـان و شـێخانی ئەزهـەر پـێش مـن كـەوتوون لـە بەرپەرچـدانەوەی بانگەشەی رۆژهەڵاتناسان دەربارەی نەسخی هەندێك لە ئایـەت، بـە سـەدان سـاڵیش خوالێخۆش بوو زانای پایەبەرز "أبو مسلم الأصـفهاني" پـێش هـەمووان كـەوتووە، ئەو كەسەی لە تەفسیرە مەزنەكەیدا نەبوونی نەسخی لە قورئاندا سەلماندووە، بـەڵام هەندێ لە نەزانان سوتاندیان تاكو ئەو حەقیقەتە دروستە بڵاو نەبێتەوە.

دووەم-جیاكردنەوەی ئەوەی نەسخی تیادا گوزەر دەكات و ئەوەی نەسخی تێـدا

گوزەر ناکات لەیەکتر، هەوڵی مـن بـۆ نـەرێکردنی نەسـخ کورتدەبێتـەوە لـە نەسـخی قورئان بە قورئان لەگەڵ پارێزگاری لە تیدانەسخکراو، بەڵام نەسخی سوننە بە سوننە یان نەسخی سوننە بە قورئان و نەسخی هەنـدێ لـە حـوکمی پەیامـەکانی پێشـوو بـە پەیامی محەمەدی ئەوە لە بەڵگەنەویستەکانە و ناتوانرێت سەرپێچی لێ بکرێت.

سێیەم–بەڵگەنەویستە نەسخ هەڵوەشاندنەوەی حوکمی پێشترە بە بەڵگەی دواتر لە شەریعەتەکان و یاساکاندا، ئەمەش دوو جۆرە: راشکاوانە و ئامێزگرانە.

أ.نەسخی راشکاوانە: وەك ئەوەی قورئان بفەرموێت فڵان ئایـەت بـە فـڵان ئایـەت نەسخکراوەتەوە، ئەمەش روونـە، بـەڵام لـە قورئـانی پـیرۆزدا ئـەم جـۆرە لـە نەسـخ نابینرێتەوە.

ب–ئەوەیە لە قورئاندا دوو ئایەتی دژ بە یەکتر کۆببنەوە و مەرجەکانی دژیەکییان تێدا بێت، بۆ لادانی ئەم دژیەکییەش ئایەتی دواتر لـە هاتنـدا دەبێـت بـە نەسـخکەری ئایەتەکەی پێشووتر، ئەمەش بە مەبەستی لادانی دژیەکی بەهۆی کۆدەنگی زانایـان و ئاقڵانەوە لەسەر ئەوەی کە دوو دژیەیەکتر نە کۆدەبنـەوە، نـە هـەردووکیان پێکـەوە لادەدرێن، وەك چۆن بەدرێژی لەم کتێبەدا باسی لەبارەوە دەکەین.

چوارەم–جێگیرنەبوونی حیکمەتێك داوای نەسخ بکات لە قورئاندا، بۆیە نەسخ لـە قورئاندا بەبێ بوونی حیکمەتێك کارێکی گەوجانەیە، خوداش پـاك و مـەزنترە لـەوەی کاری بێمانا ئەنجام بدات یان بڕیـاری لەسـەر بـدات، رووەکـانی ئەمـە لـە یـەکێك لـەم گریمانانە دەرناچێت:

أ.خودا–سبحانە– لە کاتی تەشریع کردنی حـوکمی یەکـەمی سـڕاوەدا نـەیزانیوە حوکمە تازە جێگرەوە نەسخکەرەکە باشـتر و چـاکترە، ئەمـەش سەردەکێشـێت بـۆ دانەپاڵی نەزانی بۆ لای خودا، پێویستبوونەکە بە کۆدەنگی ئاقڵان پـووچ و بێبنەمایـە و هەر بەو جۆرە پێویستکراوەکە.

ب–یـان ئـەوەی دەزانـی، بـەڵام ئـەو کـات دەستەوسـان بـووە لـە هێنـانی ئـەو جێگرەوە، ئەمەش دانەپاڵی دەستەوسانی بۆ خودا پێویست دەکات، پێویستە پـووچ

و بێبنەمایە و هەر بەو جۆرە پێویستکراوەکە.

ج-یان دەیزانی نەسخکراوەکە چاکتر بووە بۆ مانەوە لە نەسخکەرەکە و دەسەڵاتیشی بەسەریدا هەبووە، سەرەڕای ئەوەش پێی باش بووە نەسخ بەسەر چاکتردا بهێنێت لە کاتی تەشریعدا، ئەمەش دیسان رەدکراوەیە بە کۆدەنگی ئاقڵان، چونکە لە دەروازەی گێلێتی و کاری پڕوپووچە و خوداش لەو دوانە پاك و بێگەردە.

د-یان دەسەڵاتی موسڵمانان لەسەرەتاوە لاواز بووە بۆیە قورئان رێگەی داوە بە مامەڵە لەگەڵ ناموسڵماناندا بە شێوەیەکی پلە بە پلە و ئاسانکاری لەگەڵیان و بەباشزانینی بانگکردنیان بە حیکمەت و ئامۆژگاری جوان بەسەر بەکارهێنانی توندوتیژی و هێز، بەڵام کاتێك دەسەڵاتیان پەیداکرد و توانیان هێز بەکاربهێنن پەیامی محەمەد(ﷺ) گۆڕانی بەسەردا هات لە شێوازی ئاشتیانەوە بۆ شێوازی بەکارهێنانی هێز و رێگەی توندوتیژی، ئەمەش ئەوەیە رۆژهەڵاتناسان بانگەشەیان بۆ کردووە لەوەی نووسیویانە لەسەر ئیسلام و موسڵمانان و مامەڵەیان لەگەڵ ناموسڵمانەکاندا، ئەم بانگەشەیان پووچ و بێبنەمایە، چونکە ئەو لایەنەی لەسەر رێگەی راست و دروستە بریتییە لە خودا نەك موسڵمانان، وێناناکرێت خودا لاواز بێت و لاوازی بدرێتە پاڵی.

هـ-دوایین بەڵگەهێنانەوەی ئەوانەی بانگەشەی نەسخ دەکەن ئەوەیە حوکمەکانی قورئان بە گۆڕانی بەرژەوەندییەکانی مرۆڤایەتی گۆڕانیان بەسەردا هاتووە، بۆیە ئەو بەرژەوەندییەی داوای حوکمی نەسخکراو دەکات گۆڕانی بەسەردا هاتووە و ئاڵوگۆڕکراوە بە بەرژەوەندییەکی تازە کە داوای گۆڕینی حوکمەکە(نەسخکراو) و هێنانی حوکمێکی نوێ(نەسخکەر) دەکات.

ئەم گریمانەیە گەر خۆمانی رادەست بکەین ئەوا وتنی پەکخستنی قورئان لە ئەمڕۆ و لە داهاتوودا پێویست دەکات، چونکە بۆچوونی نەسخکردنەوەی زیاتر لە (٢٥٠) ئایەتی قورئان لە درێژایی بیست و سێ ساڵ لە تەمەنی وەحیدا-وەك هەندێك لە سەرخەرانی نەسخ دەیڵێن- لەسەر بنچینەی گۆڕانی بەرژەوەندییەکان لە

ژینگەیەکی دواکەوتوودا وەك نیمچە دوورگەی عەرەبی داوای کارنەکردن بە قورئان دەکات لەدوای ئەوەی بەرژەوەندی مرۆڤایەتی گۆڕانی بەسەردا هات لەم سەردەمەدا و زیاتر لە سەد بەرانبەری تەمەنی وەحی لەو سەردەمەدا.

ئەم بانگەشەیە وەك دەردەکەوێت پووچ و بێبنەمایە، چونکە قورئان کورتبووەتەوە لەسەر هەمووەکییەکان و بە گۆڕانی کات و شوێن گۆڕانیان بەسەردا نایەت، و داوای لە ژێری مرۆڤایەتی کردووە بەشەکییە کاریگەرەکان بە کات و شوێن بگێڕنەوە بۆ ئەو هەمووەکیانە.

بۆیە مانەوەی پەیامی محەمەدی و مەودای گشتگیری و ئابلۆقەگیری ئەو پەیامە بە هەموو ئەوەی روودەدات لە داهاتوودا بەزۆری لەسەر بنچینەی چوارچێوەدارکردنی قورئان لە هەمووەکییەکاندا بیناکراون، و گێڕانەوەی بەشەکییە گۆڕاوەکان و رووداوە نوێیەکان لە داهاتوودا بۆ ئەو هەمووەکیانە.

شەشەم–ئاگادارکردنەوەی ئەو کەسەی بە گومانی باشی خۆی بەرگری دەکات لە بوونی نەسخ لە قورئاندا لەمەڕ ئەوەی بەو کارەی تەنها خزمەت بە دوژمنانی ئیسلام[1] دەکات، ئەو دوژمنانەی لە دانراوەکانیاندا بە نەسخ تانە لە قورئان دەدەن و بەڵگە دەهێننەوە بەوەی نەسخ لە روخساری یاساڕێزییە و بەری دەستی مرۆڤە.

حەوتەم–زەقکردنەوەی تێکەڵی راوەستاو لە نێوان نەسخ بە مانا گشتییەکەی لەلای پێشینانی چاك کە هەموو ئەوەی بەسەر دەقدا دێت دەگرێتەوە لە تایبەتکردن و سنووردارکردن و درێژەپێدان و سووککردن و هاوشێوەکانی ئەمانە لەگەڵ نەسخ بە مانا تایبەتەکەی کە زانایانی ئوسوڵ لە پاشین دایانهێناوە کە بریتییە لە هەڵوەشاندنەوەی حوکمێکی پێشوو بە بەڵگەیەکی شەرعی دواتر، هەڵەیەکی گەورەیە نەسخ بە مانا تایبەتەکەی لەلای پاشین تێکەڵ بکرێت بەو مانا گشتییەی لەلای پێشین جێگیرکراوە.

---

[1] وەك رۆژهەڵاتناسەکان.

هەشتەم—ئیمان بە قورئانی پیرۆز راستەوخۆ دوای ئیمان بە خودا دێت، زانایانی موسڵمانانی کۆن و نوێ کۆدەنگیان هەیە لەسەر نادروستی شانددان لەسەر گومانئامێزەکان لە باوەڕدا لە رێگەی ئیجتیهادەکانەوە، هەروەها کۆدەنگیان هەیە لەسەر نادروستی شوێنکەوتنی رێگەی چاولێکەری و ئیمانی چاولێکەریانە، هەموو ئەوەی وتراوە لەمەڕ نەسخ لە قورئاندا تەنها شان لەسەر بەڵگەی گونانئامێز دادەدات و تەنها گومان دەگەیەنێت.

بۆیەم—دوای پێداچوونەوەی سەدان سەرچاوەی باوەڕپێکراو لە تەفسیرەکانی قورئان و فەرموودەی شەریف و شرۆڤە و لێکدانەوەکان و کتێبەکانی ئوسوڵی فیقه و دانراوە کۆن و نوێیەکان لەمەڕ نەسخ لە قورئاندا بەڵگەیەکی یەکلاکەرەوەم نەبینییەوە لە ئایەتی قورئان یان سوننەتی پێغەمبەری متەواتیر یان کۆدەنگی هاوەڵان یان قسەی نووسەرانی وەحی کە ژمارەیان زیاتر لە چل هاوەڵن ئاماژە بکات بۆ نەسخی ئایەتێکی دیاریکراو بە ئایەتێکی تر یان بە سوننەتێکی متەواتیر.

هەموو ئەوەی نووسراوە و وتراوە تەنها بەڵگەیەکی گومانئامێزی جێناکۆکە لە فەرموودەی ئاحاد یان ئیجتیهاداتی تاکەکەسی یان ئاماژەی گومانئامێز بۆ دەقەکان وەرگیراوە، زانایانی ئیسلامی کۆن و نوێ کۆدەنگیان هەیە ئەو شتەی بە یەقین جێگیر بوو تەنها بە یەقین دەسڕێتەوە.

زۆرێك لە هۆی تر بوونیان هەیە رۆشنکردنەوە و درێژەپێدان و پشتیوانی کردنیان بە بەڵگەی نەقڵی و ئەقڵی بە مۆڵەتی خودا دەخرێنە روو، رجامە لە لوتفی بێسنووری خودا لە هەڵە و تێکەوتن بمپارێزێت و لە زمان درێژی زیریە چەقبەستووەکان و بیرکردنەوەی کوێرانە و دەمارگیرەکانە بمپارێزێت، ئەوکەسانەی قسەکانیان پێش کرداریان دەکەوێت و زمانیان لە ئەقڵیان لێوەشاوەترە، خودا بەسەر هەموو شتێکدا زاڵ و دەستڕۆیشتووە.

دانەر

بسم الله الرحمن الرحيم

حەمد بۆ ئەو خودایەی بە زانستەکەی ئابلۆقەی داوە بەوەی گوزەری کردووە و ئەوەی گوزەر دەکات لە هەر سێ دەمەکاندا، صەڵەوات و سەلام لەسەر ئەو قسەی خودا پێی دەفەرموێت: (وأنزلنا إليكَ الذكْرَ لِتُبين للناسِ ما نُـزِّلَ إلـيهم) هەروەها لەسەر ئالوبەیت و هاوەڵانی کە ڕێگەی تێگەیشتن لە قورئانیان بۆ ئەوانەی دوای خۆیان ئاسان کرد.

# نەسخ

**نەسخ لە زمانی عەرەبدا:**

نەسخ لە زمانی عەرەبدا بە چەند مانایەك هاتووە: لەوانە "لابردن"، وەك ئایـەتی: ﴿فَيَنْسَخُ اللَّهُ مَا يُلْقِي الشَّيْطَانُ ثُمَّ يُحْكِمُ اللَّهُ آيَاتِهِ﴾[1]، هـەروەها بـە مانـای "جێگرتنەوە"، لەوانە ئایەتی: ﴿وَإِذَا بَدَّلْنَا آيَةً مَكَانَ آيَةٍ وَاللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا يُنَزِّلُ قَالُوا إِنَّمَا أَنْتَ مُفْتَرٍ بَلْ أَكْثَرُهُمْ لاَ يَعْلَمُونَ﴾[2]، هەروەها بە مانـای ئـاڵوگۆڕ وەك "تناسـخ المیراث" واتە ئاڵوگۆڕی لە میراتگرێکەوە بۆ میراتگرێکی تر.

هەروەها بە مانای "گواستنەوە لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تـر"، لەوانـە "اكتـاب كتاب حرفا بحرف" ئەسڵەکە وێنەیەکە و لەبەرنوسـراوەکەش وێنەیـەك، چـونکە لـە جێگەی ئەو راستبووەتەوە و نووسەرەکەش "ناسخ و منتسخ"ە[3].

---

[1] سورة الحج/٥٢.

[2] سورة النحل/١٠١.

[3] لسان العرب لابن منظور (جمال الدين بن محمد مكرم الانصـاري): ٢٨/٤ فصـل النـون وحرف الخاء.

**نەسخ لە زاراوەی پێشیندا:**

بریتییە لە هەر شتێك بەسەر ڕووالەتی دەقدا دێت لە تایبەتکردنی گشتی یان سنووردارکردنی ڕەها یان ڕۆشنکردنەوەی پوختە یان قورسکردنی حوکمەکەی یان سووككردنی یان هەڵوەشانەوەی حوکمەکەی، یان هاوشێوەکانی ئەمانە.

ئیمام"ابن العربي" لەسەر تەفسیری ئایەتی: ﴿وَعَلَى الْوَارِثِ مِثْلُ ذَلِكَ﴾ دەفەرموێت: زانایانی پێشوو لە فەقیهان و تەفسیرکەرانی قورئان بە تایبەتکردنیان دەوت نەسخ، چونکە هەندێ لەوەی گشت دەستی بۆ دەبات لایداوە وەك لێبوردنێك، ئەوەش بەسەر زمانی ئەواندا(پێشین) گوزەری کردووە تا لەسەر ئەوانەی دواتر جۆرێك لە تەمومژ دەربارەی مانای نەسخ سەریهەڵداوە[1].

"ابن القيم الجوزي"[2] لەژێر ناونیشانی"مەبەست بە ناسخ و مەنسوخ لەلای پێشین و پاشین"دەڵێت: ((پێشین بەگشتی مەبەستیان بە ناسخ و مەنسوخ جارێك بریتی بووە لە هەڵگرتنی حوکمەکە بە تەواوی کە ئەمەیان زاراوەی ئەوانەیە دواتر هاتوون، جارێکیش بریتی بووە لە هەڵگرتنی ئاماژەی گشتی و ڕەها و ڕووالەت و شتانی تر، جا یان بە تایبەتکردن یان کۆتکردن یان هەڵنانی ڕەها بۆ سنووردار و تەفسیرکردنی و ڕۆشنکردنەوەی، تەنانەت هەڵواردن(الإستثناء) و مەرج و سیفەتیان بە نەسخ ناودەبرد بەهۆی لەئامێزگرتنی ئەوانە بۆ لادانی ئاماژەی ڕووالەتی و ڕۆشنکردنەوەی مەبەست، بۆیە نەسخ لەلایان و لە زمانی ئەواندا بریتی بوو لە ڕۆشنکردنەوەی مەبەست بە شتانێکی تر جگە لەو وشەیە، بەڵکو بە شتێك لە دەرەوەی وشەکەوە، هەر کەس تێڕامان بۆ قسەکانیان بکات زۆرێك لەو ڕاستییانە

---

[1] القرطبي: ١٦٩/٣.

[2] شمس الدين أبو عبد الله محمد بن أبي بكر المعروف بابن قيم الجوزية (ت-٧٥١هـ) أعلام الموقعين: ٣٥/١.

دەبینێتەوە کە نایەنە هەژماردن و لەوێشەوە و لەو ڕێگەیەوە تەمومژەکان[1] کۆتاییان پێ دێت کە هەڵدانی قسەی ئەوان بۆ سەر زاراوەی نوێی دواتر پێویستی کردووە)).

"القرطبي"[2] دەفەرموێت:((تایبەتکردنی گشتی ئەندێشەی ئەوە دروست دەکات گوایە نەسخە، بەڵام لە نەسخ نییە، چونکە هەرگیز تایبەتکراو دەستی بۆ نەبراوە لەلایەن گشتەوە، گەر دەستبۆبردنی گشت بۆ شتێك سەلمابێت و پاشان ئەو شتەی لە گشت بەدەرنابێت ئەوا ئەوە بریتی بووە لە نەسخ نەك تایبەتکردن، پێشین بە تایبەتکردنیان دەوت نەسخ وەك بەرینکردن و بەکارهێنانی مەجازی))

"الشاطبي"[3] دەڵێت: ((ئەوەی لە قسەی پێشینەوە دەردەکەوێت بەکارهێنانی نەسخ لەلایان بەرەهایی گشتگیرتر بووە لە قسەی ئوسوڵییەکان: ئەوان بە سنووردارکردنی رەهایان دەوت نەسخ، بە هەمان شێوە بە تایبەتکردنی "گشت"یان دەوت نەسخ بە بەڵگەیەکی پەیوەست یان سەربەخۆ، هەروەها بە ڕۆشنکردنەوەی ناڕوون و پوختەیان دەوت نەسخ، چونکە هەموو ئەوانە لە یەك مانادا هاوبەش بوون ئەوەش ئەوە بوو نەسخ لە زاراوەی دواتردا داوای ئەوە دەکات ئەمرە پێشکەوتووەکە مەبەستگیراو نییە لە داوادا، بەڵکو بەمەبەستگیراو ئەوەیە کە دواتر هاتووە، بۆیە یەکەم کاری پێناکرێت و دووەم ئەوەیە کاری پێ دەکرێت، ئەم مانایەش لە سنووردارکردنی رەهادا گوزەر دەکات، واتە رەها ڕوواڵەتەکەی واز لێ دەهێنرێت لەگەڵ سنووردارکردنی، بۆیە لە رەهاکردنیدا کارپێکردنی نییە، بەڵکو کارپێکراو

---

[1] لەو تەمومژ و ئاڵۆزیانە زۆرێك لە ئوسوڵییەکان و ئەهلی تەفسیر و لێکۆڵەران بەڵگە بە قسەی پێشین دەهێننەوە لەسەر نەسخی زۆرێك لە ئایەت بە مانای پاشین، ئەمەش لەڕووی مەنتقەوە رەفزکراوە، چونکە گشتگیرتر تایبەتتر پێویست ناکات، لەوێشەوە بەڵگەی پێناهێنرێتەوە لەسەر سەلماندنی.

[2] أبو عبد الله محمد بن أحمد بن أبي بكر فرح الأنصاري الخزرجي الاندلسي القرطبي المفسر (ت- ٦٧١هـ) الجامع لأحكام القرآن: ٢/٦٥.

[3] إبراهيم بن موسى اللخمي الغرناطي المالكي (ت-٧٩٠هـ) الموافقات في أصول الشريعة:٣/١٠٨.

بریتییە لە سنووردارەکە، وەك ئەوەی رەها لەگەڵ سنووردارەکەیدا سوودێك نەبەخشێت، بۆیە وەك نەسخکەر و نەسخکراویان لێهاتووە[1]، بەهەمان شێوە گشت لەگەڵ تایبەتدا گەر رووالەتی گشتەکە داوای گشتگیری حوکمەکەی دەکرد بۆ کۆی ئەوەی وشەکە دەستی بۆ دەبات، بۆیە کاتێك تایبەت دێت حوکمی رووالەتی گشتی لە بایەخپێدان بەدەردەنێت، لەوێوە بە نەسخکەر و نەسخکراو شوبهێنراون، لەگەڵ ئەوەش وشە گشتییەکە تەواوی ئاماژەکەی پشتگوێ ناخرێت، بەڵکو ئەو بەشەی پشتگوێ دەخرێت کە تایبەت[2] ئاماژە دەکاتە سەری و بەشەکانی تری لەسەر باری یەکەمی خۆیان دەمێننەوە.

رۆشنکراوە لەگەڵ ناڕۆشن[3] وەك سنووردار وایە لەگەڵ رەها، کاتێك بەو جۆرە بوو وشەی نەسخی بۆ کۆی ئەو مانانە بەکارهێناوە بەهۆی گەڕانەوەیان بۆ لای یەك شت))

"الزركشي" لەمەڕ ئیجتیهادی تەفسیرکەرانی قورئان لە بۆچوونیان دەربارەی نەسخکردنەوەی هەندێ ئایەت دەڵێت: ((هەموو ئەوەی لە قورئاندایە و بانگەشەی نەسخکردنەوەیان بە سوننەت دەکرێت لەلای ئەوانەی ئەوە بۆچوونیانە بریتییە لە رۆشنکردنەوەی حوکمی قورئان، خودا–سبحانه وتعالى– دەفەرموێت: ﴿وَأَنزَلْنَا إِلَيْكَ الذِّكْرَ لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيْهِمْ﴾[4]، بەڵام نەسخکردنەوەی قورئان بە قورئان

---

[1] وەك لە ئایەتی: (مَنْ كَانَ يُرِيدُ الْعَاجِلَةَ عَجَّلْنَا لَهُ فِيهَا) الآية مع قوله تعالى (مَنْ كَانَ يُرِيدُ حَرْثَ الآخِرَةِ) لأن قوله (نُؤْتِهِ مِنْهَا ) مطلق مقيد بالمشيئة في قوله تعالى (لمن يريد) لە جێگەی خۆی باسی لەبارەوە دەکرێت.

[2] واتە ئەوەی تایبەت ئاماژە بە پشتگوێخستنی دەکات پشتگوێ دەخرێت و کار بەوەی ماوەتەوە دەکرێت، ئەوە ش بریتییە لە جگە لە ئاماژەبۆکراوی تایبەت.

[3] وەك هاتنی نموونەکەی لە ئایەتی:(كُتِبَ عَلَيْكُمُ الصِّيَامُ كَمَا كُتِبَ عَلَى الَّذِينَ مِنْ قَبْلِكُمْ) مع قوله تعالى (أُحِلَّ لَكُمْ لَيْلَةَ الصِّيَامِ الرَّفَثُ إِلَى نِسَائِكُمْ) الآية وكما في قوله تعالى (قُلْ الأَنْفَالُ لِلَّهِ وَالرَّسُولِ) مع قوله (وَاعْلَمُوا أَنَّمَا غَنِمْتُمْ) الآية.

[4] سورة النحل/٤٤.

لەسەر ئەوەی کە زۆرێك لە تەفسیرکەرانی قورئان بۆیدەچن بریتی نییە لە نەسخ، بەڵکو بریتییە لە دواخستن یان ڕۆشنکردنەوەی پوختە لە کاتی پێویستدا، یان گوتارێك گوتارێکی تر کەوتۆتە نێوان ئەو و سەرەتاکەی، یان تایبەتکردن لە گشتدا یان حوکمێکی گشتی بۆ تایبەت، یان بۆ چوونە ناو یەکی مانایەك لە مانایەکی تر.. جۆرەکانی گوتار زۆرن، بۆیە وا گومانیان برد ئەوە نەسخ بێت، بەڵام نەسخ نییە، بەڵکو قورئان کتێبێکی دەستڕۆیشتووە بەسەر هەموو کتێبەکانی تردا و لە خودی خۆیدا بەشێکی پشتیوانی بەشێکی تر دەکات، و خودا پارێزگاری ئەو قورئانەی لە ئەستۆ گرتووە و دەفەرموێت: ﴿إِنَّا نَحْنُ نَزَّلْنَا الذِّكْرَ وَإِنَّا لَهُ لَحَافِظُونَ﴾)) [1].

بەم خستنەرووەی وتەی گەورە زانایان دەوەستم کە دەڵێن مانای نەسخ لەلای پێشینی چاکان زۆر گشتگیرتر بووە لەو مانا ناسراوەی لەلای زانایانی ئوسوڵ بوونی هەیە وەك لە داهاتوودا باسی لەبارەوە دەکەین، هەموو ئەوەی ئیبن عەباس ریوایەتی کردووە لە دانەپاڵی نەسخ بۆ هەندێ لە ئایەتی قورئان هەڵدەدرێتە سەر ئەم مانایە، و دروست نییە بۆ شرۆڤەکەرانی قورئان و زانایانی ئوسوڵ و لێکۆڵەران بەڵگە بە قسەی "ئیبن عەباس" بهێننەوە لەسەر نەسخی ئایەتێك بە مانا تایبەتەکەی نەسخ لەلای پاشین.

هەر بەو جۆرە ئەوەی لە گەورەمان "علي بن أبي طالب"ەوە–کرم الله وجهه– ریوایەتکراوە دەربارەی نەسخ هەڵدەدرێتە سەر مانای گشتی، ئەوەی کە بە قازی کوفە(أبي محي)ی وت: ئایا نەسخکەر و نەسخکراو دەزانیت؟ وتی: نەخێر، فەرمووی: خۆت تیاچووی و خەڵکیشت تیابرد، واتە خۆت و خەڵکیت ڕووبەڕووی تیاچوون کردەوە کاتێك زانستی نەسخکەر و نەسخکراو نازانیت، بۆیە ئەم ریوایەتە گەر دروست بێت ئەوا نەسخ لە قسەکەیدا مەبەستی پێی تایبەتکردنی گشت بووە و سنووردارکردنی رەها بووە و ڕۆشنکردنەوەی پوختە بووە و شتانی تریش لە مانای

---

[1] سورة الحجر/٩.



جۆراوجۆر کە لەژێر مانای نەسخدا لەلای پێشینی چاکان جێگەی دەبێتەوە، ئەوەی ڕۆشنە لە مەرجەکانی لێوەشاوەیی قەزا ئەوەیە ئەو کەسەی دەیگرێتە دەست زانا بێت بە سیفەتە جۆراوجۆرەکانی وشەی دەقەکان لە گشت و تایبەت و ڕەها و سنووردار و پوختە و ڕۆشنکەرەوە و ڕوخسەت و عەزیمەت و شتانی تر کە زانایانی ئوسولّ دەستیان بۆ بردووە.

**نەسخ لە زاراوەی پاشیندا:**

لە سەرچاوە ئوسولّییەکانەوە بۆ نەسخ بە مانای تایبەت لەلای پاشین چەندین پێناسەی ئوسولّی و تەفسیری لە گوزارەی جۆراوجۆردا یان نزیک بەیەکتر لە مانادا هاتووە، هەموویان بە دەوری یەك مانادا دەسوڕێنەوە ئەوەش ئەوەیە نەسخ بریتییە لە سڕینەوەی حوکمێکی شەرعی پێشوو بە بەڵگەیەکی شەرعی دواتر[1].

---

[1] زانای ئوسولّی حەنەفی صدر الشريعه (عبيد الله بن مسعود) پێناسەی کردووە لە "التوضيح والتنقيح: ٢/٣٠٥ دەڵێت: ئەوەیە بەڵگەیەکی شەرعی دواکەتوو لە بەڵگەیەکی شەرعی تر هاتبێت و داواکارییەکانی پێچەوانەی حوکمەکەی بێت.
زانای ئوسولّی مالیکی "القراف (شهاب الدين أحمد بن إدريس)له شرح تنقيح الفصول في اختصار المحصول في الاصول ص٣٠١پێناسەی کردووە بەوەی: گوتارێکە ئاماژە دەکاتە سەر هەڵگرتنی حوکمێکی حوکمێکی جێگیر بە گوتارێکی پێشکەوتوو لە ڕوویەکەوە گەر ئەوە نەبوایە ئەوا جێگیر دەبوو لەگەڵ دواکەوتنی لێی.
زانای ئوسولّی شافیعی "ابن السبکی (تاج الدين عبد الوهاب) في کتابه جمع الجوامع: ٢/٥٠ پێناسەی کردووە بەوەی هەڵگرتنی حوکمێکی شەرعییە بە گوتارێك.
زانای ئوسولّی حەنبەلی "الفتوحي (شهاب الدين أحمد بن عبد العزين) في کتابه شرح الکوکب المنير المسمى بمختصر التحرير ص٢٥٤ پێناسەی کردووە بەوەی هەڵگرتنی حوکمێکی شەرعییە بە بەڵگەیەکی شەرعی دواتر.
زانای ئوسولّی شیعی "محمد جواد مغنية في کتابه علم أصول الفقه في ثوبه الجديد ص١٩١ پێناسەی کردووە بەوەی ڕۆشنکردنەوەی بەڵگەیەك لەسەر کۆتاهێنانی حوکمی ئەوەی هەیە.

تێبینی دەکرێت زۆربەی پێناسە ئوسوڵییەکان بۆ نەسخ پێداگری دەکات لەسەر نەسخی حوکمێکی پێشوو بە بەڵگەیەکی شەرعی دواتر، ئەمەش بەرهەڵستی دەکات لەگەڵ دابەش کردنەکەیان بۆ نەسخ لە قورئان بە دانانی نەسخ بۆ نەسخی حوکم و خوێندنەوە پێکەوە و حوکم نەسخکراو بەبێ خوێندنەوە و خوێندنەوە نەسخکراو بەبێ حوکم، چونکە پێناسەکەی ئەوان لەسەر هەڵوەشانەوەی حوکم کورتهەڵهاتووە.

پێناسەی هەڵبژێرراو پێشنیار دەکەم وەربگیرێت ئەوەیە: نەسخ بریتییە لە هەڵوەشانەوەی وەحییەکی پێشتر بە وەحییەکی دواتر، ئەمەش وەحی خوێنراوە(قورئان) و وەحی نەخوێنراوە(سوننەتی پێغەمبەر) دەگرێتەوە.

بەڵام حوکمی ئیجتیهادی نەسخەکەی دەزانرێت بەوەی هەڵوەشانەوەی حوکمێکی پێشترە بە پاڵپشتێکی شەرعی دواتر، بۆیە هەڵوەشانەوەی کۆدەنگی(إجماع) بە کۆدەنگی(إجماع) و هەڵوەشانەوەی پێوانە(قیاس) بە کۆدەنگی یان بە پێوانە دەگرێتەوە.

**شیاویی نەسخ:**

١–جیاوازی لە نێوان زانایانی موسڵماندا نییە لەوەی شەریعەتی خوایی پێشووتر کە لقە حوکمەکانیان بە گۆڕانی کات و شوێن دەگۆڕێن بە شەریعەتی ئیسلام

---

زانای ئوسوڵی زەیدی پێناسەی کردووە " الحسين بن أمير المؤمنين المنصور بالله القاسم بن محمد في كتابه هداية العقول الى غاية السؤل في علم الاصول: ٤٠٧/٢ پێناسەی کردووە بەوەی رۆشنکردنەوەی کۆتاپێهێنانی حوکمێکی شەرعی بە رێگەیەکی شەرعی دواتر.

زانای ئوسوڵی زاهیری "ابن حزم (محمد بن علي بن حزم الاندلسي الظاهري) في كتابه الإحكام في أصول الأحكام.: ٤٣٨/٤: پێناسەی کردووە بەوەی: رۆشنکردنەوەی کۆتاپێهێنانی سەردەمی ئەمری یەکەم لەو شتەی دووبارە نابێتەوە.

زانای ئوسوڵی ئیبازی "السالمي أبو محمد في كتابه شرح طلعة الشمس على الألفية:٦٩/١: پێناسەی کردووە بەوەی بریتییە لە هەڵگرتنی حوکمێکی شەرعی لەدوای جێگیربوونی بە حوکمێکی شەرعی تر.

سڕاونەتەوە، چونکە قورئانی پیرۆز دوایین دەستووری خوداییە، و بۆ ڕاستکردنەوەی دەستووورە پێشـووەکانی تـر هـاتووە، بۆیـە ئـەوەی شـایەتی هەڵوەشـانەوەیە هەڵیوەشـاندۆتەوە و ئـەوەش قـابیلی هەڵوەشـانەوە نییـە –وەك ئـەو حوکمانـەی پەیوەندیان بە بیروباوەڕەوە هەیە و ئەو ئایەتانـەی لەمـەڕ حوکمـەکان هـاتوون و بـە جیاوازی کـات و شـوێن گۆڕانیـان بەسـەردا نایـەت– دانـی پیـادا نـاون، ئـەو حوکمـە نەسڕاوانە بوون بە بەشێك لە شەریعەتی ئیسلام، وەك چۆن دەستووری دانراو هەندێ لـە حوکمـەکانی دەسـتوور دەسـڕێتەوە و هەنـدێکی تـری دەهێڵێتـەوە و ئـەو بەشـە دەبێت بە پارچەیەك لە دەستووری نوێ، بۆیە کـاری پـێ دەکرێـت نـەك لەسـەر ئـەو بنچینەی بەشێکە لە دەستووە کۆنەکە، وەك چۆن کۆمەڵگەی یەك دەوڵـەت بـۆ یـەك دەستوور گەردنکەچ دەبێت، هەر بەو جۆرە خێزانی مرۆڤایەتی داوای لێکراوە بۆ یـەك دەستووری خودایی گەردنکەچ بن، چونکە هەموویان برا و خوشکی یەکترن و لە یەك دایك و باوکەوە هاتوون، هەموویان لە یەك کانزا دروستکراون و یەك دروستکەر و یـەك چارەنووسیان هەیە.

٢–جێگەی ناکۆکی نییە سوننەتی پێغەمبەر سوننەتی تری سڕیوەتەوە، لە پیادە کردنەکانی ئەو نەسخکردنە فەرموودەکەی پێغەمبەرە(ﷺ): ((من پێشتر لە سەردانی گۆڕستان نەهیم لێکردبوون ئێستا سەردانی بکەن، یـان ئاگادارتـان دەکـەم سـەردانی بکـەن))[1]، سـەردانی گۆڕسـتان حـەرامکراو بـوو لـە سـەرەتای ئیسـلامەوە، چـونکە خەڵکی پێش هاتنی ئیسلام باوەڕیان بە پیرۆزکردنی گۆڕ هەبوو، بۆیە ئیسلام ڕێگری لێ کردن و ئەو نەرێتەی لێ حەرام کردن، چونکە پیرۆزی بۆ هەر شتێك جگە لە خودا حەرامکراوە، کاتێك حەقیقەت بەرجەستە بوو و خەڵکی بـاوەڕی هێنـا بـە تـەنها یـەك خـودا و لـە بـیری نەفسـانە و پڕوپـووچ ڕزگاریـان بـوو پێغەمبـەر(ﷺ) حوکمەکـەی پێشووی سڕیەوە کە بریتی بوو لە حەرام کردن و ڕێگەی بە سەردانی گۆڕستان دا بـە

---

[1] رواه مسلم واحمد في مسنده.

ئەندازەی ئەوەی یادی دوارۆژ دەهێنێتە پێش چاوی مرۆڤ و مرۆڤ بیر لە چارەنووسی خۆی دەکاتەوە، تاکو ژیانی دونیا زاڵ نەبێت بەسەریدا و لە ڕێگەی دروست لابدات، بەڵام پیرۆزکردنی قەبر تاکو ئێستا حەرامکراوە و نەسخنەکراوەتەوە.

٣-جیوازی لەوەدا نییە سوننەتی پێغەمبەر بە قورئان نەسخکراوەتەوە، وەك نەسخی ڕووکردنە "بيت المقدس" دوای ئەوەی ئەو ڕووتێکردنە بە سوننەتی پێغەمبەر بڕیاری لەسەر درابوو، بەجۆرێك لە دوای کۆچکردن بۆ مەدینەش ئەو ڕووتێکردنە بەردەوام بوو بۆ ماوەیەك کە لە نێوان سیازدە مانگ تا هەژدە مانگدایە بەپێی جیاوازی لە ریوایەتی ئەم بابەتەدا، قورئان ئەو ڕووتێکردنەی هەڵوەشاندەوە و فەرمانی بۆ ڕووکردنە "البيت الحرام" کرد لە مەککەی شکۆمەند وەك دواتر لە جێگەی خۆیدا بەدرێژی باسی لەبارەوە دەکەین.

٤- جیاوازی نییە لە گونجاوی نەسخی قورئان بە قورئان لەڕووی ئەقڵەوە، چونکە کارێکە بۆی هەیە ڕووبدات، خودا خاوەنی توانایە بەسەر هەموو ئەو شتانەدا بۆیان هەیە روو بدەن، بەڵگەی توانا بەسەر شیاوەکاندا ئەم ئایەتەیە: ﴿مَا نَنسَخْ مِنْ آيَةٍ أَوْ نُنسِهَا نَأْتِ بِخَيْرٍ مِنْهَا﴾[1]، ئەم ئایەتە بەڵگەیە لەسەر شیاویی ئەقڵی نەك لەسەر ڕوودانی، چونکە پیتی "ما" ناوێکی مەرجییە بە مانی"إن" واتە "گەر نەسخی بکەینەوە".

شایانی باسە هەریەك لە "إن" و "إذا" لە ئامرازەکانی مەرجین، بەڵام یەکەمیان بەکاردێت بۆ کارێك دڵنیانین لە ڕوودانی بە پێچەوانەی دووەمەوە، "التفتازاني" لە پێشەکی کتێبی "المطول"دا[2] سکاڵا دەکات لە دەست سەردەمەکەی خۆی و دەڵێت: (سکاڵا تەنها بۆ لای خودایە لەدەست سەردەم، گەر(إذا) خراپە بکات لەسەر خراپەکەی سوور و بەردەوام دەبێت، گەر(إن) چاکەش ئەنجام بدات هەر ئەو ساتە پەشیمان دەبێتەوە) لەسەر ئەوە لە پەراوێزەکەدا نووسیویەتی: لەگەڵ خراپە

---

[1] سورة البقرة/١٠٦.

[2] سعد الدين التفتازاني، المطول ص٣٥.



"إذا"ی بەکارهێناوە، چونکە ڕوودانەکەی دڵنیایی تێدایە، لەگەڵ چاکەش "إن"ی بەکارهێناوە، چونکە ڕوودانەکەی لەلای ئەو گومانی تێدا هەیە، چونکە لە ڕەوشێکی هەڵواردەیی(ناباش)دا ژیانی بەسەربردووە.

بەلگەهێنانەوە لەسەر ڕوودانی نەسخ بەم ئایەتە(ئایەتی ١٠٦ی البقرة) هەڵەیەکی باوە و وردەکاری تێدا نییە.

٥-جیاوازی نییە لە ئەگەری بوونی نەسخی هەندێ ئایەت پێش مردنی پێغەمبەر(ﷺ) گوایە ئەو ئایەتانە لەم قورئانەی ئەمڕۆ لەبەردەستی موسڵماناندایە دانەنراون، بەڵام ئەم هەواڵە بە تەواوتور جێگیر نەبووە، بۆیە جیاوازی تێدا هەیە هەتا هەندێ کەس وا گومان دەبەن ئەو ئایەتانە حوکمەکانیان نەسخکراون، نەک خوێندنەوەیان، لە جێگەی خۆیدا وەلام لەسەر ئەمە دەخرێتە ڕوو.

٦-جیاوازی نییە(یان دەبێت جیاوازی نەبێت) لەسەر نەبوونی نەسخی قورئان و نەبوونی نەسخی سوننەتی پێغەمبەر بە کۆدەنگی(الإجماع) یان بە پێوانە(القیاس) چونکە ئەو دوو سەرچاوەیە لەسەر دەمی هاتنی پەیامدا کاریان پێنەکراوە و بە مردنی پێغەمبەر(ﷺ) نەسخ کۆتایی هاتووە.

٧-جیاوازی نییە(یان دەبێت جیاوازی نەبێت) لەوەدا نەسخ بەسەر هەواڵەکان و بەڵێن و هەڕەشەکان و حوکمەکانی باوەڕ و حوکمە هەتاهەتاییەکاندا گوزەر ناکات.

٨-جیاوازی لەوەدا نییە لە قورئاندا کۆمەڵێك ئایەت بوونیان هەیە کارکردن پێیان ڕاگیراوە، چونکە حوکمەکانیان تایبەتکراون بە کۆمەڵێك هۆوە کە نەماون و بۆ هەتاهەتایە کۆتاییان پێهاتووە، بۆیە حوکمەکان وەستاون بەپێی تیاچوونی هۆیەکان، لەو ئایەتانە وەستانی پێدانی زەکات بۆ "المؤلفة قلوبهم-ئەوانەی بە پێدانی زەکات دڵیان بۆ لای ئیسلام ڕادەکێشرا یان شەڕ و خراپەیان ڕادەگیرا، چونکە زیان بەر بەرژەوەندییەکانیان گەیشتبوو"، هۆی ئەم کارە پێویستی ئیسلام بوو بە ڕاکێشانی دڵان تاکو نەبن بە بەردی لەمپەر بۆ بڵاوبوونەوەی پەیامی ئیسلام، بۆیە کاتێك

ئیسلام بەهێز بوو و بێنیازبوو لەو دڵڕاکێشانە هۆیەکە نەما و حوکمیش لەگەڵ هۆیەکەی دەسوڕێتەوە بە بوون و بە نەبوون.

هەروەها لەو ئایەتانە ئایەتی پەیوەست بە حوکمەکانی کۆیلە و کەنیزەکەوە، وەك لە ئایەتی: ﴿فَإِنْ خِفْتُمْ أَلاَّ تَعْدِلُوا فَوَاحِدَةً أَوْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُكُمْ﴾[1]، هەروەها ئایەتی: ﴿وَالْمُحْصَنَاتُ مِنَ النِّسَاءِ إِلاَّ مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُكُمْ﴾[2]، ئەمانە و چەندین ئایەتی تر کە دەستیان بردووە بۆ ئەو حوکمانەی پەیوەستبووە بە سیستمی کۆیلە و کەنیزەکەوە، چونکە ئیسلام سیستمی رزگار کردنی مرۆڤی هێناوە لە کۆیلایەتی بۆ کەسانێك یان شتانێك جگە لە خودا، بۆیە دانی نەناوە بە سیستمی کۆیلەکردنی مرۆڤدا لەلایەن برا مرۆڤەکەیەوە، بەڵکو کۆمەڵێك پێشەکی داناوە بۆ کۆتاهێنان بەم سیستمە بێزراوە لە ماوەیەکی گوازراوەدا کە بۆ هەتاهەتایە کۆتایی پێهات، وەك لەم رۆشنکردنەوەدا:

پلە بە پلەیی(قۆناغبەندی) لە کۆتاهێنان بە سیستمی کۆیلایەتی:

لە شێوازەکانی پلە بە پلەیی لە قورئاندا بۆ حەرامکردنی کۆیلەکردنی مرۆڤ لەلایەن مرۆڤەوە: ئیسلام لە کاتێکدا هات ژمارەی کۆیلەکان لە جیهاندا لە مرۆڤە ئازادەکان زۆرتر بوون، گەر بە یەکجار ئازادی بکردبانایە سەرئەنجامی نەرێیی لەسەر ئەوە سەریهەڵدەدا، وەك لەم رۆشنکردنەوەدا:

١.ملیۆنەها بەندە و کەنیزەك لەسەر خەرجی سەردارەکانیان دەژیان، بۆیە ئازادکردنیان بەیەکجار سەریدەکێشا بۆ پەرچەکرداری نەرێی، ئەوەش هەستانی ئەو کۆیلە و کەنیزەکانە بوو بە یاخیبوون دژ بە ئیسلام بەهۆی لاوازی "بیت المال"ی موسڵمانان لەو کاتەدا لە دابینکردنی ژیانی کۆیلەکان و خەرجکردن لەسەریان،

---

[1] سورة النساء/٣.

[2] سورة النساء/٢٤.

هـەروەها لاوازی دەوڵـەتی ئیسـلامی تـازە دروسـت بـوو لـە دۆزینـەوەی کـارێکی شەرەفمەندانە بۆ هەریەکێك لەوانە تاکو ژیانێکی ڕێزمەندانەیان بۆ دەستەبەر بکات.

٢.گەر قورئان بە یەکجار ئەوانەی ئازاد بکردبایە ملهوڕان و زۆرداران کە سەردارانی کۆیلەکان و کەنیزەکەکان بـوون هەڵدەسـتان بـە کـاری دوژمنکارانـە دژ بـە ئیسـلام، ئـەوەش لەبـەر ڕووبەڕووبوونـەوەی بەرژەوەندییـەکانیان بـە زیـانی تایبـەت، ڕوون و ئاشکرایە نموونەی ئەو زۆرداری و ملهوڕییە لە سەرەتای ئیسلامەوە زیانی بە ئیسـلام و موسڵمانان دەگەیاند، ئەو کاتەی ئەوان لاواز بوون لەڕووی مادی و ژمـارە و چـەك و پێویستییەکانی جەنگەوە.

٣.بازرگانی بە کۆیلەوە بڕبڕەی پشتی ژیانی ئابووری بـوو، هـەروەك ئـەو قازانجـە سووخۆرییەی لە بانکەکاندا لە قەرز و سولفە لە ئێستادا بەدەستدەهێنرێت و بـە دەق و ئیجماع حەرامکراوە، ئەوەی ڕۆشنە ئەوەیە داخستنی هـەر دەروازەیـەکی ئـابووری ڕەوا یان ناڕەوا بەڕووی خەڵکیدا پێویسـتی بـە جێگرەوەیـەك هەیـە ببێتـە بـریتی بـۆ لابراوە ئاڵوگۆڕپێکراوەکە.

٤.لە سروشتی دەروونی مرۆڤـەکان ئەوەیـە گـەر بـۆ ماوەیـەك لەسـەر شـێوازێکی دیاریکراو لـە ژیـان و زینـدەگی بـەردەوام بـوون ئـەو شـێوازە دەبێـت بـە بەشـێك لـە سروشتی و ئەوکات داڕنینی یەکجاری لەو شێوازە گران دەکەوێتـەوە، گـەر سیسـتمی کۆیلایەتی لە سەرەتای ئیسلامەوە بەیەکجار حەرام بکرابایـە ئـەوە سەریدەکێشـا بـۆ پەرچەکرداری نەرێیی لەسەر ئەو کۆیلانەی ژیانیان لە ماڵی سەردارەکانیان بـە باشـتر دەزانی لە ئازادی و مانەوە بەبێ شوێن و ماوا، وەك چۆن ئەوە ڕوویدا کاتێك ئـەمریکا بەیـەکجار کۆیلایـەتی قەدەغـە کـرد[1] بـەبێ سـەرنجدان بـە خوێندنـەوە جەوهەرییـە باسکراوەکان، بۆیە بیرۆکەی ڕزگاربوون بەو لێدانە کوتوپڕییـە سـڕایەوە و سـەرلەنوێ

[1] لماذا أنا مسلم/للأستاذ عبد الرحمن العيسوي/ص١٤٩.

کۆیلەکان لە ئازادی بەرەو کۆیلایەتی خۆیان هەڵدەهاتن، چونکە دەستەوسان بوون لە دابینکردنی ئەوەی سەردارەکانیان بۆیان دابین دەکردن.

بینا لەسەر ئەمانە و شتانی تر ئیسلام ئەم نەخۆشییە کوشندە مێژووییە پڕ لە شەرمەزاری و رسواکەرە بۆ رێز و پایەی مرۆڤ و لەناوبردنی مرۆڤبوونی مرۆڤ وەك زەلکاوێکی بۆگەن کە لە چەندین سەرچاوەوە ئاوەڕۆ دەچێتەوە سەری سەرنجدەدات و رێگەی حیکمەتی گرتە بەر لە وشککردنی لقەکانی کە ئاوی پیس دەهێنێتە ناو ئەو زەلکاوە بۆگەنەوە تاکو وشك ببێت بەشێوەیەکی پلە بە پلە و بۆ هەتاهەتایە کۆتایی پێ بێت و نەگەڕێتەوە.

**سەرچاوەکانی کۆیلایەتی**

بۆ کۆیلایەتی چەندین سەرچاوە هەیە گرنگترینیان ئەمانەن:

١.دیلی جەنگ: مرۆڤ لەو کاتەوەی لەسەر ئەم هەسارەیە بوونی هەیە فێری شەڕکردن بووە، ئەوەش بەرهەمی حەزی دەستگرتن بەسەردا و زاڵبوون و پێشکەوتنی شەڕکردن لە نێوان تاکێك و تاکێکی تردا، بۆیە شەڕکردن دەرکەوتەیەکی بەکۆمەڵی وەرگرت و شەڕ لە نێوان خێزانەکان و تیرە و هۆزەکاندا بڵاو بوویەوە، دواتر لە نێوان ناوچەکان و هەرێمەکاندا و پاشان لە نێوان دەوڵەتاندا، پرسی دیل وەك یەکێك لە بەرهەمەکانی جەنگ سەریهەڵدا، دیلەکان لە چاخی هەمەجی یەکەمدا دەکوژران و سەردەبڕان و دەشێوێنران و گۆشتەکانیان دەخورا، ئەمەش بە پاڵنەری تۆڵەسەندنەوە و کۆتاهێنان بە دوژمن، جەنگاوەران لە رۆژگارە سەرەتاکانی ژیانی مرۆڤایەتی ژیانی دیلەکانیان لە پیاوان دەپاراست بۆ مەرامی سزادانیان یان سەربڕینیان لە پەرستگای خواوەندەکاندا، بەزۆریش دیل لە مەیدانی جەنگدا دەکوژرا، ئەمەش بۆ رزگاربوون لە نان پێدان و ترساندنی هۆز و تیرەکانیان، بەڵام ژن و منداڵیان دەهێڵایەوە و دەدرانە پاڵ هۆزی سەرکەوتوو لە جەنگدا بۆ زۆربوونی دانیشتوانیان، لەدوای ئەوەی مرۆڤ پێینایە قۆناغی بەرهەمهێنانی زەوی و کشتوکاڵەوە جەنگاوەران لە مەیدانی جەنگدا پارێزگاریان بە پیاوە دیلەکانەوە دەکرد

بۆ بەکارهێنانیان لە کشتوکاڵدا، بەم جۆرە کۆیلایەتی سەریهەڵدا و دیل بوو بە کۆیلەی جەنگاوەری سەرکەوتوو لە جەنگ و بەسەردادان و بوو بەشێك لە شتوومەك و سەروەت و سامان[1]، مەلیکەکان و سەرکردەکان و پێشەواکان یەکەمین کەسانێك بوون پەنایان بۆ بە کۆیلەکردنی دیل بردووە.

کاتێك ئیسلام هات کە بریتییە لە ئایینی مرۆڤایەتی و مەرامەکانی بریتییە لە دەستەبەرکردنی بەرژەوەندی خێزانی مرۆڤایەتی، وەك خودا-سبحانه وتعالى- دەفەرموێت: ﴿وَمَا أَرْسَلْنَاكَ إِلاَّ رَحْمَةً لِلْعَالَمِينَ﴾[2] یەکسانی لەنێوان مرۆڤەکاندا راگەیاند لەسەر بنچینەی یەکبوونیان لە رەچەڵەك و یەکێتی کانزایان کە لێیەوە دروستکراون، خودا دەفەرموێت: (إن أكرمكم عند الله أتقاكم)، دروشمێکی لەسەر مرۆڤ پێویست کرد لە نوێژەکەیدا رۆژانە دەیان جار دەیڵێتەوە، ئەوەش ئایەتی: ﴿إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ﴾ تاکو هەست بە رێز و پایەداری و کەسایەتی خۆی بکات و بزانێت لە خودی خۆیدا سەردارە و تەنها بۆ دروستکەرەکەی بەندەیە نەك بۆ کەسێکی تر، ئیسلام چارەنووسی دیلی دیاریکرد و کورتیکردەوە بە وتنی: یان منەت بکەن بەسەریاندا و بەرەڵایان بکەن یان فدیەیان لێ وەربگرن بە برێك لە ماڵ یان بە گۆڕینەوەی دیل لەلای لایەنە شەڕکەرەکەی تر، خودا دەفەرموێت: ﴿فَإِذا لَقِيتُمْ الَّذِينَ كَفَرُوا فَضَرْبَ الرِّقَابِ حَتَّى إِذَا أَثْخَنتُمُوهُمْ فَشُدُّوا الْوَثَاقَ فَإِمَّا مَنًّا بَعْدُ وَإِمَّا فِدَاءً حَتَّى تَضَعَ الْحَرْبُ أَوْزَارَهَا ﴾[3].

٢.چەتەیی و فڕاندن و کۆیلەکردن: ئەم رێگانە هۆکاربوون بۆ راوکردنی مرۆڤ لەلایەن برا مرۆڤەکەیەوە، یان دزینی مرۆڤ و فڕاندنی و بە کۆیلەکردنی و کردنی بە بەندە بۆ خۆی و بوون بە بەشێك لە ماڵ و سامانی تایبەتی خۆی.

---

[1] ول ديورانت/قصة الحضارة، ط/١٩٥٦ ترجمة الدكتور زكي نجيب محمود: ٤٢/١، أسرى الحرب عبر التأريخ/الاستاذ عبد الكريم فرحان ج١/بيروت ص٦.

[2] سورة النمل/٧٧.

[3] سورة محمد/٤.

ئەم رێگەیە لای ئەغریقەکان باو بوو، گەلی ئەغریقی کە مەزنانی لە فەیلەسوفان لێوە لەدایك بوو لەوانە سوقرات و ئەفلاتوون و ئەرەستۆ و کەسانی تر کە سەرمایەیەکی فەلسەفی زەبەلاحیان بۆ مرۆڤایەتی بەجێهێلا بە کۆیلەکردنیان بە دەرکەوتەی سروشت و شارستانی لێکدەدایەوە، "ئەرەستۆ" پێیوابوو پێکهاتەی دروستبوونی هەندێ مرۆڤ بەرزیان ناکاتەوە بۆ ئاستی سەرداران و لە جیهاندا کۆمەڵێك مرۆڤ هەن بۆ سەردارەکان دروستکراون و هەندێکی تریان بۆ گوێڕایەڵی، ئەفلاتوون کۆمارەکەی لەسەر شانی کۆیلەکان دامەزراندووە، یاسادانەری بەناوبانگ "سۆلۆن" چەتەگەری دەریایی لەسەر بنچینەیەك رێکخست گوایە پیشەی سەردارەکان و مەزنەکانە و کۆمەڵەی جۆراوجۆری بۆ ئەو چەتانە پێکهێنا بۆ پشتیوانی کردنیان بەوەی پێی ئاتاجن لە کەشتی و چەك.

کاتێك ئیسلام هات چەتەگەری و فڕاندنی حەرام کرد و ئەوانەی هەڵدەستان بەو کارە بە "مفسدون في الأرض-ئاشووبنەرەوە لە زەویدا" ناوی بردن، بۆیە توندترین و سەختترین سزای بۆ برینەوە و فەرمووی: ﴿إِنَّمَا جَزَاءُ الَّذِينَ يُحَارِبُونَ اللَّهَ وَرَسُولَهُ وَيَسْعَوْنَ فِي الأَرْضِ فَسَادًا أَنْ يُقَتَّلُوا أَوْ يُصَلَّبُوا أَوْ تُقَطَّعَ أَيْدِيهِمْ وَأَرْجُلُهُمْ مِنْ خِلاَفٍ أَوْ يُنفَوْا مِنَ الأَرْضِ ذَلِكَ لَهُمْ خِزْيٌ فِي الدُّنْيَا وَلَهُمْ فِي الآخِرَةِ عَذَابٌ عَظِيمٌ﴾[1].

٣.هەستان بە هەندێ تاوانی ترسناك وەك کوشتن و دزی و زینا: سزاس حوکم بەسەر تاوانباردا لەم تاوانانەدا بە کۆیلەکردن بوو بۆ بەرژەوەندی دەوڵەت یان تاوان دەرحەقکراو یان میراتگرانی، ئەم سەرچاوەیە بۆ کۆیلەکردن لەلای رۆمانییە ناسراوەکان بە یاساڕێزی دانراو باوبوو، بۆ قازی رۆمانی هەبوو حوکمی کۆیلایەتی ئەوانە دەربکات لە سوپا هەڵدەهاتن یان زەریبەی حکومەتیان نەدەدا، گەر نەتوانرابایە هەڵهاتوان بگرن ئەوا باوك و دایکیان دەکرد بە کۆیلە، هەروەها لە

---

[1] سورة المائدة/٣٣.

یاساکانیان ئەوە هەبوو گەر ئافرەتی ئازاد لەڕووی سەرجێییەوە لەگەڵ کۆیلەیەکی کەسێکی تر خەوت سەرەڕای ئاگادارکردنەوەی سەرداری کۆیلەکە بۆ ئافرەتەکە ئەوا دەبێتە کۆیلە بۆ ئەو سەردارە لەو سۆنگەیەوە بەکۆیلەکردن سزایەك بووە بۆ تاوانی زینا.

کاتێك ئیسلام هات بۆ هەر تاوانێك سزایەکی دیاریکرد و سزادانی هەر تاوانکارێك بە دوو سزای بنەڕەتی حەرام کرد، بۆیە سزای دزی بریتییە لە دەستبڕین گەر پایەکان و مەرجەکانی هاتنە دی و ڕێگرەکانی نەرێکران، سزای زینا بریتییە لە دارلێدان گەر پایەکان و مەرجەکانی فەراهەم بوون و ڕێگرەکانی نەرێکران، بە هەمان شێوە بە کۆیلەکردنی کەسی ئازادی حەرام کرد.

٤-هەژاری بەربڵاو کە سەردەکێشێت بۆ کەوتنە ژێر باری قەرزداری: لە کۆمەڵگەیەکی هەژاردا کە پێوەرەکانی دادپەروەری تێدا بزر بووە کاتێك قەرزدار دەستەوسان دەبوو لە گێڕانەوەی قەرزەکە ئەوا سووی دەخرایە سەر و ئەو سووە دەبووە هۆی زیادبوونی باری هەژاری تا وای لە قەرزدار دەکرد بکەوێتە ناو زەلکاوی کۆیلایەتییەوە و بۆ کەسی قەرزدەر ڕەوا بوو کەسی قەرزدار وەك بەندەیەك بفرۆشێت، ئەمەش لە زۆرێك لە کۆمەڵگەکاندا باو بوو پێش هاتنی ئیسلام، کاتێك ئیسلام هات سووی حەرام کرد و فەرمووی: ﴿يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ وَذَرُوا مَا بَقِيَ مِنْ الرِّبَا إِنْ كُنتُمْ مُؤْمِنِينَ، فَإِنْ لَمْ تَفْعَلُوا فَأْذَنُوا بِحَرْبٍ مِنْ اللَّهِ وَرَسُولِهِ وَإِنْ تُبْتُمْ فَلَكُمْ رُءُوسُ أَمْوَالِكُمْ لاَ تَظْلِمُونَ وَلاَ تُظْلَمُونَ﴾[1].

هەروەها تایبەت بە قەرزداری بێتوانا بۆ گێڕانەوەی قەرزەکە دەفەرموێت: ﴿وَإِنْ كَانَ ذُو عُسْرَةٍ فَنَظِرَةٌ إِلَى مَيْسَرَةٍ﴾[2]، بینا لەسەر ئەوە لە هیچ بارێك لە بارەکاندا بۆ خاوەن قەرز دروست نییە دەست بۆ حورمەتی قەرزدارەکە ببات یان بەندی بکات یان سزای بدات، بەڵام گەر قەرزدارەکە دەیتوانی قەرزەکە بگێڕێتەوە ئەوا لەو بارەدا

---

[1] سورة البقرة/٢٧٩.

[2] سورة البقرة/٢٨٠.

دروسته بەند بكرێت وەك چۆن دروسته به خراپی ناوی بهێنرێت لەبەردەم خەڵكیدا، پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت: ((نەگێڕانەوەی قەرز لەلایەن ئەو كەسەی هەیەتی حورمەت و سزادانی حەڵاڵ دەكات)) [1].

٥.دەسەڵاتی تاكەكەس بەسەر خۆیدا لەباری پێویستی ئابووریدا: كەسی هەژار مافی ئەوەی هەبوو خۆی بفرۆشێت به كەسانی تر لەپێناوی بەدەستهێنانی پارووییەك ناندا.

چینییەكان دیلی جەنگیان دەكرد به كۆیله و ئەو هەژارانەی برسێتی و نەبوونی پەنای پێ دەبردن بۆ فرۆشتنی خۆیان لەلای ئەوان دەكرانه كۆیله.

ئیسلام هات و بەرەهایی فرۆشتنی كەسی ئازادی حەرام كرد و خەرجی خزمی نزیكی خسته سەر خزمی نزیك، بۆیه هەموو خزمێكی میراتگر بۆ خزمەكەی خەرجی ئەوی لەسەر پێویست دەبێت ﴿وَعَلَى الْوَارِثِ مِثْلُ ذَلِكَ﴾[2]، هەروەها زەكاتی لەسەر دەوڵەمەندان فەرز كرد و دەفەرموێت: ﴿إِنَّمَا الصَّدَقَاتُ لِلْفُقَرَاءِ وَالْمَسَاكِينِ وَالْعَامِلِينَ عَلَيْهَا وَالْمُؤَلَّفَةِ قُلُوبُهُمْ وَفِي الرِّقَابِ وَالْغَارِمِينَ وَفِي سَبِيلِ اللَّهِ وَابْنِ السَّبِيلِ فَرِيضَةً مِنْ اللَّهِ وَاللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ﴾[3]، سەرباری ئەوانه فەرمانی كرد بەو كەسانەی لەڕووی داراییەوه بەهێزن لەسەر هەژاران خەرج بكەن و پێیان ببەخشن، بۆیه دەفەرموێت: ﴿وَأَنْفِقُوا مِمَّا جَعَلَكُمْ مُسْتَخْلَفِينَ فِيهِ﴾[4]، هاریكاری و دەستگرۆیی لەسەر تاكەكانی كۆمەڵگه پێویست كرد و فەرمانی پێكردن به هاوكاری لەسەر خێر و چاكه و دەفەرموێت: ﴿وَتَعَاوَنُوا عَلَى الْبِرِّ وَالتَّقْوَى﴾[5]، ئەمانه و

---

[1] أخرجه أحمد في أول مسند الكوفيين والنسائي في البيوع وأبو داود في الاقضية وابن ماجة في الاحكام واللفظ لأحمد. "العِرض بكسر العين": ئەوەی كەسێكی پێ مەدح یان پێ زەم دەكرێت.

[2] سورة البقرة/٢٣٣.

[3] سورة التوبة/٦٠.

[4] سورة الحديد/٧.

[5] سورة المائدة/٢.



سەدانی تر لە فەرمان بە بەخشین بەسەر ئاتاجاندا و درێژکردنی دەستی یارمەتی تاکو هەژارییەکەیان پاڵیان نەنێت بۆ ئاکارێك لەگەڵ مرۆڤبوونی مرۆڤ و رێز و پایەیدا گونجاو نەبێت.

٦.دەسەڵاتی باوکایەتی و هاوسەداری: ئەم دەسەڵاتە باوك یان مێردی سەرپشك دەکرد بۆ فرۆشتنی منداڵەکانی یان هاوسەرەکەی، بۆیە فرۆشراو دەبووە کۆیلە و موڵکی کڕیارەکە وەك ماڵ و سامانە تایبەتەکەی تری، ئەم رێگەیە لای چینییەکان باو و زانراو بوو.

٧.وەچەخستنەوەی کۆیلە: منداڵی کەنیزەك دەبووە کۆیلە با مێردەکەشی کەسێکی ئازاد بوایە ئەوەش لە رێگەی میراتگرییەوە، ئیسلام هات و کۆتایی بەو رێگەیە هێنا و بڕیاری ئازادی کوڕەکەی دا وەك چۆن بڕیاری ئازادی دایکی کوڕەکەی دا[1] دوای مێردکردنی بە کەسێکی ئازاد یان دوای مردنی مێرەدەکەی بەپێچەوانەی ئەوەی لە پرسەکەدا هەبوو.

ئەم پێنج سەرچاوە ئامازەبۆکراوە بە تێرژانی ئاو زەلکاوی کۆیلایەتییان زیندوو دەکردەوە، بۆیە ئیسلام بڕینی و زەلکاوەکە وشك بوو، بۆ هەتاهەتایە و بەبێ گەڕانەوە کۆتایی بە سیستمی کۆیلایەتی هات، هەر قسەیەك بە پێچەوانەی ئەمەوە هەڵەیە، چونکە بە قورئاندا دەکێشێت و کۆیلایەتی تێدا نییە، سەرباری بنەما گشتییەکان کە بە شێوەیەکی گومانبڕانە ئامارە دەکەنە سەر حەرامکردنی سیستمی بەکۆیلەکردن سەرچاوەکەی هەرچییەك بێت.

---

[1] أم الولد وهي الجارية التي عاشرها سيدها أو زوجها الحر وأنجبت منه ولداً ذكراً كان أو انثى.

**هۆیەكانی كۆتاهێنان بە كۆیلایەتی:**

سەریاری بڕینی سەرچاوە باسكراوەكانی كۆیلایەتی ئیسلام زۆرێك لە ڕێگەی تری خستۆتە روو بۆ كۆتاهێنان بەو سیستەمەی دژ بە مرڤایەتی و ئەو ڕێز و پایەیە خودا بە مرۆڤی بەخشیوە، لەو هۆیانە ئەمانەن:

١.ئیسلام یاسای "المكاتبة–نووسراو"ی دارشتووە، واتە بەندە(پیاوی كۆیلە یان كەنیزەك) داوای لە گەورەكەی خۆی دەكرد نووسراوی بۆ بكات لەسەر بڕێك لە ماڵ پێیدەدا بەرانبەر بە ئازادكردنی، و لەسەر گەورەكەی پێویست بوو ئەو داوایە قبووڵ بكات، بە ئایەتی: ﴿وَالَّذِينَ يَبْتَغُونَ الْكِتَابَ مِمَّا مَلَكَتْ أَيْمَانُكُمْ فَكَاتِبُوهُمْ إِنْ عَلِمْتُمْ فِيهِمْ خَيْرًا ﴾[1]، لەسەر "بيت المال" پێویست كرابوو یارمەتی ئەو بەندە بدات نووسراوی كردووە لەسەر پێدانی بڕێك لە ماڵ پەیمانی داوە بیدات بە گەورەكەی خۆی بەرانبەر ئازاد كردنی، هەروەها زەكاتی فەرز كرد و هەشت یەكی زەكاتی بۆ بەندەكان تەرخان كرد تاكو بتوانن خۆیانی لە سەردارەكانیان پێبكڕنەوە.

٢.ئیسلام ئازاد كردنی كۆیلەی كردووە بە كەفارەتی زۆرێك لە گوناه، لەوانە:

كەفارەتی پشتهەڵكردن(الظهار)، دەفەرموێت: ﴿وَالَّذِينَ يُظَاهِرُونَ مِنْ نِسَائِهِمْ ثُمَّ يَعُودُونَ لِمَا قَالُوا فَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مِنْ قَبْلِ أَنْ يَتَمَاسَّا﴾[2]

سوێندی درۆ یان گەڕانەوە لە سوێند، دەفەرموێت: ﴿لاَ يُؤَاخِذُكُمْ اللَّهُ بِاللَّغْوِ فِي أَيْمَانِكُمْ وَلَكِنْ يُؤَاخِذُكُمْ بِمَا عَقَّدْتُمْ الأَيْمَانَ...﴾[3]

كوشتن بە هەڵە، دەفەرموێت: ﴿وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ أَنْ يَقْتُلَ مُؤْمِنًا إِلاَّ خَطَأً وَمَنْ قَتَلَ مُؤْمِنًا خَطَأً فَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مُؤْمِنَةٍ وَدِيَةٌ مُسَلَّمَةٌ إِلَى أَهْلِهِ إِلاَّ أَنْ يَصَّدَّقُوا﴾[4]

شكاندنی رەمەزان بە چوونە لای هاوسەر: لە "أبي هريرة"وە(ﷺ) فەرمووی:

---

[1] سورة النور/٣٣.

[2] سورة المجادلة/٣.

[3] أخرجه مسلم والبخاري والترمذي وأبو داود.

[4] سورة المائدة/٨٩" وابن ماجة والدارمي ومالك في كتاب الصيام.

(پیاوێك هـات بـۆ لای پێغەمبـەر(ﷺ) و وتـی: تیاچـووم ئـەی پێغەمبـەری خـودا، فەرمووی: چی تۆی تیابردووە؟ وتی: لە رەمەزاندا چوومەتە لای ژنەکـەم، فـەرمووی: توانات هەیە بەندەیـەك رزگـار بکـەی؟ وتـی: نـەخێر، فـەرمووی: دەتـوانی دوو مانـك لەسەر یەك بەرۆژوو بیت؟ وتی: نەخێر، فەرمووی: دەتـوانی خـواردنی شەسـت گـەدا بدەی؟ وتی: نەخێر، دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) دانیشت و سەبەتەیە خورمایان بۆ هێنـا و فەرمووی: ئەمە بکە بە صەدەقە، پیاوەکە وتی: جا کەس هەیە لە من هەژارتر؟ لەم شوێنەدا خانەوادەیەك نییە لە ئێمە ئاتاجتر بێت، پێغەمبەر(ﷺ) پێکەنی تا دانەکانی دەرکەوتن، پاشان فەرمووی: برۆ و دەرخواردی خانەوادەکەتی بدە[1]

٣.ئیسلام نیزامی بەشکردنی دارشت: گەر بەندەیەك یان کەنیزەکێك موڵکی چـەند شەریکێك بوو دروستە بۆ یەکێکیان بەشـەکەی خـۆی ئـازاد بکـات، بۆیـە لـەو بـارەدا پێویستە شەریکەکانی تر نووسراو بۆ بەندەکـە یـان کەنیزەکەکـە بکـەن، لـەو بـارەدا بەندەکە پێی دەوترێت بەشکراو.

٤.ئیسلام لەسەر شەریکە ئازادکەرەکەی پێویسـت کـردووە گـەر دەوڵەمەنـد بـوو بەرانبەر بۆ هەر شەریکێك بەشی خۆی پێبدات تـاکو بەندەکـە ئـازادی تـەواوی خـۆی بەدەستبهێنێت، پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت: (هەر کەس بەشی خۆی لە بەندەیەکـدا ئازاد بکات ئەو ماڵەی بۆ هەیە لە بەندەکەدا پێی دەگات، ئەگەر نە، ئەوەنـدەی ئـازاد بووە ئازادکراوە)[2].

٥.ئیسلام ئازادکردنی کۆیلەی لەسەر سەردارەکان پێویسـت کـردووە گـەر ئـازاری بدات یان خراپ مامەڵەی لەگەڵ کرد، بۆیە پێغەمبەر(ﷺ) دەفـەرموێت: (هـەر کـەس لە بەندەکەی خۆیدا یان کێشای بە روخساریدا کەفارەتەکەی ئازاد کردنییەتی) [3].

---

[1] سورة النساء/٩٢.

[2] أخرجه البخاري في كتاب العتق.

[3] رواه مسلم وأبو داود عن ابن عمر.

٦.ئیسلام لەسەر سەردارەکانی پێویست کردووە گەر بە شۆخییەوە بە بەندەکەی وت ئـازادی دەبێـت ئـازادی بکـات بـا لـە شۆخییەکەشـی پەشـیمان ببێتـەوە، پێغەمبـەر(ﷺ) دەفـەرموێت: (سـێ شـت یـاری تێـدا نییـە: تـەڵاق و نیکـاح و ئازادکردن)[1].

٧.ئیسلام هانیداوە لەسەر رزگارکردنی کۆیلە و دەفەرموێت: ﴿فَلاَ اقْتَحَمَ الْعَقَبَةَ، وَمَا أَدْرَاكَ مَا الْعَقَبَةُ، فَكُّ رَقَبَةٍ﴾[2].

٨.ئیسلام نووسراوی بۆ کاتێکی دیاریکراو دواخستووە کـە ماوەکـەی دوو پێدانـە، پێویستە لەسەر خاوەن کۆیلە برێك لـە مـاڵی(دارایی) نووسـراوەکە دابنێـت پارمـەتی کۆیلەکە بدات لەسـەر پێهەسـتان بـە "پێدانـەکان"ی نووسـراوەکە، ئەمـەش لـەڕووی خاوەن کۆیلەکەوە پێویستە[3].

بەم جۆرە ئیسلام ماوەیەکی گوازراوەی دانا بۆ کۆتاهێنانی ئەو سیسـتمە بێـزراوە کە لە سەدەی یەکەمی کۆچی تێنەپەڕی، ئەو هۆکارە باسکراوانەی بۆ هاتنـەدی ئـەو مەرامە تەرخان کرد و بەدڵنیاییەوە هاتەدی.

ئەو حوکمانەی تایبەت بـە بەنـدەکان لـە قورئانـدا هـاتوون وەك: ﴿أَوْ مَـا مَلَكَـتْ أَيْمَانُكُمْ﴾[4] و هاوشێوەکانی ئـەوە، ئـەم حوکمانـە کۆتاییـان پێهـاتووە، چـونکە بـە کاتێك دیـاریکرابوون و بـە کۆتاهـاتنی ئـەو کاتـە کۆتاییـان پێهـات، هـەموو ئەوانـەی بانگەشەی ئەوە دەکـەن ئیسـلام سیسـتمی کۆیلایـەتی دانپیادانـاوە درۆیـان بـە دەم خوداوە هەڵبەستووە.

---

[1] انفرد بە مالك.
[2] سورة البلد/١١.
[3] واتە جێگەی پاشگەزبوونەوە نییە.
[4] سورة النساء/٣.



**مەرجەکانی نەسخ:**

زانایانی ئوسولّ و لێکۆلّەران لە مەرجەکانی نەسخدا جیاوازیان نەکردووە لە نێوان نەسخی قورئان و نەسخەکانی تر جگە لە قورئان، ئەمە یەکەمین هەلّەیەکە دەرحەق بە قورئان کراوە، هەروەها جیاوازییان هەیە لە هەژمارکردنی ئەو مەرجانە لە نێوان کەمی و زۆریدا لە لایەکەوە و نێوان دابەشکردنی بۆ مەرجە لەسەر رێکەوتووەکان و مەرجە لەسەر ناکۆکەکان، ئەوەی لەم باسەدا لای ئێمە گرنگە بریتییە لە مەرجەکانی نەسخ لە قورئاندا، چونکە جیاوازیان تێدایە لەڕووی نەسخ و نەبوونی نەسخەوە، جگە لەوە پێویستمان بە ئاماری مەرجەکانی نەسخ نییە تیایدا، بەتایبەت رۆلّی نەسخ کۆتایی پێهاتووە و ئەوەی نەسخکراوەتەوە و نەسخکراوەیە و ئەوەش ماوەتەوە ماوەتەوە.

شایانی باسە لێکۆلّینەوەکەمان بۆ مەرجەکانی نەسخ لە قورئاندا هۆکارێکە لە هۆکارەکانی لادانی تەمومژ لە نەسخی قورئاندا، چونکە ئەوانەی نەزانانە بەلّگە بە زۆرێك لە ئایەتی قورئان بۆ نەسخ دەهێننەوە ئەو مەرجانە نازانن.

ئەوەی رۆشنە ئەوەیە کتێبێکی ئوسولّی لە جیهانی ئیسلامیدا نابینیتەوە بە رێگەیەکی دوورودرێژ یان پوخت باسی لە نەسخ نەکردبێت، لە سالّی(١٩٤٠)ەوە[1] لەگەلّ زانستی ئوسولّی فیقهدا دەژیم وەك فێرخواز و فێرکەر و دانەر و لێکۆلّەر، لەدرێژایی ئەو شارەزاییە دوورودرێژەدا بۆم رۆشنبوویەوە مەرجەکانی نەسخ لە قورئاندا چوارن و پێنجی نییە، وەك لەم رۆشنکردنەوەیەدا:

مەرجی یەکەم: هەموو ئەوەی لە قورئاندا بە نەسخکەر و نەسخکراو(الناسخ والمنسوخ) ناودەبرێت لە قورئاندا جێگیرن، بینا لەسەر ئەوەی زانایانی ئیسلام لە ئوسولّییەکان و فەقیهەکان و شرۆڤەکرانی قورئان لە کۆن و نوێدا کۆدەنگیان لەسەری هەیە: هەر سورەتێکی قورئان و هەر ئایەتێك لە ئایەتەکانی و هەر رستەیەك لە

---

[1] واتە ماوەی شەست سالّە.

رستەکانی و هەر وشەیەك لە وشەکانی قورئانیبوونی بە تەواتور جێگیربووە و بە تەواتور ئەو قورئانە بەدەستمان گەیشتووە و لە مەصحەفی ئیمامدا کە لەبەرستی موسڵماناندایە جێگیر کراون.

بەهەمان شێوە زانایانی مەنتق کۆدەنگیان هەیە[1] لەسەر پێچەوانەی دژی ئەم کۆدەنگییە بۆ ئەو ڕێسا هەمووەکییەی داوا دەکات هەر شتێك متەواتیر نەبێت لە قورئان نییە، لێرەوە نەسخ لە قورئاندا پێی ناوترێت نەسخ جگە لە قورئان بە قورئان، ئەم ڕێسا مەنتقیانە لە بەڵگەنەویستە جێگیرەکانن بە ئیجماع و تەواتور کە گفتوگۆ تیایدا لە دەروازەی نەزانییە یان دەمەقاڵەی لوتبەرزانەیە، لەسەر هەموو خاوەن ژیرییەکی تەندروست پێویستە خۆی لێ بەدوور بگرێت، بینا لەسەر ئەو بەڵگەنەویستانە پووچەڵی هەواڵی ئاحاد لە دەروازەی نەسخی قورئان ڕۆشن دەبێتەوە، یەکسانە ئەو هەواڵە بە نەسخکەر یان نەسخکراو دابنرێت.

لەو هەواڵە ئاحادانە خراونەتە قورئانەوە و تیایدا بە نەسخکەر یان نەسخکراو دادەنرێن ئەمانەن:

أ.لە سەحیحی "مسلم"دا هاتووە: ((حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ يَحْيَى قَالَ: قَرَأْتُ عَلَى مَالِكٍ عَنْ عَبْدِاللَّهِ بْنِ أَبِي بَكْرٍ عَنْ عَمْرَةَ عَنْ عَائِشَةَ أَنَّهَا قَالَتْ: كَانَ فِيمَا أُنْزِلَ مِنْ الْقُرْآنِ عَشْرُ رَضَعَاتٍ مَعْلُومَاتٍ يُحَرِّمْنَ، ثُمَّ نُسِخْنَ بِخَمْسٍ مَعْلُومَاتٍ، فَتُوُفِّيَ رَسُولُ اللَّهِ(ﷺ) وَهُنَّ فِيمَا يُقْرَأُ مِنْ الْقُرْآنِ-.

عائشە دەفەرموێت: ئەوەی لە قورئان دابەزێنرا بوو دە ژەمەشیری زانراو بوو کە دەبووە هۆی لەیەکتر حەرامبوون(لەیەکتر حەرامبوونی منداڵە شیرەخۆرەکە و برا و

---

[1] في البرهان للكلنبوي ص٢٨٠: (پێچەوانەی دژ ئەوەیە حوکمپێکراو بکرێت بە حوکم لەسەرکراو، و دژی حوکم لەسەرکراویش بکرێت بە حوکمپێکراو لەگەڵ هێڵانەوەی صدق و چۆنێتی(ئەرێ و نەرێ)، بۆیە ئەرێی هەمووەکی لەسەر خودی خۆی پێچەوانە دەبێتەوە) بینا لەسەر ئەوە پێچەوانەی دژی ڕێسای(هەموو قورئانێك متەواتیرە) ئەوەیە کە (هەر شتێك متەواتیر نەبێت قورئان نییە).

خوشــکه شــیرییەکانی)، پاشــان نەســخکرانەوە بــە پێــنج ژەمەشــیری زانــراو، پێغەمبەر(ﷺ) مرد و ئەوانە لە قورئاندا دەخوێنران))

لێرەدا ئەم پرسیارانە دەخەمە بەردەم خوێنەری بەڕێز و وەڵامەکانیان بۆ هەموو خاوەن ژیرییەکی تەندروست واز لێ دەهێنم:

١.چ حیکمەتێکی خودایی بوونی هەبوو وابکات یەکەمجار دە ژەمەشیری زانراو بکات بە حەرامکەر و پاشان لە دووەمجاردا پێنجیانی سڕیەوە، ئایا خودا–سبحانه وتعالى– نەیدەزانی پێنج ژەمەشیر بەسە بۆ حەرامکردن و پێویست بە دە ژەمەشیر ناکات، پاشان بۆی دەرکەوت و پێنج ژەمە شیری لێ سڕیەوە؟

یان بەرژەوەندییەك هەبوو یەکەمجار داوای دە ژەمەشیری دەکرد و پاشان ئەو بەرژەوەندییە گۆڕا و داوای کرد بکرێت بە پێنج ژەمەشیر، ئەو بەرژەوەندییە کامەیە؟

٢–بۆچی نەسخکەرەکە لەڕووی خوێندنەوەوە نەسخکرایەوە و حوکمەکەی مایەوە وەك هەندێ وا بانگەشەی بۆ دەکەن؟

٣.گەر ئەو ژمارەیە(پێنج ژەمەشیر) لە قورئانە لەڕووی حوکمەوە نەك لەڕووی خوێندنەوەوە بۆ لە قورئانەوە بوو بە فەرموودە؟

٤.گەر قورئان بوو بۆچی "عمرة" تەنهاکەوتۆتەوە لە ریوایەتکردنی لە دایکی باوەڕداران عائشەوە(ﷺ) و هیچ کەس جگە لە ئەو بەم قورئانی بوونەی نەزانی، بۆ زانینت بابەتەکە هەستیارە و پەیوەستە بە حەڵاڵ و حەرام و شەرەف و ناموس و وەچەی مرۆڤەوە؟

٥.گەر ئەم فەرموودە ئاحادە قورئان بوو بۆ هیچ کەسێك جگە لە شافیعییەکان کاریان پێنەکردووە؟

٦.چۆن جمهوری فەقیهانی شەریعەتی ئیسلام سەرپێچی لەم ئایەتە نەسخکراوە دەکەن نیوەی یەکەمی بە نیوەی دووەمی نەسخکراتەوە؟

٧.ئەم دژیەکییە چییە لە نێوان گوتارەکان و ڕێسا گشتییەکاندا کە کۆدەنگیان لەسەرە؟

ب.هەروەها لە سەحیحی "مسلم"دا[1]:((عن قتادة عن أنس قال: قال رسول الله(ﷺ) لو كان لابن آدم واديان من مال لابتغى وادياً ثالثاً ولا يملأ جوف ابن آدم إلا التراب[2] ويتوب الله على من تاب-.

پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: گەر بۆ رۆڵەی ئادەم دوو دۆڵ لە ماڵ و سامان بوونی هەبێت بەدوای دۆڵی سێیەمدا دەگەڕێت، بۆشایی(واتە ناوەوەی) رۆڵەی ئادەم تەنها بە خۆڵ پڕ دەبێتەوە، خودا تەوبە لە هەر کەسێك قبووڵ دەکات کە تەوبە دەکات)).

لە ریوایەتەکەی "أنس بن مالك"دا: ((عَنْ قَتَادَةَ عَنْ أَنَسٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ(ﷺ): لَوْ كَانَ لِابْنِ آدَمَ وَادِيَانِ مِنْ مَالٍ لَابْتَغَى وَادِيًا ثَالِثًا وَلَا يَمْلَأُ جَوْفَ ابْنِ آدَمَ إِلَّا التُّرَابُ وَيَتُوبُ اللَّهُ عَلَى مَنْ تَابَ))[3].

شتێکی نامۆیە هەندێ لە گەورە زانایان ئەم فەرموودە دەگوێزنەوە و بە قورئانی نەسخکراوی دادەنێن لەڕووی حوکمەوە نەك لەڕووی خوێندنەوەوە بەبێ هەڵوێستە و شك و گومان، لەو زانایانە "ابن سلامة"[4] کە دەڵێت: ئەوەی حوکمەکەی و نووسینەکەی نەسخکراوە ئەوەیە لە "أنس بن مالك"ەوە ریوایەتکراوە، دەڵێت: لە سەردەمی پێغەمبەردا(ﷺ) سورەتێکمان دەخوێندەوە بە ئەندازەی سورەتی "التوبة" بوو، تەنها یەك ئایەتیم لەبیرماوە ئەوەش: لو أن لابن آدم واديين ..تا کۆتاییەکەی، نامۆتر لەوە گێڕەرەوەی فەرموودەکە لە سەحیحی "مسلم"دا خودی "أنس بن مالك"ە، باشە چۆن جارێك بە قورئانی دادەنێت و جارێکیش بە فەرموودە؟

---

[1] ٧٢٥/٢ باب لو أن لابن آدم واديين لابتغى ثالثاً، رقم الحديث ١٠٤٨.

[2] واتە بەردەوام هەڵپە دەکات بۆ دونیا تا دەمرێت و ناوەوەی پڕ دەبێت لە خۆڵی قەبر.

[3] صحيح مسلم: ٧٢٥/٢.

[4] الناسخ والمنسوخ لهبة الله بن سلامة بن نصر بن عامر البغدادي (ت-٤١٠هـ) دراسة وتحقيق موسى نباه علوان العليلي ص٦٥-٦٦.

لەوانەش "السیوطي" کە فەرموودەکە لە کتێبی "الإتقان في علوم القرآن" دەگوێزێتەوە لەسەر ئەو بنچینەی ڕیوایەتەکە لە قورئانی نەسخکراوە لەڕووی حوکمەوە نەك لەڕووی خوێندنەوەوە، هەر بەو جۆرە "ابن حزم" گواستوویەتەوە لەژێر ناونیشانی "نسخ الخط والحکم"دا[1].

مەرجی دووەم: جێگیربوونی دواکەوتنی نەسخکەر لە نەسخکراوەکە لە دابەزیندا بە تەواتور، چونکە حوکمی نەسخکراو پێش نەسخکەرە لە قورئاندا، قورئانیبوونی بە تەواتور جێگیربووە، ئەوەش بە تەواتور جێگیر بوویێت تەنها بەوەی بە تەواتور جێگیر بووە دەسڕێتەوە، بەو ڕێسا شەرعییە گشتییەی کۆدەنگی لەسەرە(یەقین تەنها بە یەقین دەسڕێتەوە) و ئەو ڕێسا فیقهییەی دەڵێت: (یەقین بە شك لانادرێت)، بەڵکو بە گومانیش لانادرێت.

"ابن حزم الظاهري"[2] دەڵێت: ((حەڵاڵ نییە بۆ هیچ موسڵمانێك ئیمانی بە خودا و ڕۆژی دوایی هێنابێت دەربارەی شتێك لە قورئان یان سوننەت بڵێت ئەمە نەسخکراوەتەوە مەگەر بە یەقین، چونکە خودا(ﷻ) دەفەرموێت: ﴿وَمَا أَرْسَلْنَا مِنْ رَسُولٍ إِلاَّ لِيُطَاعَ﴾[3] هەروەها دەفەرموێت: ﴿اتَّبِعُوا مَا أُنْزِلَ إِلَيْكُمْ مِنْ رَبِّكُمْ﴾[4])) پاشان بەردەوام دەبێت لە وتنەکەی و دەڵێت: زۆرێك لە خەڵکی زیادەڕەوییان کردووە لە بانگەشەی بوونی ئایەتی نەسخکراو تا بانگەشەی نەسخ گەیشتۆتە سەدان، هەموو ئەوەی خودا دایبەزاندووە لە قورئان یان لەسەر زمانی پێغەمبەرەکەی شوێنکەوتنیان فەرزە، هەر کەس وتی: بۆیان باسکردووم ئەوە نەسخکراوە پێویستە گوێڕایەڵی ئەوە نەکرێت و پێویستی شوێنکەوتنی بێبنەمایە، ئەمە بریتییە لە

[1] الناسخ والمنسوخ في القرآن الكريم لابن حزم الاندلسي ص٩.
[2] الاحكام في أصول الاحكام: ٤/٤٣٨.
[3] النساء/٦٤.
[4] سورة الاعراف/٣.

یاخیبوون له خودا و حەرامکراوه و سەرپێچییەکی ئاشکرایه، مەگەر بورهان لەسەر دروستی قسەکەی راستبێتەوه(بورهان بەڵگەی گومانبڕه و پێویستە هەموو پێشەکییەکانی یەقینبەخشن)، ئەگەر نه، ئەو کەسە درۆی هەڵبەستووه و قسەکەی پووچ و بێبنەمایه، هەر کەس پێچەوانەی ئەمەی ئێمه وتمان پەیڕەوبگرێت ئەوا قسەکەی وەك پووچەڵکردنەوەی هەموو شەریعەت لێکدانەوەی بۆ دەکرێت)).

پوختەی قسان ئیجتیهاد لە نەسخدا هیچ رۆڵێکی نییە، چونکه بەڵگەیەکی گومانبەخشه، قورئانیش جێگیربوونەکەی براوەیە(گومانبڕه)، بۆیه ناکرێت گومانبڕێك به بەڵگەیەکی گومانبەخش بسڕێتەوه.

مەرجی سێیەم: ئامادەیی حوکمەکە بۆ نەسخکردنەوه، بۆیە حوکمەکانی بیروباوەڕ و هەواڵەکان و بەڵێنەکان و هەڕەشەکان و حوکمە بنەڕەتییەکان کە بە گۆڕانی کات و شوێن گۆڕانیان بەسەردا نایەت بە کۆدەنگی زانایان نەسخ قبوولْ ناکەن.

"السیوطي" دەڵێت[1]: ((نەسخ تەنها لە ئەمر و نەهیدا روودەدات با بە گوزارەی هەواڵیش بێت، بەڵام ئەو هەواڵەی کە بە مانای داوا نییە ئەوە نەسخی تێناچێت لەوانە بەڵێنەکان و هەڕەشەکان))

"صدر الشریعة"[2] دەڵێت: ((لە مەرجەکانی نەسخ ئەوەیە حوکمی پێشوو لە حوکمەکانی بیروباوەڕ و ئەوانەی وەك ئەون نەبێت، وەك کاروبارە بەرهەستەکان و هەواڵەکان لە کاروباری رابردوو و ئێستا و داهاتوو)).

"ابن حزم" دەڵێت[3]: ((نەسخ لە ئەمر و نەهیدا روودەدات و دروست نییە لە هەواڵی رووتدا رووبدات و هەڵواردن(الإستثناء) نەسخ نییە)).

---

[1] الاتقان في علوم القرآن: ٢/٢١.
[2] التوضيح والتنقيح مع الحواشي: ٢/٣٠٩.
[3] الناسخ والمنسوخ في القرآن الكريم ص٨.

مەرجی چوارەم: دژیەکی لە نێوان دوو ئایەتەکەدا(نەسخکەر و نەسخکراو) بەلگەنەویستە نەسخ(سڕینەوە) لە شەریعەتی ئیسلام و یاسای دانراودا یان راشکاوانەیە یان ئامێزگری.

١.نەسخی راشکاوانە: ئەوەیە ئایەتێك یان سوننەتێکی موتەواتیر یان کۆدەنگی هاوەڵان ئاماژە بکات فلان ئایەت لە قورئان بە فلان ئایەت سڕاوەتەوە، ئەم جۆرە لە نەسخ بوونی نییە لە قورئاندا بە کۆدەنگی زانایانی موسڵمان لە کۆن و نوێدا، بەڵام لە سوننەتی پێغەمبەردا بوونی هەیە، بە کۆدەنگی ئەوە سەلماوە رووکردنە "بیت المقدس" کە بە سوننەت جێگیربووە بە قورئان نەسخ کراوەتەوە، ئەوەش بە فەرمانکردن بۆ رووکردنە "بیت الحرام" لە مەککەی شکۆمەند.

هەر بەو جۆرە نەسخی سەردانی گۆڕستان بەوەی نەسخێکی ئاشکرایە لە فەرموودەی پێغەمبەردا(ﷺ) کە دەفەرموێت: ((پێشتر نەهیم لێکردن لە سەردانی گۆڕستان ئێستا سەردانی بکەن))، ئەم دەقە ئاشکراو و راشکاوە لە سڕینەوەی حەرامە جێگیرەکە بە نەهیلێکردن بەهۆی دروستی سەردانکردنی بە فەرمانێکی جێگیر.

٢.نەسخی ئامێزگری: ئەوەش ئەو نەسخەیە بە بوونی دژایەتی لە نێوان دوو دەقەکە دەناسرێتەوە و هەڵدەگیرێت بە وتنی ئەوەی دەقە دواکەوتوەکە لە تەشریعدا دەقە پێشووەکەی سڕیوەتەوە.

بینا لەسەر ئەم حەقیقەتە نەسخ لە قورئاندا بەوەی ئامێزگری بێت تەنها لە باری دژیەکیدا لە نێوان دوو ئایەتەکەدا راست دەبێتەوە کە نە دەتوانرێت کۆبکرێنەوە و نە دەتوانرێت هەڵبگیرێن، بۆیە تەنها چارەسەرێك بۆ هەلگرتنی ئەو دژیەکییە بریتییە لە وتنی ئەوەی یەکێك لە دوو ئایەتە دژیەکەکە ئەویتریانی سڕیوەتەوە.

بەڵام تەنها بەرهەڵستکاری نێوانیان نەسخ پێویست ناکات، چونکە بەرهەڵستکاری دەتوانرێت بەبێ پەنابردن بۆ نەسخ(سڕینەوە) هەڵبگیرێت، ئەوەش چونکە زانایانی شەریعەت لە ئوسولییەکان و فەقیهەکان کۆدەنگیان هەیە لەسەر ئەوەی هەلگرتنی

بەرهەڵستی نێوان دوو بەڵگـە(یان دوو دەق) پێویستە بەپێی ئـەم ریزبەندییـە هەڵبگیرێت، بەم شێوەیە:

یەکەم–هەوڵی کۆکردنەوە لە نێوان دوو دەقە بەیەکتر بەرهەڵستکارەکەدا، ئەمـە کارێکی گونجاوە، وەك لە بەرهەڵستی نێوان عیدەی ئافرەتی مێرد مردوو و عیدەی ئافرەتی سکپڕدا، ئەو دوانە بەرهەڵستی یەکتر دەکەن و دەتوانین بـە کۆکردنـەوەیان بەرهەڵستییەکە هـەڵبگیرێت، چونکە رێژە لـە نێوانیانـدا گشـتی و تایبەتییـە لەڕوویەکەوە، وەك لەم رۆشنکردنەوەوە دەردەکەوێت:

ئایەتی:﴿وَالَّذِينَ يُتَوَفَّوْنَ مِنْكُمْ وَيَذَرُونَ أَزْوَاجًا يَتَرَبَّصْنَ بِأَنفُسِهِنَّ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ وَعَشْرًا﴾[1]، ئەم ئایەتە گشتییە بۆ ئافرەتی سکپڕ و ئافرەتانی تریش، بە تایبـەت بۆ ئەو ئافرەتانەی مێردەکانیان دەمرن.

ئایەتی:﴿وَأُوْلاَتُ الأَحْمَالِ أَجَلُهُنَّ أَنْ يَضَعْنَ حَمْلَهُنَّ﴾[2] گشتییە و ئـافرەتی تەڵاقدراو و ئافرەتی مێردمردوو دەگرێتەوە و تایبەتە بە عیدەی ئافرەتی سکپڕ.

لەبەر ئەوەی هەریەك لەو دوو ئایەتە گشتییە لە روویەکەوە و تایبەتە لە روویـەکی ترەوە، دەتوانرێت کۆبکرێنەوە بەوەی پێکەوە کاریـان پـێ بکرێت لەسـەر بنچینەی عیدەی ئافرەتی سکپڕی مێردمردوو دوورترین ماوەی دوو ماوەکـە بێـت بـەبێ دانـانی منداڵەکە، گەر منداڵەکەی دانا پێش چوار مانگ و دە رۆژ چاوەڕوانی کۆتاهـاتنی ئـەو ماوەیە دەکات، کاتێك ماوەکە کۆتایی پێ هـات و هێشـتا منداڵەکـەی دانـەنابوو ئـەوا چاوەڕوانی دانانی منداڵەکە دەکات.

هەندێ لـە فـەقیهانی هـاوەڵان دوو ئایەتەکـەیان کۆکردۆتـەوە، لەوانـە گـەورەمان "علي بن أبي طالب" لە ئیمامەکانیش ئیمـامی مالیـك، یاسـادانەری عێـراقیش بەمـە کاری کردووە[3].

---

[1] سورة البقرة/٢٣٤

[2] سورة الطلاق/٤

[3] المادة (٣/٤٨) من قانون الاحوال الشخصية رقم ١٨٨ سنة ١٩٥٩.

دووەم–هەوڵی پارسەنگدانی یەکێك لە دوو دەقەکە یان یەکێك لە دوو بەڵگەکە بەسەر ئەویترياندا گەر کۆکردنەوە لە نێوانیاندا جۆر نەبوو، وەك بەرهەڵستی نێوان گشتی و تایبەتی، بەرهەڵستییەکە هەڵدەگیرێت بە پارسەنگدانی کارکردن بە تایبەت بەسەر کارکردن بە گشتی لە رێگەی تایبەتکردنی گشتییەکەوە، هەروەها بەرهەڵستی نێوان رەها و سنووردار، هەڵدەگیرێت بە پارسەنگدانی کارکردن بە سنووردارەکە و هەڵدانی رەها بۆ سەر سنووردار، لە جێگەی خۆی بەدرێژی باس لەمە دەکرێت.

لە دوو ئایەتە ئاماژەبۆکراوەکەدا، جمهور بەرهەڵستیان لە نێوانیاندا هەڵگرتووە بە پارسەنگدانی کارکردن بە ئایەتی: ﴿وَأُوْلاَتُ الأَحْمَالِ أَجَلُهُنَّ أَنْ يَضَعْنَ حَمْلَهُنَّ﴾ بەسەر ئایەتی ئافرەتی سکپڕی مێردمردوو پاڵپشت بە فەرموودەکەی "سبيعة الأسلمية"

سێیەم–هەوڵی زانینی پاشینەکە لە دوو بەرهەڵستکارەکە بەیەکتر لەڕووی تەشریعەوە تاکو پاشینەکەیان بە نەسخکەری پێشینەکەیان دابنرێت، بینا لەسەر ئەمە بەرهەڵستکاری بەس نییە بۆ وتنی نەسخ، بەڵکو دەبێت دژیەکی راست ببێتەوە، چونکە هەموو دژیەکییەك بەرهەڵستکارییە، بەڵام هەموو بەرهەڵستکارییەك دژیەکی نییە، بۆیە رووداني نەسخ جۆرنابێت لە قورئاندا یان لە سوننەتدا یان لە ئیجماعدا گەر لە نێوان دوو دەقەکەدا(دوو بەڵگەکەدا) یان دوو ئایەتەکەدا دژیەکی بوونی نەبێت، بەڵگەنەویستە دژیەکی لەدوای یەکگرتنیان لە نۆ خاڵدا و جیاوازیان لە دوو خاڵدا دەستەبەر دەبێت:

أ.یەکێتی لەم نۆ خاڵەدا:

١–یەکێتی بابەت(یان حوکم بەسەرداکراو یان بۆپاڵدراو) بۆیە دژایەتی نییە لە نێوان(گرێبەستی لێوەشاوە کاملی دروست) و (گرێبەستی لێوەشاوە نەبووی پووچەڵ) بەهۆی نەبوونی یەکێتی بابەتەوە، هەر بەو جۆرە دژایەتی نییە لە نێوان ئایەتی:﴿وَاللاَّتِي يَأْتِينَ الْفَاحِشَةَ مِن نِّسَآئِكُمْ فَاسْتَشْهِدُواْ عَلَيْهِنَّ أَرْبَعةً مِّنكُمْ فَإِن شَهِدُواْ فَأَمْسِكُوهُنَّ فِي الْبُيُوتِ حَتَّىَ يَتَوَفَّاهُنَّ الْمَوْتُ أَوْ يَجْعَلَ اللّهُ لَهُنَّ

سَبِيلاً﴾(1) لەگەڵ ئایەتی: ﴿وَاللَّذَانَ يَأْتِيَانِهَا مِنكُمْ فَآذُوهُمَا فَإِن تَابَا وَأَصْلَحَا فَأَعْرِضُواْ عَنْهُمَا إِنَّ اللّهَ كَانَ تَوَّاباً رَّحِيماً﴾(2) لەگەڵ ئایەتی: ﴿الزَّانِيَةُ وَالزَّانِي فَاجْلِدُوا كُلَّ وَاحِدٍ مِّنْهُمَا مِئَةَ جَلْدَةٍ وَلَا تَأْخُذْكُم بِهِمَا رَأْفَةٌ فِي دِينِ اللَّهِ إِن كُنتُمْ تُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ وَلْيَشْهَدْ عَذَابَهُمَا طَائِفَةٌ مِّنَ الْمُؤْمِنِينَ﴾(3)، چونکە بابەتی حوکم لەم سێ ئایەتەدا جیاوازن، بابەتی ئایەتی یەکەم باس لە تاوانی "مساحقة" دەکات لە نێوان دوو ئافرەتدا، بابەتی ئایەتی دووەم باس لە نێربازی دەکات لە نێوان دوو نێردا، بابەتی ئایەتی سێیەم باس لە تاوانی زینا دەکات لە نێوان نێر و مێدا، بۆیە دژیەکی لە نێوان ئەم ئایەتانەدا نییە تا پاشینەکەیان بکرێت نەسخکەر بۆ پێشینەکەیان، وەك چۆن زۆر خەڵکی وای بۆدەچن.

٢.یەکێتی هەڵدراو، دژایەتی نییە لە نێوان (لێوەشاوە نەبوو لەڕووی مەدەنییەوە پرسیاری لێ دەکرێت) لەگەڵ (لێوەشاوە نەبوو لەڕووی تاوانکارییەوە پرسیاری لێ ناکرێت) واتە لەباری زیانگەیاندن بە کەسانی تر، هەر بەو جۆرە دژایەتی نییە لە نێوان ئایەتی: ﴿وَالَّذِينَ يُتَوَفَّوْنَ مِنكُمْ وَيَذَرُونَ أَزْوَاجاً يَتَرَبَّصْنَ بِأَنفُسِهِنَّ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ وَعَشْراً فَإِذَا بَلَغْنَ أَجَلَهُنَّ فَلاَ جُنَاحَ عَلَيْكُمْ فِيمَا فَعَلْنَ فِي أَنفُسِهِنَّ بِالْمَعْرُوفِ وَاللّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ﴾(4) لەگەڵ ئایەتی: ﴿وَالَّذِينَ يُتَوَفَّوْنَ مِنكُمْ وَيَذَرُونَ أَزْوَاجاً وَصِيَّةً لِّأَزْوَاجِهِم مَّتَاعاً إِلَى الْحَوْلِ غَيْرَ إِخْرَاجٍ فَإِنْ خَرَجْنَ فَلاَ جُنَاحَ عَلَيْكُمْ فِي مَا فَعَلْنَ فِيَ أَنفُسِهِنَّ مِن مَّعْرُوفٍ وَاللّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ﴾(5)، چونکە ئایەتی یەکەم تایبەتە بە مافی خودا و ئایەتی دووەم تایبەتە بە مافی ژن، کەوابوو دژیەکی بنەڕەتی نەسخە،

---

[1] النساء : ١٥

[2] النساء : ١٦

[3] النور : ٢

[4] البقرة : ٢٣٤

[5] البقرة : ٢٤٠

چونکە نەسخ بۆ هەلگرتنی دژیەکی دێت، بۆیە گەر بنەڕەت نەبوو بێت ئەوکات لقەکە بوونی نابێت.

٣.یەکێتی کات، دژایەتی نییە لە نێوان(ڕۆژوو لە ڕۆژی ڕەمەزاندا پێویستە) لەگەڵ(ڕۆژوو لە شەوەکانی ڕەمەزاندا پێویست نییە).

٤.یەکێتی شوێن، دژایەتی نییە لە نێوان(یاسای سزاکانی عێراق گوزەر دەکات بەسەر ئەو تاوانانەی ئەنجام دەدرێت لە هەرێمی عێراقدا) لەگەڵ (گوزەر ناکات بەسەر ئەو تاوانانەی ئەنجام دەدرێت لە دەرەوەی عێراق).

٥.یەکێتی مەرج، دژیەکی نییە لە نێوان(تۆمەتبار سزا دەدرێت بە مەرجی جێگیربوونی تۆمەتی ئاراستەکراو بۆی) لەگەڵ (تۆمەتبار سزا نادرێت بە مەرجی بێتاوانی لە تۆمەتەکە) بەهۆی جیاوازی لە مەرجدا.

٦.یەکێتی دانەپاڵ، دژیەکی نییە لە نێوان(تۆمەتبار تاوانبار دەکرێت لەسەر ئەو تاوانەی ئەنجامیداوە) لەگەڵ(تۆمەتبار تاوانبار ناکرێت لەسەر تاوانێك کە ئەنجامدانی نەسەلماوە).

٧.یەکێتی هێز و کردار، دژیەکی نییە لە نێوان(کۆرپەلە کەسایەتییەکی یاسایی هەیە) واتە بەهێز و ئامادەیی، لەگەڵ(کۆرپەلە کەسایەتییەکی یاسایی نییە) واتە بە کردار پێش لەدایکبوونی.

٨.یەکێتی گشت و بەش، دژیەکی نییە لە نێوان(هەنار دەخورێت واتە بەشێکی) کە بریتییە لە کرۆکەکەی، لەگەڵ(هەنار ناخورێت، واتە هەمووی) چونکە توێکڵی هەنار ناخورێت.

یەکێتی عەزیمەت یان ڕوخسەت: عەزیمەت بریتییە لە حوکمە بنەڕەتییەکە وەك ئەوەی لە خاوەن شەرعەوە داواکراوە، ڕوخسەت بریتییە لە گۆڕان(یان ئاڵوگۆڕ)ی حوکمەکە لە گرانییەوە بۆ ئاسانی بەهۆی پاساوێکەوە لەگەڵ ڕاستبوونەوەی هۆی حوکمە بنەڕەتییەکە، بینا لەسەر ئەوە دژیەکی نییە لە نێوان ئایەتی: ﴿يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ حَرِّضِ الْمُؤْمِنِينَ عَلَى الْقِتَالِ إِن يَكُن مِّنكُمْ عِشْرُونَ صَابِرُونَ يَغْلِبُواْ مِئَتَيْنِ وَإِن

يَكُن مِّنكُم مِّئَةٌ يَغْلِبُواْ أَلْفاً مِّنَ الَّذِينَ كَفَرُواْ بِأَنَّهُمْ قَوْمٌ لاَّ يَفْقَهُونَ﴾[1] لەگەڵ ئایەتی: ﴿الآنَ خَفَّفَ اللّهُ عَنكُمْ وَعَلِمَ أَنَّ فِيكُمْ ضَعْفاً فَإِن يَكُن مِّنكُم مِّئَةٌ صَابِرَةٌ يَغْلِبُواْ مِئَتَيْنِ وَإِن يَكُن مِّنكُمْ أَلْفٌ يَغْلِبُواْ أَلْفَيْنِ بِإِذْنِ اللّهِ وَاللّهُ مَعَ الصَّابِرِينَ﴾[2]، چونکە حوکمەکە لە یەکەمدا عەزیمەتە و لە دووەمدا روخسەتە.

هەر بەو جۆرە ئەم ئایەتە لە دەروازەی نەبوونی یەکێتی لە عەزیمەت و روخسەت دەژمێررێت: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا نَاجَيْتُمُ الرَّسُولَ فَقَدِّمُوا بَيْنَ يَدَيْ نَجْوَاكُمْ صَدَقَةً ذَلِكَ خَيْرٌ لَّكُمْ وَأَطْهَرُ فَإِن لَّمْ تَجِدُوا فَإِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ أَأَشْفَقْتُمْ أَن تُقَدِّمُوا بَيْنَ يَدَيْ نَجْوَاكُمْ صَدَقَاتٍ فَإِذْ لَمْ تَفْعَلُوا وَتَابَ اللَّهُ عَلَيْكُمْ فَأَقِيمُوا الصَّلَاةَ وَآتُوا الزَّكَاةَ وَأَطِيعُوا اللَّهَ وَرَسُولَهُ وَاللَّهُ خَبِيرٌ بِمَا تَعْمَلُونَ﴾[3].

ب.جیاوازییەکان لە چەندێتی و چۆنێتیدا:

جیاوازی لە چەندێتیدا بەوەی یەکێکیان هەمووەکی بێت و ئەویتریان بەشەکی، دژیەکی نییە لە نێوان دوو هەمووەکیدا بەهۆی گونجاوی ناڕاستی هەردووکیانەوە، وەك هەموو زیندوویەك مرۆڤە و هیچ شتێك لە مرۆڤ زیندوو نییە، ئەم دوانە هەردووکیان درۆن، هەر بەو جۆرە دژیەکی نییە لە نێوان دوو پرسی بەشەکیدا، وەك هەندێ مرۆڤ زانایە، لەگەڵ هەندێ مرۆڤ زانا نییە، بەهۆی راستێتی هەردووکیانەوە.

جیاوازی لە چۆنێتیدا واتە لە ئەرێ و نەرێدا، وەك چۆن لە نۆ نموونەکەی پێشتر باسمان لەبارەوە کرد.

لەگەڵ رەچاکردنی ئەم چوار مەرجەدا بۆ نەسخی قورئان لێکۆڵەر ناتوانێت دوو ئایەتی دژبەیەك بدۆزێتەوە ئەو مەرجانەیان تێدا بێت.

---

[1] الأنفال : ٦٥

[2] الأنفال : ٦٦

[3] المجادلة : ١٢-١٣

**بەڵگەكانی سەرخەرانی نەسخ لە قورئاندا**

مەنتقی تەندروست گونجاوی نەسخ لەڕووی ئەقڵەوە پاساودار دەكات چونكە كارێكە دەكرێت رووبدات و خودا بەسەر هەموو شتێكدا دەسترۆیشتووە، سەرباری روودانی لە شەریعەتە پێشووەكانی تردا، جیاوازییەكە لە روودانیدایە لەناو قورئاندا، ئەوانەی دەڵێن نەسخ بە قورئان لە قورئاندا هەیە بەڵگە دەهێننەوە بە هەندێ رىوایەت لە پێشینەوە سەرباری هەندێ بەڵگەی ئەقڵی، بەم شێوەیە:

**یەكەم-قورئان:**

بەڵگە دەهێنەوە بە هەندێك ئایەتی قورئانی لەسەر روودانی نەسخ لە قورئاندا لە كاتێكدا تەنها ئاماژە بە ئەگەری گونجانی دەكەن، لەو ئایەتانە:

أ.ئایەتی ﴿مَا نَنسَخْ مِنْ آيَةٍ أَوْ نُنسِهَا نَأْتِ بِخَيْرٍ مِنْهَا أَوْ مِثْلِهَا﴾[1].

ب.ئایەتی ﴿يَمْحُوا اللَّهُ مَا يَشَاءُ وَيُثْبِتُ وَعِنْدَهُ أُمُّ الْكِتَابِ﴾[2]

ج.ئایەتی ﴿وَإِذَا بَدَّلْنَا آيَةً مَكَانَ آيَةٍ وَاللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا يُنَزِّلُ قَالُوا إِنَّمَا أَنْتَ مُفْتَرٍ بَلْ أَكْثَرُهُمْ لاَ يَعْلَمُونَ﴾[3]

**گفتوگۆی بەڵگەهێنانەوە بەم ئایەتانە لەسەر روودانی نەسخ:**

ئایەتی یەكەم- ئاماژە دەكات بۆ ئەگەری گونجاوی نەك روودانی، لەبارێكدا ئەگەری مانای وشەی "آية" بە مانای ئایەتی قورئانی هاتبێت، بەم هۆیانە:

١-ئایەتی(١٠٦) وەڵامە بۆ ئایەتی(١٠٥)ی پێش خۆی، واتە نەسخ لە كتێبە پێشووەكاندا نەك لە قورئاندا، چونكە ئەو ئایەتەی پێش ئەو ئەمەیە ﴿ما يَودُّ الذين كَفَروا مِنْ أهلِ الْكتابِ ولا الْمُشْرِكينَ أنْ يُنزلَ عَلَيكُمْ مِنْ خَيرٍ مِن رَبكُمْ وَالله يَخْتَصُ بِرَحْمَتِهِ مَن يَشاءُ وَاللهُ ذو الْفضلِ الْعظيم﴾.[4]

---

[1] سورة البقرة/١٠٦

[2] سورة الرعد/٣٩.

[3] سورة النحل/١٠١.

[4] البقرة ١٠٥

بێباوەڕان لە ئەهلی کیتاب و هاوەڵدانەران دابەزینی وەحییان بۆ سەر محمد(ﷺ) و ئوممەتەکەی پێخۆش نەبوو، ئایینەکەی خۆیان پێ باشتر بوو لە ئیسلام، بۆیە خودا ئەو ئایەتەی دابەزاند(مَا نَنْسَخْ مِنْ آيَةٍ-الاية) وەك بەرپەرچدانەوەیەك بۆ ئەوان، بۆیە ماناکەی بەم جۆرە دەبێت: (ئایەتێك لە تەورات یان لە ئینجیل و کتێبەکانی پێشوو ناسڕینەوە لە قورئاندا چاکتر و باشتر نەهێنین، ئەمەش لە دووتوێی ئایەتەکانی پێش ئەو و دوای ئەودا رۆشنن، چونکە لە بابەتی ئەهلی کیتابن.

٢-وشەی"ما" لە ئایەتی: ﴿مَا نَنسَخْ مِنْ آيَةٍ﴾دا ناوی مەرجییە بە مانای"إن"ی مەرجی، ئەمەش بە سروشت بەکاردەهێنرێت بۆ رووداوێك ئەگەری روودانەکەی دڵنیایی تێدا نەبێت[1]، "سەعدەدینی تەفتازانی" لە پێشەکی کتێبەکەیدا "المطول"[2]دا دەڵێت:

لە کاتێکدا سکاڵا دەکات لەدەست ناجێگیری باروبۆخ لە رەوشی دانانی ئەو کتێبەدا: (سکاڵا بۆ لای خودایە لەدەست رۆژگار، کاتێك خراپە دەکات(إذا أساء) لەسەر خراپەکەی سوور و پێداگرە، کاتێك چاکە دەکات(إن أحسن) هەر لەو دەمەدا لێی پەشیمان دەبێتەوە)، لەسەر ئەم قسەیە هەندێ کەس قسەیان هەیە و دەڵێن: "إذا"ی بەکارهێنا لە خراپەدا، چونکە روودانەکەی دڵنیایی تێدایە، و "إن" بەکارهێنا لە چاکەدا، چونکە روودانەکەی جێگەی شك و گومانە.

بینا لەسەر ئەوە ئایەتەکە ئاماژە دەکات بە ئەگەر(گونجان)ی نەسخ گەر مەبەست بە گوزارەی"آية" ئایەتی قورئانی بێت، نەك لەسەر رووداني نەسخ.

---

[1] "الرازي" (ضياء الدين عمر) في تفسيره الشهير بالتفسير الكبير ومفاتيح الغيب: ٢٤٧/٢ دەڵێت: (بەڵگەهێناوە بە ئایەتی (ما ننسخ من آية) الآيه، بەڵگەهێنانەوەیەکی لاوازە، چونکە (ما) لەم ئایەتەدا مانای مەرج و جەزای هەیە و ئاماژە بە رووداني نەسخ ناکات بەڵکو ئاماژە دەکاتە سەر ئەوەی هەر کات نەسخ روویدات خودا باشتر لەوە دەهێنێت.

[2] صفحة ٤.

٣-مەبەست بە وشەی "آیة" لە ئایەتە باسکراوەکەدا بریتییە لە "نیشانە و موعجیزە" کە خودا دەریدەخات بۆ سەلماندنی پێغەمبەرایەتی یەکێك لە پێغەمبەرانی و پەیامهێنێك لە پەیامهێنەکانی، مەبەست لە نەسخ لەم ئایەتەدا بریتییە لە کارنەکردن بە موعجیزەکانی پێشوو و دووبارە نەکردنەوەیان و هێنانی کۆمەڵێك موعجیزەی نوێ بۆ پێغەمبەرە پاشینەکان، ئەوەی رۆشنە ئەوەیە بۆ هەر پێغەمبەرێك کۆمەڵە ئایەتێك لە موعجیزە بوونی هەیە، بۆ سەروەرمان موسا-علیه السلام- کۆمەڵێك موعجیزەی تایبەت هەبوو، هەر بەو جۆرە بۆ سەرەوەرمان عیسا-علیه السلام- کە بە چەند موعجیزەیەك تەنها کەوتبووەوە، بۆ گەورە و سەروەرمان محمد(ﷺ) موعجیزەی تایبەت هەبوو جیا لە موعجیزەکانی پێش خۆی، لەپێش هەموویانەوە قورئانی پیرۆز کە بە مانا و گوزارەی موعجیزەیە.

بەڵگە لەسەر هەڵدانی وشەی"آیة" بۆ سەر "موعجیزە" لەو ئایەتە باسکراوەدا کۆتایی ئایەتەکەیە: ﴿أَلَمْ تَعْلَمْ أَنَّ اللَّهَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ﴾، چونکە باسکردنی توانا و دەسەڵات و راگەیاندنی لەگەڵ بابەتی "الأحکام"دا گونجاو نییە، بەڵکو لەگەڵ "موعجیزەکان" شیاو و گونجاوە، گەر مەبەستی پێی ئایەتی قورئانی بوایە دەیفەرموو: (ألم تعلم ان الله علیم حکیم)[1].

هەر بەو جۆرە دوو ئایەتەکەی دوای ئەو ئاماژە دەکەن بەوەی مەبەست لە وشەی "آیة" لە سورەتی "البقرة"دا بریتییە لە "موعجیزە"، ئەو دوانەش:

ئ- ئایەتی﴿أَلَمْ تَعْلَمْ أَنَّ اللَّهَ لَهُ مُلْكُ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ وَمَا لَكُمْ مِنْ دُونِ اللَّهِ مِنْ وَلِيٍّ وَلاَ نَصِيرٍ﴾[2].

ب- ئایەتی﴿أَمْ تُرِيدُونَ أَنْ تَسْأَلُوا رَسُولَكُمْ كَمَا سُئِلَ مُوسَى مِنْ قَبْلُ وَمَنْ يَتَبَدَّلْ الْكُفْرَ بِالأَيمَانِ فَقَدْ ضَلَّ سَوَاءَ السَّبِيلِ﴾[1].

---

[1] تفسیر المنار للاستاذ الامام الشیخ محمد عبدة والاستاذ الشیخ محمد رشید رضا: ٤١٦/١.

[2] سورة البقرة/١٠٧.

ئەوەی ڕۆشنە ئەوەیە پەیوەندییەکی دامەزراو و پەیوەستبوونێکی تونـدوتۆڵ لـە نێوان ئایەتەکانی قورئاندا هەیە بەجۆرێك هەندێکی شرۆڤەی هەنـدێکی تـری دەکـات، وەك لە شرۆڤەی ئایەتی: ﴿مَا نَنسَخْ مِنْ آيَةٍ﴾ بە دوو ئایەتەکەی دواتری ئەو ئایەتە.

بەڵام گەر نەسخ هەڵبدەینە سەر مانـا زاراوەییەکـەی کـە بریتییـە لـە سـڕینەوەی قورئان بە قورئان ئەوا هیچ گونجان و شـیانێك لـە نێـوان ئایەتەکـە و دوو ئایەتەکـەی دوای خۆی نامێنێت.

٤-وشـەی "آيـة" ئایـەتی قورئـانی یـان مـوعجیزەی خـوایی بـۆ بەڕاسـتزانینی پێغەمبـەران و شـەریعەتە خواییـەکانی پێشـوو هەڵدەگرێت وەك باسمـان کـرد، گـەر "ئەگـەر" جـێگیر بـوو بەڵگەپێهێنانـەوە بەردەبێتـەوە(إذا ثبـت الإحتمـال سـقط الإستدلال)

٥-گەر لەپێناو گفتوگۆدا خۆمان ڕادەستی ئەوە کرد ئەم ئایەتە ئاماژە دەکات بۆ بوونی نەسخ لە قورئاندا ئەوا نە لە نزیك و نە لە دوور نابێتە بەڵگە و ئاماژە بـۆ بـوونی تەنها یەك ئایەت لە قورئاندا کە لەم کتێبـەی بەردەسـتی موسـڵماناندایە حوکمەکـەی سڕابێتەوە و گوزارەکەی مابێت یان بە دەربڕینێکی تر کـرۆك و جەوهـەری لابرابێـت و بەرگ و توێکڵی مابێتەوە، یان بە پێچەوانەی ئەوەوە حوکمەکەی مابێتەوە و خودەکە سڕابێتەوە یان ئاماژەبۆکراو پارێزراو بێت و ئاماژەکەر سڕابێتەوە، چونکە ئەم شێوازە شازە ناماقووڵە گـەر یاسـادانەر لـە یاسـای دانـراودا ئـەنجامی بـدات ئـەوا بێمانـایی و دەرچوون لە باو و لە ماقووڵی دەدرێتە پاڵ، خودا-سبحانە وتعالی- پاك و بێگەردترە لەوەی شتێك بدرێتە پاڵی بۆ مرۆڤ ناتەواوییە ﴿وَلِلَّهِ الْمَثَلُ الأَعْلَـى﴾، ﴿وَاللَّـهُ يَعْلَـمُ وَأَنْتُمْ لاَ تَعْلَمُونَ﴾، درێژەی بابەتەکە لە شوێنی خۆی دێت.

ئایەتی دووەم- ئایەتی: ﴿يَمْحُوا اللَّهُ مَا يَشَاءُ وَيُثْبِتُ وَعِنْـدَهُ أُمُّ الْكِتَـابِ﴾[٢]، هەندێ کەس بەڵگە بەم ئایەتە دەهێننەوە لەسەر ڕوودانی نەسخ لـە قورئانـدا لەسـەر

---

[١] سورة البقرة/١٠٨.

[٢] سورة الرعد/٣٩.

لێکدانەوەی وشەی "المحو" بە نەسخ و لێکدانەوەی وشەی "الإثبات" بە نەسخکەر، ئەم گومانە ئیجتیهادێکی هەڵەیە لەبەر ئەم هۆیانە:

١-قورئان هەندێکی هەندێکی تری شرۆڤە دەکات، پەیوەستبوون و گرێدان لە نێوان ئایەتەکاندا بوونی هەیە، ئەو ئایەتانەی بەدوای ئەم ئایەتەدا دێن ناگونجێن لەگەڵ هەڵدانی وشەی "محو" بۆ سەر نەسخ، چونکە ئایەتێکی روون و رۆشن و راشکاوە لە مەبەست بە ئاڵوگۆڕە گەردوونییەکان وەك چۆن ئەم راستییە لە ئایەتی: ﴿أَوَلَمْ يَرَوْا أَنَّا نَأْتِي الأَرْضَ نَنْقُصُهَا مِنْ أَطْرَافِهَا وَاللَّهُ يَحْكُمُ لاَ مُعَقِّبَ لِحُكْمِهِ وَهُوَ سَرِيعُ الْحِسَابِ﴾[1] حاڵیدەبین، بۆیە مەبەست پێی خودا ئەوەی بیەوێت لە دروستکراوەکان دەیسڕێتەوە و ئەوانەش کە دەیەوێت جێگیریان دەکات، هەموو موڵکی ئەون و ئەویش لە موڵکی خۆیدا هەڵسوکەوت و دەستێوەردان دەکات لەبەر رۆشنایی حیکمەتەکەی بۆ ئەوەی ئەو گۆڕانکاریانە ئاماژە بن لەسەر ئەوەی ئەم جیهانە رووداوە و بۆ هەموو رووداوێك هۆیەك بوونی هەیە و خودا-سبحانە وتعالی- بریتییە لەو هۆیە.

٢-"محو" گشتییە و نەسخ لە بەشەکییەکانیەتی، شێوەیەکە لە شێوەکانی، وەك چۆن ئەوە لە نەسخدا دێتەدی لە شتانی تریش جگە لە نەسخ دێتەدی، بۆیە دروست نییە بەڵگە بە گشتگیرتر لەسەر تایبەتتر بهێنرێتەوە.

٣-بۆ "المحو و الإثبات" ئەگەری زۆر هەیە، لەوانە:

أ.لە رزق دەسڕێتەوە و تیایدا زیاد دەکات، بەختەوەری و بەدبەختی دەسڕێتەوە و جێگیریان دەکات.

ب-بە تەوبەکردن هەموو گوناهان دەسڕێتەوە لە جێگەی گوناهان چاکەکان جێگیر دەکات، وەك ئەم ئایەتە ئاماژەی پێدەدات:﴿إِلاَّ مَنْ تَابَ وَآمَنَ وَعَمِلَ عَمَلاً صَالِحًا فَأُوْلَئِكَ يُبَدِّلُ اللَّهُ سَيِّئَاتِهِمْ حَسَنَاتٍ﴾.

---

[1] سورة الرعد/٤١.

ج-سەدەکان و ئەوانەی تیایاندا دەژین دەسڕێتەوە نەوە و گەل و نەتەوەی تر بەدوایاندا دەهێنێت و جێگیریان دەکات، وەك ئەم ئایەتانە: ﴿ثُمَّ أَنْشَأْنَا مِنْ بَعْدِهِمْ قَرْنًا آخَرِينَ﴾ وقوله: ﴿كَمْ أَهْلَكْنَا قَبْلَهُمْ مِنَ الْقُرُونِ﴾.

ئەگەری زۆری تر هەن کە بواری باسکردن و خستنەڕوویان نییە[1]، لە ڕێسا ئوسولییە مەنتقییەکان(گەر "ئەگەر" لە شتێکدا بەرهەم هات بەلگەهێنانەوە پێی بەردەبێتەوە)

٤-هەر ئایەتێك لە ئایەتەکانی قورئان خوێندنەوە و حوکمیان بە تەواتور جێگیربووە، ئایەتە باسکراوەکە ئاماژە دەکات بە نەسخ بە ئاماژەیەکی گومانئامێز، ئەوەش بە یەقین(متەواتر) جێگیربووە بە شك و گومان ناسڕێتەوە.

ئایەتی سێیەم- ئەم ئایەتەیە: ﴿وَإِذَا بَدَّلْنَا آيَةً مَكَانَ آيَةٍ وَاللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا يُنَزِّلُ قَالُوا إِنَّمَا أَنْتَ مُفْتَرٍ بَلْ أَكْثَرُهُمْ لاَ يَعْلَمُونَ﴾.

لە قورئاندا وشەی "تبديل" و داتاشراوەکانی زیاتر لە چل جار هاتوون، هەموویان بۆ ئەم سێ شێوازە دەگەڕێنەوە کە ئەمانەن:

أ.هاوتا بە پیتی "الباو" وەك لە ئایەتی: ﴿وَمَنْ يَتَبَدَّلْ الْكُفْرَ بِالأَيمَانِ فَقَدْ ضَلَّ سَوَاءَ السَّبِيلِ﴾[2] هەروەها ئایەتی: ﴿أَتَسْتَبْدِلُونَ الَّذِي هُوَ أَدْنَى بِالَّذِي هُوَ خَيْرٌ﴾[3]

"الباء" لەم شێوازەدا دەچێتە سەر "المبدل منه-لێئالوگۆڕکراو" هەندێ لە نووسەران دەیخەنە سەر "المبدل-ئالوگۆڕکراو" ئەوەش سەردەکێشێت بۆ بەدحاڵی بوون لە تێگەیشتنی قسەدا.

ب-هەندێ جار وشەی "تبديل" و داتاشراوەکانی لەگەڵ وشەی "مكان"دا باسدەکرێن، وەك لە ئایەتی: ﴿ثُمَّ بَدَّلْنَا مَكَانَ السَّيِّئَةِ الْحَسَنَةَ﴾ هەروەها

---

[1] ينظر: مجمع البيان في تفسير القرآن للطبرسي: ٢٩٨/٦.

[2] سورة البقرة/١٠٨.

[3] سورة البقرة/٦١.

ئایەتی:﴿وَإِنْ أَرَدْتُمْ اسْتِبْدَالَ زَوْجٍ مَكَانَ زَوْجٍ وَآتَيْتُمْ إِحْدَاهُنَّ قِنطَارًا فَلاَ تَأْخُذُوا مِنْهُ شَيْئًا أَتَأْخُذُونَهُ بُهْتَانًا وَإِثْمًا مُبِينًا﴾[1]

ج—هەندێ جار وشەی "تبدیل" و داتاشراوەکانی هاوتا نابن نە بە "الباو" و نە بە "مكـان" وەك لـە ئایـەتی:﴿فَمَـنْ بَدَّلَـهُ بَعْـدَمَا سَـمِعَهُ فَإِنَّمَـا إِثْمُـهُ عَلَـى الَّـذِينَ يُبَدِّلُونَهُ﴾[2]، هەندێکیش پێیان وایە "التبدیل" لەم ئایەتـەدا﴿وَإِذَا بَـدَّلْنَا آيَـةً مَكَـانَ آيَةٍ﴾..الخ مەبەست پێـی نەسـخە، واتـە گـەر ئایـەتێکمان نەسـخکردەوە و ئایـەتێکی نەسخکەرمان لە جێگەی دانا بێباوەڕان دەڵێن ئەمە درۆهەڵبەستنە بـە دەم خـوداوە، ئەم بیروبۆچوونە لە چەند ڕوویەکەوە هەڵەیە:

١.وشەی "آیـة" هاوبەشـێکی گوزارەییـە—وەك پێشـتر باسمـان کـرد— لـە نێـوان "ئایەتی قورئانی و ئایەت لە هەموو شەریعەتە خودایییەکان و موعجیزە و نیشـانەدا"، قورئان بەم چوار مانایە بەکاریهێناوە، هاوبەشە گوزارەییەکەی هەڵداوەتە سەر یەکێك لەو مانانە بەبێ بوونی نیمچەبەڵگەیەکی یەکلاکەرەوە تـاکو ئـەو مانایـە دیـاری بکـات ئەوەش هەڵـدانێکی ئیجتیهادیانـەی گومانئـامێزە بـەهۆی هاوتانـەبوون لـە نێـوان دوو بەڵگەکەدا.

٢.بینا لەسەر ئەمە مەبەست لە ئایەتی: ﴿وَإِذَا بَدَّلْنَا آيَةً مَكَانَ آيَةٍ﴾ ئەوەیە: گەر ئایەتێك لە قورئانمـان بـە ئایـەتێك لـە تـەورات یـان لـە ئینجیـل یـان جگـە لەوانـە لـە شەریعەتە پێشووەکان ئاڵوگۆڕ کـرد ئـەهلی کیتـاب دەڵـێن: ئەمـە درۆکردنـە بـە دەم خوداوە.

گەر بۆ گفتوگۆ خۆمان رادەستی ئەوە کرد مەبەست بە "التبـدیل" بریتی بێت لـە نەسخ، ئەوا نابێتە بەڵگەی "سڕینەوەی حوکم بـەبێ خوێندنـەوە" یـان "سـڕینەوەی خوێندنەوە بەبێ حوکم"، چونکە "التبدیل" هەموو ئایەتەکە بەتـەواوی دەگرێتـەوە، ئەمەش ناتوانرێت نەرێبکرێت بەهۆی گونجاوی نەسخی ئایاتەوە کە لـەو مەسـحەفەی

---

[1] سورة النساء/٩٠.

[2] سورة البقرة/١٨١.

ئەمڕۆ لەبەردەستی موسڵماناندایە جێگیر نەکراون، بەڵام نابێتە بەڵگە لەسەر ئەوەی سەرخەرانی نەسخ بانگەشەی بۆ دەکەن لە بوونی دەیان ئایەت لە قورئاندا لەڕووی حوکمەوە نەسخکراون و لەڕووی خوێندنەوەوە ماونەتەوە، چونکە نموونەی ئەو هەڵسوکەوتە لە بێمانابیەوەیە و ئەقڵی تەندروست رەفزی دەکات، خودا-سبحانە وتعالى- پاك و بێگەردترە لەوەی بێمانایی ئەنجام بدات، وەك لە دابەشکردنی نەسخ لەڕووی نەسخکراوەوە باسی لەبارەوە دەکەین.

٣.نەیفەرموو: "وإذا نسخنا آية بآية"

٤. نەیفەرموو: "وإذا بدلنا آية بآية"، بەڵکو فەرمووی: "وإذا بدلنا آية مكان آية"، ئەم جۆرە "تبديل"ە لە قورئاندا زۆر هاتووە، وەك چیرۆکی ئادەم-عليه السلام- کە لە حەوت سورەتی قورئاندا باسکراوە، لە هەر سورەتێك و لە هەر شوێنێکدا بە شێوازێکی نوێ بەبێ بوونی کەمترین دژایەتی، چیرۆکی هەموو پێغەمبەران بەهەمان شێوەیە، لە چەندین بابەتی ناو قورئاندا هاتوون بە شێوازی جۆراوجۆر کە بەڵگەیە لەسەر موعجیزەی قورئان[1]

دووەم-بەڵگەهێنانەوە بە وتەی پێشینی چاکان:

سەرخەرانی نەسخ بەڵگەی زۆر دەهێننەوە بە وتە و ریوایەتگەلێك لە پێشینی چاکانەوە لەسەر جێگیرکردنی ئەم نەسخە[2].

---

[1] علوم القرآن/ص.١٢٢.

[2] بۆ نموونە: "النحاس" لە کتێبی "الناسخ والمنسوخ ص١٦ في قوله تعالى ﴿كُتِبَ عَلَيْكُمُ الْقِصَاصُ فِي الْقَتْلَى الْحُرُّ بِالْحُرِّ وَالْعَبْدُ بِالْعَبْدِ﴾ الآية ، دەڵێت: لە "ابن عباس"ەوە دەڵێت: نەسخکراوەتەوە بە ئایەتی: ﴿وَكَتَبْنَا عَلَيْهِمْ فِيهَا أَنَّ النَّفْسَ بِالنَّفْسِ﴾.
"ابن سلامة" لە کتێبی "الناسخ والمنسوخ"دا ص٦٩ دەڵێت: "الضحاك" دەڵێت: نەسخ دەچێتە ناو ئەمر و نەهی و هەواڵ کە ماناکەی ئەمر و نەهی بێت.
"ابن حزم" لە کتێبي "الناسخ والمنسوخ في القرآن الكريم ص٤٢ دەڵێت: سورەتی "إبراهيم" مەکییە و لەلای جمهوری فەقیهان موحکەمە جگە لە "عبدالرحمن بن زيد بن أسلم" ئەو دەڵێت ئایەتێکی نەسخکراوی تێدایە کە بریتییە لە: ﴿وَإِنْ تَعُدُّوا نِعْمَةَ

بەڵگەنەویستە بەڵگەهێنانەوە لەسەر نەسخ بە مانا تایبەتەکەی لای ئەوانەی بەدوای پێشینی چاکاندا هاتن بریتییە لە هەڵوەشاندنەوەی نەسخ بە مانا گشتییەکەی لای پێشینی چاکان کە تایبەتکردنی دەقی گشتی و سنووردارکردنی دەقی رەها و رۆشنکردنەوەی پوختە و روخسەت و پلە بە پلە و هاوشێوەکانی ئەمانە دەگرێتەوە، ئەمەش بەڵگەهێنانەوەیەکی هەڵەیە لە ترازووی ئەقڵی تەندروست و مەنتق و رێسای گشتی بەڵگەنەویست کە دەڵێت: تایبەتتر بە گشتگیرتر جێگیر نابێت.

بۆیە لە دەروازەی ئیجتیهادی هەڵەیە حوکم کردن بەسەر زۆرێك لە ئایەتی ئەحکامی قورئاندا بەوەی نەسخکراون لەڕووی حوکمەوە و ماونەتەوە لەڕووی خوێندنەوەوە، چونکە ئەو ئایەتانە یان گشتین تایبەتکراون یان رەهان سنووردار کراون یان پوختەن رۆشنکراونەتەوە یان هاوشێوەکانی ئەوانە، وەك چۆن بەدرێژی لە شوێنی خۆیدا بە یارمەتی خودا باسی لەبارەوە دەکەین.

سێیەم-بەڵگەهێنانەوە بە بەڵگەی ئەقڵی:

سەرخەرانی نەسخ لە قورئاندا بەڵگەی ئەقڵی لەسەر بوونی نەسخ دەهێننەوە، لەوانە:

أ.نەسخ لەڕووی ژیرییەوە قەدەغەکراوی تێدا نییە، هەر شتێکیش بەو جۆرە بێت لەڕووی ژیرییەوە گونجاوە، بە گونجاوی ئەقڵی بەڵگەیان لەسەر روودانی نەسخ هێناوەتەوە، ئەم بەڵگەهێنانەوە ئیجتیهادێکی هەڵەیە، چونکە "گونجان" "روودان" پێویست ناکات و ناکرێت روودان بە گونجاوی ئەقڵی جێگیربکرێت، چونکە دەچێتە

---

اللّهِ لاَ تُحْصُوهَا إِنَّ الإِنسَانَ لَظَلُومٌ كَفَّارٌ﴾ نەسخکەرەکەی بریتییە لە: ﴿وَإِنْ تَعُدُّوا نِعْمَةَ اللّهِ لاَ تُحْصُوهَا إِنَّ اللّهَ لَغَفُورٌ رَحِيمٌ﴾ سورة النحل/١٦.

"ابن الجوزی" لە کتێبی "الناسخ والمنسوخ ص٦٠ دەڵێت: لە "عکرمە"وە لە "ابن عباس"وە ئایەتی وەسێت نەسخکراوەتەوە بە ئایەتی میرات، هەر بەو جۆرە سەدان بەڵگەهێنانەوە بە وتەی پێشین کە لێرەدا بواری باسکردنیان نییە.

خانەی جێگیرکردنی بانگەشەی تایبەت بە بەڵگەی گشتی، ئەمەش پێچەوانەی مەنتق و ئەقڵی تەندروستە.

ب- بەڵگە دەهێننەوە لەسەر رووداني نەسخ لە قورئاندا بە رووداني نەسخ لە قورئاندا، لەم بەڵگەهێنانەوەدا گێژاو یان نەشیاوی مەنتقی بوونی هەیە، چونکە سەلماندنی رووداني لەسەر سەلماندنی رووداني وەستاوە، و جێگیربوونی رووداني لەسەر جێگیربوونی رووداني وەستاوە.

**زیادەڕەوی لە وتنی نەسخ لە قورئاندا:**

زۆرێك لە ئەهلی تەفسیر و زانایانی ئوسوڵ و دانەرانی کتێب لەم مەیدانەدا زیادەڕوویان کردووە بە پلەیەکی ناماقوڵ لەڕووی شەرعی و مەنتقی و ئەقڵییەوە.

بۆ نموونە:

"هبه الله بن سلامه البغدادی"(ت-٤١٠هـ) لە کتێبەکەیدا "الناسخ والمنسوخ"دا دەڵێت:

ئایەتی شمشێر لە ئایەتی: ﴿فَاقْتُلُوا الْمُشْرِكِينَ حَيْثُ وَجَدْتُمُوهُمْ﴾ [1] سەد و بیست و چوار ئایەتی لە قورئاندا نەسخکردۆتەوە پاشان کۆتایی ئایەتەکە سەرەتای ئایەتەکەی سڕیوەتەوە، ئەوەش ئەو بەشەی ئایەتەکەیە کە دەفەرموێت: ﴿فَإِنْ تَابُوا وَأَقَامُوا الصَّلاَةَ وَآتَوْا الزَّكَاةَ فَخَلُّوا سَبِيلَهُمْ﴾، سەرباری ئایەتی تری نەسخکراو بە چەندین ئایەتی تر جگە لە ئایەتی شمشێر و لە قورئاندا بوونیان هەیە و دەخوێنرێنەوە، دەڵێت: ((هەرچی لە قورئاندایە وەك "أعرض، تولی عنهم، ذرهم" و هاوشێوەکانی ئەمانە نەسخکەرەوەکەیان بریتییە لە ئایەتی شمشێر))

---

[1] سورة التوبة/٥.

هەروەها هەموو ئەوەی لە قورئاندایە لە: ﴿إِنِّـي أَخَـافُ إِنْ عَصَـيْتُ رَبِّـي عَـذَابَ يَوْمٍ عَظِيمٍ﴾[1] نەسخکەرەکەی بریتییە لە: ﴿لِيَغْفِرَ لَكَ اللَّهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِـكَ وَمَـا تَأَخَّرَ﴾[2]

هەروەها هەموو ئەوەی لە قورئاندایە لە هەواڵی ئەوانەی کتێبیان پێدرا و فـەرمان بە لێبوردن نەسخکەرەکەی بریتییە لە: ﴿قَاتِلُوا الَّذِينَ لاَ يُؤْمِنُونَ بِاللَّـهِ وَلاَ بِـالْيَوْمِ الآخِـرِ﴾[3]، هـەروەها هـەموو ئـەوەی لـە قورئاندایـە لـە فـەرمان بـە شـایەتیدان نەسخکەرەوەکەی بریتییە لە: ﴿فَإِنْ أَمِنَ بَعْضُكُمْ بَعْضًا﴾[4]

هـەروەها هـەموو ئـەوەی لـە قورئاندایـە لـە توندکردنـەوە و هەڕەشـەلێکردن نەسخکەرەوەکەی بریتییە لە: ﴿يُرِيدُ اللَّهُ بِكُمْ الْيُسْرَ وَلاَ يُرِيدُ بِكُمْ الْعُسْرَ﴾[5]

"ابن حزم الأندلسـي" لـە کتێبەکەیـدا "الناسـخ والمنسـوخ في القـرآن الكـريم" دەڵێت:

پشتهەڵکردن لە هاوەڵدانەران لە سەد و چواردە ئایەتدا بوونی هەیە کـە لـە چـل و هەشت سورەتدایە:

١. "البقـره" ﴿وَقُولُـوا لِلنَّـاسِ حُسْـنًا﴾[6] گشـتگیرییەکەی سـڕاوەتەوە ﴿لَنَـا أَعْمَالُنَـا﴾ ،﴿فَـإِنْ انتَهَـوْا﴾ ماناکـە سـڕاوەتەوە، چـونکە لەژێریـدا فـەرمان بـە لێبوردن کراوە ﴿قُلْ قِتَالٌ﴾، ﴿لاَ إِكْرَاهَ﴾.

٢. آل عمران ﴿فَإِنَّمَا عَلَيْكَ الْبَلاَغُ﴾ ، ﴿مِنْهُمْ تُقَاةً﴾.

---

[1] سورة يونس/١٥.

[2] سورة الفتح/٢.

[3] سورة التوبة/٢٩.

[4] سورة البقرة/٢٨٣.

[5] سورة البقرة/١٨٥.

[6] الآية ٨٣.

٣. النساء ﴿فَأَعْرِضْ عَنْهُمْ﴾ لە دوو شوێندا ﴿فَمَا أَرْسَلْنَاكَ عَلَيْهِمْ حَفِيظًا﴾ ،﴿لاَ تُكَلَّفُ إِلاَّ نَفْسَكَ﴾ ، ﴿إِلاَّ الَّذِينَ يَصِلُونَ﴾.

٤. المائدة ﴿وَلاَ آمِّينَ﴾، ﴿عَلَى رَسُولِنَا الْبَلاَغُ﴾، ﴿عَلَيْكُمْ أَنفُسَكُمْ... إِذَا اهْتَدَيْتُمْ ﴾ واتە فەرمانتان پێکرا و نەهیتان لێکرا.

٥. الانعام ﴿قُلْ لَسْتُ عَلَيْكُمْ بِوَكِيلٍ﴾، ﴿ثُمَّ ذَرْهُمْ﴾، ﴿وَمَا أَنَا عَلَيْكُمْ بِحَفِيظٍ﴾، ﴿وَأَعْرِضْ﴾، ﴿فَمَا أَرْسَلْنَاكَ عَلَيْهِمْ حَفِيظًا﴾، ﴿وَلاَ تَسُبُّوا﴾، ﴿فَذَرْهُمْ﴾ لە دوو شوێندا ﴿وَيَاقَوْمِ اعْمَلُوا عَلَى مَكَانَتِكُمْ﴾، ﴿قُلْ انتَظِرُوا﴾، ﴿لَسْتَ مِنْهُمْ فِي شَيْءٍ﴾.

٦. الاعراف ﴿وَأَعْرَضَ﴾ ، ﴿وَأَمْلي﴾.

٧. الانفال ﴿وَإِنْ اسْتَنْصَرُوكُم﴾ واتە هاوپەیمانان.

٨. التوبة ﴿فَاسْتَقِيمُوا لَهُم﴾.

٩. يونس ﴿فَانْتَظِرُوا﴾، ﴿فَقُلْ لِي عَمَلِي﴾، ﴿وَإِمَّا نُرِيَنَّكَ﴾، ﴿أَفَأَنْتَ تُكْرِهُ﴾، ﴿فَمَنِ اهْتَدَى﴾ مانا:پشتگوێخستن و دانبەخۆداگرتن.

١٠. هود ﴿إِنَّمَا أَنْتَ نَذِيرٌ﴾ مانا: واتە تۆ دەیانترسێنیت ﴿وَيَاقَوْمِ اعْمَلُوا عَلَى مَكَانَتِكُمْ﴾، ﴿وَانْتَظِرُوا﴾.

١١. الرعد ﴿عَلَيْكَ الْبَلاَغُ﴾.

١٢. الحجر﴿ذَرْهُم﴾،﴿فَاصْفَح﴾،﴿وَلاَ تَمُدَّنَّ﴾،﴿أَنَا النَذِير﴾، ﴿وَأَعرِض﴾.

١٣. النحل ﴿فَإِنَّمَا عَلَيْكَ الْبَلاَغُ﴾، ﴿وَجَادِلهُمْ﴾،﴿وَاصْبِر﴾ جیاوازی تێدایە.

١٤. بني اسرائيل ﴿رَبُّكُمْ أَعْلَمُ بِكُمْ﴾.

١٥. مريم عليها السلام ﴿وَأَنْذِرْهُمْ﴾ مانا[١] ﴿فَلْيُمْدِد﴾ پەلە مەکە.

١٦. طه ﴿فاصبر﴾ ، ﴿قُلْ كل﴾.

١٧. الحج ﴿وَإِنْ جَادَلُوكَ﴾.

---

[١] نسخت حكماً وبقيت تلاوة.

١٨. المؤمنون ﴿فَذَرْهُم﴾ ، ﴿ادفع﴾.
١٩. النور ﴿فَإِنْ تَوَلَّوا﴾.
٢٠. النمل ﴿فَمَنِ اهْتَدى﴾ مانا
٢١. القصص ﴿لَنَا أَعْمَالُنَا﴾.
٢٢. العنكبوت ﴿إنَّمَا أنَا نَذِيرٌ﴾ مانا
٢٣. الروم ﴿فاصبر﴾.
٢٤. لقمان ﴿ومن كفر﴾.
٢٥. السجدة ﴿وانتظر﴾.
٢٦. الاحزاب ﴿ودع اذاهم﴾.
٢٧. سبأ ﴿قل لا تسألون﴾.
٢٨. فاطر ﴿إن أنت إلا نذير﴾.
٢٩. يس ﴿فلا يحزنك﴾ جياوازى تێدايه.
٣٠. الصافات ﴿فتول﴾ و﴿تول﴾ ، ﴿وما بينهما﴾.
٣١. ص ﴿فاصبر﴾ ، ﴿إنما أنا منذر﴾ مانا.
٣٢. الزمـر ﴿إن الله يحكـم بيـنهم﴾ مانـا ﴿فاعبـدوا مـا شـئتم﴾، ﴿يـا قـوم اعملوا﴾، ﴿من يأتيه﴾، ﴿فمن اهتدى﴾ مانـا ﴿أنـت تحكـم﴾ مانـا چونكه سەرپشك كردنه.
٣٣. المؤمن ﴿فاصبر﴾ له دوو شوێندا.
٣٤. السجدة ﴿ارفع﴾.
٣٥. حمعسق﴿وما أنت عليهم بوكيل﴾، ﴿لنا أعمالنا﴾، ﴿فإن أعرضوا﴾
٣٦. الزخرف ﴿فذرهم﴾ ، ﴿فاصفح﴾.
٣٧. الدخان ﴿فارتقب﴾.
٣٨. الجاثية ﴿يفطر﴾.
٣٩. الاحقاف ﴿فاصبر﴾.

٤٠. محمد ﴿فأما منا﴾.

٤١. ق ﴿فاصبر﴾ ، ﴿فذكر﴾.

٤٢. المزمل ﴿واهجرهم﴾ ، ﴿وذرني﴾.

٤٣. الانسان ﴿فاصبر﴾.

٤٤. الطارق ﴿فهل﴾.

٤٥. الغاشية ﴿لست عليهم بمسيطر﴾.

٤٦. والتين ﴿أَلَيْسَ اللَّهُ بِأَحْكَمِ الْحَاكِمِينَ﴾. مانا.

٤٧. الكافرون ﴿لكم دينكم﴾.

پاشان "ابن حزم الأندلسي" دەڵێت: هەموو ئەوانە(١١٤ ئایەت) بە ئایەتی﴿فَاقْتُلُوا الْمُشْرِكِينَ حَيْثُ وَجَدْتُمُوهُمْ﴾ نەسخكراونەتەوە، ئەم ئایەتە ئایەتی پێنجەمی سورەتی "التوبة"یە، بانگکەرانی نەسخ ناویان ناوە ئایەتی شمشێر، ئەمە و سەرباری وتنی ئایەتی تر کە بەبێ ئایەتی شمشێر نەسخکراونەتەوە و ژمارەیان(١٠٠) ئایەتە، چونکە کۆی ئایەتە نەسخکراوەکان لە قورئاندا(٢١٤) ئایەتن، ئەو(ابن حزم) بانگەشەی نەسخبوونەوەی هەموو ئەو ئایەتانە دەکات بەبێ ئەوەی یەك بەڵگە راستبکاتەوە –گەر بۆ تەنها یەك جاریش بێت– لەسەر سەلماندنی بانگەشەکەی، سەرباری ئەوەش کتێبەکەی(الناسخ والمنسوخ في القرآن الكريم) پڕە لە دژبەیەکی، لەوانە وتنی ئەوەی ئایەتەکانی هەواڵ نەسخ نایانگرێتەوە، پاشان لە کتێبەکەیدا بانگەشەی نەسخبوونەوەی چەندین ئایەتی هەواڵ دەکات، لەوانە وتنی: هەڵواردن و تایبەتکردن(الإستثناء والتخصيص) لە نەسخ نین، پاشان حوکم دەردەکات بەسەر زۆرێك لە ئایەتدا بە نەسخبوونەوە لە رێگەی هەڵواردن و تایبەتکردنەوە[1].

---

[1] وعلى من يريد مزيداً من التفصيل فليراجع مؤلفه المذكور.

لای "ابن الجوزي"[1] ژمارەی ئەو ئایەتانەی لە حوکمدا نەسخکراونەتەوە نەك لە خوێندنەوەدا و لە مەسحەفدا دەخوێنرێنـەوە(٢٤٧) ئایـەتن، (٢١٣) ئایـەت لای "ابـن السـلامة"[2]، (١٣٤) ئایـەت لای "أبـي جعفـر النحـاس"[3]، و (٦٦) ئایـەت لای "عبدالقاهر البغدادي"[4].

"السيوطي"[5] سنووورداری کردووە بە (٢٠) ئایەت، زانای ئوسوڵی "الشيخ محمد الخضري" بەرپەرچی داوەتەوە و سەلماندوویەتی تەنها یەك ئایـەتیش لـەو ئایەتانـە نەسخنەکراونەتەوە[6]، "مصـطفى زيـد"[7] لـە پێـنج ئایەتـدا سـنووورداری کـردووە، مامۆستا"موسى جواد عفانة"[8] نەسخنەبوونەوەی ئەو پێنج ئایەتەی سەلماندووە.

"السيوطي" لە "الإتقان الآيات المنسوخة" لـە چـەند دێڕێکدا هۆنیوەتـەوە، بـەم جۆرە: وحق تقواه فيما صح[9] في أثـر في الحرام[10] قتال للاولى كفـروا والاعتـداد بحـول مع وصيتهـا[11] وان يدان حديث[12] النفس والفكر والحلف والحبس للزانـي[13] وتـرك

---

[1] ينظر مؤلفه نواسخ القرآن.
[2] هبة الله بن سلامة البغدادي (ت- ٤١٠هـ) الناسخ والمنسوخ الدار العربية للموسوعات.
[3] محمد بن احمد بن اسماعيل الصفار (ت- ٣٣٨هـ) ينظر في مؤلفه الناسخ والمنسوخ في القرآن الكريم.
[4] في كتابه الناسخ والمنسوخ نقله عنه محمد بن أحمد المروزي واستنسخه في ٦١٢هـ.
[5] الاتقان في علوم القرآن ٢/٢١ وما بعدها.
[6] ينظر كتابه (أصول الفقه) ص٢٥٠-٢٥٥.
(٧) في كتابه النسخ في القرآن.
(٨) ينظر مؤلفه الرأي الصواب في منسوخ الكتاب.
(٩) قوله تعالى: (اتَّقُواْ اللّهَ حَقَّ تُقَاتِه)آل عمران/١٠٢.
(١٠) قوله تعالى: (يَسْأَلُونَكَ عَنِ الشَّهْرِ الْحَرَامِ قِتَالٍ فِيهِ قُلْ قِتَالٌ فِيهِ كَبِيرٌ) البقرة/٢١٧.
(١١) قولـه تعـالى: (وَالَّـذِينَ يُتَوَفَّـوْنَ مِـنكُمْ وَيَـذَرُونَ أَزْوَاجـاً وَصِـيَّةً لِّـأَزْوَاجِهِم.. الآيـة) البقرة/٢٤٠.
(١٢) قوله تعالى: (وَإِن تُبْدُواْ مَا فِي أَنفُسِكُمْ أَوْ تُخْفُوهُ يُحَاسِبْكُم بِهِ اللّهُ) البقرة/٢٨٤.
(١٣) قوله تعالى: (وَاللاَّتِي يَأْتِينَ الْفَاحِشَةَ مِن نِّسَآئِكُمْ.. الآيَة) النساء/١٥.

أولى كفروا شهادهم[١] والصبر[٢] والنفر[٣] ومنع عقد لزان و زانية[٤] وما على المصطفى في العقد محتظر[٥] ودفع مهر لمن جاءت[٦] وآية نجواه[٧] كذاك قيام الليل[٨] مستطر وزيد آية الاستئذان[٩] من ملكت وآية القسمة[١٠] الفضلى لمن حضروا.

شايانى باسه "السيوطي" بۆچوونى نەسخى لە زۆرێك لەو ئايەتانەدا داوەتە پاڵ كەسانى تر، بەڵام لەبەر ئەوەی بێدەنگ بووە لە بەرپەرچدانەوەيان لەوانە دەژمێررێت كە بۆچوونى نەسخيان هەيە تيايانـدا، وەك دەستبردن بۆ ئەو رێسا شەرعييە گشتييە((قسە نادرێتە پاڵ بێدەنگ، بەڵام بێدەنگبوون لە ميانەی پێويستيدا راگەياندنە))[١١].

زانای پايەبەرز"محمد الخضري" بانگەشەی نەسخبوونەوەی ئەو ئايەتانەی بە حوكم سڕاونەتەوە و ئەوانەش بە خوێندنەوە سڕاونەتەوە بەرپەرچ دەداتەوە كە "السيوطي" و ئەوانەی لەگەڵ ئەون هێناويانە، بەرپەرچدانەوەكەشی بە بەڵگەی زانستی و مەنتقی[١٢] راستدەكاتەوە، مامۆستا "عبدالمتعال محمد الجبري" لە كتێبەكەيدا "النسخ في الشريعة الإسلامية" –وەك ئەوەی من لێی تێدەگەم– هەستاوە بە:

---

(١) قوله تعالى: (او اخران منكم.. الآية) منسوخة بقوله (واشهدوا ذوى عدل منكم).
(٢) قوله تعالى: (إن يكن منكم عشرون صابرون.. الآية).
(٣) قوله تعالى: (انفروا خفافاً وثقالاً.. الآية).
(٤) قوله تعالى: (الزاني لا ينكح إلا زانية أو مشركة.. الآية).
(٥) قوله تعالى: (لا يحل لك النساء من بعد.. الآية).
(٦) قوله تعالى: (وان فاتكم شيء من ازواجكم.. الآية).
(٧) قوله تعالى: (اذا ناجيتم الرسول فقدموا بين يدي نجواكم صدقة).
(٨) قوله تعالى: (يا أيها المزمل قم الليل الا قليلاً.. الآية).
(٩) قوله تعالى: (ليستأذنكم الذين ملكت أيمانكم.. الآية).
(١٠) قوله تعالى: (واذا حضر القسمة اولو القربى.. الآية).
(١١) المادة (٦٧) من مجلة الأحكام العدلية.
(١٢) ينظر أصول الفقه للخضري نشر المكتبة التجارية الكبرى ص٢٥١–٢٥٥.

١.نەسخ لە قورئاندا نییە، بۆچی؟

٢.داهێنانی تەشریعی ئەوانەی کردووە کە وتراوە نەسخکراون[١].

ئەو ئایەتانە کۆدەکاتەوە بانگەشەی ئەوە دەکەن تەنها لەڕووی خوێندنەوەوە سڕاونەتەوە یان تەنها لەڕووی حوکمەوە سڕاونەتەوە ژمارەیان دەگەیەنێتە(٥٦٤) لە کۆی(٦٢٠٤ ) ئایەت لە قورئاندا، ئەوەش ڕێژەی یەك بۆ یازدەیە، ئامارەکەی لەو سەرچاوە ناوبراوەدا بەم جۆرەیە:

| ژمارەی ئایەت | ڕۆشنکردنەوەیان |
|---|---|
| ٢٠١ | لە قورئاندا وەك ریواتکراون لەلایەن[٢]. |
| ٢١٣ | ئەوەی لە سورەتی الأحزاب کەمیکردووە[٣]. |
| ١٣٠ | سورەتێك وەك هاوشێوەی سورەتی براءة (التوبة). |
| ١٨ | دوو سورەتی الخلع والتهجد (القنوت). |
| ٢ | دوو ئایەتی شیردان و ڕەجم. |
| کۆ (٥٦٤) | |

بە ڕێژەی (١) بۆ (١١) لە قورئانی پیرۆز بەو سەرنجدانەی ژمارەی ئایەت–لەلای بەصرییەکان– (٦٢٠٤)ئایەتە، تێبینی دەکرێت ژمارەی(٢١٣) کە مامۆستا

---

[١] نشر دراسات اسلامية ص٧١.

[٢] واتە ژمارەی ئەو ئایەتانەی لەڕووی حوکمەوە نەسخکراونەتەوە و لە قورئاندا لەڕووی خوێندنەوەوە ماونەتەوە لە قورئاندا، لای "ابن هلل"(٢٠١) ئایەتن و لای کەسانی تر زۆرتر یان کەمترە، ئەمڕۆ لەڕووی گوزارەوە دەخوێنرێتەوە نەك لەڕووی ماناوە، حاشا خودا–سبحانه وتعالى– شتێکی لەو جۆرە دابەزێنێت و پاشان کرۆکەکەی و دەریهێنێت و توێکڵەکە بهێنێتەوە بۆ ئەوەی ببێتە دەستوورێکی نەمر بۆ خێزانی مرۆڤایەتی.

[٣] "السيوطي" المرجع السابق ٢٥/٢ دەڵێت: "عروة"ەوە لە "عائشة"ەوە دەڵێت: سورەتی "الأحزاب" لەسەردەمی پێغەمبەردا دەخوێنرایەوە، دووسەد ئایەت بوو، کاتێك "عثمان" مەسحەفی نووسیوە تەنها ئەوەندەی مایەوە کە ئێستە هەیە، ئاشکرایە ژمارەی ئایەتەکان ئێستا(٧٣) ئایەتە.

"عبدالمتعال" گواستوویەتەوە لە کەمکردنی سورەتی "الأحزاب" بەرهەڵستی دەکات لەگەڵ ئەوەی لە "الإتقان"ی "السیوطي"دا هاتووە لەوەی ژمارەی ئایەتەکانی سورەتی "الأحزاب" دووسەد ئایەت بووە و تەنها (٧٣) ئایەتی لێ ماوەتەوە، تەماشای ئەو سەرچاوەم نەکردووە "عبدالمتعال" شانی لەسەر داداوە، بەڵام ریوایەتێکی تری گواستۆتەوە پوختەکەی دەڵێت: سورەتی "الأحزاب" وەك سورەتی "البقرة" وابووە (٢٨٦) ئایەت بووە.

**هۆیەکانی زیادەڕەوی لە وتنی نەسخ لە قورئاندا:**

زیادەڕەوی بێمانا لە وتنی نەسخ لە قورئاندا بەرهەڵستی دەکات لەگەڵ مەزنی خودای دروستکەری ئەم گەردوونەی کە ژیری گەردووونناسان تاکو ئێستا سەرسام کردووە و نازانن لە کوێوە دەست پێدەکات و لە کوێ کۆتایی پێ دێت، ئەو خودایە بەسەر هەموو شتەکاندا دەسترۆیشتووە و گەشە و گۆڕانە گەردوونییەکان و گۆڕانکارییەکانی بەرژەوەندی مرۆڤ لە هەموو کات و شوێنێکدا دەکەونە ژێر ویستی ئەو، و ویستی ئەو ناچێتە ژێر دەسەڵاتی ئەوانەوە تاکو ئەمڕۆ حوکمێك دەربکات و ناچاربێت سبەینێ بیسڕێتەوە وەك چۆن یاسادانەری یاسادانراوەکان بەو کارە ئاتاجە، چونکە نازانێ چی لە داهاتوودا روودەدات، ئەو یاسایەك دەردەکات گونجاو نابێت لەگەڵ پێشکەوتنی هاوچەرخدا، بۆیە ناچار دەبێت گۆڕانکاری تێدا بکات یان هەمواری بکاتەوە و بەیەکجاری بیسڕێتەوە و یاسایەکی نوێ بهێنێت گونجاو بێت لەگەڵ بەرژەوەندییەکی نوێدا، هۆیەکانی ئەم زیادەڕەوییە زۆرن، دەتوانین بیانگێڕینەوە بۆ ئەم چەند خاڵە:

١-تێکەڵی لە نێوان نەسخ بە مانا گشتییەکەی لەلای پێشینی چاکان، هەموو ئەوەی بەسەر رواڵەتی دەقدا دێت لەئامێز دەگرێت، لە تایبەتکردن یان سنووردارکردن یان سوککردن(روخسەت) یان درێژەپێدان یان قۆناغبەندی یان نەسخ بە مانای تایبەتەکەی و هاوشێوەکانی ئەمانە، لەگەڵ مانای نەسخ لای پاشین لە

ئـەهلی تەفسـیر و زانایـانی ئوسـولّ و لێکۆڵـەرانی هاوچـەرخ، ئـەوەش بریتییـە لـە سڕینەوەی وەحییەکی پێشوو بە وەحییەکی دواتر.

٢-تێکەڵی لە نێوان تایبەتکردنی دەقێکی گشتی بە تایبەتکەرێك لەگەڵ نەسخ بـە مانا تایبەتەکەی، لەگەڵ ئەوەی جیاوازی جەوهەری زۆر هەیە لە نێوانیاندا، وەك چۆن بەم نزیکانە ڕۆشنکردنەوە لەسەری دەدرێت.

٣-تێکەڵی لە نێوان سـنووردارکردنی دەقێکـی رەهـا و نەسـخکردنەوەی بـە مانـا تایبەتەکەی وەك چۆن دواتر ڕۆشنکردنەوەکەی دێت.

٤-تێکەڵی لە نێوان قۆناغبەندی(پلە بە پلە) حوکم و نەسخکردنەوەی، وەك چـۆن لە ئایەتەکانی حەرامکردنی ئارەقدا ڕۆشن دەکرێتەوە.

٥-تێکەڵی لە نێوان بەرهەڵستکاری و دژیـەکی، دانـانی دوو ئایـەتی بەرهەڵسـتکار بەیەکتری لە ڕوواڵەتدا بە دوو ئایەتی دژ بەیەکتر، لەوێوە هەڵگرتنی دژیەکییەکەیان بە دانانی پاشینەکەیان بە نەسخکەر بۆ پێشـینەکەیان، لەگـەڵ ئـەوەی بەرهەڵسـتکاری زۆرجار بـە کۆکردنـەوەی نێـوان دوو بەرهەڵسـتکارەکە یـان پارسـەنگدانی یـەکێکیان بەسەر ئەویتریاندا لە کارکردنـدا هەڵـدەگیرێت، بـەبێ پێویسـتبوون بـە وتـنی نەسـخ، نەسـخ بەرهەڵسـتی پـێ هەڵـدەگیرێت لـە بـاری ڕاسـتبوونەوەی دژیەکیـدا، هـەموو دژیەکییەك بەرهەڵستکارییە بەبێ پێچەوانەی هەمووەکی.

٦-تێکەڵی لە نێـوان شـرۆڤەکردنی پوختـە(تفسـیر المجمـل) و نەسـخدا بـە مانـا تایبەتەکـەی، وەك لـە ئایەتـەکانی ئـەحکامی ڕۆژوودا و ئایەتـەکانی ئـەحکامی تۆڵەسەندنەوەدا.

٧-تێکەڵی لە نێوان ڕوخسەت و نەسخدا، وەك لە هەندێ ئایەتی جەنگ و ئایـەتی تەهەجود لە شەودا و ئایەتی پێشکەشکردنی صەدەقە لە کاتی نەجوادا(چپەکردن).

٨-تێکـەڵی لـە نێـوان مەرجـەکانی نەسـخ لـە قورئانـدا و مەرجـەکانی نەسـخ بەشێوەیەکی ڕەها، بۆیە ئەوەی داواکراوە لە نەسخی قورئانـدا هەنـدێ جـار داواکـراو

نییە لە نەسخی سوننەدا یان نەسخی یاسادا یان هەڵوەشانەوەی ئیجماعی پێشوو بە ئیجماعی دوای ئەو کە لە زاراوەدا پێی ناوترێت نەسخ.

٩-تێکەڵی لە نێوان گونجاوی نەسخ لەڕووی ئەقڵەوە لەگەڵ ڕوودانی بە کردار، بۆیە ئەو بەڵگانەی سەرخەرانی نەسخ ئاماژەی پێدەکەن ئاماژەیە بە گونجانی نەسخ نەك ڕوودانی نەسخ وەك پێشتر ڕۆشنکردنەوەمان لەسەر دا.

١٠-تێکەڵی لە نێوان ئەوەی نەسخی تێدا گوزەر دەکات وەك فەرمانەکان و نەهیلێکردنەکان لەگەڵ ئەوەی نەسخی تێدا دروست نییە وەك هەواڵەکان و حوکمەکانی باوەڕ و بەڵێن و هەڕەشەکان.

١١-تێکەڵی لە نێوان نەسخکردنەوەی ئەحکامی شەریعەتەکانی پێشوو بە قورئان لەگەڵ نەسخکردنی قورئان بە قورئان وەك نەسخکردنەوەی پێویستبوونی ڕۆژووی عاشورا بە ڕۆژووی ڕەمەزان.

١٢-تێکەڵی لە نێوان "ئایەت" بە مانای دەقی قورئانی لەگەڵ "ئایەت" بە مانای دەقی ئینجیلی و تەوراتی و موعجیزە و نیشانە، وەك پێشتر ڕۆشنکردنەوەم دا لە بەلگەهێنانەوە لەسەر ڕوودانی نەسخ.

١٣-تێکەڵی لە نێوان نەسخی سوننەت بە قورئان و نەسخی قورئان بە قورئان، وەك لە گۆڕینی قیبلەدا لە "بیت المقدس"ەوە بۆ "بیت الله الحرام"

١٤-تێکەڵی لە نێوان نەسخی سوننەت بە سوننەت لەگەڵ نەسخی قورئان بە قورئان.

١٥-تێکەڵی لە نێوان قورئان کە بریتییە لە وشە و مانا لەگەڵ ئەو وشانەی دەبنە قاڵب بۆ ماناکان، وەك لەو ئایەتانەی لەڕووی خوێندنەوەوە نەك لەڕووی حوکمەوە لە قورئاندا ماونەتەوە بەپێی بانگەشەی ئەوان، بۆیە قورئان سیفەتی قورئانی بوون لەدەست دەدات گەر لە مانا و جەوهەر و کرۆکی ڕووت بکرێتەوە، چونکە جیاوازی لە نێوان قورئان و سوننەتدا: قورئان وشە و ماناکەی لەلای خوداوەیە-سبحانە وتعالی- گەر حوکمەکەی بسڕێتەوە پێی ناوترێت قورئان.

١٦-تێکەڵی لە نێوان ئەوەی لە تەوراتە و پێغەمبەر(ﷺ) کاری پێکردووە لەگەڵ ئەوەی قورئانە و بە شێوەی وەحی بۆ سەر سەروەرمان محمد(ﷺ) دابەزیوە، وەك لە (الشَّيْخ والشَّيْخَة إذَا زَنَيَا فَارْجموُهمُاَ البَتَّة)، ئەمە ئەوەبوو لە سەردەمی نەفامیدا پێش هاتنی ئیسلام پیادە دەکرا و لە تەوراتدا فەرمانی پێکرابوو، پێغەمبەریش(ﷺ) وەك شوێنکەوتنێك بۆ ئەوە کاری پێکرد.

١٧-تێکەڵی لە نێوان هەمووەکیەکان(الكليات)ی قورئان کە هەرگیز نەسخ قبووڵ ناکەن لەگەڵ بەشەکییەکان(الجزئيات)دا کە دەگەڕێنەوە بۆ ئەو هەمووەکیانە و قابیلی راستکردنەوە و گۆڕانن، بۆیە قورئان راستکردنەوە و گۆڕان قبووڵ ناکات لەرووی دەقەکان و رێسا گشتییەکانەوە، بەڵام هەندێ جار ئاڵوگۆڕ و راستکردنەوە لە پیادەکردنی رێسا گشتییەکەدا بەسەر بەشەکییەکانیدا قبووڵ دەکات، چونکە بۆ هەر بەشەکیەك تایبەتمەندی و رەوشی تایبەت و پاشخانی دیاریکراو هەیە و حوکم لەرووی پیادەکردنەوە پێیان کاریگەر دەبێت.

١٨-تێکەڵی لە نێوان مانەوەی نەسخکراو لەگەڵ لادانی لە مەسحەفی شەریفدا.

ئەمە گرنگترین ئەو هۆیانەی زیادەڕەوین لە وتنی نەسخ لە قورئاندا، هەوڵدەدەم ئەم خاڵە تێکەڵانە درێژە پێبدەم لە هەر ئایەتێکدا ئەوان بانگەشەی نەسخبوونەوەی دەکەن، هەریەکەیان بەپێی سروشتی حوکمەکەی لەگەڵ رەچاوکردنی ریزبەندی ئایەتە هاتووەکان لە قورئانی پیرۆزدا.

راستەقینە زانستییە جێکۆدەنگەکان کە لەگەڵ زیادەڕەوی نەسخ لە قورئاندا بەرهەڵستی دەکەن:

یەکەم-وتنی نەسخ لە زۆرێك لە ئایەتەکانی قورئاندا وا بانگەشە دەکەن نەسخکراوین بە تێگەیشتنی زانایانی ئوسولڵ لە پاشینەکان کە بریتییە لە سڕینەوەی وەحییەکی پێشوو بە وەحییەکی دوای ئەو بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ دانەپاڵی نەزانی بۆ لای خودا پێویست دەکات بەوەی لە داهاتوودا روودەدات و پاشان زانست

پێـی کـە پێـی دەوترێـت "البـداء-بۆدەرکـەوتن"، یـان دانـەپاڵی دەستەوسـانی لـە چارەسەری بابەتەکە بەوەی گونجاو بێت لەگەڵ بەرژەوەندی مرۆڤ لە داهاتوودا، یان بێمانایی لە دارشتنی حوکمێکدا و پاشان لە کەمترین ماوەدا سـڕینەوەی بدرێتـە پـاڵ ئـەو-سـبحانە وتعـالی- ئـەوەی پێویسـتە لـە هـەموو ئـەم بارانـەدا پووچـەڵە، بۆپێویستکراویش بۆ پووچەڵ پووچەڵە، رووی پێویستییەکە گەر راست بێت خـودا- بۆ نموونە- چوونە لای ئافرەت و خـواردن و خواردنـەوە و هـەموو رۆژووشـکێنەکانی تری حەرام کردبێت لەدوای خەوتن لە شەوەکانی رەمەزاندا بە ئایەتی: ﴿كُتِبَ عَلَيْكُمْ الصِّيَامُ كَمَا كُتِبَ عَلَى الَّذِينَ مِنْ قَبْلِكُمْ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ﴾[1]، پاشـان ئـەم ئایەتـە سڕابێتەوە-وەك بانگەشـەی بـۆ دەکـەن- بـە ئایـەتێکی تـر هـەموو ئەوانـەی موبـاح کردبێت لە شەوانی رەمەزاندا، وەك لە ئایەتی: ﴿أُحِلَّ لَكُمْ لَيْلَةَ الصِّيَامِ الرَّفَثُ إِلَى نِسَائِكُمْ﴾[2]، ئەوا یەکێك لەم سێ حاڵە پێویست دەبوو:

أ.یان نەزانی بەوەی لە داهاتوودا لـە رۆژووەوانـان روودەدات و وا دەکـات حوکمـە یەکەمە حەرامکراوەکە گۆڕانی بەسەردا بێت بە دووەمە موباحەکە.

ب-یان دەستەوسانی لە داڕشتنی حوکمی دووەم لە جێگەی یەکەم لەسەرەتاوە.

ج-یان بێمانایی لەسەر ئەو بنچینەی چۆنی حەز لێ بێت بەو جـۆرە هەڵسـوکەوت دەکات لە موڵکەکەیدا.

هەرسێ حاڵەتەکە پووچـەڵن بـە کـۆدەنگی ئـاقڵان، پێویسـتکراو بـۆ پووچـەڵیش پووچەڵە، ئـەوەی ئـەوان لەسـەر ئـەو ئایەتـە ئامـاژەبۆکراوە بـە نەسـخی دەزانـن لـە دەروازەی تێکەڵکردنە لە نێوان نەسخ و درێژەپێدانی پوختە.

دووەم-گەر ئەوە دروست بێت نەسـخ لـە قورئانـدا پەیوەنـدی بـە بەرژەوەندییـە مرۆییەکانـەوە بـووە و لـەو کاتانـەدا بەرژەوەندییـەکانی گـۆڕاون بۆیـە گـۆڕینی حوکمەکـەیان پێویسـت کـردووە بـە حـوکمێکی نـوێ تـاکو بگـونجێ لەگـەڵ

---

[1] سورة البقرة/١٨٣.

[2] سورة البقرة/١٨٧.

بەرژەوەندییەکی نوێدا، ئەوا پێویستی دەکرد ئەوەش ماوەتەوە لە ئایەتەکانی قورئان گۆڕانیان بەسەردا بهاتبایە لەدوای ئەوەی بەرژەوەندییە مرۆییەکان سەد بەرانبەری ئەوە گۆڕاوە گەر بەراورد بکرێت لەگەڵ ئەو گۆڕانانەی لە نیمچە دوورگەی عەرەبیدا و لە ژینگەیەکی سەرەتایی ئەو کاتە و لە ماوەی (٢٣)دا لە تەمەنی وەحی روویانداوە، ئاشکرایە پێویست پووچەڵە بە کۆدەنگی زانایانی کۆن و نوێ و قورئان دەستورێکی نەمرە و خێزانی مرۆیی بۆی گەردنکەچ دەبن هەتا ژیان لەسەر ئەم هەسارەی زەوییە بەردەوام بێت، پێویستکراویش بۆ پووچەڵ دیسان پووچەڵە بە کۆدەنگی ژیرمەندان.

سێیەم–زانایانی ئوسولی دین و ئوسولی فیقه لە ئەهلی سوننە کۆدەنگیان هەیە لەسەر ئەوەی وشەکانی قورئان کەلامێکی نەفسی دێرینن، هەر بەو جۆرە کۆدەنگیان هەیە لەسەر ئەوەی هەموو ئەوەی دێرینییەکەی جێگیربووە نەبوونی رێگەپێنەدراوە، کەلامی خودا وەك کەلامی مرۆڤ نییە قابیلی راستکردنەوە و ئالوگۆڕ و گۆڕان بێت بەپێی گۆڕانکارییەکانی ژیان، وتنی نەسخ وتنی گۆڕانی حوکمێکی خاوەن سروشت هەمیشەییە لە دووتوێی ماوەیەکی کاتی کەمدا.

نەسخ بە مانا ئوسولییەکەی بریتییە لە تیابردن دوای هەبوون، ئەمەش لە خەسڵەتەکانی "رووداو"ە، بەڵام ئەمە وا ناکات نەسخی شەریعەتەکانی پێشوو بە شەریعەتی ئیسلام نەگرێتەوە، چونکە هەر لە سەرەتاوە سنووردار بوون بە ماوەیەکی دیاریکراو بەهۆی حیکمەتێك کە لە نەسخی قورئان بە قورئان فەراهەم نابێت لە ماوەیەکی کورتدا و ژیری تەندروست رەدی دەکاتەوە.

چوارەم–ئەو بەڵگانەی سەرخەرانی نەسخ شانیان لەسەر داداوە بۆ سەلماندنی نەسخی قورئان بە قورئان هەموویان بەڵگەی گومانئامێزن، چونکە لەسەر ئیجتیهاد و پێشەکی و هەواڵی ئاحادی گومانئامێزی شوێنکەوتوو بۆ نزمترین پێشەکییەکانی بیناکراون، گەر یەکێکیان گومانئامێز بوو ئەوا بەڵگەکە گومانئامێز دەبێت، لەوێشەوە ئەو ئەنجامەی پێی جێگیر دەبێت گومانئامێزە، قورئان جێگیربوونەکەی براوەیە(یەقینییە) بۆیە لادانی(سڕینەوەی) تەنها بە بەڵگەیەکی براوە دەبێت و لە

هێزی پابەندکردن لە ئاستی ئەودا بێت، زانای پایەبەرز"ابن حزم"[1](رەحمەتی خودای لێ بێت) دەڵێت: ((حەڵاڵ نییە بۆ هیچ موسڵمانێك باوەڕی بە خودا و ڕۆژی دوایی هێنابێت بە شتێك لە قورئان و سوننەت بڵێت ئەوە نەسخکراوە مەگەر بە یەقینێك، چونکە خودا دەفەرموێت: ﴿اتَّبِعُوا مَا أُنْزِلَ إِلَيْكُمْ﴾[2] دروست نییە گوێڕایەڵی ئەمرێك وەلا بنێین کە خودا فەرمانی پێکردووین مەگەر بە بوونی یەقینێك))

"السيوطي"-رەحمەتی خودای لێ بێت- دەڵێت: ((لە نەسخدا شاندانادرێت لەسەر قسەی ئەهلی تەفسیر بەگشتی و ئیجتیهادی موجتەهیدەکان جگە لە نقلێکی دروست و بەرهەڵستییەکی ڕۆشن))

"أبو جعفر النحاس"-رەحمەتی خودای لێ بێت- دەڵێت: ((زەکاتی سەرفیترە فەرزکرا پاشان جیاوازی هەیە لەمەڕ نەسخکردنەوەی، هەر شتێك بە ئیجماع و فەرموودەی سەحیح جێگیر بووبێت تەنها بە ئیجماع دەتوانرێت بسڕێتەوە))[3]، واتە بە بەڵگەیەکی جێگیربوو بە ئیجماع.

پێنجەم-وتنی نەسخبوونەوەی حوکمی ئایەتێك لە قورئان لەگەڵ پارێزگاری لە وشەکانی ژێری تەندروست و مەنتق ڕەدی دەکاتەوە، چونکە قورئان بۆ ئاواز و دووبارەکردنەوە نەهاتووە بەبێ کارکردن بە ماناکەی و پابەندبوون بە داواکارییەکانی، خوێنەری قورئان لەسەر خوێندنەوەکەی پاداشت دەدرێتەوە گەر بە ماناکەی بەندایەتی بۆ خودا دەربڕێت، ئەگەر نە دەکەوێتە بەر ئەم ئایەتە: ﴿كَبُرَ مَقْتًا عِنْدَ اللَّهِ أَنْ تَقُولُوا مَا لاَ تَفْعَلُونَ﴾[4]، سەرباری ئەوەی بورهانێکی یەکلاکەرەوە نابینرێتەوە لە پێغەمبەری خوداوە یان لە خەلیفەکانی ڕاشیدینەوە یان هاوەڵان یاخود لە شوێنکەوتوانەوە لەسەر ئەم کارە شازە کە یاسادانەری یاسا دانراوەکان

---

[1] الإحكام في أصول الأحكام: ٨٣/٤ وما بعدها.

[2] سورة الأعراف/٣.

[3] الناسخ والمنسوخ ص٢٥٥.

[4] سورة الصف/٣.

ئەنجامی نادات چجای خاوەن شەرعێکی دانا ئەوەش سڕینەوەی حوکم و هێڵانەوەی ئەوەی ئامـاژەی پـێ دەکـات لەگـەڵ ئـەوەی ئاماژەکـەر و ئامـاژەبۆکراو لـە بـوون و نەبووندا هاوملی یەکترن.

ئەم دابەشکردنانە لە ئیجتیهادەکـانی زانایـانی ئوصـوڵی فیقهـە و لەگـەڵ مـەزنی خـودای بـەتوانا و زانـا و دانـادا پێکنایەتـەوە، هـەر بـەو جـۆرە لەگـەڵ پایـەی ئـەو دەسـتوورەدا پێکنایەتـەوە کـە بـۆ ڕێکخسـتنی ژیـانی خێزانـی مرۆڤایـەتی و دەستەبەرکردنی بەختەوەری لە هەردوو خانەکەدا هاتووە.

ئەوانـە دەبنـە دابەشـکردنێکی هـاتوو و مـاقووڵ گـەر مەبەسـت بـە نەسـخ مانـا گشـتییەکە بێـت بـەوەی مەبەسـتی تایبـەتکردنی گشـتی و سنووردارکردنی ڕەهـا و هاوشێوەکانی ئەمانە بێت وەك باسمان کرد.

شەشەم-زانایانی ئوصوڵ و ئەهلی تەفسیر و فـەقیهان کۆدەنگیـان هەیـە لەسـەر ئەوەی نەسخ بە مانا تایبەتەکەی پەنای بۆ دەبرێت لەپێناو هەڵگرتنی بەرهەڵستکاری لە دژایـەتی تایبـەت دوای نەشیاوی کۆکردنـەوەی نێـوان دوو بەرهەڵسـتکارەکە یـان پارسەنگدانی یەکێکیان بەسەر ئەویتریاندا.

هەر بەو جۆرە کۆدەنگیان هەیە لەسەر ئەوەی هەر ئایەتێك لە ئایەتەکانی قورئـان و هەر سوننەتێك لە سوننەتەکانی پێغەمبەر(ﷺ) ڕێسایەکی گشتی داڕێژراو و هاوتایـە بە پاداشت و سزا قسە لەگەڵ خێزانی مرۆڤایەتیدا دەکـات و داوای کـارکردنی دەکـات بە داواکارییەکانی.

گشـتیش گشـتی کەسـەکان و بارودۆخـەکان و کـات و شـوێن دەگرێتـەوە گـەر پێچەوانەی ئەمە نەسەلمابێت.

حەوتـەم-زانایـانی فـەرموودە و زانایـانی ئوسـوڵ و فـەقیهان و ئـەهلی تەفسـیر کۆدەنگیـان هەیـە لەسـەر ئـەوەی ڕێـژەی فـەرموودەی متـەواتیر لـە فـەرموودەکانی پێغەمبەر(ﷺ) زۆر کەمە بـەجۆرێك دەگاتـە ئاسـتی نـەبوو فەرموودەیـەکی متـەواتیر

لەڕووی گوزارەوە ببینینەوە بە دژایەتییەکی راشکاوانە لەگەڵ ئایەتێکی قورئانیدا دژایەتی بکات تاکو بوترێت ئەم سوننەتە نەسخکەری قورئانە.

بینا لەسەر ئەم راستییەی کۆدەنگی لەسەرە سوودی ئەو جیاوازییە ئوسوڵییە نەزۆکانە چییە کە مەیدانێکی بەرین لە کتێبەکانی ئوسوڵی فیقهی داگیر کردووە دەربارەی گونجاوی نەسخی قورئان بە سوننەتی موتەواتیر، تاکەی بیری خۆمان و قوتابییەکانمان بە وەهم و ئەندێشەوە خەریك بکەین، و جیهانی دەرەوەی ئیسلامیش لەڕووی زانستی و ژیارییەوە لە هەموو بوارەکانی ژیاندا لە پێشکەوتندان؟!

هەشتەم—زانایانی موسڵمان کۆدەنگیان هەیە لەسەر ئەوەی دژیەکی لە نێوان دوو بەڵگەدا راستدەبێتەوە با ئامازەکەشی لە خودی خۆیدا یان لە رێگەی ئیجماعەوە لەسەر ئەو حوکمەی تیایدا هاتووە براوە(یەقینی) بێت، هەر ئایەتێك لە ئایەتە قورئانییەکان جێگیربوونیان بڕەوەیە با ئامازەکەشی بۆ سەر حوکمەکە گومانئامێز بێت، هەر بەو جۆرە کۆدەنگیان هەیە لەسەر ئەوەی سوننەتی موتەواتیر و ناموتەواتیری پێغەمبەر(ﷺ) لە بەڵگە و بورهاندا(الحجـة) لە دوای قورئانەوە دێت و شوێنی دووەم لە شەریعەتی ئیسلامدا داگیر دەکات لە دوای قورئان، دوای ئەمە و ئەوە چۆن دژیەکی لە نێوان قورئان و سوننەتی ئاحاددا وێنا دەکرێت لە کاتێکدا ئەو دوانە هاوتا نین بەیەکتر، با تەنها لەڕووی گفتوگۆشەوە خۆمان رادەستی بوونی دژیەکی بکەین چۆن فەرموودە دەبێتە نەسخکەری قورئان لەگەڵ بوونی کۆدەنگی لەسەر ئەوەی نەسخکەر پێویستە بەهێزتر بێت لە نەسخکراوەکە یان یەکسان بێت پێی لە هێزی پابەندکردندا؟

بۆیە وەسێتدەکەم بە پشتگوێخستنی هەموو ئەوەی لە کتێبی ئوسوڵ فیقهدا نوسراوە دەربارەی بابەتێکی نەزۆکی بێسوود کە تاکو ئێستا لە جیهانی خەیاڵدا دەژی و نەهاتۆتە ناو بوونەوە و تاکو ئێستا نووری نەبینیوە لەدوای تێپەڕبوونی زیاتر لە هەزار و چوارسەد ساڵ لە تەمەنی شەریعەتی ئیسلامی ئەوەش بریتییە لە نەسخی قورئان بە سوننەتی پێغەمبەر(ﷺ)

نۆیەم-قورئانی پیرۆز دەستورێکی خودایيە، کاری دەستووریش بریتییە لە پلاندانان و نەخشەکێشانە بۆ ژیان و کورتبوونەوە لەسەر بنەما گشتییەکان و ڕێسا هەمووەکییە جێگیرەکان کاریگەرنەبوو بە پێشکەوتنەکانی ژیان و سەرپشککردنی ژیری مرۆیی بۆ گێڕانەوەی بەشەکییەکان بۆ ئەو هەمووەکییەنە لەبەر ڕۆشنایی داواکارییەکانی ژیان و پێویستییەکان و بابەتە نوێیەکانیدا، کاریگەربوو بە گۆڕانی بەرژەوەندییەکان و ئاڵوگۆڕە گەردوونییەکان بریتییە لە بەشەکییەکان نەك هەمووەکییەکان.

گەر بگەڕێینەوە بۆ لای قورئانی پیرۆز دەبینین ئایەتەکانی ئەحکام تیایدا لەسەر هەمووەکییەکان کورتبوونەتەوە، ئەو هەمووەکییانەی کاریگەر نابن بە پێشکەوتن و دواکەوتنی ژیانی مرۆیی، ئەو هەمووەکیانە قابیلی راستکردنەوە و ئاڵوگۆڕ نین هەتا ژیان بوونی هەبێت لەسەر ئەم هەسارەی زەوییە، و هەتا مرۆڤ پارێزگاری لە مرۆڤبوون و جیاکاری خۆی بکات لە تەواوی گیاندارە زیندووەکانی تر.

بۆ ڕۆشنکردنەوەی ئەم حەقیقەتە هەندێ نموونە لەو هەمووەکیانە دەخەمە روو کە قابیلی گۆڕان نین هەرچەند بەرژەوەندییەکانی مرۆڤ گۆڕانیان بەسەردا بێت، بەڵکو تەنها بەشەکییەکانی گۆڕانیان بەسەردا دێت:

أ-لە مامەڵە داراییەکاندا: قورئان جەختی لەسەر ئەم پایانە کردۆتەوە:

١-پێویستی فەراهەمبوونی توخمی رازیبوون لە هەموو بریتیدانەکاندا، خودا دەفەرموێت: ﴿يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لاَ تَأْكُلُوا أَمْوَالَكُمْ بَيْنَكُمْ بِالْبَاطِلِ إِلاَّ أَنْ تَكُونَ تِجَارَةً عَنْ تَرَاضٍ مِنْكُمْ﴾[1].

هەروەها زەرورەتی دەستەبەربوونی توخمی دڵاوایی(گيبە النفس) لە هەموو بەخشینە داراییەکاندا، خودا دەفەرموێت: ﴿وَآتُوا النِّسَاءَ صَدُقَاتِهِنَّ نِحْلَةً فَإِنْ طِبْنَ لَكُمْ عَنْ شَيْءٍ مِنْهُ نَفْسًا فَكُلُوهُ هَنِيئًا مَرِيئًا﴾[2].

---

[1] سورة النساء/٢٩.

[2] سورة النساء/٤.

٢–زەرورەتـی فەراهـەمبوونی هاوسـەنگی لـە نێـوان دوو بـریتی لـە بریتیدانـە داراییەکان، هـەموو هەڵەیەك لـەم هاوسـەنگبوونەدا حـەرامکراوە و بـە سـوو تەماشـا دەکرێت گەر قازانجی بۆ یەکێك لە دوو گرێبەستکارەکە تێدا بـوو لەسـەر زیانتۆمەنـدی گیرفانی کەسەکەی تر، دەفەرموێت: ﴿وَأَحَلَّ اللَّهُ الْبَيْعَ وَحَرَّمَ الرِّبَا﴾[1]، واتە هەموو بریتییەك هاوسەنگی تێدا دەستەبەر بێت لـە نێـوان دوو بریتییەکـەدا حەڵاڵـە و هـەر گرێبەستێك ناهاوسەنگی تێدا سەرهەڵدەدات حەرامە.

٣–لەسەر هەر گرێبەستکارێك پێویستە وەفا بکات بـەو پابەندبوونانـەی لەسـەر بەسـتنی گرێبەسـتەکە سـەرهەڵدەدات، دەفـەرموێت: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا أَوْفُوا بِالْعُقُودِ﴾[2]، واتـە وەفـا بکـەن بـەو پابەندبوونانـەی لەسـەر گرێبەسـتەکانتان سـەرهەڵدەدەن، گـەر سـەرنجی رەهـایی و گشـتگیری ئـەم ئایەتـە بـدەین هـەموو پابەندبوونـەکان لـە گرێبەسـتە نادارایـیـەکانیش وەك گرێبەسـتی هاوسـەرگیری دەگرێتەوە.

٤–لە متمانەگری گرێبەستە داراییەکاندا بە تۆمارکردنیان یان بـە بارمتـە یـان بـە کەفیل(دەستیار) وەك پارێزگاری لە بەرژەوەندییەکانی دوو گرێبەستکارەکە فـەرمانی کردووە بە شێوەگری(الشكلية) لەو گرێبەستانەدا ئەگەری دوژمنایەتی و نـاکۆکی بـۆ هەیـە، دەفـەرموێت:﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا تَدَايَنتُم بِدَيْنٍ إِلَى أَجَلٍ مُسَمًّى فَاكْتُبُوهُ وَلْيَكْتُب بَّيْنَكُمْ كَاتِبٌ بِالْعَدْلِ﴾ هـەروەها دەفـەرموێت: ﴿وَأَشْهِدُوا إِذَا تَبَايَعْتُمْ﴾ هەروەها لە متمانەگری قـەرز بـە بارمتـە دەفـەرموێت: ﴿وَإِن كُنتُمْ عَلَى سَفَرٍ وَلَمْ تَجِدُوا كَاتِبًا فَرِهَانٌ مَقْبُوضَةٌ﴾[3]، شایانی باسە ئـەم مەرجـە تێگەیشـتنی پێچەوانەی بۆ نییە، بۆیە وەرگرتنی بارمتە لە سەفەر و لە نیشتەجێبووندا دروستە.

---

[1] سورة البقرة/٢٧٥.

[2] سورة المائدة/١

[3] سورة البقرة/٢٨٢، ٢٨٣.

٥–فەرمانی کردووە بە هەموو ئەوانەی پابەندبوونیان لەسەرە بەرانبەر بە کەسانی تر لەڕووی داراییەوە بێت یان پابەندبوونی تر، وەفا بکات پێی و هەستێت بەو ئەمانەتەی لە ئەستۆیدایە، با خاوەنەکەشی داوای نەکات یان قەواڵەیەکی نەبێت بۆ سەلماندنی، دەفەرموێت: ﴿إِنَّ اللَّهَ يَأْمُرُكُمْ أَنْ تُؤَدُّوا الأَمَانَاتِ إِلَى أَهْلِهَا﴾[1].

ئەم پێنج توخم و پێنج حوکمە کاریگەر نابن بە شتە نوێیەکان و گۆڕانکارییەکان لە ژیاندا، بۆیە قورئانی پیرۆز ڕۆشنی کردوونەتەوە و ژیری مرۆڤی سەرپشك کردووە بە داهێنانی گرێبەست و پابەندبوونەکان و حوکمەکانی لەبەر ڕۆشنایی داواکارییەکانی ژیان لە هەموو کات و شوێنێکدا بە مەرجێك بەرهەڵستی نەکات لەگەڵ دەستوری خوایی، ئەوەی باوە لە نێوان ئەهلی تەفسیر و زانایانی ئوسوڵدا ئەو فەرمانانە بە تۆمارکردن و شایەتەکان و بارمتە بەم ئایەتە نەسخکراونەتەوە: ﴿فَإِنْ أَمِنَ بَعْضُكُمْ بَعْضًا فَلْيُؤَدِّ الَّذِي اؤْتُمِنَ أَمَانَتَهُ﴾[2] هەڵەیەکی زەبەلاحە و جێگەی لێخۆشبوون نییە وەك چۆن لە جێگەی خۆی ڕۆشنی دەکەینەوە.

ب–لە پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکانی نێوان گەلان و نەتەوە جیاجیاکاندا: قورئان پێداگری کردووە لەم پایە بنچینەییانە بۆ ئەو پەیوەندیانە، ئەوەش کاریگەر دەبێت بە گۆڕانی شتە نوێیەکانەوە لە ژیانی گەلاندا و بۆ ژیری مرۆڤی بەجێهێڵاوە، بەم جۆرە:

١–خودا–سبحانه وتعالى– ئەوەی ڕۆشن کردۆتەوە بنچینەی پەیوەندییە مرۆییەکان دوو شتە:

یەکەمیان یەکێتی ڕەچەڵەك، دەفەرموێت: ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَاكُمْ مِنْ ذَكَرٍ وَأُنْثَى وَجَعَلْنَاكُمْ شُعُوبًا وَقَبَائِلَ لِتَعَارَفُوا إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِنْدَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ﴾[3].

دووەم یەکێتی کانزا کە مرۆڤی لێ دروستکراوە، دەفەرموێت: ﴿وَمِنْ آيَاتِهِ أَنْ خَلَقَكُمْ مِنْ تُرَابٍ ثُمَّ إِذَا أَنْتُمْ بَشَرٌ تَنْتَشِرُونَ﴾[1].

---

[1] سورة النساء/٥٨.

[2] سورة البقرة/٢٨٣.

[3] سورة الحجرات/١٣

پێغەمبەر(ﷺ) ئەم دوو بنچینەیەی لە حەجی ماڵئاواییدا دووپات کردەوە و فەرمووی: ((هەمووتان لە ئادەمن و ئادەمیش لە خاکە)) هەندێ لە خەڵکی لە زێڕ دروست نەکراوە و هەندێکی تری لە ئاسن یان تەنەکە، تا ئەوەی یەکەمیان جیاکارییەکی هەبێت لەوەی دووەم خۆی پێ جیابکاتەوە، بۆیە خەڵکی لە مافەکان و ئەرکەکاندا –وەك دانەی شانە– یەکسانن.

٢–بنەڕەت لە پەیوەندییە مرۆییەکاندا لە نێوان گەلان و نەتەوە جیاجیاکاندا بریتییە لە ئاشتی و جەنگ هەڵواردەیە لە باری بەرگری شەرعیدا، زەرەرەتەکانیش بە ئەندازەی خۆیان دەستیان بۆ دەبرێت، خودا–سبحانە وتعالی– دەفەرموێت: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا ادْخُلُوا فِي السِّلْمِ كَافَّةً وَلاَ تَتَّبِعُوا خُطُوَاتِ الشَّيْطَانِ إِنَّهُ لَكُمْ عَدُوٌّ مُبِينٌ﴾[2]، پەنابردنی بۆ بەکارهێنانی هێز بەبێ باری بەرگری شەرعی بە شوێنکەوتنی هەنگاوەکان و ڕێنموونییەکانی شەیتان داناوە کە لە خراپترین دوژمنەکانی مرۆڤە.

٣–فەرمانی کردووە بە وەفاداربوون بەرانبەر ئەو بەڵێن و پەیماننامە و ڕێکەوتنە دووقۆڵی و بەکۆمەڵانەی دەوڵەتان دەیبەستن و دەفەرموێت: ﴿وَأَوْفُوا بِالْعَهْدِ إِنَّ الْعَهْدَ كَانَ مَسْئُولاً﴾[3].

٤–چارەنووسی دیلی دیاریکردووە بە بەردانی یان وەك منەت لەسەرکردن یان فیدیە بە بەرانبەرێکی دارایی یان نادارایی وەك ئاڵوگۆڕی دیل، بۆیە کوشتن و بەکۆیلەکردن و ناچارکردنی لەسەر ئیسلام دروست نییە، چونکە ئەوەی هاتووە لە ئایەتەکەدا چوارچێوەدارە بە بەردانی دیل و ئیجتیهاد بە بوونی دەقێکی ڕاشکاو وەرناگیرێت، خودا–سبحانە وتعالی– دەفەرموێت: ﴿فَإِذا لَقِيتُمْ الَّذِينَ كَفَرُوا فَضَرْبَ

---

[1] سورة الروم/٢٠.
[2] سورة البقرة/٢٠٨.
[3] سورة الإسراء/٣٤٠.

الرِّقَابِ حَتَّى إِذَا أَثْخَنتُمُوهُمْ فَشُدُّوا الْوَثَاقَ فَإِمَّا مَنًّا بَعْدُ وَإِمَّا فِدَاءً حَتَّى تَضَعَ الْحَرْبُ أَوْزَارَهَا.. الآية﴾[1].

٥–سامانه كانزايي و سروشتييەكانى ناو زەوى لە نێوان خێزانى مرۆڤايەتيدا هاوبەشن، زيادە لە هەر گەلێكى دەسەڵاتدار پێويستە بۆ گەلانى ترى هەژار خەرج بكرێت، دروست نييە خەرج بكرێت لەپێناو دروستكردن و كڕينى هۆكارەكانى وێرانكارى و جەنگى نێوان گەلان و نەتەوە جياجياكان، ئەمەش ئەوەيە قورئان لە زۆرێك لە ئايەتەكانيدا پێداگرى لێ دەكات، خودا–سبحانه وتعالى– دەفەرموێت: ﴿هُوَ الَّذِي خَلَقَ لَكُمْ مَا فِي الأَرْضِ جَمِيعًا﴾[2].

٦–ماف بەرگرى شەرعى موباح كردووە لە بارى دەستدرێژى بۆ سەر ئايين و ژيان و ماڵ و ناموس، بە مەرجێك بەرگرييەكە بە ئەندازەى بەرپەرچدانەوەى دوژمنكارييەكە بێت، ئەگينا بەرگريكار وەردەگرێت بۆ دەستدرێژكار، دەفەرموێت: ﴿فَمَنْ اعْتَدَى عَلَيْكُمْ فَاعْتَدُوا عَلَيْهِ بِمِثْلِ مَا اعْتَدَى عَلَيْكُمْ وَاتَّقُوا اللَّهَ وَاعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ مَعَ الْمُتَّقِينَ﴾[3]

ئەمە بريتييە لە گرنگترين رێسا هەمووەكييەكانى پەيوەندييە نێودەوڵەتييەكان، ئەو بەشەكييەكانەش كاريگەر دەبن بە كاريگەرى كات و شوێن و پێشكەوتنى ژيان بۆ ژيرى مرۆڤ بەجێهێڵراوە بەمەرجێك ئەو ژيرييە پابەند بێت بە سنوورەكانى قورئانەوە لە بازنەى ئەخلاقدا: ﴿تِلْكَ حُدُودُ اللَّهِ فَلاَ تَعْتَدُوهَا وَمَنْ يَتَعَدَّ حُدُودَ اللَّهِ فَأُوْلَئِكَ هُمْ الظَّالِمُونَ﴾[4]

ج–لە پەيوەنديية ناوەكييەكانى نێوان دەسەڵات و هاوڵاتيدا: قورئان پێداگرى لەسەر كۆمەڵێك بنەماى گشتى رێساى هەمووەكى كردۆتەوە كە كاريگەر نابن بە

---

[1] سورة محمد/٤.
[2] سورة البقرة/٢٩.
[3] سورة البقرة/١٩٤.
[4] سورة البقرة/٢٢٩.

کاریگەری کات و شوێن و پێشکەوتنی ژیان و بەشەکییەکانی بۆ ژیری مرۆڤ بەجێهێڵاوە بەم جۆرە:

١-فەرمانی کردووە بە سەرۆکی وڵات بڕیاری پەیوەست بە کۆمەڵگە بە ویستی یەکلایەنی خۆی دروست نەکات، بەڵکو پێویستە لەسەری راوێژ بە شارەزایان و پسپۆڕان بکات هەر یەکەیان لە زەمینەی پسپۆڕی خۆیدا، خودا فەرمان بە پێغەمبەرەکەی(ﷺ) دەکات و لەوەوە فەرمان بە هەموو سەرۆکی دەوڵەتێك یان سەرۆکی دامەزراوەیەك یان سەرۆکی خێزانێك دەکات: ﴿وَشَاوِرْهُمْ فِي الأَمْرِ﴾[1] هەروەها دەفەرموێت: ﴿وَأَمْرُهُمْ شُورَى بَيْنَهُمْ﴾[2]، بۆیە هیچ سەرۆکێك ماف ئەوەی نییە بڕیار بە ویستی یەکلایەنەی خۆی دەربکات لەوەی پەیوەستە بە کاروباری ئەوانەی دەکەونە ژێر دەسەڵاتی ئەوەوە.

٢-فەرمانی بە داد و دادپەروەری کردووە، ئەوەش بریتییە لە پێدانی ماف بە هەموو خاوەن مافێك، لە زۆرێك لە ئایەتەکاندا هاتووە، لەوانە: ﴿إِنَّ اللَّهَ يَأْمُرُ بِالْعَدْلِ وَالإِحْسَانِ﴾[3]

٣-فەرمانی کردووە بە یەکسانی کە بریتییە لە هاوتابوونی مافەکان و ئەرکەکان، دەفەرموێت: ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَاكُمْ مِنْ ذَكَرٍ وَأُنثَى وَجَعَلْنَاكُمْ شُعُوبًا وَقَبَائِلَ لِتَعَارَفُوا إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِنْدَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ﴾[4]

٤-فەرمانی بە ڕێزگرتن لە نیزام و گوێڕایەڵی دەسەڵاتدار(ولی الامر) کردووە کە نوێنەرایەتی سیستەمەکە دەکات و دەفەرموێت: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا أَطِيعُوا اللَّهَ وَأَطِيعُوا الرَّسُولَ وَأُوْلِي الأَمْرِ مِنْكُمْ﴾[5].

---

[1] سورة آل عمران/١٥٩.
[2] سورة الشورى/٣٨.
[3] سورة النحل/٩٠.
[4] سورة الحجرات/١٣.
[5] سورة النساء/٥٩.

٥-بەم برە لە ڕۆشنکردنەوە دەوەستم کە دڵۆپێکە لـە دەریایـەك لەسـەر ئـەوەی قورئان نەسخی قبووڵ نەکردووە و قبووڵی ناکات.

## جیاوازییە جەوهەرییەکان لە نێوان نەسخ و تایبەتکردندا

هەر کەس بە قووڵی شوێنپێی ئەو ئایەتانە هەڵبگرێت پاشینەکان لە زانای ئوسولْ فیقە و ئەهلی تەفسیر و لێکۆڵەران بە نەسـخکراویان دادەنـێن دەبینێـت ئـەو ئایەتانـە گشتین و بەو ئایەتانەی پێیان وایە نەسخکەرن تایبەتکراون، ئەوان گەر مەبەستیان بە نەسخ مانا گشتییەکە بێت ئـەوا بەرهەڵسـتی بـۆ قسـە و بۆچـوونەکەیان نییـە و دوو پاداشتیان بۆ هەیە لەسەر ئیجتیهاد و پێکان لـە ئیجتیهادەکەیانـدا، گـەر مەبەسـتیان پێی مانای تایبەت بێت ئەوەش بریتییە لە سڕینەوەی پێشوو بەوەی بەدوایدا هاتووە لەم بارەدا ئەوان نـەیانپێکاوە و تـەنها یـەك پاداشـتیان لەسـەر ئیجتیهادەکـە و نیێـت پاکیان بۆ دەنوسرێت.

سەرچاوەی هەڵە لەم بابەتەدا دوو شتە:

یەکەمیان: تێکەڵی لە نێوان دوو چەمکی نەسخی گشتی و نەسخی تایبەتدا، ئەوان بانگەشەی نەسخ دەکەن بە مانا تایبەتەکـەی و بەڵگـە دەهێننـەوە بـەوەی پێشـینی چاکان وتویانە لەسەر نەسخ بـە مانـا گشـتییەکەی، ئەمـەش لـەڕووی مەنتقـەوە ڕەد دەکرێتەوە، چونکە جێگیرکردنی(سەلماندنی) داوایەکی تایبەت بە بەڵگەیەکی گشـتی دروست نییە.

دووەمیان: تێکەڵی لە نێوان نەسخ و تایبەتکردندا، چونکە ٩٠٪ی ئـەوەی وتویانـە نەسخکراوە بە مانا تایبەتەکە هاتووە و لە دەروازەی تایبەتکردنە، بۆیە بـە پێویسـتم بینی گرنگترین جیاوازی جەوهـەری نێـوان نەسـخ بـە مانـا ئوسـوڵییە نوێیەکـەی لای پاشین لەگەڵ تایبەتکردن ڕۆشن بکەمەوە، ڕجاوایـە پابەنـد بـبن بـەلای دروسـتەوە و

خۆیان رزگار بکەن لە خراپی ئەدەب لەگەڵ قورئان، ئەم جیاوازیانە دەتوانرێت بگێڕرێتەوە بۆ بیست و پێنج روو[1]:

١–لەرووی چییەتییەوە: بۆ هەر یەکێك لەو دوانە چییەتییەکی سەربەخۆ هەیە جیاوازە لە چییەتی ئەویتریان، نەسخ بریتییە لە سڕینەوەی وەحییەکی پێشوو بە وەحییەکی دوای ئەو، لەکاتێکدا تایبەتکردن رۆشنکردنەوەی دەرچوونی هەندێ لە تاکەکانی گشتیە لەوەی حوکمی گشتییەکە بیانگرێتەوە بە بەڵگەیەکی پەیوەست یان جیابووەوە.

٢–لەرووی سروشتەوە: نەسخ بریتییە لەوەی بەویستگیراوە لە دەقە نەسخکراوەکەدا، بەڵام تایبەت کردن بریتییە لە رۆشنکردنەوەی ئەوەی بە مەبەست نەگیراوە لە دەقە گشتییەکەدا، بۆیە نەسخکراو کارکردن پێی داواکراوە پێش سڕینەوە بە پێچەوانەی تایبەتکردنەوە.

٣–بەڵگەی تایبەتکەر بۆ دەقی گشتی: وەك دەکرێت دەق بێت دەکرێت شتی تریش بێت جگە لە دەق وەك ئیجماع و عورف و پێوانە و بەرژەوەندی و ئەقڵ بە پێچەوانەی نەسخ کە تەنها بە دەق دەبێت.

٤–نەسخ لە هەواڵەکاندا گوزەر ناکات چونکە بەدرۆزانینی بێژەرەکەی لێ دەکەوێتەوە بە پێچەوانەی تایبەتکردنەوە کە بەدرۆزانین پێویست ناکات، چونکە تایبەتکراو هەر لەسەرەتاوە بەمەبەست نەگیراوە.

---

[1] بۆ زانیاری زیاتر بگەڕێرەوە بۆ ئەم سەرچاوە ئوسوڵییانە: البحر المحیط للزرکشي: ٢٤٣/٣ وما بعدها" المعتمد في اصول الفقه لابي الحسین محمد بن علي البصري المعتزلي: ٢٥١/١" روضة الناظر وجنّة المناظر في اصول الفقه الحنبلي لابن قدامة ص٦٨" المحصول في علم الاصول للرازي ج ت٣ ص٩ وما بعدها، الإحكام في اصول الأحكام للآمدي: ٢٤٣/٢ وما بعدها. الابهاج شرح المنهاج للعلامة على عبدالكافي السبکي وولده عبد الوهاب ابن السبکي: ٦٢٥/٢" کشف الاسرار على اصول البزدوي لشیخ الاسلام عبد العزیز البخاري: ٨٩٥/٣ وما بعدها.



٥–نەسخ لە بەڵێن و هەڕەشەدا گوزەر ناکات، بە پێچەوانەی تایبەتکردنەوە، چونکە تایبەتکراو مەبەست نەبووە، بۆیە دواکەوتنی بەڵێن و هەڕەشە پێویست ناکات.

٦–بەڵگەی تایبەتکراو هەندێ جار پەیوەستە بە دەقێکی گشتییەوە، وەك هەڵواردن(الإستثناء) و سیفەت و مەرج و جێگرەوەی "هەندێك" لە "هەموویەك"، هەندێ جاریش جیابووەوە(سەربەخۆ) دەبێت لە دەقی نەسخکراو، بۆیە جمهوری زانایان کۆدەنگیان هەیە لەسەر ئەوەی گونجاو نییە نەسخکەر و نەسخکراو بە مانا ئوسوڵییەکەی کۆبکرێنەوە لە یەك دەقدا، پێچەوانەی ئەو کەسەی بانگەشە دەکات گوایە نەسخ هەندێ جار بە هەڵواردن و مەرج و سیفەت و ئامانج و جێگرەوەی "بەشێك" لە "هەموویەك" دەبێت.

٨–شەریعەتی پێشوو بە شەریعەتی دوای ئەو نەسخ دەکرێتەوە، وەك نەسخکردنەوەی شەریعەتە خواییەکانی پێشوو بە شەریعەتی ئیسلام، بەڵام دەقێکی گشتی لە شەریعەتێك بە دەقێکی تایبەت لە شەریعەتێکی تر تایبەت ناکرێت، چونکە تایبەتکردن ڕۆشنکردنەوەی ئەوەیە بە مەبەست نەگیراوە لە هەمان شەریعەتدا.

٩–تایبەت کردن تەنها لە دەقی گشتیدا گوزەر دەکات، بە پێچەوانەی نەسخەوە کە لە دەقی گشتی و دەقی تایبەتدا گوزەر دەکات.

١٠–تایبەت کردن دەگونجێ بە نزمترین بەڵگە بێت لەڕووی هێزی پابەندکەرەوە، وەك تایبەت کردنی گشتی دەقەکانی قورئان بە فەرموودەی ئاحاد و ئیجماع و عورف و پێوانە و بەرژەوەندی و ژیری بە پێچەوانەی نەسخەوە کە تەنها بە بەڵگەیەك دەبێت بەهێزتر بێت لە نەسخکراوەکە، وەك نەسخی سوننەت بە قورئان یان پێی یەکسان بێت وەك نەسخی قورئان بە قورئان و سوننەت بە سوننەت.

١١–لای جمهوری زانایان نەسخ تەنها لەو بارەدایە کار بە نەسخکراو بکرێت، بە پێچەوانەی تایبەتکردنەوە دەکرێت لەدوای کارکردن بێت پێی وەك لە باری تایبەتکردن بە بەڵگەیەکی سەربەخۆ بینرابێتەوە لەدوای کارکردن بە گشتییەکە،

هەندێ جاریش دەکرێت پێش کارکردن بێت پێی وەك لەباری تایبەتکردن بە بەڵگەیەکی پەیوەست بە دەقێکی گشتی وەك هەڵواردن و سیفەت و هاوشێوەکانیان.

١٢-بەزۆری بۆ نەسخ بەدیل(جێگرەوە) هەیە بە پێچەوانەی تایبەتکردنەوە، چونکە حوکمی تایبەت بەوەی لە دەقی گشتی دەردەچێت لە دەقی یەکەمدا بەمەبەست نەگیراوە تاکو بۆ لابردنی بەدەلێك هەبێت.

١٤-تایبەتکردن وەك چۆن بە گوفتارە وەك قورئان و سوننەتی گوفتاری، بە هەمان شێوە بە کرداریش دەبێت وەك سوننەتی کرداری پێغەمبەر(ﷺ) وەك کردارە تایبەتکەرەکانی بۆ دەقە گشتییەکان و ڕۆشنکەرەوە بۆ دەقە پوختەکان، بە پێچەوانەی نەسخەوە کە تەنها بە گوفتار دەبێت وەك نەسخکردنەوەی دەق بە دەق.

١٥-تایبەتکردن کەمکردنەوەیە و نەسخ بەدلکردنە.

١٦-نەسخ لە حوکمەکانی باوەڕدا نە لە شەریعەتی ئیسلام و نە لە شەریعەتەکانی پێشوودا ڕوونادات، چونکە باوەڕ بە گۆڕانی گەلان و کات و شوێن گۆڕانی بەسەردا نایەت، بە پێچەوانەی تایبەتکردنەوە، چونکە ڕۆشنکردنەوەی ئەو شتەیە لەسەرەتاوە ناچێتە ناو بیروباوەڕەوە.

١٧-دەقی گشتی دەتوانرێت بەتەواوی نەسخ بکرێتەوە، بەجۆرێك شتێکی لێ نەمێنێتەوە، بە پێچەوانەی تایبەتکردنەوە کە گونجاو نییە بەسەر هەموو تاکەکانی ژێر دەقە گشتییەکەدا گوزەر بکات، بەڵکو لە نزمترین ئاستدا دەوەستێت کە دوو یان سێیە لەسەر جیاوازی هەبوو لە کەمترین کۆکردنەوەدا.

١٨-حوکمە بنەڕەتییە داواکراوەکانی خودا بۆ خێزانی مرۆڤایەتی کە بە جیاوازی کات و شوێن گۆڕانیان بەسەردا نایەت، وەك حەرامبوونی ستەم و درۆ و کوشتن بە ناحەق و دزی و پڕدان و هاوشێوەکانی ئەمانە، لە هەموو شەریعەتە خواییەکاندا نەسخ قبووڵ ناکەن، بەڵام تایبەت کردن قبووڵ دەکەن، چونکە ڕۆشنکردنەوەی ئەوەیە یەکەمجار بەمەرام نەگیراوە.

١٩-بوونی دژیەکی لە نێوان دەقی گشتی و دەقی تایبەتدا بەمەرج ناگیرێت، بەڵکو تەنها بوونی بەرهەڵستی رووالەتی لە نێوان دوو دەقەکەدا بەسە بۆ ئەو کارە، چونکە تایبەتکردن پارسەنگدانی دەقێکی تایبەتە بەسەر کارکردن بە دەقێکی گشتی بۆ هەلگرتنی بەرهەڵستکاری، بە پێچەوانەی نەسخەوە کە تەنها لە نێوان دوو دەقی دژ بەیەکتردا روودەدات، دوو دەق نە دەتوانرێت لەگەڵ یەکتر کۆبکرێنەوە نە دەتوانرێت یەکێکیان پارسەنگ بدرێت بەسەر ئەویتریاندا، چونکە دوو دژ بەیەک نە کۆدەبنەوە و نە هەڵدەگیرێن.

٢٠-تایبەتکردن هەمیشە ئاماژەییە و لەسەر راستبوونەوەی بەرهەڵستکاری رووالەتی نێوان گشتی و تایبەت بیناکراوە و هەلگرتنی بەرهەڵستی بە تایبەتکردنی دووەم دەبێت بۆ یەکەم، بە پێچەوانەی نەسخەوە بۆی هەیە ئاماژەیی بێت لە دژایەتی نێوان دوو دەقەکە(یان دوو حوکمەکە)ەوە وەربگیرێت کە ناتوانرێت کۆبکرێنەوە یان پارسەنگی یەکێکیان بدرێت بەسەر ئەویتریاندا.

٢١-تایبەتکردن نایەت بەسەر فەرماندا بە یەك فەرمانپێکراو و نەهی لە یەك کەس بۆ دوورکەوتنەوە لە نەهیلێکراو، وەك ئەو حوکمانەی تایبەتن بە پێغەمبەر، بە پێچەوانەی نەسخەوە کە وێنای ئەوەی تێدا دەکرێت.

٢٢-جێگیرکردنی نەسخی قورئان بە قورئان تەنها لە رێگەی تەواتورەوە دەبێت، چونکە هەموو ئایەتەکانی قورئان بە تەواتور جێگیرکراون، ئەوەش بە تەواتور جێگیر کرابێت تەنها بە تەواتور دەسرێتەوە، چونکە یەقین بە یەقین هەڵدەگیرێت، بە پێچەوانەی تایبەتکردنەوە.

٢٣-زانایان جیاوازیان لە نێواندا هەیە لەسەر گونجاوی کارکردن بە دەقێکی گشتی پێش گەڕان لە تایبەتکەرێك بۆی، چونکە هەموو گشتییەك قابیلی تایبەتکردنە گەر بەڵگەیەك پێچەوانەی ئەوە راستنەبوویەوە، بە پێچەوانەی نەسخەوە پێویستە کار بە نەسخکراو بکرێت تا نەسخکردنەکەی دەسەلمێت.

٢٤–تایبەتکردن یەکسەرە بەبێ دواکەوتن چونکە ڕۆشنکردنەوەیە، بە پێچەوانەی نەسخەوە کە هێوری و پەلەنەکردنە تیایدا تا نەسخکردنەوەی دەسەلمێت.

٢٥–نەسـخ تـەنها لـە ژیـانی پێغەمبـەردا(ﷺ) هـەبووە، بـە پێچـەوانەی تایبەتکردنـەوە، لێـرەدا دەقـی گشـتی هەنـدێ جـار لـە یـەکێك لـە سـەردەمەکاندا تایبەتکردن قبووڵ دەکات بۆ زەرورەتێك یان بەرژەوەندییەکی نـوێ لـە دوای مردنـی پێغەمبەر(ﷺ) کە تایبەتکردن پێویست دەکات، چونکە دەقەکانی قورئان نەمرن لەو ڕووەوە کە هەموارکردنەوە و گۆڕان قبووڵ ناکەن، بەڵام هەندێ جار ڕاستکردنەوە لـە پیادەکردنیدا سەرهەڵدەدات گەر دەقەکە ئاماژە بڕاوە نەبوو لەسەر حوکمەکە.

# بەشەکانی نەسخ

زانایانی ئوسولّ و ئەهلی تەفسیر لە چەندین رووەوە و بە چەندین بەش نەسخیان دابەش کردووە:

لەرووی نەسخکراوەوە: دابەشیان کردووە بۆ سێ جۆر: حوکم و خوێندنەوەکەی پێکەوە سڕابێتەوە، و حوکمەکەی سڕابێتەوە بەبێ خوێندنەوەکەی، و خوێندنەوەکەی سڕابێتەوە بەبێ حوکمەکەی.

لەرووی نەسخکەرەوە: دابەشیان کردووە بۆ: نەسخ بە قورئان و سوننەت و ئیجماع، تەنانەت هەندێکیان زیادەڕەوییان کردووە و نەسخ بە پێوانە(قیاس)یان خستۆتە سەریان.

لەرووی سروشتی حوکمەکەوە: دابەشیان کردووە بۆ: نەسخی فەرز بە فەرز، و نەسخی نەدب بە فەرز، و نەسخی فەرز بە نەدب.

دابەشکردنی چوارەمیان خستۆتە پالّ ئەم سیانە ئەوەش نەسخی راشکاو و نەسخی ئامێزگرانە، ئەم بەشەیان لە سەرچاوەکانی نەسخدا بەرچاوم نەکەوتووە ئاماژە بێت بەم دابەشکردنە بە شێوەیەکی راشکاوانە[1].

[1] بەلاّم هەندێ ئاماژەیان پێکردووە بە ڕێگەیەکی ئامێزگرانە، "السیوطي" دەلّێت: (الاتقان:٢/٢٤): ("ابن الحصار" دەلّێت: نەسخ دەگەڕێتەوە بۆ گواستنەوەی راشکاوانە لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) یان لە هاوەلّێکەوە بلّێت فلاّن ئایەت بە فلاّن ئایەت نەسخکراوەتەوە، دەلّێت: هەندێ جار حوکمی پێ دەکرێت لەباری بوونی

## دابەشکردنی یەکەم-لەڕووی نەسخکراوەوە:

سەرخەرانی نەسخ لەڕووی نەسخکراوەوە دابەشیان کردووە بۆ: نەسخی حوکم و خوێندنەوە پێکەوە، و نەسخی حوکم بەبێ خوێندنەوە و نەسخی خوێندنەوە بەبێ حوکم، سەرخەرانی بەشی یەکەمیان زۆرتر و زیاترن لە سەرخەرانی دوو بەشەکەی تر(دووەم و سێیەم) [1].

بە بۆچوونی ئێمە بەشی یەکەم هیچ گرفتێکی زانستی و مەنقی لە خودی خۆیدا دروست ناکات گەر بێمانایی رووی لێ نەکات، خودا لە کاری بێمانا پاك و بێگەردە، چونکە کارێکی گونجاوە و خوداش بەسەر هەموو کارە گونجاوەکاندا خاوەن

---

بەرهەڵستکارییەکی براوەدا لەگەڵ زانستی مێژووی دابەزین، بۆ ئەوەی پێشین لە پاشین جیابکەینەوە، دەڵێت: لە نەسخدا شان دانادرێت لەسەر قسەی هەندێ لە ئەهلی تەفسیری رەشۆکی، بەڵکو شان دانادرێت لەسەر ئیجتیهادی موجتەهیدەکانیش بەبێ گواستنەوەیەکی راشکاو و بەرهەڵستکارییەکی رۆشن، چونکە نەسخ هەڵگرتنی حوکمێك و جێگیرکردنی حوکمێکی تر لەخۆ دەگرێت کە لەسەردەمی پێغەمبەردا بڕیاری لێ دراوە، شان لەسەر دادراو بریتییە لە گواستنەوە و مێژووی دابەزین نەك را و ئیجتیهاد، هەروەها دەڵێت: خەڵکی لەمەدا لەنێوان دوو بەرەی دژدان، هەیانە دەڵێت: لە نەسخدا هەواڵی ئاحادی عدول قبوول ناکرێت، هەندێ ئاسانکەریش تەنها بە قسەی تەفسیرکەرێك یان موجتەهیدێك رازی دەبێت، دروست پێچەوانەی قسەی ئەو دوو کەسەیە(واتە کەسی موفەسیر و کەسی موجتەهید)

[1] في هداية العقول في اصول الفقه الزيدي: ٤٣٢/٢: (روودانی نەسخ لە قورئاندا رێیتێدەچێت چ لەڕووی حوکمەوە چ لەڕووی خوێندنەوەوە، تەنها ئەوانە جیاوازیان لەسەری هەیە روودانی نەسخ لە قورئاندا قەدەغە دەکەن، ئەو کەسەش بریتییە لە "أبو مسلم"، لە هەندێ لە ئوسوڵییەکانەوە ریوایەتکراوە رێگری دەکەن لە نەسخی حوکم نەك نەسخی خوێندنەوە، هەندێکیشیان نەسخی خوێندنەوە قەدەغە دەکەن لەگەڵ هێڵانەوەی حوکمدا، "السرخسي" پێداگری لەمە کردووە، هەندێکیش هەردوو بەشەکە قەدەغە دەکەن).

دەسەڵاتە، بەڵام گرفتی نەقلّی و ئەقلّی لە بەشی دووەم و سێیەمدایە، وەك لەم ڕۆشنکردنەوەدا دەیخەینە ڕوو:

**بەشی یەکەم-حوکم و خوێندنەوەکەی پێکەوە سڕابێتەوە:**

کەسانێك وا گومان دەبەن هەندێ ئایەتی قورئان لەڕووی حوکم و خوێندنەوەوە سڕاونەتەوە و لەم مەسحەفەی ئەمڕۆ لە جیهانی ئیسلامیدایە بوونیان نییە، ئەم قسەیە لەڕووی ئەقڵەوە ڕێتێدەچێت و ئەگەری ڕوودانیشی هەیە، چونکە هیچ نەشیاوییەکی شەرعی و مەنتقی لەسەری سەرهەڵنادات.

بەڵام هەندێ پیادەکردنی جیاواز بۆ ئەم بەشە هەیە کە ڕیوایەتەکەیان دراوەتە پاڵ کەسایەتی ئیسلامی دیار بۆ شێواندنی وێنەی ئیسلام و نەهێڵانی متمانە بە قورئان لەو ڕووەوە کە وەحی خوداییە، لەوانە:

أ.لە "الإتقان"دا هاتووە کە: "أبو عبيدة" دەڵێت "إسماعيل بن إبراهيم" لە "أيوب"ەوە لە "نافع"ەوە لە "ابن عمر"ەوە وتی: یەکێك لە ئێوە دەڵێت هەموو قورئانم وەرگرتووە ناشزانێت هەمووی کامەیە، زۆرێك لە قورئان ڕۆیشتووە، با بڵێت ئەوەندەی بۆم دەرکەوتووە وەرمگرتووە.

هەروەها دەڵێت: "ابن مريم" بۆی باسکردین لە "أبي لهيعة"ەوە لە "ابن الأسود"ەوە لە "عروة بن الزبير"ەوە لە "عائشة"ەوە فەرمووی: سورەتی "الأحزاب" لە سەردەمی پێغەمبەردا دەخوێنرایەوە نزیك بە دووسەد ئایەت بوو، کاتێك عوسمان مەسحەفەکانی نووسیوەوە تەنها ئەوەندە گەیشت بە دەستمان کە هەیە.

ئەمە ئەوەیە "السيوطي" لە کتێبی "الإتقان في علوم القرآن" گواستوویەتەوە، جێگەی داخە زانایەکی مەزنی وەکو ئەو نموونەی ئەم قسە هەڵبەستراوانە بگوێزێتەوە و خۆی لە قسەکردن لەسەری بێدەنگ بکات، هەرچەند نیێتەکەی باش و چاکە، بەڵام ئەو کارەی بە هەڵە دەژمێررێت بەهۆی ئەو ترسناکییەی لەم ڕووانەوە لێیەوە سەرهەڵدەدەن: یان تۆمەتبارکردنی دایکی باوەڕداران عائشەیە بە بوختان و

دەستدرێژی بۆ سەر خەلیفەی سێیەم عوسمان بن عەفان-خوا لێی رازی بێت- و لیژنەی کۆکەرەوەی قورئان، یان تۆمەتبار کردنی ئەو لیژنەیە بە خیانەت و گۆڕینی قورئان و لادانی وەحی لە قورئان کە گەورەمان عوسمان سەرپەرشتی کردووە.

هەموو ئەم ئەگەرانە بە ئەقڵ و مەنتق و تەواتور پووچ و بێبنەمان، سەرچاوەی ئەم جۆرە ریوایەتانە هەمان ئەو سەرچاوەیە بە ناوی پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرموودەیان دروست کردووە بۆ شێواندنی راستەقینەی ئیسلام، بۆیە زۆرێك لە ئەفسانەیان خستە ناو ئەم ئاینە مەزنەوە کە زۆربەی ئەو ئەفسانانە تاکو ئێستا نەزانان دووبارەیان دەکەنەوە لەسەر ئەو بنچینەی گوایە لە شەریعەتی ئیسلامن.

چۆن دەبێت باوەڕ بەوە بهێنین قورئان زۆربەی بزر بووە و سورەتی "الأحزاب" ئەوەندە ئایەت بووە و تەنها (٧٣) ئایەتی ماوەتەوە، ئەی ئەویتری بۆ کوێ چوو، چۆن ئەو بەشە تیاچوو لەگەڵ ئەو گرنگییە زۆرەی لە هەموو هاوەڵان و شوێنکەوتووانەوە بە قورئان دەدرا و هەموو ئایەتەکان بە رێگەی تەواتور لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) گوازراونەتەوە؟.

خەلیفە عوسمان-خوا لێی رازی بێت- هەموو مەسحەفەکانی لە یەك مەسحەفدا کۆکردەوە و چەند نوسخەیەکی لەبەرگرتەوە و دابەشی کرد بەسەر وڵاتاندا، ئەوەیان لەبیرچووە کە عوسمان بەتەنها قورئانی کۆنەکردۆتەوە، بەڵکو دەستەیەك لە هاوەڵانی لەگەڵ بووە.

زانای پایەبەرز"أبوبکر الباقلاني"[1] لە کتێبەکەیدا "الإنتصار لنقل القرآن"[2]دا دەڵێت: ((گەر یەکێك بڵێت: پێمان بڵێ ئایا مەسحەفەکەی عوسمان هەمان مەسحەفی ئەبوبەکر بوو-خوا لێی رازی بێت- یان جیاوازی هەیە لەگەڵی؟ گەر وەك مەسحەفەکەی ئەبوبەکر بوو رووی کارەکەی عوسمان بۆ چی بوو؟ گەر جیاوازی هەیە

---

[1] المتوفی ٤٠٣ هـ.

[2] دراسة وتحقيق الدكتور محمود زغلول سلام استاذ كرسي اللغة العربية وادابها بجامعة الاسكندرية ص٣٥٨.

لەگەڵی دەبێت یەکێکیان هەڵە بن، پێی دەوترێت: ئـەوەی عوسمـانی بـانگ کـرد بـۆ کاری مەسحەفەکە ئەو جیاوازییە بوو لـەناو خەڵکیـدا لەسـەر خوێندنـەوەی قورئـان و سەرهەڵدانی بێباوەڕکردنی یەکتری و نووسراوەکانی هەندێ کەس بۆ عوسمـان–خـوا لێـی رازی بێـت– لـەو وڵاتانـەوە لەمـەڕ ئـەو پرسـە، "حذیفـة" لـە فتوحـاتی ئەرمەنییەکانەوە گەڕایەوە و فەرمووی بە عوسمان: فریای ئـەم ئوممەتـە بکـەوە بـەر لـەوەی جیـاوازی لـە قورئانـدا سـەرهەڵبدات وەك چـۆن یـەهود و نەصـارا جیاوازیـان تێکـەوت، عوسمـان نـاردی بـۆ لای "حفصـة"ی خێزانـی پێغەمبـەردا(ﷺ) ئـەو لاپەڕانەمان بۆ رەوانە بکە تاکو لەبەری بگرینەوە لە چەند مەسحەفێکدا و پاشان بۆت رەوانە دەکەینەوە، ئەویش لاپەڕەکانی بۆ رەوانە کـرد، عوسمـان "زیـد بـن ثابـت و عبدالله بن الزبیر و سعید بن العاص"ی بانگکرد، وتراویشـە "ابـان بـن سـعید بـن العاص و عبدالرحمن بن الحارث بن هشام" لە هەندێ ریوایەتی تردا: "عبدالله بـن عباس و عبدالله بن عمر و عبدالله بن عمـرو بـن العـاص" لـە چـەند مەسـحەفێکدا لەبەریان گرتەوە، عوسمـان فـەرمووی بـە دەسـتە قورەیشـییەکە: گـەر لـە شـتێکدا جیاوازی کەوتە نێوانتانەوە بـە زمانی(بـە لەهجـەی) قـورەیش بینووسـن، چـونکە بـە لەهجـەی ئـەوان دابـەزیوە، ئـەوانیش ئـەو کارەیـان ئەنجامـدا تـا مەسـحەفەکانیان لەبەرگرتەوە و عوسمان ناردیەوە بۆ لای حەفصە پاشان هەر مەسـحەفێکی رەوانـەی ئاسۆیەك کرد).

لـە بەڵگەنەویسـتەکانە قورئـان بـڕ بـڕ لـە مەکـە و مەدینـە بـۆ سـەر سـەروەرمان محمەد(ﷺ) لە ماوەی بیست و سێ ساڵدا دابەزیوە، یەك بەیەکی موسڵمانان تامەزرۆ و موشتاقبوون بۆ وەحی و چاوەڕوانی هـەواڵی وەحـی بـوون کـە پەیوەسـت بـوو بـە کاروبارەکانی خێزانی مرۆڤایەتییەوە تایبەت و گشـتی، هـاوەڵانی پێغەمبـەر(ﷺ) بـە شـەوق و تامـەزرۆیی و لێوردبوونـەوە و وردەکارییـەوە گوێیـان بـۆ دابـەزینی قورئـان رادەگرت تاکو سوود لە حوکمەکانی وەربگرن لە کاروباری دین و دونیایاندا، هەر کـات ئایـەتێك دادەبـەزی بەناویانـدا بـڵاوەی دەکـرد و لەبـەریان دەکـرد، بۆیـە ئایـەتێك

دانەبەزیوە گواستنەوەکەی بە ڕێگەی هەواڵی ئاحاد بێت، بەڵکو هەموو ئایەتـەکان لـە پێغەمبەری خوداوص– بە موتەواتیری گوازراونەتەوە.

ب–هەروەها لـەو هەواڵـە هەڵبەسـتراوانەی خزێنراوەتـە نـاو فـەرموودەوە ئەوەیـە ریوایەتکراوە، دەستەیەك لە هاوەڵانی پێغەمبـەر(ﷺ) پیاوێـك لـە ناویـان لـە نیـوەی شەودا راستدەبێتەوە دەیـەوێت سـورەتێك بخوێنێـت کـە پێشـتر لەبـەری کـرد بـوو، نەیتوانی هیچ شـتێکی لـیٚ بخوێنێـت جگـە لـە "بسـم الله الـرحمن الـرحیم" کـات ڕۆژ بوویەوە پێیـەوە هـات بـۆ لای پێغەمبـەر(ﷺ) و لـەو بارەیـەوە پرسـیاری لـیٚ کـرد، کەسـێکی تـر و کەسـێکی تـر بـەدوای یەکـدا هـاتن تـا کۆبوونـەوە، هەنـدێکیان لـە هەنـدێکیانی پرسـی چـی کـۆی کردوونەتـەوە، هەنـدێکیان دەربـارەی ئـەو سـورەتە هەواڵیان دا بە هەندێکی تریان، پاشان پێغەمبەر(ﷺ) مۆڵـەتی پێـدان و هەواڵەکـەیان پێدا و پرسیاری سورەتەکەیان لیٚ کرد، پێغەمبەر(ﷺ) ماوەیەك بێدەنگ بـوو و هـیچ وەڵامێکی بۆیان نـەبوو، پاشـان فـەرمووی دوێنـێ نەسـخکرایەوە، لـە سـینەیان و لـە هەموو شتێك تیایدا نووسرابوو سڕایەوە، ئەوەی نامۆیە ئەوەیە "ابن الجوزي"[١] ئەم ریوایەتە هەڵبەستراوە ئەفسانەیەی کە خزێنراوەتـە نـاو فـەرموودەوە گواسـتۆتەوە و هیچ قسەیەکی لەسەر نەکردووە و پرسیاری ئەوەی نەکردووە حیکمەت چـی بـوو لـە دابەزینی سـورەتێك لـە قورئـان و تـەنها ژمارەیـەکی کـەم لـە هـاوەڵان پێیـان زانـی، سورەتێك دادەبەزێت و تەشریع بگەیەنێت و پاشـان نەسـخ ببێتـەوە و بسـڕێتەوە لـە نێوان ئێوارە و چێشتەنگاودا، ئایە ئەمە گاڵتەجاڕی نییە؟ ئایا وێنای کاری گاڵتەجاڕی لە خودا دەکرێت؟ یان بۆچی پێغەمبەر(ﷺ) ماوەیەك بێدەنگ بـوو؟ لای هـیچ کـەس ترسناکی ئەم ریوایەتە لاواز و هەڵبەستراوانە لەگەڵ بێدەنگ بوون لە بەرپەرچدانەوە و پووچکردنەوەیان شاراوە نییە، بە تایبەت بۆ سـەر بیروبـاوەڕی موسـڵمانێك خـاوەنی ئیمانێکی زانستی نییە، سەرباری ئەوەی ئەم ریوایەتانە –کە بنچینەیەکیان بۆ نییە–

---

[١] نواسخ القرآن لابن الجوزي ص ٣٣.

تیشکی سەوز دەدەن بە دوژمنانی ئیسلام بۆ ئەوەی وەك خاڵی لاواز لەسەر ئیسلام و بوونی قورئان وەك وەحییەك لەلای خوداوە تۆماری بکەن.

هەروەها لەوانەی "السیوطي"[1] بە نموونەی پیادەکردنەکانی نەسخی حوکم و خوێندنەوە دەیهێنێتەوە ئەوەیە کە دەڵێت: ((عائشە دەڵێت: لەوەی دابەزی بوو "دە ژەم شیربوو" نەسخکرایەوە بە "پێنج ژەم شیری دیاریکراو"، پێغەمبەر(ﷺ) کۆچی دوایی کرد و ئەوە لە قورئاندا دەخوێنرایەوە))

هەروەها "السیوطي" گواستوویەتەوە[2] لە پیادەکردنەکانی نەسخی حوکم و خوێندنەوە: ((انا انزلنا المال لاقام الصلاة وایتاء الزكاة لو ان لابن ادم وادیا لاحب ان یكون الیه الثاني ولو كان الیه الثاني لاحب ان یكون الیهما الثالث ولا یملأ جوف ابن ادم الا التراب ویتوب الله على من تاب)).

پێشتر باسی ئەم تێکەڵییەی نێوان قورئان و سوننەتی پێغەمبەرمان(ﷺ) کرد، سەرباری ئەوەی ئەم دوو ریوایەتە باسکراوە لە فەموودەی پێغەمبەردا(ﷺ) بوونیان هەیە، گەر حوکمی ئەو دوو فەرموودە نەسخکراوەتەوە بۆچی لە سەحیحی بوخاریدا هاتوون، هەر بەو جۆرە "ابن سلامة و ابن الجوزي والسیوطي" ریوایەتگەلێکیان گواستۆتەوە وێنەی قورئان دەشوێنن و شك و گومان دەخەنە سەر ئەمانەتی عوسمان لە کۆکردنەوەی قورئاندا هەڵبەت بەبێ ئەوەی مەبەستێکیان هەبێت، بۆ ئەو مەبەستە، بەڵکو زۆرتر لەو مەبەستە "الغماري"[3] لە کتێبەکەیدا "الإحسان في تعقیب الإتقان للسیوطي" دەڵێت: ((کتێبی "الإتقان في علوم القرآن"ی ئیمامی "الحافظ ابن الفضل جلال الدین السیوطي"–رەحمەتی خوای لێ بێت– کتێبێکە گەورە و بەپێزە و سوودی زۆرە، بەڵام هەندێ بۆچوونی نادروستی تێخزێنراوی تێدایە، دانەر(واتە السیوطي) نەیتوانیوە لە شازبوونەوەیان و بەریوونەوەیان بەئاگا

[1] الاتقان ٢/٢٥.
[2] الاتقان ٢/٢٤.
[3] ابو الفضل عبد الله بن الصدیق الغماري دار الانصار ص ٣ وما بعدها.

بێت، بۆیە ڕۆژهەڵاتناسان و کلکەکانیان کردوویانن بە پێپەیژە بۆ تانەدان لە هەندێ ئایەتی قورئـان و ئـەوەی پەیوەنـدی بـە کۆکردنـەوەی قورئانـەوە هەیـە، دۆسـت و مۆڵەتپێدەری ئێمە زانای پایەبەرز خوالێخۆشبوو "محمد زاهد الكوثري" هـەواڵی پێداین که وانەی زانستەکانی قورئانی بە قوتابیانی وتۆتەوە لە زانکۆی ئەستەنبوڵی ئەستانە و گرنگی دەدا بەوەی ڕۆژهەڵاتناسان دەیاننووسی تاکو بەرپەرچیان بداتەوە و قوتابییەکانی لێ بـەئاگا بهێنێت، زۆرێك لـە تانـە و تەشـەرەکانی ئـەوانی دەبـینی پشتیان بەو ڕاو و ڕیوایەتانە دەبەست لە کتێبی "الإتقـان"دا هـاتبوو، ئەمـەش هـۆی هێرشە توندەکەی بوو لەسەر ئەو کتێبە))

لەڕاستیدا "السیوطي" لە کتێبەکەیدا "الإتقان في علوم القرآن" لەژێر ناونیشانی جۆری چل و حەوت لە نەسخکەر و نەسخکراوەکەی ڕیوایەتی هەڵبەستراو و گوماناوی هێناوە، تەنها ئەوانـە کۆیدەکەنـەوە و بـەو ڕێگەیـە ڕێکیدەخـەن و دەیخەنـە ڕوو کـە تۆمەتبارن بە هەڵبەستن و هێنانی شك بۆ ناو قورئان، حاشا "السیوطي" لـەو جـۆرە کەسانە بێت بەهۆی پلە و پایەی زانستی و خزمەتی مەزنیەوە، بەڵام وا دەردەکەوێت پیـاوێکی سـادە بووبێـت و هـەموو ئـەوەی دەیگواسـتەوە بەڕاسـتی زانیبێـت بـە چاوداخستن لـە دروسـتی و پووچـەڵییەکەی، بـەڵام ئـەم سـادەکارییەی بەرهەڵسـتی دەکات لەگەڵ ئەو قووڵی و وردەکارییەی لە هەندێ بابەتی تردا هەیبووە.

خودا لەوانە خۆشببێت بەرگری دەکات لە هەڵەکانی کەسانی تر بە نیـێتی باشـی، بەڵام گەر ئەو کەسانە لە ڕابردوودا خاوەن بیانو و پاساوی خۆیـان بـووبن ئـەوا ئێمـە پاساو و بیانوومان بۆ نییە، ئێمە لە چاخی ئەتۆم و گەشتی ئاسمان و گەشە و گۆڕانی تەکنەلۆژی و چاخی ئینتەرنێت و ئەقڵی ئەلەکترۆنیداین.

**بەشی دووەم-حوکمەکەی نەسخکراوە بەبێ خوێندنەوەکەی**

زانایانی ئوسوڵ و فەقیهان و ئەهلی تەفسیر زیادەڕەوییان کـردووە لـە قسـەکردن لەمەڕ نەسخ لەم بەشەدا وەك باسمان کرد بەتایبەت ئەوەی "ابن سلامة و ابن حـزم و السیوطي" وتوویانە، وەك چۆن درێژەی پیادەکردنـەکانی ئـەم بەشـە لـە قورئانـدا

دێت، لەو ئایەتانەی بانگەشە دەکەن لە رووی حوکمەوە نەسخکراوین، بەڵام لەڕووی خوێندنەوەوە ماونەتەوە، ژمارەی ئەو ئایەتانە لە قورئاندا و لەو مەسحەفەی لە جیهانی ئیسلامیدا لەبەردەستی موسڵماناندایە زیاترە لە (٢٠١) ئایەت لە ئایەتەکانی ئەحکام کە دەڵێن کۆی هەموو ئایەتەکانی ئەحکام لە (٥٠٠) ئایەت تێناپەڕێت.

"السیوطي"[1] هۆ بۆ دروستی سڕینەوەی حوکمی ئایەت و مانەوەی خوێندنەوەکەی دەهێنێتەوە بە وتنی: (گەر دەڵێی: حیکمەت چییە لە هەڵگرتنی حوکم و مانەوەی خوێندنەوەکەی، ئەوا وەڵامەکەی لە دوو رووەوەیە:

یەکەمیان: قورئان وەك چۆن دەخوێنرێتەوە بۆ ئەوەی حوکمەکەی بزانرێت و کاری پێبکرێت دەشخوێنرێتەوە بەهۆی ئەوەی کەلامی خودایە و لەسەری پاداشت وەردەگیرێت، بۆیە خوێندنەوەکەی بەهۆی ئەو حیکمەتەوە وازلێهێنراوە.

دووەم: نەسخکردنەوەی کرۆك(حوکم) بۆ ئاسانکردنە و خوێندنەوەکە هێڵراوەتەوە وەك یادخستنەوەیەك بۆ نیعمەت و لابردنی ئەو بارگرانییە)

بەردەوام چاولێکەران بۆ گوفتارەکانی کەسانی تر لە نووسینەکانیان و وتارەکانیان و ئامۆژگارییەکانیان بۆ خەڵکی نموونەی ئەم قسە سەیر و سەمەرانە دووبارە دەکەنەوە و هۆی ناماقوڵ دەهێننەوە و پاساو بۆ کارێك دەخەنە روو مرۆڤی ژیر نایەوێت ئەنجامی بدات، سەرەڕای ئەوەش بۆ قورئان بە شیاوی دەزانن و رێگە بە خۆی دەدات ئەوەی بۆ مرۆڤ نەنگی و ناتەواوییە بیداتە پاڵ خودا، ئەوانە بانگەشەی ئەوە دەکەن رێزی ئیسلام دەگرن بە بەرگرییە گەرموگوڕەکانیان لە ئایەتەکانی قورئان کە ناوەڕۆکیان سڕاوەتەوە–وەك "السیوطي" ناوی لێنا– و توێکڵەکەیان ماوەتەوە بۆ ئەوەی ببێتە دەستوورێکی نەمر بۆ خێزانی مرۆڤایەتی، خودا لە موسڵمانێك خۆشبێت ئەقڵی بەکارناهێنێت لەوەی لە کەسانی ترەوە دەیگوێزێتەوە و بە توندی بەرگری لێدەکات، چونکە بەرگرییەکەیان لەڕووی نیێت پاکی و نەبوونی

---

[1] الاتقان المرجع السابق ٢/٢٣.

وردەکاری و بێبەشبوونی قووڵی بەڵگەهێنانەوەوەیە، گەر بە یەکێك لەو کەسانە بڵێیت نیـوەی ئـەو قورئانـەی لەبەردەسـتماندایە نەسـخکراوەتەوە و کـارکردن پێـی پەکیکـەوتووە، بـەڵام وەك تەبـەرك بەکاریـدەهێنین هـەزاران کـەس دەبینییـەوە پشـتگیریت دەکـەن، گـەر بڵێـی نموونـەی ئـەو کـارە ناتەواوییـە تایبـەت بـە مـرۆڤ و یاسادانەری یاسای دانراو ئیتر چۆن دەبێت ئەو ناتەواوییە بدرێتـە پـاڵ خـودا، لێـرەدا کەسێك نابینیتەوە پشتیوانیت لێ بکات با بەڕێژەی (١٪)یش بێت لەوانەی خۆیان بـە بانگکەری پەیامی ئیسلام دەزانن، ئەم دیاردەیە جێگەی داخە لە جیهانی ئیسـلامیدا، وتـنی مانـەوەی ئایـەتی قورئـان بـۆ خوێندنـەوە و سـڕانەوەی لـەڕووی حوکمـەوە ڕەدکراوەیە بەم بەڵگانە:

١-وشەکانی قورئان قاڵبن بۆ ماناکانی کە بـریتین لـەو حوکمانـەی ژیـانی خێزانـی مرۆڤایـەتی ڕێکدەخـەن و بەختـەوەری هەتاهـەتایی لـە هـەردوو خانەکـەدا بـۆ دابـین دەکـەن، بۆیـە وشـەکان لـە خـودی خۆیانـدا بەمەبەسـتگیراو نـین، بـەڵکو خـودا ئـەو وشانەی گێڕاوە بە هۆکارێك بۆ گەیاندنی ئەو مانا و ئەحکامانە بە مرۆڤ، ئەم وشانە لە کتێبە ئاسمانییەکاندا هاتوون بە چەندین زمان هاتوون و دواین زمانیان زمانی عەرەبی زیندووە کە ئامادەیی ئەوەی تێدایە زۆرترین مانا لە ماناکانی قورئـانی مـەزن لـەئامێز بگرێت، ئەو قورئانەی دوایین دەستوورە و هەموارکـەرەوەی دەسـتوورە خواییـەکانی پێشووە، مرۆڤ پابەند دەبێت بە کارکردن بە داواکارییـەکانی هـەتا ژیـان لەسـەر ئـەم هەسارەی زەوییە بەردەوام بێت.

وشـەکان تـوێکڵن و حوکمـەکان کـرۆکن وەك لـە غـەیری قورئانـدا لـە خواردنـە موباحەکانی مرۆڤ، دەبێ سوودی توێکڵ چی بێت گەر لە ناوەرۆکەکەی دابڕێنرێت، ئایا لەدوای ئەوە بەهایەکی بۆ دەمێنێتەوە بایەخی پێبدرێت؟

٢-قورئان بۆ سەر محەمـەد(ﷺ) دابـەزیوە تـاکو بـە هـەموو خێزانـی مرۆڤایـەتی بگەیەنێت و ببێتە ڕەحمەت بۆ هەموو جیهانان، وەك خودا-سـبحانە- دەفـەرموێت: ﴿وَمَا أَرْسَلْنَاكَ إِلاَّ رَحْمَةً لِلْعَالَمِينَ﴾ خودا قورئانی دانەبەزاندووە تاکو بـە وشـەکانی

دووبـاره بكرێتـەوە و بكرێتـە دەنـگ و ئـاواز لـە بۆنـەكان و لەسـەر گۆڕسـتانەكان و مردووەكان، بەڵكو قورئان دەستووری زیندووانە بۆ كاركردن بە ناوەرۆك و مەرامەكان و داواكارییـەكانی، دەبـێ داواكـاری قورئـان چـی بێـت گـەر مەبەسـت و مەرامـە بنچینەییەكە بزر بوبێت؟

٣-چی دەڵێی بە كەسێك قوتوویەك شیرینیت پێشكەش بكات و بیداتـە دەسـتت پاشان ناوەرۆكی ئەو شـیرنەمەنییە رابكێشـێت و داواش لـە تـۆ بكـات پارێزگـاری لـە قوتووەكە بكەیت تاكو بۆنی شیرنەمەنی بكەیت و چێژی لێ وەربگریت؟

٤-چی دەوترێت بە كەسێك یاسایەك دادەڕێـژێت بـۆ ڕێكخسـتنی كۆمەڵگەكـەی و دەستەبەركردنی مافەكان و ئەركەكانی تـاكی ئـەو كۆمەڵگەیـە، پاشـان كـاركردن بـە هەنـدێ مـادەی ئـەو یاسـایە هەڵدەوەشـێنێتەوە بـەهۆی پێشـكەوتنەكانی ژیـان و بەرژەوەندییەكانەوە و كۆمـەڵێك مـادەی نـوێ دەهێنێـت جێگـەی ئەوانـە بگرنـەوە و چەند حوكمێك لەخۆ بگـرن لەگـەڵ بەرژەوەندییـە نوێیەكانـدا گونجـاو بـن، بـەڵام لـە هەمان كاتدا فەرمان دەكات بە پارێزگاری لێكردنی ئەو مادە سڕاوانە و هێڵانەوەیان لە نێوان مادەكانی تری هەمان یاسادا؟ گومانی تێدا نییە نموونەی ئـەم جـۆرە كـارە بـە كارێكی ناماقوڵ دادەنرێت و لەلایەن تاكەكانی ئەو كۆمەڵگەوە لە دەرەوە و لە ناوەوە یاسادانەر دەكەوێتە بەر رەخنە.

گەر سڕینەوەی حوكم و هێڵانەوەی مادەكە ناتەواوی بێت بۆ مرۆڤێك دەبێ چـۆن گونجاو بێت بدرێتە پاڵ خودایەكی "علیم و حكیم و عزیز و قدیر"ی پاك و بێگـەرد لە هەرچی نەنگی و ناتەواوییە؟

ئەمە هەندێ لەو بەڵگانەیـە دەیخەمـە بـەردەم ئـەو كەسـانەی خـاوەن ژیرییـەكی نـەرمن، لـە داهـاتوودا پەرچـەكرداری نـەرێی لـە سـەرخەرانی نەسـخەوە ڕووبـەڕووم دەبێتـەوە، بـەڵام مـەرامی مـن سەرخسـتنی قورئـان و خزمەتكردنـە بـە شـەریعەتی ئیسلامی مەزن و پێنەدانی تیشكی سەوز بە دوژمنانی.

باوەڕدارێك كە خاوەنی باوەڕێكی دروستی زانستییە لە لۆمەی لۆمەكەران ناترسێت و لە حەق بێدەنگ نابێت لە ترسی زماندرێژی كەسانی تر، با ئەوەی دوێنێ بە "أبي مسلم الأصفهاني" وترا سبەینێش بە من بوترێت، ئەو بەرگری لە قورئان كرد و بە كافریان دانا.

*بەشی سێیەم- خوێندنەوەی سڕاوەتەوە بەبێ حوكمەكەی:*

بانگكەرانی ئەم جۆرە لە نەسخ بەڵگە بە فەرموودەی ئاحاد دەهێننەوە، لەوانە: ((الشَّيْخ والشَّيْخَة إذَا زَنَيَا فَارْجمُوهُماَ البَتَّة نَكَالاً مِنَ الله))[1].

"الزركشي"[2] لە قسەكردن لەسەری دەڵێت: ((حیكمەت چییە لە هەڵگرتنی خوێندنەوەكەی و هێڵانەوەی حوكمەكەی؟ ئەی بۆ خوێندنەوەكەشی نەهێڵرایەوە بۆ ئەوەی كاركردن بە حوكمەكەی لەگەڵ پاداشتی خوێندنەوەكەی كۆببێتەوە؟))

خاوەنی "الفنون"[3] وەڵام دەداتەوە و دەڵێت: ((ئەوە بۆ ئەو مەبەستەیە رادەی گوێڕایەڵی ئەم ئوممەتە لە پەلەكردن بۆ بەخشینی نەفس بە رێگەی گومان بەبێ رۆشنكردنەوە و درێژەپێدان بۆ رێگەی یەكلاكەرەوە پێی ئاشكرا بكات، بۆیە بە ئاسانترین شت پەلەی بۆ دەكەن وەك چۆن ئیبراهیمی خەلیل–علیە السلام–كوڕەكەی بە بینینی خەونێك سەربڕی، خەون نزمترین ئاستی وەحییە)).

وتنی" پێی ئاشكرا بكات –لیظهر به" واتە بۆ ئەوەی بۆ خودای ئاشكرا بكات وەك ئەوەی خودا نەزان بێت بەوەی بەندەكەی ئەنجامی دەدات لە رابردوو و ئێستا و داهاتوودا بۆیە تاقیدەكاتەوە تاكو بڕوانێت بەسەر راستەقینەدا.

ئەم شیكردنەوەیە چەند سەیروسەمەرەیە لەگەڵ رێزمان بۆ پلە و پایەی "ابن الجوزي"، "الزرقاني"[4] شیكردنەوەی بۆ دەكات بە وتنی: ((نهێنی لە سڕینەوەی

---

[1] البرهان في علوم القرآن للامام بدر الدين محمد بن عبد الله الزركشي: ٣٥/٢.

[2] المرجع السابق: ٣٧/٢.

[3] هو كتاب فنون الافنان في عجائب علوم القرآن لابن الجوزي.

[4] مناهل العرفان: ٩٢/٢-٩٣.

خوێندنەوەی ئایەتی "الشیخ والشیخة إذا زنیا فارجموهما" بەبێ حوکمەکەی ئەوەیە: یەکەمجار دەخوێنرایەوە وەك دەمکوتکردنێك بۆ کەسانێك نەفسی هانی دەدا بۆ خۆپیسکردن بەم نەنگی و عارە ناشیرینە لە "شیخ و شیخة"دا، هەتا ئەم حوکمە جێگیر بوو لە دەروونەکاندا ئەو کات خودا خوێندنەوەکەی سڕیەوە بەهۆی حیکمەتێکی ترەوە کە ئاماژەیە بە خراپی ئەو کارە پیسە و نالەباری دەرچوونی لە "شیخ و شیخة"وە جۆرە ڕێگەیەکیان گرتۆتە بەر شایستەی ئەوە نییە باس بکرێت نەك بگوێزرێتەوە، بۆیە بە ئاقارێکیدا برد وەك ئەوەی هەرگیز ڕوونەدات، وەك ئەوەی وتبێتی: گوێتان لە بیستنی بەپاك ڕابگرن و زمانتان لە وتنی سەرباری ڕاکردن لێی و پیسبوون بە چڵك و چەپەڵییەکەی))

ئەم تەئویلە ناماقووڵە نموونەی ئەو زانا مەزنە بۆی دەچێت تاکو ئەوەی قسەیەکی باو بووە لە سەردەمی نەفامیدا بکات بە قورئانێکی دابەزێنراو لە خوداوە.

ئەم بەشە لە نەسخی بانگەشەبۆکراو بەم بەڵگانە ڕەد دەکەینەوە، گرنگترینیان:

١-ئەم قسەیە گەر ڕاست بێت ئەوا لە قورئان نییە، بەڵکو فەرموودەیەکە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی و قەزاوەتی پێکردووە لە کۆمەڵێك داوادا لەوانە ڕەجمکردنی "الغامدیة و ماعز" و کەسانی تریش، "النحاس"[1]دەڵێت: (("الزهري" لە عەبدوڵای کوڕی عەباسەوە ڕیوایەتی کردووە دەڵێت: "عمر بن الخطاب" وتاری بۆ داین و وتی: ئێمە "الشیخ والشیخة إذا زنیا فارجموهما البتة بما قضیا من اللذة.."مان کاتی خۆی دەخوێند، "أبو جعفر" دەڵێت ئیسنادی فەرموودەکە دروستە، بەڵام تەنها ئەوەندە هەیە حوکمەکەی وەك حوکمی قورئان نییە کە کۆمەڵێك لە کۆمەڵێکەوە گواستوویانەتەوە، بەڵام سوننەتێکی جێگیرە، لەوانەیە مرۆڤ بڵێت ئەوەم خوێندەوە بەبێ ئەوەی قورئان بێت، بەڵگەش لەسەر ئەمە

---

(1) محمد بن احمد بن اسماعیل الصفار النحوي المصري المعروف بأبي جعفر النحاس المتوفى ٣٣٨هـ كتاب الناسخ والمنسوخ في القرآن الكریم ص٨.

ئەوەیە عومەر دەڵێت: گەر ئەوەم پێ ناخۆش نەبوایە بوترێت عومەر قورئانی زیاد کردووە ئەوا زیادم دەکرد))

٢-رەجم بە قورئان جێگیر نەبووە، بەڵکو بە کاری پێغەمبەر(ﷺ) و قەزاوەتی ئەو جێگیرکراوە، ئەوەش تەبایە لەگەڵ ئەوەی لە تەوراتدا هاتووە لەلای ئەهلی کیتاب، وەك "البخاري" ریوایەتی دەکات: پێغەمبەر(ﷺ) تەبایی لەگەڵ ئەهلی کیتابدا پێخۆش بوو لەو شتانەی قورئانی تێدا دانەبەزی بوو تا دادەبەزی.

٣-رەجمکردنی "المحصن-پیاو و ژنی خاوەن هاوسەر" پێش ئیسلام بوونی هەبوو گوزارەی: (الشیخ والشیخة إذا زنیا...) پێش ئیسلام بوونی هەبوو و کاری پێدەکرا.

هەرکەس کەمترین زەوقی رەوانبێژی تێدا بێت دەزانێت ئەوە کەلامی خودا نییە.

٤-ئەو فەرمووده هەواڵێکی ئاحادە و قورئان بە موتەواتر جێگیر بووە، هەر شتێك موتەواتر نەبێت بە قورئان ناژمێررێت، ئیتر لەسەر کام بنچینەی دروستی جێگیر بە قورئانێك دادەنرێت خوێندنەوەکەی سڕابێتەوە بەبێ حوکمەکەی؟

٥-جیاوازی هەیە لە نێوان زانایاندا لە مانەوەی حوکمی رەجم لەسەر بنچینەی جیاوازی لە بەرواری دابەزینی ئایەتی: ﴿الزَّانِيَةُ وَالزَّانِي فَاجْلِدُوا كُلَّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا مِائَةَ جَلْدَةٍ﴾، ئەوانەی دەڵێن پێش رەجم دابەزیوە دەڵێن رەجم ماوەتەوە بەهۆی جێگیربوونی بە جێگیربوونێکی یەکلاکەرەوە بە قەزاوەتی پێغەمبەر(ﷺ) و زانایانیش کۆدەنگیان هەیە لەسەر ئەمە.

هەرکەسێکیش دەڵێت ئەو ئایەتە دوای حوکمی رەجم دابەزیوە دەڵێت ئەو حوکمە سڕاوەتەوە و وەك سڕانەوەی سوننەت وایە بە قورئان، هەردوو ئاراستەکە بەڵگەیەکی یەکلاکەرەوەیان[1] راست نەکردۆتەوە و زانست لەلای خودایە.

---

[1] في فتح الباري شرح صحيح البخاري(٢٠/٨): (لە "الشیبانی"ەوە وتی: پرسیارم کرد لە "عبد الله بن ابي اوفی" ئایا پێغەمبەر(ﷺ) کەسی رەجم کردووە؟ فەرمووی: بەڵێ، وتم: پێش دابەزینی سورەتی "النور" یان دوای دابەزینی؟ وتی: نازانم).

شایانی باسه رووداني رەجم لەدوای پێغەمبەر(ﷺ) تاکو ئەمڕۆ جێگیر نەبووە بەهۆی جێگیرنەبوونی تاوانی زیناوە بە چوار شایەت دادپەروەری و یەکێتی وەڵامگۆیی و بینینی ڕۆشن بۆ کارە تاوانییەکەیان بوونیان هەبێت بەجۆرێك شك و شوبهە رووی لێ نەکات، چونکە سنووربەزێنییەکان بە شوبوهات پاڵ پێوە دەنرێت.

٦-زانایانی مەزن ئەم جۆرە لە بەشی نەسخیان ڕەد کردۆتەوە بەهۆی نامەنتقیبوونییەوە، لەو زانایانە:

أ. "الزركشي"[١] دەڵێت: (خۆری ئیمامان"السرخسي" پێداگری لەوە دەکات نابێت ئەم جۆرە نەسخە بوونی هەبێت بە نەسخکردنەوەی خوێندنەوە و مانەوەی حوکمەکەی، چونکە حوکم بەبێ خوێندنەوە جێگیر نابێت)

ب-"صدر الشريعة"[٢] دەڵێت: (زانایان ڕێگریان لەوە کردووە نەسخ لە خوێندنەوەدا رویدابێت، چونکە دەق بۆ حوکمەکەیەتی و حوکمیش بە دەقە و جیابوونەوە لە نێوانیاندا ناکرێت)

ج-قازی "أبوبكر الباقلاني"[٣]دەڵێت: ریوایەتەکەی عومەر و هاوشێوەکانی لە ریوایەتەکان بانگەشەی ئەوە دەکەن قورئان هەیە خوێندنەوەکەی سڕاوەتەوە ریوایەتی ئاحادن و شانداداں لەسەریان دروست نییە، ئەوەی جێگیری دەکەن جێگیر نەبووە، گەر خوێندنەوە ماوەتەوە ئەوا گەورەمان عومەر-خوا لێی ڕازی بێت- هەوڵی نووسینەوەی دەدا و نەیدەبەستەوە بە کار و کردەوەی خەڵکەوە.

---

[١] البحر المحيط: ١٠٤/٤.

[٢] التوضيح والتنقيح: ٣١٨/٢.

[٣] الانتصار لنقل القرآن المخطوطة ص٢٠١.

**دابەشکردنی دووەم: نەسخبوونەوەی قورئان لەڕووی نەسخکەرەوە:**

سەرخەرانی نەسخ لە قورئاندا لەڕووی نەسخکەرەوە دابەشیان کردووە بۆ: نەسخ بە قورئان–بانگکەرانی ئەم بەشەیان زۆرە– و نەسخ بە سوننەت–ڕێژەی بانگکەرانی ئەم بەشەیان ناوەندە– و نەسخ بە ئیجماع– بانگەرانی ئەم بەشە شاز و کەمن–، وەك لەم ڕۆشنکردنەوەیەدا:

**بەشی یەکەم- نەسخی قورئان بە قورئان:**

پێشتر باسمان کرد زانایانی ئوسولّ لە پاشینەکان و ئەهلی تەفسیر و لێکۆڵەران لە بابەتی نەسخکەر و نەسخکراو زیادەڕەوییان کردووە لە نەسخی قورئان تا ژمارەی ئایەتە نەسخکراوەکان گەیشتۆتە نیوەی ئایەتەکانی ئەحکامی قورئان.

لە پێشەنگی ئەوانەی زیادەڕەوییان کردووە لەم مەیدانەدا "ابن سلامة"یە کە دەڵێت[1]: ئەم ئایەتە نەسخکەرە(واتە ئەو ئایەتەی پێی دەوترێت ئایەتی شمشێر)[2] سەد و بیست و چوار ئایەتی سڕیوەتەوە و پاشان کۆتاییەکەی سەرەتاکەی سڕیوەتەوە.

هەروەها دەڵێت[3]: ئەو ئایەتانەی لە حوکمدا سڕاونەتەوە و لە خوێندنەوەدا ماونەتەوە بەسەر (٦٣) سورەتدا دابەشبوون و دەڵێت: بزانە هەموو ئەوەی لە قورئاندایە وەك "أعرض، تولى عنهم، ذرهم" و هاوشێوەکانی ئەمانە نەسخکەرەوەکەیان بریتییە لە ئایەتی شمشێر.

هەموو ئەوەی لە قورئاندایە لە: ﴿إِنِّي أَخَافُ إِنْ عَصَيْتُ رَبِّي عَذَابَ يَوْمٍ عَظِيمٍ﴾[4] نەسخکەرەکەی بریتییە لە ﴿لِيَغْفِرَ لَكَ اللَّهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِكَ وَمَا تَأَخَّرَ﴾[1].

---

[1] في كتابه الناسخ والمنسوخ تحقيق العليلي ص١٢٨.

[2] ئەوەش بریتییە لە ئایەتی پێنجەمی سورەتی "التوبة"

[3] المرجع السابق ص٢٠٢.

[4] سورة يونس/١٥.

هـەروەها هـەموو ئـەوەی لـە قورئاندایـە لـە هـەواڵ دەربـارەی ئەوانـەی کتێبیـان پێدراوە و ئەمر بە لێبووردن دەربارەیان نەسخکەرەوەکەیان بریتییە لە﴿قَاتِلُوا الَّذِينَ لاَ يُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَلاَ بِالْيَوْمِ الآخِرِ﴾[2]

هەروەها هـەموو ئـەوەی لـە قورئاندایـە لـە فـەرمان بـە شـایەتی نەسـخکەرەکەی بریتییە لە ﴿فَإِنْ أَمِنَ بَعْضُكُمْ بَعْضًا﴾[3]، هەروەها هەموو ئەوەی لە قورئاندایـە لـە توندکردنەوە و هەڕەشە نەسخکەرەوەکەی بریتییە لە: ﴿يُرِيـدُ اللَّـهُ بِكُـمُ الْيُسْـرَ وَلاَ يُرِيدُ بِكُمُ الْعُسْرَ﴾[4]

"ابـن حـزم الأندلسـي" دەڵێـت[5]: ئـەو سـورەتانەی ناسـخ و مەنسـوخیان تێنەکـەوتووە چـل و سـێ سـورەتن، ئـەو سـورەتانەی نەسـخکەریان تێدایـە و نەسخکراویان تێدا نییـە چـل سـورەتن، ئـەو سـورەتانەی نەسـخکەر و نەسـخکراویان تێکەوتووە ژمارەیان بیست و پێنج سورەتە[6]

هەروەها دەڵێت: پشتهەڵکردن لە هاوەڵدانەران لە (١١٤) ئایەتدا لە (٤٨) سورەتدا کـە یەکـەمیان سـورەتی "البقـرة"یـە و دواهـەمینیان سـورەتی "الکـافرون"ە، هەرهەموویان بە ئایەتی:﴿فَاقْتُلُوا الْمُشْرِكِينَ حَيْثُ وَجَدْتُمُوهُمْ﴾ نەسخکراونەتەوە.

پێشتر بەدرێژی باسی نەسخی قورئان بە قورئانمان کردووە لـەلای ئـەو زانایـە(ابن حزم) کە پێش "ابن سلامة" کەوتووە و زیادەڕەوی کردووە لە نەسخی قورئاندا.

دواتر رەدی ئەم بانگەشەیە دەدەینەوە بە پشتیوانی خودا.

---

(١) سورة الفتح/٢.

(٢) سورة التوبة/٢٩.

(٣) سورة البقرة/٢٨٣.

(٤) سورة البقرة/١٨٥.

(٥) واتە "ابن حزم الظاهري"

(٦) الناسخ والمنسوخ في القرآن الكريم ص١٠-١٢.

بەشی دووەم-نەسخی قورئان بە سوننەت:

زانایانی موسڵمان لە ئوسوڵییەکان و فەقیهان و ئەهلی تەفسیر جیاوازیان هەیە لە نەسخی قورئان بە سوننەتی پێغەمبەر و بەسەر سێ ئاراستەدا دابەش بوون[1]:

ئاراستەی یەکەم- کە "الشافعي"(رەحمەتی خودای لێ بێت) سەرۆکایەتی دەکات ئەوەیە سوننەت ئاحاد بێت یان موتەواتیر ئایەتێکی قورئانی نەسڕیوەتەوە، هەموو ئەوەی لەم بارەیەوە وتراوە بریتییە لە تێکەڵی نێوان بوونی سوننەتی پێغەمبەر(ﷺ) بە نەسخکەری ئایەتێك بە شێوەیەکی سەربەخۆ لە قورئان لەگەڵ بوونی بە پشتیوان بۆ ئایەتی نەسخکەر[2]، بۆ نموونە هەر کەس پێیوایە فەرموودەکەی پێغەمبەر(ﷺ) ((ان الله اعطى كل ذي حق حقه فلا وصية لوارث -خودا مافی بە هەموو خاوەن مافێك داوە بۆیە وەسێت بۆ میراتگر نییە) نەسخکەرەوەی ئایەتی وەسێتی واجبە: ﴿كُتِبَ عَلَيْكُمْ إِذَا حَضَرَ أَحَدَكُمُ الْمَوْتُ إِنْ تَرَكَ خَيْرًا الْوَصِيَّةُ لِلْوَالِدَيْنِ وَالأَقْرَبِينَ بِالْمَعْرُوفِ حَقًّا عَلَى الْمُتَّقِينَ﴾، لەو بانگەشەیەدا بەهەڵەدا چووە، چونکە لە وتنی: (قد أعطى كل ذي حق حقه) "أعطى" فەرمانێکی رابردووە و رستە فەرمانییەکە هەواڵێکە دەربارەی حوکمێك خودا رایگەیاندووە، ئەو رستەیە رۆشنکردنەوەی مەرامی خودایە-سبحانه وتعالى- لەوەی ئایەتی وەسێت بە ئایەتی میرات سڕابێتەوە وەك چۆن بێبەشان لە

---

[1] ينظر في اصول الفقه الحنفي التوضيح والتنقيح لصدر الشريعة: ٣١٢/٢ وما بعدها" والمالكي شرح تنقيح الفصول للقرافي ص٣١٣ وما بعدها والشافعي جمع الجوامع وشرحه: ٥٣/٢ وما بعدها والحنبلي المسودة لآل تيمية ص٢٠١ وما بعدها. واصول فقه الامامية معالم الدين في الاصول للتبريزي ص٢٧١ وما بعدها" والزيدية هداية العقول الى غاية السؤل في علم الاصول للقاسم بن محمد: ٤٣٦/٢ وما بعدها" والظاهرية الإحكام في اصول الأحكام لابن حزم الظاهري: ٤٧٧/٤ وما بعدها" والاباضية شرح طلعة الشمس على الالفية للسالمي ص٢٨٩ وما بعدها.

[2] في جمع الجوامع: ٥٣/٢ (لە هەر شوێنێك نەسخی قورئان بە سوننە روویداوە قورئانێك بوونی هەیە پشتیوانی لێ دەکات).

بەکارهێنانی بیر و ژیری تەندروست وێنای دەکەن و رەفتاریان بریتییە لە چاولێکەری و دووبارەکردنەوەی قسەی خەڵکانی تر یان مەبەستەکەی کۆی ئایەتی وەسێتی واجب تایبەتکراوە بە ئایەتی میرات وەك لێکۆڵەران لە خاوەن بیرکردنەوەی تەندروست و پەیبردنی ورد دەیڵێن، لە هەردوو بارەکەدا کاری فەرموودەکە رۆشنکردنەوە و دووپاتکردنەوەیە بۆ حوکمی خودا، یەکسانە حوکمەکە نەسخ بێت یان تایبەتکردن.

بۆ ئاراستەکەی "الشافعي" کۆمەڵێك سەرخەر لە لێکۆڵەرانی ئوسوڵییەکانی زانستی ئوسوڵی فیقه لە هەموو مەزهەبە ئیسلامییە تۆمارکراوەکاندا[1] بوونیان هەیە، لێرەدا بوار نییە بۆ ناوهێنان و خستنەرووی بەڵگەکانیان، ئەوان جیاوازیان نەکردووە لە نێوان سوننەتی موتەواتیر و ئاحاددا، گەورەترین بەڵگەی ئەم ئاراستەیە ئەوەیە دەڵێن: قورئان کاری فەرموودەی پێغەمبەری(ﷺ) لە راگەیاندن و رۆشنکردنەوەدا کورت کردۆتەوە بەپێی ئایەتی: ﴿وَأَنزَلْنَا إِلَيْكَ الذِّكْرَ لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيْهِمْ﴾[2]

ئاراستەی دووەم– "ابن حزم الظاهري" سەرۆکایەتی دەکات، بریتییە لە گونجاوی نەسخی قورئان بە سوننەتی پێغەمبەر(ﷺ) و روودانی ئەو جۆرە نەسخە، یەکسانە سوننەتەکە موتەواتیر بێت یان ئاحاد، دەڵێت: ((قورئان بە قورئان و بە سوننەتی پێغەمبەر نەسخ دەکرێتەوە، سوننەتیش بە قورئان و بە سوننەتی پێغەمبەر دەسڕێتەوە، ئێمە پێمان وایە، و بە دروستی دەبینین یان یەکسانە لەلامان سوننەتەکە بە موتەواتیر یان بە ئاحاد گوزارابێتەوە، بەڵگەی ئەوە پێویستبوونی گوێڕایەڵییە بۆ ئەوەی لە پێغەمبەرەوە هاتووە وەك ئەو پێویستبوونەی گوێڕایەڵی کە بۆ قورئان هاتووە..)) پاشان بەردەوام دەبێت بە وتنی((گەر کەلامی پێغەمبەر وەحی

---

[1] هەر کەس دەیەوێت پەی بەم راستەقینەیە ببات با بگەڕێتەوە بۆ ئەو سەرچاوە ئاماژەبۆکراوانە و سەرچاوەکانی تر.

[2] سورة النحل/٤٤.

بێت لەلای خوداوه و قورئانیش وەحی بێت ئەوا نەسخ کردنی وەحی بە وەحی گونجاوە..)) پاشان دەڵێت: ((کارکردن بە فەرمووده باشتره له کارکردن بە ئایەتی نەسخکراو)).

لەم شیکردنەوانەدا –کە خاڵی نین لە هەڵەکاری، لەگەڵ ڕێزمان بۆ پلە و پایە زانستییەکەی– ئەم تێبینیانە دەکرێت، بەم جۆرە:

١–گوێڕایەڵی پێغەمبەر(ﷺ) واجبە لەدوای گوێڕایەڵی خودا وەك لەم بەدوای یەکتردا هاتنەی ناو ئایەتەکە: ﴿يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا أَطِيعُوا اللَّهَ وَأَطِيعُوا الرَّسُولَ وَأُوْلِي الأَمْرِ مِنْكُمْ﴾ [1] پلە و پایەی پێغەمبەر(ﷺ) یەکسان نییە بە گەورەیی و شکۆمەندی خودا، سوننەتی پێغەمبەر(ﷺ) بەدوای قورئاندا دێت لە هێزی پابەندکردن، نەسخکەر پێویستە بەهێزتر بێت لە نەسخکراوەکە یان پێی یەکسان بێت لە هێز و پلە و ئاستدا.

بۆیە هیچ پەیوەندییەك نییە لە نێوان پێویستبوونی گوێڕایەڵی پێغەمبەر و نەسخی قورئان بە سوننەت.

٢–قورئان وشە و گوزارەکانی و ماناکەی وەحییە، سوننەت تەنها ماناکەی وەحییە و هاوتابوون لە نێوانیاندا نییە و دژیەکیش لە نێوانیاندا نییە تا بە نەسخ هەڵبگیرێت.

٣–وتنی کارکردن بە فەرموودەی نەسخکەرەوە باشترە لە کارکردن بە ئایەتی نەسخکراو تەنها قسەیە و دەستگرتنە بەسەر داوادا، ئەو ئایەتە قورئانییە کامەیە بە سوننەت نەسخکراوەتەوە تاکو کارکردن بە فەرموودەی نەسخکەر چاکتر بێت لە کارکردن بە ئایەتی نەسخکراو؟

---

[1] سورة النساء/٥٩.

ئاراستەی سێیەم–بریتییە لە جیاکردنەوەی نێوان "گونجاو" و ""ڕوودان" لەلایەکەوە و لە نێوان فەرموودەی موتەواتیر لەگەڵ مەشهور و ئاحاد لەلایەکی ترەوە، هەیانە دەڵێت: نەسخی قورئان بە سوننەت "گونجاو"ە بەڵام ڕووی نەداوە[1].

هەیانە دەڵێت: نەسخی قورئان بە فەرموودەی موتەواتیر گونجاوە، نەك لە خوار ئەوەوە[2].

هەشیانە بە موتەواتیر و مەشهور لایان گونجاوە[3].

بۆ هەر ئاراستەیەك دەستەیەك بوونی هەیە، ئاراستەی سێیەم وەك ئاراستەی دووەم وایە بێبنەما و پووچە و شان لەسەر بەڵگەیەکی دروستی ڕازیکەر دانادات.

بۆچوونی ئێمە لەسەر بابەتەکە:

گەر مەبەستیان بە نەسخ مانا گشتییەکەی بێت لەلای پێشینی چاکان، ئەوا نەسخی قورئان گونجاوە لە ژیانی پێغەمبەر(ﷺ) و دوای ژیانی پێغەمبەر(ﷺ) بەهەموو ئەوەی تایبەتکردنی پێ گونجاوە لە سوننەت و ئیجماع و پێوانە و

---

[1] "التبريزي" کە لە ئیمامییەکانە (المرجع السابق ص٢٧٢) دەڵێت: (جیاوازی لە گونجانی نییە، بەڵکو جیاوازی لە ڕوودانییەتی). "البرماوي" (هداية العقول:٢/٤٣٦) دەڵێت: نەسخی قورئان بە سوننەتی موتەواتیر و پێچەوانەکەی و سوننەتی متەواتیر بە سوننەتی متەواتیر و نەسخی ئاحاد بە موتەواتیر ڕێگەپێنەدراوە لەبەر نەهاتنەدی تەواتوری گوزارەیی، هەموو فەرموودەیەك لە هەواڵی ئاحادە لە سەرەتاکەی یان کۆتاکەی یاخود سەنەدەکەی)

[2] في المسودة لآل تيمية ص٢٠٢ ((شێخی ئێمە–مەزهەبی مالیکی لە نەسخی قورئان– دەڵێت: لەلاین نەسخ بە ئاحاد دروست نییە، ئایا بە هەواڵی تەواتور گونجاوە، ئەوەش دوو ڕووی هەیە)) قارن شرح تنقيح الفصول ص٣١١.

[3] نەسخ ب فەرموودەی مەشهور خاوەنی "هداية العقول" دەیداتە پاڵ پاشینەکان لە حەنەفییەکان: ٤٣٧/١" ئیبازییەکانیش هەمان بۆچوونیان هەیە لە (طلعة الشمس: ٢٩٠/١ قورئان بە سوننەتی موتەواتیر نەسخ دەکرێتەوە یان بە سوننەتی مەشهور کە لەلایەن ئوممەتەوە قبوولکرابێت، نموونە بە فەرموودەی "لا وصية لوارث" دەهێننەوە کە ئایەتی وەسێتی سڕیوەتەوە لەلای ئەوان.

بەرژەوەندی و عورف، چونکە نەسخ بەم مانا گشتییە بریتییە لە تایبەتکردن و سنووردارکردن و قۆناغبەندی(پلە بەپلە) و رۆشنکردنەوەی پوختە و روخسەت وەك پێشتر باسمان کرد، ئەگەر مەبەستیشیان بە نەسخ ئەو مانایە بێت لای پاشینەکان لە ئوسولییەکان بوونی هەیە کە بریتییە لە سڕینەوەی وەحی پێشوو بە وەحییەك بەدوایدا هاتووە ئەوە بە کۆدەنگی هەموو لایەك لە دوای مردنی پێغەمبەر(ﷺ) روونەداوە و بە سوننەت و ئیجماع و پێوانە و شتانی تریش دیسان نەسخ روونادات، هەر بانگەشەیەك لەم بارەیە پووچ و بێبنەمایە بەهۆی زۆرێك لە بەڵگەوە کە هەندێکیان نەقڵی و هەندێکیان ئەقڵین.

أ.بەڵگە نەقڵییەکان(گوازراوەکان):

١–ئایەتی: ﴿مَا نَنسَخْ مِنْ آيَةٍ أَوْ نُنسِهَا نَأْتِ بِخَيْرٍ مِنْهَا أَوْ مِثْلِهَا﴾[1]، بۆیە فەرموودەی پێغەمبەر نە خێرترە لە قورئان و نە وەك قورئان وایە.

٢–ئایەتی: ﴿قُلْ مَا يَكُونُ لِي أَنْ أُبَدِّلَهُ مِنْ تِلْقَاءِ نَفْسِي إِنْ أَتَّبِعُ إِلاَّ مَا يُوحَى إِلَيَّ إِنِّي أَخَافُ إِنْ عَصَيْتُ رَبِّي عَذَابَ يَوْمٍ عَظِيمٍ﴾[2].

٣–فەرموودەی پێغەمبەر(ﷺ) ((گەر فەرموودەیەك لە منەوە بۆ ئێوە ریوایەت کرا ئەوا بەسەر کتێبەکەی خودادا بیخەنە روو، گەر لەگەڵی تەبا بوو قبووڵی بکەن، گەر پێچەوانەی بوو رەدی بکەنەوە))

هەر تەئویلێك بۆ ئەم بەڵگە نەقڵیانە بۆ سەلماندنی نەسخی قورئان بە سوننەت پووچ و بێبنەمایە، چونکە نەسخ پێچەوانەی بنەڕەتە و تەئویل پێچەوانەی بنەڕەتە و سەلماندنی پێچەوانەی بنەڕەت بە پێچەوانەی بنەڕەت پووچ و بێبنەمایە.

---

[1] سورة البقرة/١٠٦.

[2] سورة يونس/١٥.

ب–له بەڵگە ئەقڵییەکان:

١–ژیرمەندانی سەر زەوی کۆدەنگیان هەیە لەسەر ئەوەی ئەو کەسەی هەموارکردنەوەی یاسا یان سڕینەوەی لەدەستدایە هەر ئەو کەسە خاوەنی یاساڕێژییە، شەریعەتی ئیسلام ئایینی فیترەتی خاوێن و ژیری تەندروست و زانستی دروستە، وەك چۆن پێغەمبەر(ﷺ) مافی تەشریعی ئایەتێکی قورئانی نییە و هەر بەو جۆرە مافی هەموارکردنەوە و سڕینەوەی نییە.

٢–کارەکانی سوننەتی پێغەمبەر(ﷺ) لە پێنج کاردا کورتبووەتەوە کە لە ناویدا نەسخ بوونی نییە، ئەوانەش:

أ.تایبەتکردنی دەقێکی گشتی کە گشتییەکەی بە مەبەست نەگیراوە.

ب–سنووورداکردنی دەقێکی رەها کە رەهابوونەکەی بەمەبەست نەگیراوە.

ج–رۆشنکردنەوەی دەقێکی پوختە کە بەمەرامگیراو تیایدا ناڕۆشنە.

د–دووپاتکردنەوەی حوکمێکی هاتوو لە قورئاندا.

هـ–رۆشنکردنەوەی حوکمی رووداوێك قورئان چارەسەری نەکردبێت بە دەقێکی راشکاوی تایبەت.

وتنی هەر کارێکی تر بۆ سوننەتی پێغەمبەر(ﷺ) بیدعەیەکی ناباشە بەپێی کورتهەڵهێنانی کارەکەی لە رۆشنکردنەوەدا وەك لە ئایەتی: ﴿وَأَنزَلْنَا إِلَيْكَ الذِّكْرَ لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيْهِمْ﴾، نەسخ سڕینەوەیە نەك رۆشنکردنەوە، چونکە رۆشنکردنەوە بە کۆدەنگی جیایە لە هەڵوەشاندنەوە، هەر کەس پێچەوانەی ئەوە گومان دەبات ئەوا بە هەڵەداچووە.

٣–لە سەرەتای ئیسلامەوە تا ئەمڕۆمان یەك سوننەتی موتەواتیر نابینیتەوە دژیەکی هەبێت لەگەڵ یەك ئایەتی قورئانیدا، هەموو ئەوەی وتراوە لەم بارەیەوە وەهم و ئەندێشەیە و شان لەسەر بەڵگەی زانستی دانادات.

٤-قورئـان جێگیربوونەکـەی بڕاوەیـە(قطعـي الثبـوت) و هـەواڵی ئاحـاد جێگیربوونەکەی گومانئامێزە(ظني الثبوت)، هاوتابوون و بەرهەڵستکاری بوونی نییە لە نێوان بەڵگەی گومانئامێز و بەڵگەی بڕاوە و نەسخیش لقێکە لە دژیەکی.

٥-هەر وتنێك لەمەڕ نەسخی قورئان بە سوننەت بەرزکردنەوەی ئاستی سوننەت بۆ ئاستی قورئان پێویست دەکات یان دابەزاندنی ئاستی بەرزی قورئانە بۆ ئاستی سوننەت، پێویست پووچەڵە بە کۆدەنگی ژیرمەندان هەر بەو جۆرە پێویستکراوەکە.

بینا لەسەر ئەم راستییانە پێشنیاری لادانی ئەم بابەتە دەکەم لە هەموو کتێبەکانی ئوسولی فیقهی ئیسلامی، چونکە مەیدانێکی بەرینی لە جەدەل و گفتوگۆ داگیرکردووە بەدرێژایی هەزار ساڵ بەبێ هیچ سوود و قازانجێك لەپێناو گرنگیدان بە راستی و دروستی دوور لە هەڵە باوەکان، و بەتایبەت لە چاخێکدا زەینی خەڵکانی تر سەرقاڵی چوونە دەرەوەیە بۆ بۆشایی ئاسمان و ئاوەدانکردنەوەی هەسارەکانی تر لە رێگەی زانست و پێشکەوتنی تەکنەلۆژییەوە.

بەشی سێیەم- نەسخی قورئان بە ئیجماع:

سەرخەرانی نەسخ بەوەوە نەوەستاون نەسخی قورئان بە سوننەت بکەنەوە، بەڵکو سنووری ماقووڵیان تێپەڕاندووە لەگەڵ قورئان، بۆیە دەڵێن: نەسخی قورئان بە سوننەت ئیجماعی فەقیهانی لەسەرە، بەڵکو زیاتر لەوە هەندێك پێیان وایە قورئان بە پێوانە(قیاس) نەسخ دەکرێتەوە.

دەڵێم: گەر مەبەستیان بە نەسخ مانای گشتی و گشتگیر بێت بۆ تایبەتکردنی گشتی و سنووردارکردنی رەها و شتانی تریش ئەوە قسەکەیان دروست و قبووڵکراوە، گەر مەبەستیان پێی مانای تایبەت بێت واتە هەڵوەشانەوەی قورئان بە ئیجماع ئەوە بۆچوونێکی پووچ و بێبنەمایە، چونکە ئیجماع لە دوای مردنی پێغەمبەر(ﷺ) دەبێت بە سەرچاوەیەکی شەرعی و نەسخ رۆڵی لە دوای مردنی پێغەمبەر(ﷺ) کۆتایی پێهاتووە، ئیتر چۆن دەتوانی بە شتێك بڵێی ئیجماع کە پێچەوانەی ئیجماعە؟.

قسه لەمەڕ نەسخی قورئان بە ئیجماع لە زۆرێك لە سەرچاوە ئوسوڵییەكاندا هاتووە، لەوانە ئەوەی لە "المسودة"دا[1] هاتووە: ((شێخمان "محمد بن بركات النحوي" لە كتێبەكەیدا"الناسخ والمنسوخ" نەسخی قورئان بە ئیجماع و هەندێكیش بە پێوانە بە گونجاو دەزانن))

پاشان خاوەن قسەكە لەسەر ئەم گوزارەیە قسەیەكی مەنتقی دەكات و دەڵێت:

(دەڵێم: هەر كەس نەسخی بەوە لێكداوەتەوە بریتی بێت لە سنووردارکردنی رەها یان تایبەتكردن قسەكەی بەدوور ناگیرێت ئیجماع سنووردارکەر یان تایبەتكەر بێت بۆ دەقێك، هەروەها ئیجماعی دووەم سنووردارکەر و تایبەتكەر بێت بۆ ئیجماعی یەكەم)

"التبریزي"[2] دەڵێت: ((نەسخكردنەوەی قورئان و سوننەت بە ئیجماع جێگەی ناكۆكییە و لەسەر جیاوازی بیناكراوە لەوەی ئایا دەتوانرێ ئیجماع پێش وەستانی وەحی دابمەزرێت واتە لەسەردەمی پێغەمبەردا(ﷺ) یان نە، چونكە نەسخ تەنها لە سەردەمی پێغەمبەردا دێتە دی، گەر بوترێت ئیجماع لە سەردەمی ئەودا(ﷺ) گونجاوە ئەوا شیاوە نەسخی پێبكرێت بەوەی نەسخكەری قورئان و سوننەت بێت و بە پێچەوانەشەوە))، پاشان لەسەر ئەم قسەیە دەڵێت: ئەم گفتوگۆیانە لەڕووی ئەقڵییەوە گونجاوە، بەڵام سوودێكی لەسەر پەیدا نابێت، چونكە لە لایەنی كردارییەوە روونەداوە[3].

---

[1] لە "اصول الفقه الحنبلي ص٢٠٢-٢٠٣ سێكەس لە "آل تیمیة" كە بریتین لە " مجد الدین ابو البركات (عبد السلام بن عبد الله)، وشهاب الدین ابو المحاسن (عبد الحلیم بن عبد السلام)، تقي الدین ابو العباس احمد بن عبد الحلیم" بەدوای یەكتردا دایانناوە.

[2] معالم الدین المرجع السابق ص٢٧٢.

[3] المرجع السابق ص٢٧٣.

هەندێ بەڵگە دەهێننەوە[1] لەسەر گونجاوی نەسخی قورئان بە ئیجماع بەم بەڵگانە:

١-"ابن عباس" چووە لای "عثمان بن عفان"-خوایان لێ رازی بێت- و فەرمووی: دوو برا بە سێ یەك تا شەش یەك میرات لە دایکیان نابەن بەڵکو سێیەك دەبەن لەگەڵ کۆبوونەوەیان لەگەڵی، چونکە خودا دەفەرموێت: ﴿فَإِنْ كَانَ لَهُ إِخْوَةٌ فَلِأُمِّهِ السُّدُسُ﴾[2]، دوو برا(الأخوان) بە زمانی قەومەکەت جیایە لە "إخوة"[3]، عوسمان فەرمووی: ناتوانم ئەوەی پێش من لەسەری بوون و بە وڵاتاندا ڕۆیشتووە و خەڵکی بەوە میراتی گرتووە ڕەد بکەمەوە[4].

ڕووی ئاماژە لەم ئەسەرەدا لەسەر سڕینەوەی قورئان بە ئیجماع ئەوەیە قسەکەی عوسمان ئاشکرایە لەوەدا کە ئیجماعی هاوەڵان لەسەر ئەوەی دایك بە دوو برا لە سێیەکەوە بێبەش دەکات بۆ شەش یەك، ئەمەش نەسخی حوکمی ئایەتەکەی کردووە لەوەی بێبەشبوون به سێ برا و زیاتر لە سێ برا دەبێت، ئەم ئاماژە پێکردنە لەم ڕووانەوە پووچ و بێبنەمایە:

أ.لە کەمترین کۆکردنەوەدا دوو ڕا هەیە: یەکەمیان دەڵێت سیانە، و دووەمیان دەڵێت کەمترینیان دوانە، بۆیە ئیجماع لەسەر لێکدانەوەی دووەم جێگیر بووە، و لە نێوان مەبەست لە "الأخوة" لە ئایەتەکەدا دوو و زیاتر لە دووە، وتنی نەسخ تێکەڵییەکە لە نێوان تەفسیر و نەسخدا.

ب-ئایەتەکە بەڕاشکاوی نەیفەرمووە دایك بە دوو برا لە سێیەك بێبەش ناکرێت تا بوترێت ئیجماع لەسەر ئەوەی دوو برا دایك بێبەش بکات نەسخکەرە بۆی.

---

[1] كعيسى بن أبان ومن معه شرح تنقيح الفصول للقرافي ص٣١٤.

[2] سورة النساء/١١.

[3] بەمە فیقهی زاهری کاریکردووە، دایك گەر لەگەڵ دوو برا یان چوار خوشکدا یان برایەك و دوو خوشکدا کۆبوویەوە سێیەکی تەواوی لە لێجێماو بۆ هەیە). المحلى: ٢٥٨/٩.

[4] أخرجه- الحاكم وقال صحيح الاسناد: ٣٣٥/٤.

ج-ئیجماع له سەردەمی پەیامدا دانەمەزراوە، چونکە گەر پێغەمبەر(ﷺ) لەگەڵ کۆبووەکاندا کۆنەبووبێتەوە ئەوا ئیجماعێکی پووچ و بێبنەما بووە، گەر لەگەڵیان تەبا بووبێت ئەوا سەرچاوەکە سوننەتی پێغەمبەرە(ﷺ) نەك ئیجماع، بەڵکو ئیجماع - وەك سەرچاوەی سێیەم لە دوای قورئان و سوننەت- لە دوای مردنی پێغەمبەر(ﷺ) دامەزراوە، بەڵگەنەویستە رۆڵی نەسخ کۆتایی پێهاتووە بە مردنی پێغەمبەر(ﷺ) ئیتر چۆن دروستە ئەم ئیجماعە یان شتانی تر نەسخکەر بن بۆ قورئان؟

لە گرنگترین مەرجەکانی نەسخ ئەوەیە نەسخکەر دەقێکی شەرعی بێت، لە کاتێکدا ئیجماع ئیجتیهادێکی ئەقڵییە لە موجتەهیدەکانەوە لەسەر بەڵگەیەکی شەرعی شان دادەدات، هەندێ جاریش ئەو پاڵپشتییە بەرژەوەندی یان عورف یان پێوانە یان هاوشێوەکانی ترە.

٢-سەرخەرانی نەسخی قورئان بە نەمانی بەشی "مؤلفة قلوبهم" لە زەکات بە بڕیاری ئیجماع بەڵگە دەهێننەوە، و دەڵێن: هاوەڵان کۆدەنگیان هەیە لەسەر نەسخی بەشێك لەم ئایەتە: ﴿إِنَّمَا الصَّدَقَاتُ لِلْفُقَرَاءِ وَالْمَسَاكِينِ وَالْعَامِلِينَ عَلَيْهَا وَالْمُؤَلَّفَةِ قُلُوبُهُمْ وَفِي الرِّقَابِ وَالْغَارِمِينَ وَفِي سَبِيلِ اللَّهِ وَابْنِ السَّبِيلِ فَرِيضَةً مِنَ اللَّهِ وَاللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ﴾[1]، ئەوەش ئەو بەشەیە: ﴿وَالْمُؤَلَّفَةِ قُلُوبُهُمْ﴾، ئەوان مافیان لە زەکات و تەماشاکردنیان وەك بەشێك لەو هەشت بەشەی زەکاتیان پێ دەدرێت بە قورئان جێگیربووە و بە ئیجماعی هاوەڵان نەسخکراوەتەوە لە سەردەمی خەلیفەکانی راشیدیندا، ئەم بۆچوونە پووچە رەد دەکرێتەوە بەوەی تێکەڵییەکە لە نێوان نەسخ و راگرتنی کارکردن بە حوکمی دەقەکە لەبەر دواکەوتنی هۆی داواکەر بۆی کە بریتییە لە پێویستی ئیسلام بۆ راکێشانی دڵی ئەو دەستەیە پێیان دەوترێت "مؤلفة قلوبهم"، زانایانی موسڵمان کۆدەنگیان هەیە لەسەر ئەوەی حوکم لەگەڵ هۆیەکەی دەسوڕێتەوە بە بوون و نەبوون.

---

[1] سورة التوبة/٦٠.

وەستانی کارکردن بە دەق بەهۆی وەستانی هۆیەکەیەوە و دواکەوتن لێی لەدوای ئەوەی ئیسلام بێنیاز بوو لە هاوکاریان و نەوەستانیان دژ بە بڵاوبوونەوەی پەیامی محەمەد(ﷺ)، چونکە ئەوکات بەرژەوەندییەکانیان بە ئیسلام زیانی بەرکەوتبوو.

سەرباری ئەوە ئەم ئیجماعە لە سەردەمی خەلافەتی ئەبوبەکردا-خوا لێی رازی بێت- دامەزراوە بە پێشنیاری عومەری کوڕی خەتتاب-خوا لێی رازی بێت-، بۆیە گەورەمان عومەر لەلایەن هەندێ دەستەوە تۆمەتبارکرا بەوەی بە ئیجتیهادی خۆی نەسخی قورئانی کردۆتەوە، ئەمەش بوختانە و هیچ بنچینەیەکی بۆ نییە، و ئیجماعی بێدەنگبوون لەلایەن هاوەڵانەوە لە دوای مردنی پێغەمبەر(ﷺ) دامەزراوە، و رۆڵی نەسخ بە مردنی ئەو(ﷺ) کۆتایی پێهاتووە و لە دوای ئەو نەسخ بوونی نییە.

٣-سەرخەرانی نەسخی قورئان بە ئیجماع[1] بەڵگە دەهێننەوە بەوەی ئیجماع بەڵگەیەکە لە بەڵگە شەرعییە براوەکان بۆیە گونجاوە نەسخی پێبکرێت وەك قورئان و سوننەتی پێغەمبەر(ﷺ) ئەم بۆچوونە رەد دەکرێتەوە بەوەی وتمان ئیجماع بووە بە بەڵگەی شەرعی لە دوای قورئان و سوننەتی پێغەمبەر(ﷺ) لە پاش مردنی پێغەمبەر(ﷺ) و سەردەمی نەسخ کۆتایی پێهاتووە بە مردنی ئەو(ﷺ) پاشان گەر

[1] لە "معالم الدين المرجع السابق ص٢٧٢-٢٧٣: ((لە هەندێ لە پاشینانەوە ئیجماع دەگونجێ نەسخکەر بێت، چونکە تەنە رێکەوتن نییە، بەڵکو بە پاڵپشتیکی براوە بە هەواڵێکی موتەواتیر و جۆرەکانی تری فەرموودە، بۆیە نەسخکەر ئەو پاڵپشتەیە نەك خودی ئیجماع، ئەوەی ئیجماع بەڵگەیەکی ئەقڵی بێت ئەوەی تێدایە هەر کات ئەقڵی فیتری حوکمی پێ بکات شەرعیش حوکمی پێ دەکات(لەسەر ئەو بنچینەی حوکمی خودا تەبایە لەگەڵ حوکمی ئەقڵ بەسەر شتەکاندا، بینا لەسەر حوسن و قوبحی ئەقڵی) بۆیە دروستە نەسخی ئیجماع بکرێت بە کیتاب و سوننەت، هەر بەو جۆر دروستە پێچەوانەکەی ئەنجان بدرێت) لە "شرح تنقيح الفصول للقرافي ص٣١٤: ((الشيخ سيف الدين" دەڵێت: ئەوەی بە ئیجماع حوکمێکی جێگیری پێ بسڕێتەوە زۆرێك نەرێیان کردووە و کەمێك بە گونجاویان زانیوە، هەروەها ئەوەی ئیجماع نەسخکەر بێت جمهور قەدەغەیان کردووە و هەندێ لە موعتەزیلە بە گونجاویان داناوە، هەروەها "عيسى بن ابان"یش).

ئەم شیکردنەوەیە راست بێت ئەوا پێویست دەکات بوترێت نەسخی قورئان بە هەموو بەڵگەیەکی شەرعی کە شەرع بایەخی پێ دەدات لە عورف و پێوانە و بەرژەوەندی و شتانی تریش گونجاوە، پێویست پووچەڵە و هەر بەو جۆرە پێویستکراویش.

نەسخی ئیجماعیش بە ئیجماع دروستە، بەڵکو بەدوور نازانرێت روویدابێت بینا لەسەر ئەوەی ئیجماع بریتییە لە رێکەوتنێکی موجتەهیدانی ئوممەتی محمد(ﷺ) لە چاخێك لە چاخەکاندا دوای مردنی پێغەمبەر(ﷺ) لەسەر حوکمێکی ئیجتیهادی شەرعی شاندادەر لەسەر پاڵپشتێکی شەرعی.

هەر بەو جۆرە دەگونجێ بەرژەوەندییەکی گشتی یان عورفێك یان هاوشێوەکانی ئەو دوانە بێت، رۆشنە بەرژەوەندییەکان و عورفەکان بە گۆڕانی کات و شوێن گۆڕانیان بەسەردا دێت، دەبێ چ رێگرێك بوونی هەبێت گەر ئیجماعی موجتەهیدان لەسەر حوکمێکی شەرعی دامەزرا پاڵپشت بۆ بەرژەوەندییەکی گشتی شەرعی پاشان بەرهەمی پێشکەوتنی ژیان ئەو بەرژەوەندییە گۆڕانی بەسەردا هات و بوو بە مەفسەدەیەك، لەو بارەدا هەڵوەشاندنەوەی ئەو ئیجماعە گونجاوە بە ئیجماعێکی نوێ کە لەسەر بەرژەوەندییەکی نوێ بیناکراوە، ئەمەش کارێکی گونجاو و نزیکە لە ژیری تەندروست و ژیانی کردارییەوە سەرەڕای نەرێکردنی نەسخی ئیجماع[1] بە

---

[1] لە "هداية العقول المرجع السابق: ٢/٤٤١-٤٤٢ ((جمهور لەسەر ئەوەن ئیجماع نەسخ نابێتەوە، چونکە نەسخکەری گریمانەکراوی یان براوەیە ئەوکات ئیجماع هەڵەیەکە بەهۆی دامەزرانی لەسەر پێچەوانەی بەڵگەی براوە، چونکە گەر دەق بێت ئەوا لە ئیجماع پێشکەوتووە بەهۆی ئەوەی لەسەردەمی پێغەمبەردا(ﷺ) دانەمزراوە، ئیجماعیش پێچەوانەی دەقی براوە دانامەزرێت، گەرۆ ئیجماعێکی براوە بێت ئەوا ئیجماع پێچەوانەی ئیجماع دانامەزرێت، ئەگینا پێویست دەکات یەکێك لە دوو ئیجماعەکە پووچەڵ بێت، یەکسانە پاڵپشتەکەی گومانئامێز بێت یان براوە بێت، لەبەر ئەوەی بووچەڵی ئیجماعی براوە رێگەپێنەدراوە ئەوا ئیجماعی تری گریمانەکراو نەسخکەرەوەیەکی پووچە بەهۆی دامەزرانی لەسەر هەڵە))" لەسەر ئەم شیکردنەوەیە تێبینی پەیوەستبوونەکە دروستە، ئەمەش کاری هەر دوو بەڵگەیەکە کە یەکێکیان نەسخکەر و ئەویتریان نەسخکراو بێت، بەڵام پێویست پووچ نییە

ئیجماع لەگەڵ وتنی نەسخی قورئـان بـە ئیجمـاع، ئـەم بانگەشـەیە پێویسـت دەکات ئاستی ئیجماع بەهێزتر و باڵاتر بێت لە قورئان یـان پێـی یەکسـان بێـت، پێویسـتەکە پووچە و پێویستکراوەش هەر بەو جۆرە.

دابەشکردنی سێیەم لەڕووی سروشتی حوکمەوە:

هەندێ لە بانگـەرانی نەسـخ[1] نەسـخی قورئـان بـە قورئانیـان لـەڕووی سروشـتی حوکمی نەسخکەر و نەسخکراو لەفەرز و نەدب دابەشکردووە بۆ ئەم بەشانە:

أ. نەسخی فەرز بە فەرز وەك نەسخی بەندکردنی زیناکەر بە دارلێدان.

ب-نەسخی نەدب بە فەرز، وەك: جەنگ پێشتر مەنـدوب بـوو، پاشـان نەدبەکـەی نەسخکرایەوە و بوو بە فەرز لەسەر هەر کەسێك بتوانێـت چـەك هـەڵبگرێت و لەگـەڵ دوژمن بجەنگێت.

ج-نەسخی فەرز بـە نـەدب وەك نەسـخی شـەونوێژ بـە خوێندنـەوەی قورئـان لـە ئایـەتی: ﴿فَـاقْرَءُوا مَـا تَیَسَّـرَ مِـنْ الْقُـرْآنِ﴾، ئەمـەش بانگەشـەیەکی پووچـە بـەم بەڵگانە:

١-گەر دابەشکردنەکە دروست بێت لەڕووی سروشتی حوکمەوە ئەوا بەشـی تـری دەگرتە خۆ وەك نەسخی گونجاو(الجواز) بە حەرام و پێچـەوانەی ئـەوەش، هـەروەها نەسخی واجب بە حەرام و پێچەوانەکەی، چونکە حوکمـە داواکارییـەکان پێـنجن نـەك تەنها فەرز و نەدب بن.

٢-نەسخی بەندکردن بە دارلێدان لە تاوانی سزادا بانگەشەیەکی پووچە وەك چۆن لە جێگەی خۆی دەیخەینە روو.

---

بـەهۆی گونجـاوی گـۆڕانی ئیجمـاع بـە گـۆڕانی پاڵپشـتەکەی کـە بریتییـە لـە بەرژەوەندییەکی گۆڕاو.

[1] لەوانە "مکی" وەك چۆن "السوطي" ئەم دابەشکردنەی لێوە گواستۆتەوە لـە کتـێبی "الاتقان"دا ٢/٢١.

٣-بانگەشەی نەسخی ئەدب بە فەرز لە جەنگدا بێبنەمایە چونکە لە قورئاندا ئایەتێك نابینینەوە فەرمانی کردبێت بە جەنگان لە رێگەی ئەدبەوە و پاشان نەسخکرابێتەوە بە ئایەتێکی تر کە ئاماژە بکاتە سەر فەرزی جەنگان، چونکە جەنگان لە کاتی پێویستیدا فەرزی کیفایەیە لەسەر هەرکەسێك توانای بەسەریدا هەبێت هەر لەسەرەتاوە، بەبێ ئەوەی بە ئەدبدا گوزەر بکات یەکەمجار و بە فەرزدا دووەمجار.

٤-هیچ بەرهەڵستییەك نابینرێتەوە لە نێوان شەونوێژ و خوێندنی قورئان لە جێگەی خۆی بە درێژی باس لە بانگەشەی نەسخی شەونوێژ دەکەین بە خوێندنەوەی قورئان.

دوای ئەم ڕێخۆشکردنە بە بەڵگەی نەقڵی و ئـەقڵی دەست دەبەین بۆ گفتوگۆی هەموو ئەوەی وتراوە دەربـارەی نەسـخی هـەر ئایـەتێك پێیـان وایـە نەسـخکراوە لـەڕووی حوکمـەوە و ماوەتـەوە لـەڕووی خوێندنـەوەوە لـە مەسـحەفی شـەریفی بەردەسـتی موسـڵمانان، لـە ئایـەتی سـێیەمی سـورەتی "البقـرة"ەوە دەسـتپێدەکەین﴿وَمِمَّـا رَزَقْنَـاهُمْ يُنفِقُـونَ﴾ و بـە ئایـەتی شەشـەمی سورەتی: "الكافرون"﴿لَكُمْ دِينُكُمْ وَلِـيَ دِيـنِ﴾ کۆتـایی پـێ دێـنین، داوا لـە خـودای خـاوەن دەسەڵات دەکـەین راسـتیمان ئیلـهام بکـات، ئـەو بەسـەر هـەموو شـتێکدا دەستڕۆیشـت و خـاوەن دەسەڵاتە.

# نەسخی بانگەشەبۆکراو لە سورەتی "البقرة"دا

بانگەشـەکەرانی نەسـخ لـە قورئانـدا پێیـان وایـە ئـەو ئایەتانـەی لـە سـورەتی "البقره"دا نەسخکراونەتەوە گەیشتوونەتە سی ئایەت، ئێستا بـەپێی ئـەو بانگشـەیە ئایەتەکان دەخەینە روو:

﴿الَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِالْغَيْبِ وَيُقِيمُونَ الصَّلاَةَ وَمِمَّا رَزَقْنَاهُمْ يُنفِقُونَ ﴾ (٣)

﴿إِنَّ الَّذِينَ آمَنُوا وَالَّذِينَ هَادُوا وَالنَّصَارَى وَالصَّابِئِينَ مَنْ آمَنَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ وَعَمِلَ صَالِحًا فَلَهُمْ أَجْرُهُمْ عِنْدَ رَبِّهِمْ وَلاَ خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلاَ هُمْ يَحْزَنُونَ.﴾ (٦٢)

﴿بَلَى مَنْ كَسَبَ سَيِّئَةً وَأَحَاطَتْ بِهِ خَطِيئَتُهُ فَأُوْلَئِكَ أَصْحَابُ النَّارِ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ﴾ (٨١)

﴿وَإِذْ أَخَذْنَا مِيثَاقَ بَنِي إِسْرَائِيلَ لاَ تَعْبُدُونَ إِلاَّ اللَّهَ وَبِالْوَالِدَيْنِ إِحْسَانًا وَذِي الْقُرْبَى وَالْيَتَامَى وَالْمَسَاكِينِ وَقُولُوا لِلنَّاسِ حُسْنًا وَأَقِيمُوا الصَّلاَةَ وَآتُوا الزَّكَاةَ ثُمَّ تَوَلَّيْتُمْ إِلاَّ قَلِيلاً مِنْكُمْ وَأَنْتُمْ مُعْرِضُونَ﴾. (٨٣)

﴿يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لاَ تَقُولُوا رَاعِنَا وَقُولُوا انظُرْنَا وَاسْمَعُوا وَلِلْكَافِرِينَ عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾ (١٠٤)

﴿ فَاعْفُوا وَاصْفَحُوا حَتَّى يَأْتِيَ اللَّهُ بِأَمْرِهِ إِنَّ اللَّهَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ﴾ (١٠٩)

﴿وَلِلَّهِ الْمَشْرِقُ وَالْمَغْرِبُ فَأَيْنَمَا تُوَلُّوا فَثَمَّ وَجْهُ اللَّهِ إِنَّ اللَّهَ وَاسِعٌ عَلِيمٌ﴾ (١١٥)

﴿قُلْ أَتُحَاجُّونَنَا فِي اللَّهِ وَهُوَ رَبُّنَا وَرَبُّكُمْ وَلَنَا أَعْمَالُنَا وَلَكُمْ أَعْمَالُكُمْ وَنَحْنُ لَهُ مُخْلِصُونَ﴾ (١٣٩)

﴿إِنَّ الَّذِينَ يَكْتُمُونَ مَا أَنزَلْنَا مِنَ الْبَيِّنَاتِ وَالْهُدَى مِن بَعْدِ مَا بَيَّنَّاهُ لِلنَّاسِ فِي الْكِتَابِ أُولَئِكَ يَلْعَنُهُمُ اللَّهُ وَيَلْعَنُهُمُ اللاَّعِنُونَ﴾. (١٥٩)

﴿إِنَّمَا حَرَّمَ عَلَيْكُمُ الْمَيْتَةَ وَالدَّمَ وَلَحْمَ الْخِنزِيرِ وَمَا أُهِلَّ بِهِ لِغَيْرِ اللَّهِ﴾ (١٧٣)

﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا كُتِبَ عَلَيْكُمُ الْقِصَاصُ فِي الْقَتْلَى الْحُرُّ بِالْحُرِّ وَالْعَبْدُ بِالْعَبْدِ وَالأُنثَى بِالأُنثَى﴾ (١٧٨)

﴿كُتِبَ عَلَيْكُمْ إِذَا حَضَرَ أَحَدَكُمُ الْمَوْتُ إِن تَرَكَ خَيْرًا الْوَصِيَّةُ لِلْوَالِدَيْنِ وَالأَقْرَبِينَ بِالْمَعْرُوفِ حَقًّا عَلَى الْمُتَّقِينَ﴾ (١٨٠)

﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا كُتِبَ عَلَيْكُمُ الصِّيَامُ كَمَا كُتِبَ عَلَى الَّذِينَ مِن قَبْلِكُمْ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ﴾ (١٨٣)

﴿وَعَلَى الَّذِينَ يُطِيقُونَهُ فِدْيَةٌ طَعَامُ مِسْكِينٍ فَمَن تَطَوَّعَ خَيْرًا فَهُوَ خَيْرٌ لَّهُ وَأَن تَصُومُوا خَيْرٌ لَّكُمْ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ﴾ (١٨٤)

﴿وَقَاتِلُوا فِي سَبِيلِ اللَّهِ الَّذِينَ يُقَاتِلُونَكُمْ وَلاَ تَعْتَدُوا إِنَّ اللَّهَ لاَ يُحِبُّ الْمُعْتَدِينَ﴾ (١٩٠)

﴿وَلاَ تُقَاتِلُوهُمْ عِندَ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ حَتَّى يُقَاتِلُوكُمْ فِيهِ فَإِن قَاتَلُوكُمْ فَاقْتُلُوهُمْ كَذَلِكَ جَزَاءُ الْكَافِرِينَ﴾ (١٩١)

﴿فَإِنِ انتَهَوْا فَإِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾ (١٩٢)

﴿وَلاَ تَحْلِقُوا رُءُوسَكُمْ حَتَّى يَبْلُغَ الْهَدْيُ مَحِلَّهُ﴾ (١٩٦)

﴿يَسْأَلُونَكَ مَاذَا يُنفِقُونَ قُلْ مَا أَنفَقْتُم مِّنْ خَيْرٍ فَلِلْوَالِدَيْنِ وَالأَقْرَبِينَ وَالْيَتَامَى وَالْمَسَاكِينِ وَابْنِ السَّبِيلِ وَمَا تَفْعَلُوا مِنْ خَيْرٍ فَإِنَّ اللَّهَ بِهِ عَلِيمٌ﴾ (٢١٥)

﴿كُتِبَ عَلَيْكُمُ الْقِتَالُ وَهُوَ كُرْهٌ لَّكُمْ وَعَسَى أَن تَكْرَهُوا شَيْئًا وَهُوَ خَيْرٌ لَّكُمْ وَعَسَى أَن تُحِبُّوا شَيْئًا وَهُوَ شَرٌّ لَّكُمْ وَاللَّهُ يَعْلَمُ وَأَنتُمْ لاَ تَعْلَمُونَ﴾ (٢١٦)

﴿يَسْأَلُونَكَ عَنِ الشَّهْرِ الْحَرَامِ قِتَالٍ فِيهِ قُلْ قِتَالٌ فِيهِ كَبِيرٌ وَصَدٌّ عَن سَبِيلِ اللَّهِ وَكُفْرٌ بِهِ..﴾ (٢١٧)

﴿يَسْأَلُونَكَ عَنْ الْخَمْرِ وَالْمَيْسِرِ قُلْ فِيهِمَا إِثْمٌ كَبِيرٌ وَمَنَافِعُ لِلنَّاسِ وَإِثْمُهُمَا أَكْبَرُ مِنْ نَفْعِهِمَا﴾ (٢١٩)

﴿وَيَسْأَلُونَكَ مَاذَا يُنفِقُونَ قُلْ الْعَفْوَ﴾ (٢١٩)

﴿وَلاَ تَنكِحُوا الْمُشْرِكَاتِ حَتَّى يُؤْمِنَّ﴾ (٢٢١)

﴿وَالْمُطَلَّقَاتُ يَتَرَبَّصْنَ بِأَنفُسِهِنَّ ثَلاَثَةَ قُرُوءٍ﴾ (٢٢٨)

﴿وَلاَ يَحِلُّ لَكُمْ أَنْ تَأْخُذُوا مِمَّا آتَيْتُمُوهُنَّ شَيْئًا إِلاَّ أَنْ يَخَافَا أَلاَّ يُقِيمَا حُدُودَ اللَّهِ فَإِنْ خِفْتُمْ أَلاَّ يُقِيمَا حُدُودَ اللَّهِ فَلاَ جُنَاحَ عَلَيْهِمَا فِيمَا افْتَدَتْ بِهِ﴾ (٢٢٩)

﴿وَالْوَالِدَاتُ يُرْضِعْنَ أَوْلاَدَهُنَّ حَوْلَيْنِ كَامِلَيْنِ﴾ (٢٣٣)

﴿وَالَّذِينَ يُتَوَفَّوْنَ مِنْكُمْ وَيَذَرُونَ أَزْوَاجًا وَصِيَّةً لأَزْوَاجِهِمْ مَتَاعًا إِلَى الْحَوْلِ غَيْرَ إِخْرَاجٍ فَإِنْ خَرَجْنَ فَلاَ جُنَاحَ عَلَيْكُمْ فِي مَا فَعَلْنَ فِي أَنفُسِهِنَّ مِنْ مَعْرُوفٍ وَاللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ﴾ (٢٤٠)

﴿لاَ إِكْرَاهَ فِي الدِّينِ قَدْ تَبَيَّنَ الرُّشْدُ مِنْ الْغَيِّ﴾ (٢٥٦)

﴿يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا تَدَايَنتُمْ بِدَيْنٍ إِلَى أَجَلٍ مُسَمًّى فَاكْتُبُوهُ..﴾، ﴿وَأَشْهِدُوا إِذَا تَبَايَعْتُمْ﴾ (٢٨٢)

﴿وَإِنْ كُنتُمْ عَلَى سَفَرٍ وَلَمْ تَجِدُوا كَاتِبًا فَرِهَانٌ مَقْبُوضَةٌ﴾ (٢٨٣)

﴿وَإِنْ تُبْدُوا مَا فِي أَنفُسِكُمْ أَوْ تُخْفُوهُ يُحَاسِبْكُمْ بِهِ اللَّهُ﴾ (٢٨٤)

-ئایەتی(۳)ی سورەتەکە: ﴿وَمِمَّا رَزَقْنَاهُمْ يُنفِقُونَ﴾ ئەمەش بەشێکە لە ئایەتی(۳) ﴿الَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِالْغَيْبِ وَيُقِيمُونَ الصَّلاَةَ وَمِمَّا رَزَقْنَاهُمْ يُنفِقُونَ﴾[1].

بنەڕەتی خەرجکردن(الإنفاق) بریتییە لە دەرکردنی ماڵ و دارایی لە دەست، وشەی "من" لە وشەی "مما"دا بۆ بەشە(تبعیض) واتە لە بەشێك(لە هەندێك) لەوەی پێیاندراوە وەك پارێزگارییەك لەسەر ماڵ و سامانیان و دوورخستنەوەی زیادەخەرجی و دەستبڵاوی ناباش و نەهیلێکراو، چونکە زیادەخەرجی(زیادەڕەوی) لە هەموو شتێکدا کارێکی قبووڵکراو نییە با لە رێگەی خێر و چاکەشدا بێت، واتە جیاکەرەوەی خەرجکەر بە صەدەقە بە هەندێ لە ماڵ و سامانەکەی.

خەرجکردن هەندێ جار لەوانەیە پێویست(واجب) بێت و هەندێ جاریش پەسەند بێت(مندوب)، وەك چۆن بۆی هەیە "موباح" و حەرامکراو" و ناپەسەند(مکروە) بێت بەپێی توانای دارایی خەرجکەر و پێویست لەسەرخەرجکراو و سروشتەکەی لەو رووەوە رووی خێر بێت یان رووی خراپە و تاوان، خەرجکردنی پێویست(الواجب) بریتییە لە زەکات.

مەبەست پێی لەم ئایەتەدا گشتگیرترە لە زەکات، بەڵکو خەرجکردن لەسەر خۆ و خانەوادە و هەژاران و گەدایان و هەموو دامەزراوەیەکی چاکخوازی دەگرێتەوە[2]، لەبەر گرنگی خەرجکردن خودا-سبحانه وتعالى- لە زیاتر لە (۷۰) ئایەتی قورئاندا فەرمانی بە خەرجکردن کردووە، چونکە ئیسلام ئایینی هاوکاری و کۆمەك و یارمەتی و دەستگرۆیی ئابوورییانەیە لە نێوان دەوڵەمەندان و هەژاراندا.

---

[1] سورة البقرة/۳.

[2] الرازي (العلامة ضياء الدين عمر) الشهير بخطيب الرى تفسيره الشهير بالتفسير الكبير ومفاتيح الغيب۱/۳٥ الزمخشري (العلامة ابو القاسم جار الله محمود بن عمر) (٤٦٧-٥۳۸) تفسيره الكشاف عن حقائق التنزيل وعيون الاقاويل في وجوه التاويل ۱/۱۳۲.

سەرباری ئەوە هەندێ کەس بانگەشەی ئەوە دەکەن هەر ئایەتێك فەرمانی بە خەرجکردن(الإنفاق) کردووە بە ئایەتی زەکات سڕاوەتەوە، لەو ئایەتە نەسخکراوانە —پێیانوایە— بە ئایەتی زەکات سڕاونەتەوە: ﴿وَمِمَّا رَزَقْنَاهُمْ يُنفِقُونَ﴾ هەروەها ئایەتی: ﴿وَأَنفِقُوا مِمَّا رَزَقْنَاهُمْ﴾[1] ﴿آمِنُوا بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ وَأَنفِقُوا مِمَّا جَعَلَكُمْ مُسْتَخْلَفِينَ فِيهِ﴾[2] ﴿وَاسْمَعُوا وَأَطِيعُوا وَأَنفِقُوا خَيْرًا لِأَنفُسِكُمْ﴾[3]، ئەمانە و زۆرێك لە ئایەتی تر کە فەرمان بە خەرجکردن دەکەن هەریەك بەپێی توانای خۆی، و بۆ هەر کەسێك بەپێی پێویستی خۆی، "ابن سلامة"[4] دەڵێت: ((مقاتل[5] و دەستەیەك دەڵێن: ئەوەی لە زەکات زیاترە زەکاتی فەرزکراو نەسخی کردۆتەوە، "أبو جفر بن يزيد بن القعقاع" دەڵێت: زەکاتی فەرزکراو هەرچی صەدەقەیە لە قورئاندا نەسخی کردووە، هەروەها مانگی رەمەزان هەموو رۆژوویەکی لە قورئاندا نەسخ کردووە، قوربانیش هەموو سەربڕینێکی نەسخ کردووە))

"ابن الجوزي"[6] ئەوەی "ابن سلامة" لەسەر نەسخی ئەو بەشەی ئایەتی(٣) دەیڵێت گواستوویەتەوە.

ئەم زیادەڕەوییە لە وتنی ئەوەی هەر خەرجکردنێك لە قورئاندا فەرمانی پێکرابێت بە ئایەتی زەکات نەسخکراوەتەوە تیشکی سەوزی هەڵکرد بۆ دوژمنانی ئیسلام بۆ ئەوەی لە نووسراوەکانیاندا بڵێن: "زەکات لەسەر موسڵمانان فەرزکرا بۆ خزمەتی دەوڵەمەندەکانیان، بۆ موسڵمان هەیە ببێت بە خاوەنی هەر شتێك بە ڕێگەی ڕەوا و ناڕەوا گەر بەردەوام بێت لەسەر پێدانی زەکات، لەباری خۆگرتنەوە لە پێشکەش

---

[1] سورة المنافقون/١٠.

[2] سورة الحديد/٧.

[3] سورة التغابن/١٦.

[4] الناسخ والمنسوخ ص ٧٦.

[5] هو ابو بسطام مقاتل بن حيان النبطي البلخي الخراساني (ت- ١٤٩ هـ)، تهذيب التهذب:١٠/٢٧٧.

[6] جمال الدين ابو الفرج عبد الرحمن بن الجوزي ، نواسخ القرآن ص ٤١.

نەکردنی هیچ کۆمەکییەکی دارایی تـر بـۆ کەسێکی سروشتی یـان مەعنـەوی بـا زۆر ئاتاجی ئەو کۆمەکییەش بێت پرسیار لە دەوڵەمەندەکە ناکرێت"[1].

لە بەڵگەکانی پووچی و بێبنەمایی نەسخی ئایەتی(٣) بە ئایەتی زەکات:

نەبوونی هیچ بەرهەڵستکارییەك لە نێوان نەسخکەر و نەسخکراوی بانگەشەبۆکراودا بـەهۆی جیـاوازی بابەتەکـەی هـەردووکیان لـە یـەکتر، بابـەتی زەکـات بریتییـە لـە خەرجکردنی پێویست(واجب) لە ماڵێکی دیاریکراودا و بە ڕێژەیـەکی دیـاریکراو و بـە کۆمەڵێك مەرجی تایبەت:

أ.زەکات لە کۆمەڵێك ماڵی دیاریکراودا دەبێت، خەرجکردن لە هەموو ماڵێکدایە.

ب–زەکات دیاریکراوە بۆ هەشت پۆل لە قورئاندا، خەرجکردن بۆ ئەو هەشت پۆلە و کەسانی تریش بەدەر لەوانە دەگرێتەوە.

ج–زەکات بڕەکـەی بـە دەق دیـاریکراوە، خـەرجکردن بڕەکـەی بـەجێهێڵراوە بـۆ هەڵبژاردەی خەرجکەر بەپێی توانا و ئاتاجی لەسەرخەرجکراو(کەسی ئاتاج).

د–زەکـات گـەر پایـەکان و مەرجـەکانی فەراهـەم بـوون و ڕێگرەکـانی نـەڕێکران پێویست(واجب) دەبێـت، خـەرجکردن پێـنج حوکمـە داواکارییەکـەی بەسـەردا دێـن بـــەپێی خـــەرجکردن و ڕووی خەرجکردنەکـــە و نیـــێتی کەســـی خەرجکـــەر و هاوشێوەکانی.

–ئایەتی(٦٢) ﴿إِنَّ الَّذِينَ آمَنُوا وَالَّذِينَ هَادُوا[2] وَالنَّصَارَى[1] وَالصَّابِئِينَ[2] مَنْ آمَنَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ وَعَمِلَ صَالِحًا فَلَهُمْ أَجْرُهُمْ عِنْدَ رَبِّهِمْ وَلاَ خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلاَ هُمْ يَحْزَنُونَ﴾

---

[1] لەو دانراوانەی قسە دەکات لەسەر نەسخی خەرجکردن بە زەکـات "خدمـة للاغنيـاء" كتاب من قاموس التراث تأليف هادي العلـوي/ ئـەوە یەکێکە لـەو کتێبانـەی پـڕە لـە ئاژاوەگێڕی و ژەهـر و شـان لەسـەر قسـەی ئەوانـە دادەدات دەڵـێن زەکـات نەسـخی هەموو جۆرە خەرجکردنێکی لە قورئاندا کردۆتەوە. ينظر ص(٧٧– ١٠٢) منه.

[2] واتە بوون بە یەهود، "اليهود"یش لە "الهود"ەوە هاتووە بە مانای "التوبـه" بـەهۆی تەوبەکردنیانەوە لە پەرستشی گوێرەکە.

ئەهلی تەفسیر لە لێکدانەوەی ئەم ئایەتەدا جیاوازیان لە نێواندایە، سەرچاوەی جیاوازییەکەیان بریتییە لە وێناکردنی دووبارەبوونەوە تیایدا لە نێوان ﴿إِنَّ الَّذِينَ آمَنُوا﴾ نێوان ﴿مَنْ آمَنَ بِاللَّهِ.. الى أخره﴾ وەك ئەوەی خودا-سبحانه وتعالى- فەرموویێتی: " ياايها الذين آمنوا آمنوا -ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێنا باوەڕ بهێنن"، بینا لەسەر ئەم گومانە ئەوە دەبێتە "بەدەستهێنانی بەدەستهێنراو" ئەوەش گەر موحالّ نەبێت دەبێتە گاڵتەجاڕی، بۆ هەڵگرتنی ئەم تەمومژە ئەهلی تەفسیر چەند ڕێگەیان گرتۆتە بەر:

أ.هەیانە[٣] دەڵێت: "إن الذين آمنوا" بەڕووالّەت، ئەوانە بریتین لە دووڕووان بەو بەڵگەیەی لە ریزی ناموسڵمانان دایناون، هەر کەس بەڕاستی ئیمانی هێنابێت ئەوا پاداشتی خۆیان بۆ هەیە، بۆیە وشەی"من" بریتییە لە بەدەلی بەش لە هەموو(بدل بعض من الكل)، هەمووەکە(الكل) بریتییە لە "الذين" لە ﴿ان الذين امنوا﴾دا هەروەها لە: ﴿والذين هادوا...الخ﴾، واتە ئەوانەی لە دووڕووان بەڕاستی باوەڕیان بە خودا و بە ڕۆژی دوایی هێنا لە یەهود و نەصارا و صابیئە...هتد.

---

[١] کۆی "النصران"ە وەك "السكران" و "سكارى" ئەوەش بریتییە لە پڕبوو بە "نصر"، وەك چۆن "الغچبان" بریتییە لە پڕبوو بە تووڕەیی، یان لە "الناصره"ەوە کە بریتییە لەو ئاوەدانییەی عیسا-عليه السلام- تیایدا نیشتەجێ بوو بوو، یان لە قسەی حەوارییەکانەوە وەرگیراوە کە وتیان: "نحن أنصار الله".

[٢]کۆی "صابئ"ئەوەش بریتییە لەو کەسەی دەگوێزێتەوە بۆ ئایینێکی تر، یان نیشتمانی خۆی بەجێدەهێڵێ و دەگوێزێتەوە بۆ زەوییەکی تر، ئەمانە دان بە خودا و ڕۆژی دواییدا دەنێن و باوەڕیان بە پێغەمبەران هەیە. ينظر مجمع البيان للطبرسي (الشيخ ابي علي الفضل بن الحسن) ١/١٢٦.

[٣] "السدى" دەڵێت: ئەوانە بریتین لە ئەهلی حەنەفییەت کە بە محمد(ﷺ) نەگەیشتوون، بەڵام ئەم قسەیە ڕەد دەکرێتەوە بەوەی هەیانە لەدوای دابەزینی پەیامی محمد(ﷺ) ژیاوە، وەك وەرەقەی کوڕی نەوفل کە لەدوای چوار ساڵ لە دابەزینی وەحی کۆچی دوایی کرد، هەروەها سەلمانی فارسی ئیمانی بە پێغەمبەر(ﷺ) هێنا/ ينظر تفسير الرازي ٣/١١١- ١١٢.

ب.هەروەها هەیانە[1] دەڵێت: بریتییە لە هەر کەسێك پێش ناردنی محەمەد(ﷺ) باوەڕی بە عیسا—علیه السلام— هێنابێت، و نموونە بە "ورقة بن نوفل" و "بحیری الراهب" و "سلمان الفارسي" و کەسانی تریش دەهێننەوە.

ج.هەروەها هەیانە[2] دەڵێت: "إن الذین آمنوا" لە ئوممەتی محەمەد(ﷺ) بە دامەزراوی مانەوە لەسەر باوەڕەکەیان، "والذین هادوا والنصاری والصابئین" هەر کەسێك لەوانە باوەڕ بە ئیسلام بهێنن پاداشتی تایبەت بە خۆیان هەیە ئەوکات "من" دەبێتە بەدەل بۆ "الذین"ی دووەم وەك بەدەلی بەشێك لە هەموو(بدل بعض من الکل)

د. قسەیەك دراوەتە پاڵ "ابن عباس"[3] گوایە ئەو ئایەتە لە سەرەتای ئیسلامەوە دابەزیوە و خودا بڕیاری پێداوە بەوەی هەرکەس لەسەر یەهودیبوون و نەصارابوون و صابیئەبوونی خۆی بمێنێتەوە و باوەڕی بە خودا و ڕۆژی دوایی هەبێت ئەوا پاداشتی خۆی بۆ هەیە، پاشان ئەوەی لەم ئایەتەدا بڕیاری لێدراوە بە ئایەتی"ومن یبتغ غیر الإسلام دینا فلن یقبل منه" سڕایەوە.

**بانگەشەی نەسخ لەم ڕووانەوە بەرپەرچ دەدرێتەوە:**

تەنهاکەوتنەوەی "ابن عباس" لە ناو هەموو فەقیهان لە هاوەڵان و شوێنکەوتوواندا بەم ڕیوایەتە، ئەمەش لە هەواڵە ئاحادەکانە، و هەواڵی ئاحادیش یەقین ناگەیەنێت، چونکە قورئان بە موتەواتیر جێگیربووە و هیچ بەشێکی ناسڕێتەوە بە تەواتور نەبێت.

"الرازي" لە "ابن عباس"ەوە ڕیوایەت دەکات وتوویەتی: مەبەست بەشێك لەوانەیە باوەڕیان بە عیسا هێنا پێش ناردنی محەمەد(ﷺ) ئەم ڕیوایەتە ڕیوایەتەکەی پێشوو هەڵدەوەشێنێتەوە دەربارەی وتنی نەسخ.

---

[1] لەوانە: سفیان الثوري. تفسیر ابن عطیة (ابي محمد عبد الحق بن عطیة الاندلسي المحرر الوجیز في تفسیر الکتاب العزیز ١/٢٢٤. تفسیر الکشاف ١/٢٨٥.

[2] تفسیر ابي لیث السمرقندي تحقیق د. عبد الرحیم الزقة ١/٣٧٣.

[3] الرازي المرجع السابق. ابن عطیة المرجع السابق الطبرسي: ١/١٢٦.

هیچ بەرهەڵستییەك لە نێوان دوو ئایەتی نەسخكەر و نەسخكراودا بوونی نییە تاكو بـە نەسـخ هـەڵبگیرێت، چـونكە مەبەسـت لـە ئایەتەكـە ئەوانـەی لـە ئوممـەتی محەمەد(ﷺ) باوەڕیان هێنا و لەسەر باوەڕەكەیان تا مردن دامـەزراوبوون، ئەوانـەش باوەڕیان هێنا لە یەهود و نەصارا و صابیئە بـۆ هەریەكـەیان پاداشـت بـوونی هەیـە و ترس و دڵتەنگیان لەسـەر نییـە، بۆیـە وشـەی "مـن" بەدەلـە لـە "الـذین"ی دووەم، بەدەلی بەش لە هەمووە یان لە ئایەتەكەدا حەزفكراو هەیە و تەقدیرەكەی بریتییە لە:
" ان الـذین امنــوا مــن امـة محمـد ومــن امــن مــن الـذین هــادوا والنصــاری والصابئین[1]–ئەوانەی باوەڕیـان هێنـا لـە ئوممـەتی محمـد(ﷺ) هـەروەها ئەوانـەی باوەڕیان هێنا لە یەهود و نەصارا و صابیئە"

–ئایەتی ٨١: ﴿بَلَى مَنْ كَسَبَ سَيِّئَةً وَأَحَاطَتْ بِهِ خَطِيئَتُهُ فَأُولَئِكَ أَصْحَابُ النَّارِ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ﴾[2].

"ابن الجـوزي" دەڵێت: جمهوری ئـەهلی تەفسیر لەسـەر ئـەوەن مەبەسـت بـە "السیئة" بریتییە لـە "الشـرك" بۆیـە نەسـخ لـە هـیچ ڕێگەیەكـەوە ڕوو لـەم ئایەتـە ناكات، "السدي" لە شێخەكانیەوە ڕیوایەتی كردووە مەبەست بە "السـیئة" بریتییـە لە "الذنب–گوناه" لەو گوناهانەی كە خـودا بـەڵێنی ئـاگری پێداوە[3]، لەسـەر ئەمـە نەسخكراوەتەوە بە ئایەتی: ﴿إِنَّ اللَّهَ لاَ يَغْفِرُ أَنْ يُشْرَكَ بِهِ وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَلِكَ لِمَنْ يَشَاءُ﴾[4].

---

[1] ئەمە بۆچوونی زۆرینەی ئەهلی تەفسیرە. ینظر الطبري: ٣٢٣/١. والطبرسي: ١٢٧/١. ابن سلامة ص٧٧.

[2] سورة البقرة/٨١.

[3] الطبري: ٣٠٥/١.

[4] سورة النساء/١١٦.

بانگەشەی نەسخ پووچ و بێبنەمایە بەهۆی زۆرێك لە بەڵگەوە، لەوانە:

١-بەڵگەنەویستە قورئان یەك "یەکە"یە و بەش نابێت و هەندێکی هەندێکی تری شرۆڤە دەکەن، گەر لە ئایەتێکدا پوختە خرابوویە روو ئەوا لە ئایەتێکی تردا درێژەپێدانی ئەو پوختەیە دەخرێتە روو، گەر گشتی خرایە روو لە جێگەیەکی تر تایبەتکردنەکەی دەخرێتە روو، بۆیە ئایەتی(٨١) رەدکردنەوەی ئەو بانگەشەیە لە ئایەتی(٨٠)دا هاتووە: ﴿وَقَالُوا لَنْ تَمَسَّنَا النَّارُ إِلاَ أَيَّامًا مَعْدُودَةً﴾ خودا-سبحانه وتعالى- رەدی ئەو قسەیە بەم ئایەتە دەکاتەوە ﴿بَلَى مَنْ كَسَبَ سَيِّئَةً وَأَحَاطَتْ بِهِ خَطِيئَتُهُ فَأُوْلَئِكَ أَصْحَابُ النَّارِ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ﴾.

ئەو گشتگیرییەی لەم ئایەتەدا(٨١) هاتووە گشتگیرییەکەی مەبەست نییە، بەڵکو تایبەتکراوە بەوەی گەر تەوبە نەکات لەوەی لەسەری بوو ئەوا بە گومڕایی دەمرێت یان خودا نایەوێت لێی خۆش ببێت و هاوشێوەکانی ئەوە، خودا-سبحانە- لە ئایەتی تردا ئەو گشتگیرییەی تایبەت کردووە لە چەندین ئایەتدا، لەوانە: ﴿إِنَّ اللَّهَ لاَ يَغْفِرُ أَنْ يُشْرَكَ بِهِ وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَلِكَ لِمَنْ يَشَاءُ﴾، بۆیە ئەوەی مانەوەی هەتا هەتایی لە ئاگردا دەیگرێتەوە بریتییە لە "المشرك-هاوەڵدانەر" کە "سيئة"ی بەدەستهێناوە ئەوەش بریتییە لە هاوەڵدانانەکەی گەر لەسەری بمرێت.

هەر کەس بڵێت ئەم ئایەتە(١١٦/ النساء) نەسخکەری ئایەتی(٨١)ە ئەوە بە هەڵەداچووە گەر مەبەستی بە نەسخ مانا گشتییە گشتگیرییەکەی تایبەتکردن و شتانی تر نەبێت لەلای پێشینی چاکان، وتنی نەسخ بە مانا تایبەتەکەی لەلای پاشین تێکەڵ کردنە لە نێوان نەسخ و تایبەتکردندا.

٢-ئایەتی (٨١) هەواڵ و هەڕەشەیە و ئەو دوانەش ناچنە ژێر نەسخەوە بە مانای تایبەت.

-ئایەتی(٨٣): ﴿وَقُولُوا لِلنَّاسِ حُسْنًا﴾ کە بەشێکە لەم ئایەتە: ﴿وَإِذْ أَخَذْنَا مِيثَاقَ بَنِي إِسْرَائِيلَ لاَ تَعْبُدُونَ إِلاَ اللَّهَ وَبِالْوَالِدَيْنِ إِحْسَانًا وَذِي الْقُرْبَى وَالْيَتَامَى وَالْمَسَاكِينِ وَقُولُوا لِلنَّاسِ حُسْنًا وَأَقِيمُوا الصَّلاَةَ وَآتُوا الزَّكَاةَ ثُمَّ تَوَلَّيْتُمْ إِلاَ قَلِيلاً

مِنْكُمْ وَأَنْتُمْ مُعْرِضُونَ﴾

"أبـو جعفـر النحـاس"[1] دەڵێـت: (سـەعید دەڵێـت لـە "قتـادة"ەوە: ئایـەتی شمشێر(٥/ التوبة) نەسخی کردۆتەوە)

"ابن حزم الأندلسـي"[2] دەڵێـت: نەسـخکراوەتەوە و نەسخکەرەکەشـی ئایـەتی شمشێرە.

"ابن الجوزي"[3] دەڵێت: هەندێك پێیان وایە مەبەست بـەوە ئاسـانکارییە لەگـەڵ هاوەڵدانەران لە بانگـەوازکردنیان بـۆ ئیسـلام، بۆیـە ئایەتەکـە لای ئـەوان بـە ئایـەتی شمشێر نەسخکراوەتەوە.

بانگەشەی نەسخ پووچ و بێبنەمایە بەم بەڵگانە:

١-مەبەست بە "القول" لە ئایەتەکەدا(قولوا) بریتییە لە فەرمان بە چاکە و رێگری لە خراپە و هەردووکیان فـەرزن، ئـەم حوکمـەش هـەتا ژیـان مابێتـەوە دەمێنێتـەوە، وتنی نەسخی ئەو بەشە لە ئایەتەکە پێویست دەکـات نەسـخی هـەموو ئـەو ئایەتانـە بکرێتەوە فەرمان دەکەن بە چاکە و رێگری دەکەن لە خراپە، پێویست پووچە و هـەر بەو جۆرە پێویستکراو.

٢-یان مەبەست بە "القول" بریتییە لە بانگەواز بۆ حەق و راستی، بەپێی ئایەتی: ﴿ادْعُ إِلَـى سَـبِيلِ رَبِّـكَ بِالْحِكْمَـةِ وَالْمَوْعِظَـةِ الْحَسَـنَةِ﴾، وتـنی نەسـخ وتـنی نەسخکردنەوەی ئەو فەزیلەتەیە، پێویست پووچە و هەر بەو جۆرە پێویستکراو.

٣-مرۆڤ بە چاکە مامەڵە بکات لەگەڵ برا مرۆڤەکەیدا لـەڕووی گوفتـار و کـردارەوە لە فەزیلەتە مەزنەکانە و پێویستە مـرۆڤ خـۆی پـێ برازێنێتـەوە، وتـنی نەسـخی ئـەو مامەڵە چاکە وتنی سڕانەوەی ئـەو فەزیلەتەیـە، پێویسـت پووچـە و هـەر بـەو جـۆرە پێویستکراو.

---

[1] الناسخ والمنسوخ في القرآن الكريم ص٢٣.

[2] الناسخ والمنسوخ في القرآن الكريم ص٢٠.

[3] نواسخ القرآن ص٤٤.

٤-ئـەم گوتـارە هەرچـەند بەشـێکە لـە شـەریعەتی ئێمـە بـەڵام لەگـەڵ ئـەوەش ئاراسـتەی "بـني إسـرائیل" کـراوە تـاکو ئـەوەی لـەم ئایەتـەدا هـاتووە و فـەرمانی پێکردووە جێبەجێی بکەن، ئیتر چۆن ئەقڵ دەیگرێت ئەم بەشە گرنگـە ترسـناکە لـە ئایەتە باسکراوەکە نەسخکراو بێت کە حوکمـەکانی دایکـی حوکمەکانـە و بـە گـۆڕانی شەریعەتەکان و پێشکەوتنەکانی ژیان گۆڕانیان بەسەردا نایەت.

٥-ئایەتەکە لە هەواڵەکانە و نەسخ قبووڵ ناکات.

-ئایەتی(١٠٤): ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لاَ تَقُولُوا رَاعِنَا وَقُولُوا انظُرْنَا وَاسْمَعُوا وَلِلْكَافِرِينَ عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾[1].

"راعنا" فەرمانێکی داخوازییە لـە "المراعـاة"ەوە هـاتووە و بـۆ "مبالغـة"یـە لـە "الرعي" و پارێزگاری کەسانی تر، "المراعاة" بەسـەرکردنەوەی شـتێکە لـە خـودی خۆیدا یان لە کاروباریدا، "المراعاة" لەگەڵ "المحافظة" هاوواتـان، دژی "المراعـاة" بریتییە لە "الإغفال-پشتگوێخستن"، هەر کەس کاروباری دەستەیەك بگرێتە دەست ئەو کەسە دەبێتە "راعي" ئەوانە و ئەوان دەبنە "رعیة" بۆ ئەو.

موسڵمانان لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) بەم داوایە گفتوگۆیان دەکرد، بەڵام "راعنا" بـە زمانی یەهود مانای جنێوی تێدا بوو لەسەر ئەو بنچینەی لـە "الرعونـة"ەوە هاتبێـت کە مانای بێئەقڵی و گێلی و نەزانی دەگەیەنێت، ئەوەش یـان عیبرانییـە یـان سـریانی یان عەرەبی لەسەر جیاوازی بۆ ریشەکەی، بۆیە خودا-سبحانە وتعـالی- نـەهیکردووە و فەرموویەتی لە جێگەی وشەی "راعنا" بڵێن: "انظرنـا" کـە ماناکـەی بریتییـە لـە: تەماشامان بکە، یان چاوەڕوانم بە، یـان کـات و مۆڵـەتمان پـێ بـدە، یـان بەسـەرمان بکەرەوە، لە "النظر"ەوە، تا لێت تێبگەین و لێتەوە وەربگرین[2].

---

[1] سورة البقرة/١٠٤.

[2] ینظر تفسیر الطبرسي:١/١٧٨. تفسیر ابن عطیة: ١/٤٢٦. حاشیة الصاوي علی تفسـیر الجلالین:١/٥٠.

هــەر كــەس بانگەشــەی ئــەوە بكــات ئــەو ئايەتــە لــە دەروازەی "الناســخ و المنسوخ"ە[1] لە قورئاندا ئەوا هەڵەی كردووە، چونكە نەسخكراو نـەريتێكی نـەفامی بوو عورفی عەرەبی كردبووی بە موباح پێش هاتنی ئیسلام و دوای هـاتنی ئیسـلام تـا ئەم ئايەتە دابەزی، نەسخكەرەكە لە قورئان پێچەوانەی نەسخكراوەكەيە گەر -تـەنها بۆ گفتوگۆ- دروست بێت نـاوی نەسـخی لـێ بنـێين، چـونكە نەسـخ سـڕينەوەی وەحييەكی پێشووە بە وەحييەكی دوای ئەو، ئەمەش بەو جۆرە نييە.

-ئايەتی(١٠٩): ﴿فَاعْفُوا وَاصْفَحُوا حَتَّى يَأْتِيَ اللَّهُ بِأَمْرِهِ إِنَّ اللَّهَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ﴾

ئەمە بەشێكە لـە ئايـەتی: ﴿وَدَّ كَثِيرٌ مِّنْ أَهْلِ الْكِتَابِ لَوْ يَرُدُّونَكُم مِّن بَعْدِ إِيمَانِكُمْ كُفَّاراً حَسَداً مِّنْ عِندِ أَنفُسِهِم مِّن بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمُ الْحَقُّ فَاعْفُواْ وَاصْفَحُواْ حَتَّى يَأْتِيَ اللَّهُ بِأَمْرِهِ إِنَّ اللَّهَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ﴾[2].

" ابو جعفر النحـاس[3]" دەڵێت: (("جعفـر بـن مجاشـع" وتـی "ابـراهيم بـن اسحاق" بۆی باسكردين، دەڵێت "حسين" بۆی باسكردين، دەڵێت: "عمرو" بـۆی باسـكردين، دەڵێـت: "اسـباط" لــە "السـدي"ەوە بـۆی باسـكردين: ﴿فَـاعْفُوا وَاصْـفَحُوا﴾ نەسـخكراوەتەوە و نەسخكەرەكەشـی بريتييـە لـە: ﴿قَـاتِلُوا الَّـذِينَ لاَ يُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَلاَ بِـالْيَوْمِ الآخِـرِ﴾، رووی ئەمـە ئەوەيـە بـاوەڕداران لـە مەكـە ئـازار دەدران و لێيان دەدرا و بەهۆی شەڕكردنەوە لەگەڵ هاوەڵدانەران دەكوژران، قورئـان ئەوەی لێ قەدەغەكردن، فەرمانی پێكردن بە لێبوردن و پشتهەڵكردن تا خودا ئەمری خۆی دەهێنێت، دواتر نەسخی ئەوەی كردەوە))

---

[1] ينظر الناسخ والمنسوخ لأبي جعفر النحاس ص٢٤ ونواسخ القرآن لابن الجوزي ص٤٥.
[2] سورة البقرة/١٠٩.
[3] الناسخ والمنسوخ ص٢٥.

"ابن الجوزي"[1] وتنى نەسخەکەی داوەتە پاڵ "قتادة" کە دەڵێت: خودا فەرمانی بە پێغەمبەرەکەی(ﷺ) کرد لێیان ببوورێت و لێیان خۆش ببێت تا خودا ئەمری خۆی دەهێنێت، بۆیە لە سورەتی "البراءة"دا هاتووە: ﴿قَاتِلُوا الَّذِينَ لاَ يُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ﴾، "ابن حزم الأندلسي"[2] هەمان شت دەڵێت و "ابن سلامه"[3] قسەی نەکردووە لەسەر نەسخی ئەم ئایەتە کە لە سەرخەرانی زیادەڕەوییە لە نەسخی قورئاندا.

بانگەشەی نەسخی ئەم ئایەتە پووچ و بێبنەمایە بە بەڵگەی نەقلی و ئەقڵی:

أ.لە بەڵگە نەقڵییەکان:

١-لە قورئاندا خودا فەرمانی کردووە بە لێبوردن لە (٣٥) ئایەتدا و فەرمان بە "الصفح" لە (٨) ئایەتدا، وتنی نەسخ لەو ئایەتەدا نەسخبوونەوەی هەموو ئەو ئایەتانە پێویست دەکات، چونکە هەریەك لە "العفو" و "الصفح" لە ئایەتی (١٠٩)دا گشتییە و هەموو ئەوەی لە ئایەتەکانی تردا هاتوون دەیگرنەوە، پێویست پووچ و بێبنەمایە بە کۆدەنگی، هەر بەو جۆرە پێویستکراویش.

٢-خودا-سبحانە وتعالی- فەرمانی کردووە بە بەکارنەهێنانی هێز مەگەر لەباری بەرگری شەرعیدا لە ئایین و ناموس و ژیان و ماڵ و سامان، بۆیە دەفەرموێت: ﴿فَمَنْ اعْتَدَى عَلَيْكُمْ فَاعْتَدُوا عَلَيْهِ بِمِثْلِ مَا اعْتَدَى عَلَيْكُمْ﴾، هەروەها فەرمانی کردووە بە لایەنگیری ئاشتی و ئاسایش لە ئایەتی: (٨٦)، وتنی پیادەکردنی ئایەتی شمشێر بە ناوی ئیسلامەوە دژ بە هەموو ئەوانەی ناموسڵمانن وتنی لادانی هەموو ئەو ئایەتانە لە قورئاندا پێویست دەکات، پێویست پووچ و بێبنەمایە و هەر بەو جۆرە

---

[1] سورة التوبة/٢٩ لە ریوایەتێکدا لە "قتادە"وە نەسخکەرەکەی بریتییە لە ئایەتی(٥)ی سورەتی "التوبە" کە پێی دەوترێت ئایەتی شمشێر.

[2] الناسخ والمنسوخ ص٢١.

[3] الناسخ والمنسوخ ص٧٨ وكذلك الزمخشري ٣٠٤/١، الرازي: ٥٤٥/٣ الآلوسي: ٣٥٦/١. الكياالهراسي: ١٢/١، الصاوي: ٥٣/١.

پێویستکراویش.

ب-لە بەڵگە ئەقڵییەکان:

١-کاتێك مرۆڤ لەژێر سێبەری یاسای دارستاندا دەژیا بە زیری و ئاکارێکی دواکەوتووەوە سروشتی بریتی بوو لە بەکارهێنانی هێز بۆ دەستەبەرکردنی مەرامەکانی، شان و شکۆی هەروەك شان و شکۆی ئاژەڵانی دارستان وابوو، کاتێك ژیاری مرۆیی پەرەیسەند و ژیری مرۆڤ پێگەیین و کامڵبوون رووی لێکرد لە بیرۆکەی بەکارهێنانی هێز دوورکەوتەوە مەگەر لەباری بەرگری شەرعیدا، یەکەمین شەریعەتی جیهانی فەرمانی بەمە کرد بریتی بوو لە شەریعەتی ئیسلام و بنەمایەکی جیهانی راگەیاند ئەویش: ﴿فَمَنْ اعْتَدَى عَلَيْكُمْ فَاعْتَدُوا عَلَيْهِ بِمِثْلِ مَا اعْتَدَى عَلَيْكُمْ﴾، دوای چواردە سەدە لە پەیماننامەکەی خودا-سبحانە وتعالی- پەیماننامەی نەتەوە یەکگرتووەکان دەرچوو بۆ ئەوەی ئەم بنەمایە رابگەیەنێت، سەرەرای ئەوەش تا ئێستا نەیتوانیوە گوزارەیەك دابنێت شان بدات لە شانی ئەوەی قورئان هێناویەتی، لەوەی بەرپەرچدانەوەی دەستدرێژکاری پێویستە لەرووی قەبارە و رادە و دوورییەوە بە ئەندازەی دەستدرێژکارییەکە بێت، ئەگەر نە، بەرگریکار دەگۆرێت بۆ دەستدرێژکار، چونکە جەنگ بۆ زەرورەت رەوایی پێدراوە، زەرورەتیش بە ئەندازەی خۆی ئەندازەگیری بۆ دەکرێت.

٢-گەر هەرچی ئارامگری و خۆراگری و لێبوردن و لێخۆشبوون و ئاشتییەك لە قورئاندا بە ئایەتی شمشێر بسرینەوە ئەوا شمشێرێکی گەردنپەرێن دەدەینە دەست دوژمنانی ئیسلام بۆ ئەوەی هەرچی رێگەیە دایبخات لەبەردەم تێگەیشتن لەم ئایینە مەزنە وەك خۆی و چوونە ملکەچبوون بۆی لەپێناو بەرژەوەندی دونیا و دوارۆژیدا.

٣-بۆ لێبوردن و لێخۆشبوون سنوورێك هەیە، وەك چۆن بۆ ئایەتی شمشێر سنوورێك هەیە بۆ بەکارهێنانی هەریەکەیان لە کاتێکدا بارودۆخی راستبووەوە ئەو بەکارهێنانە داوا دەکات لەرووی جەنگ یان ئاشتییەوە، ئەم سنوورانە رێگە نادەن بەرهەڵستی لە نێوانیان راست ببێتەوە، نەسخ لقی بەرهەڵستکارییە، بەڵکو لقی

دژیەکییە، بۆیە گەر بنەڕەت دەستەبەر نەبوو لق بوونی نابێت چونکە دەبێتە شوێنکەوتە بۆی، شایانی باسە "الصفح" لە باری هێزدایە، هەرکەسێکیش خودای لەگەڵ بێت هەمیشە بەهێزە.

-ئایەتی(١١٥):﴿وَلِلّهِ الْمَشْرِقُ وَالْمَغْرِبُ فَأَيْنَمَا تُوَلُّواْ فَثَمَّ وَجْهُ اللّهِ إِنَّ اللّهَ وَاسِعٌ عَلِيمٌ﴾[١]

هەندێك پێیان وایە ئەم ئایەتە(ئایەتی ١١٥) بەم ئایەتە نەسخکراوەتەوە[٢] ﴿قَدْ نَرَى تَقَلُّبَ وَجْهِكَ فِي السَّمَاء فَلَنُوَلِّيَنَّكَ قِبْلَةً تَرْضَاهَا فَوَلِّ وَجْهَكَ شَطْرَ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ وَحَيْثُ مَا كُنتُمْ فَوَلُّوا وُجُوهَكُمْ شَطْرَهُ﴾[٣]

ئەم بانگەشەیە لەسەر ئەو بنچینە بیناکراوە گوایە رووکردنە "بیت المقدس" بە ئایەتی یەکەم جێگیر بووە، لە کاتێکدا بە سوننەتی پێغەمبەر(ﷺ) جێگیر بووە لە "صحیح مسلم"دا[٤] لە "ابن عازب"ەوە، دەڵێت: شەش مانگ لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) روو بە "بیت المقدس" نوێژم کرد تا ئایەتی "١٤٤/البقرة" دابەزی: ﴿وَحَيْثُ مَا كُنتُمْ فَوَلُّوا وُجُوهَكُمْ شَطْرَهُ﴾. هەروەها تیایدا هاتووە لە ئەنەسەوە-خوا لێی رازی بێت- پێغەمبەر(ﷺ) رووبە "بیت المقدس" نوێژی دەکرد بۆیە ئەم ئایەتە دابەزی:﴿قَدْ نَرَى تَقَلُّبَ وَجْهِكَ فِي السَّمَاء فَلَنُوَلِّيَنَّكَ قِبْلَةً تَرْضَاهَا فَوَلِّ وَجْهَكَ شَطْرَ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ﴾.

"ابن الجوزي" دەڵێت[٥]: ((بزانە ئایەتی: ﴿فَأَيْنَمَا تُوَلُّوا فَثَمَّ وَجْهُ اللّهِ﴾ هیچ فەرمانێکی تێدا نییە بە رووکردنە "بیت المقدس" و هیچ شوێنێکی تریش، بەڵکو

---

[١] سورة البقرة/١١٥.

[٢] لەوانە "قتادة" ینظر النحاس ص ١٤ وابن حزم ٢١-٢٢.

[٣] سورة البقرة/١٤٤.

[٤] ٣٧٣/١

[٥] نواسخ القرآن ص٥١.

ئاماژە بۆ ئەوە دەکات هەموو ئاراستەکان یەکسانن لە دروستی روو لێکردنیان))

"أبو جعفر النحاس"[1] دەڵێت: (لە "ابن عمر"ەوە گوازراوەتەوە پێغەمبەر(ﷺ) نوێژی دەکرد لە مەکەوە روو بە مەدینە لەسەر وڵاخەکەی، لەسەر ئەوە ئەم ئایەتە دابەزی: ﴿فَأَيْنَمَا تُوَلُّوا فَثَمَّ وَجْهُ اللَّهِ﴾ پێغەمبەر(ﷺ) لەسەر وڵاخەکەی نوێژی دەکرد رووی لە هەر شوێنێك بوایە)

"الرازي"[2] دەڵێت: ئایەتی: ﴿فَأَيْنَمَا تُوَلُّوا فَثَمَّ وَجْهُ اللَّهِ﴾ ئاماژەی هەڵبژاردە و سەرپشککردنی تێدایە، لە دوو شێوازدا جێگیر دەبێت:

یەکەمیان: لە نوێژە سوننەتەکاندا لەسەر پشتی وڵاخ.

دووەم: لە سەفەردا لەباری کۆششی نەبینینەوەی ئاراستەی قیبلە و تاریکی و شتی تر.

چونکە لەو دوو بارەدا نوێژکەر سەرپشکە و هەڵبژاردەی بۆ هەیە، بەڵام لە جگە لەم دوو بارەدا هیچ هەڵبژاردە و سەرپشکییەك بوونی نییە.

"النحاس"[3] دەڵێت: دروست ئەوەیە بوترێت ئایەتەکە نە نەسخکەرە و نە نەسخکراو، چونکە زانایان ناکۆکیان هەیە لەسەری و جگە لە نەسخیش لەئامێز دەگرێت، هەر ئایەتێکیش جگە لە نەسخ شتێکی تر لەئامێز بگرێت ئەوا نەسخکەر و نەسخکراوی بۆ بەکارناهێنرێت مەگەر بەڵگەیەکی یەکلاکەرەوە کە رادەستبوونی تێدا پێویست بێت، بەڵام ئەوەی پوختە و لێکدانەوە و گشتگیری و تایبەتکردن هەڵدەگرێت لە نەسخ دوورە، بەتایبەت لەگەڵ ئەم جیاوازییە.

لەم خستنەڕووەوە دوو خاڵ دەخەینە روو:

١/ یەکەمیان: ئەمە لە دەروازەی نەسخی سوننەتی پێغەمبەرە(ﷺ) بە قورئان نەك نەسخی قورئان بە قورئان.

---

[1] الناسخ والمنسوخ ص١٤.

[2] التفسير الكبير: ٢١/٤.

[3] المرجع السابق ص١٥.

٢/ حوکمی ئایەتی(١١٥) دەمێنێتەوە بۆ هەموو ئەو کەسانەی ئاراستەی قیبلە لە سەفەردا یان لە وڵاتێکی تر جیا لە وڵاتەکەی خۆی نازانن یان لە کاتی نوێژدا لە شەمەندەفەر و فڕۆکە و کەشتی و هەر هۆکارێکی تری گواستنەوەی وشکانی یان دەریایی یان ئاسمانی، بەجۆرێك بۆ کەسی نوێژگەر فەراهەم نابێت لە جێگەیەکدا جێگیر ببێت و روو لە قیبلە بکات.

-ئایەتی(١٣٩): ﴿قُلْ أَتُحَاجُّونَنَا فِي اللّهِ وَهُوَ رَبُّنَا وَرَبُّكُمْ وَلَنَا أَعْمَالُنَا وَلَكُمْ أَعْمَالُكُمْ وَنَحْنُ لَهُ مُخْلِصُونَ﴾

"ابن سلامە" دەڵێت[1]((ئایەتی: ﴿وَلَنَا أَعْمَالُنَا وَلَكُمْ أَعْمَالُكُمْ﴾ ئەم ئایەتە بە ئایەتی شمشێر سڕاوەتەوە لەسەر قسەی دەستەیەك))

"ابن الجوزي" دەڵێت: ((هەندێك لە ئەهلی تەفسیر پێیان وایە ئەم کەلامە جۆرێك لە ئاسانکاری لەگەڵ بێباوەڕان داوا دەکات و پاشان بە ئایەتی شمشێر نەسخکرایەوە و پێموانییە ئەم قسەیە دروست بێت))

پشتیوانی ئەوە دەکەم "ابن الجوزي" دەیڵێت لەسەر نەبوونی نەسخ لەم ئایەتەدا بە کۆمەڵە هۆیەك، لەوانە:

١-مانای ﴿قُلْ أَتُحَاجُّونَنَا فِي اللّهِ﴾ ئەوەیە کاتێك وتیان ئێمە لەپێشترین بۆ لای خودا لە ئێوە، ئەو پەروەردگاری ئێمە و ئێوەشە و هەردووکمان لە حوکمی بەندایەتیدا یەکسانین، وەڵامەکە دێت: ﴿وَلَنَا أَعْمَالُنَا وَلَكُمْ أَعْمَالُكُمْ﴾، واتە هیچ تایبەتمەندییەك بۆ هیچ کەسێك نییە لەلای خودا مەگەر لەڕووی گوێڕایەڵی و کردارەوە و هەریەکێکمان بەپێی کردارەکانی خۆمان پاداشت و سزا وەردەگرین[2].

---

[1] نواسخ القرآن ص ٥٣.

[2] "الزمخشري" (الكشاف ١/٣١٦ / دەڵێت:((ماناکەی ئایا موجادەلەمان لەگەڵ دەکەن دەربارەی خودا و هەڵبژاردنی پێغەمبەر(ﷺ) لە عەرەب نەك لە ئێوە، و دەڵێن گەر بۆ سەر کەسێك دابەزێت ئەوا بۆ سەر ئێمە دادەبەزێت، خۆتان پێ لەپێشترە بە

٢–نەبوونی هیچ بەرهەڵستکارییەك لەنێوان ئەم ئایەتە و ئایەتی شمشێردا تا نەسخی بکاتەوە و بەرهەڵستکارییەکە هەڵبگرێت.

٣–ئەم ئایەتە ڕێسایەکی شەرعی گشتییە روو بە خێزانی مرۆڤایەتی بەوەی هەر حوکمێك لە حوکمەکانی قورئان لە ڕەچاوکردنە تاکەکەسییەکان بەدوورە و بە پاداشت و سزا هاوتاکراوە، گەر کارەکەی خێر بێت ئەوا پاداشتەکەی خێرە و گەر کارەکەی شەڕ بوو ئەوا سزاکەی شەڕ دەبێت.

٤–ئەم ئایەتە هەواڵێکە مەبەست پێی بەڵێن و هەڕەشەیە، بۆیە هیچ یەکێك لەمانە ناچێتە ژێر باری نەسخەوە.

–ئایەتی(١٥٩): ﴿إِنَّ الَّذِينَ يَكْتُمُونَ مَا أَنزَلْنَا مِنَ الْبَيِّنَاتِ وَالْهُدَى مِن بَعْدِ مَا بَيَّنَّاهُ لِلنَّاسِ فِي الْكِتَابِ أُولَـئِكَ يَلعَنُهُمُ اللّهُ وَيَلْعَنُهُمُ اللَّاعِنُونَ﴾[١].

هەندێ پێیان وایە ئەم ئایەتە بەو هەڵواردنە(الإستثناء) لە ئایەتەکەدا هاتووە نەسخکراوەتەوە، واتە ئەم بەشەی ئایەتەکە: ﴿إِلاَّ الَّذِينَ تَابُوا وَأَصْلَحُوا وَبَيَّنُوا فَأُوْلَئِكَ أَتُوبُ عَلَيْهِمْ وَأَنَا التَّوَّابُ الرَّحِيمُ﴾[٢].

"ابن السلامة" دەڵێت[٣]: خودا بە هەڵواردن(الإستثناء) نەسخی کردۆتەوە.

"ابن حزم الأندلسي"[٤]دەڵێت: خودا بە هەڵواردن(الإستثناء) نەسخی کردۆتەوە و دەفەرموێت: ﴿إِلاَّ الَّذِينَ تَابُوا وَأَصْلَحُوا وَبَيَّنُوا﴾.

---

پێغەمبەرایەتی لە ئێمە، ئەو پەروەردگاری ئێمە و ئێوەشە، هەموومان لەوەدا بەشدارین کە بەندەی ئەوین، ئێمە کاروکردەوەکانمان بۆ خۆمانە و ئێوەش کاروکردەوەکانتان بۆ خۆتانە، کاروکردەوەش بنچینەی ئەمرە و پەند و ئامۆژگاری لە کارەوەیە))

[١] سورة البقرة/١٥٩.

[٢] سورة البقرة/١٦٠.

[٣] الناسخ والمنسوخ ص ٧٩.

[٤] الناسخ والمنسوخ في القرآن الكريم ص ٢٣.

لەوانەیە ئەم دوو زانا گەورەیە مەبەستیان بە نەسخ تایبەتکردن بێت بینا لەسەر بەکارهێنانی نەسخ بە مانا گشتییەکەی لەلای پێشینی چاکان، گەر مەبەست بە نەسخ مانا ئوسولییە تایبەتەکەی بوویێت پێویست بوو بوترابایە هەموو هەڵواردنێك لە ئایەتەکانی سزادا نەسخکەرە بۆ ئەوەی پێش خۆی، پێویست پووچ و بێبنەمایە و پێویستکراویش بە هەمان شێوە.

"ابن الجوزي"[1]دەڵێت: (هەندێك لە خوێنەرانی قورئان کە مەعریفەیان بە زانستی عەرەبی و فیقه نییە پێیان وایە ئەم ئایەتە بە هەڵواردنەکە نەسخکراوەتەوە، گەر ئەوانە بەشیان لە زمانی عەرەبی و فیقدا هەبوایە تێدەگەیشتن هەڵواردنەکە نەسخ نییە، بەڵکو بریتییە لە دەرکردن(وەدەرنان)ی "هەندێك" کە وشەکان لەخۆی دەگرن، ئەمەش لە دوو رووەوە پەردەی لەسەر لادەدرێت:

یەکەم—نەسخکەر و نەسخکراو ناکرێت کار بە یەکێکیان بکەیت مەگەر بە وازهێنان لە کارکردن بەویتریان، بەڵام لێرەدا دەتوانین کار بە هەڵواردەکراو(مستثنى) و هەڵواردەلێکراو(مستثنى منه) بکەین.

دووەم—گەر هەڵواردن چووە ناو رستەوە دەسەلمێت چوونەناوی هەڵواردەکراو بۆ ناو رستە پێشووەکە بە مەبەست نەگێراوە، ئەوەش بە گوزارەی یەکەم بەمەرام نەگێرابێت نەسخی ناچێتە ناو)

پوختەی قسان: گەر مەبەست بە نەسخ مانا گشتییە هەمەلایەنەکەی بێت بۆ تایبەتکردن ئەوا هیچ بەرهەڵستییە بۆ قسەکەیان نییە لەسەر نەسخ، گەر مەبەستیش بە نەسخ مانا تایبەتە ئوسولییەکەی بێت ئەوە هەڵەیەکی زەبەلاحە و جێگەی لێخۆشبوون نییە و تێکەڵییەکە لە نێوان نەسخ و تایبەتکردندا.

پاشان "ابن حزم الأندلسي" کە لە بانگەرانی نەسخی ئەم ئایەتەیە لە کتێبی "الناسخ والمنسوخ"دا[2] دەڵێت: (هەڵواردن نەسخ نییە، هەندێك هەڵواردن و

---

[1] نواسخ القرآن ص ٥٥.

[2] ص ٨.

تایبەتکردنیان ناوناوە نەسخ، فەقیهەکان پێچەوانەی ئەوەن)

-ئایەتی(١٧٣): ﴿إِنَّمَا حَرَّمَ عَلَيْكُمُ الْمَيْتَةَ وَالدَّمَ وَلَحْمَ الْخِنزِيرِ وَمَا أُهِلَّ بِهِ لِغَيْرِ اللَّهِ﴾[١].

"ابن سلامة"[٢]دەڵێت: خودا بە سوننەت ئەم ئایەتەی نەسخکردووە ئەوەش بریتییە لە هەندێ مردارەوەبوو و خوێن، بە فەرموودەکەی پێغەمبەر(ﷺ): ((دوو مردارەوەبوو و دوو خوێنمان بۆ حەڵاڵ بووە: ماسی و کولە لەگەڵ جگەر و سپڵ))[٣].

ابن حزم الاندلسي[٤] دەڵێت: هەندێ مردارەوەبوو و هەندێ خوێن بە سوننەت نەسخکراونەتەوە، بە فەرموودەکەی پێغەمبەر(ﷺ): ((دوو مردارەوەبوو و دوو خوێنمان بۆ حەڵاڵ بووە: ماسی و کولە لەگەڵ جگەر و سپڵ)) خودا-سبحانه وتعالى- دەفەرموێت: ﴿وَمَا أُهِلَّ بِهِ لِغَيْرِ اللَّهِ﴾، پاشان روخسەتی کەسی ناچاری داوە گەر زیاد لە رادە و سنووری خۆی دەستدرێژی نەکات بە وتنی: ﴿فَلاَ إِثْمَ عَلَيْهِ﴾.

ابن الجوزي[٥] دەڵێت: ئایەتی: ﴿إِنَّمَا حَرَّمَ عَلَيْكُمُ الْمَيْتَةَ وَالدَّمَ وَلَحْمَ الْخِنزِيرِ﴾ دەستەیەك لە ئەهلی تەفسیر پێیان وایە سەرەتای ئەم ئایەتە بەم بەشەی ئایەتەکە نەسخکراوەتەوە: ﴿فَمَنْ اضْطُرَّ غَيْرَ بَاغٍ وَلاَ عَادٍ﴾، هەندێکیان پێیان وایە تەنها حوکمی مردارەوەبوو و خوێنی بەم فەرموودەیە تێدا نەسخکراوە: ((دوو مردارەوەبوو

---

[١] سورة البقرة/١٧٣ تتمة الآية (فَمَنْ اضْطُرَّ غَيْرَ بَاغٍ وَلاَ عَادٍ فَلاَ إِثْمَ عَلَيْهِ إِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَحِيمٌ).

[٢] الناسخ والمنسوخ ص ٨٠.

[٣] ورد هذا الحديث في مسند الامام احمد بن حنبل ٩٧/٢ عن ابن عمر هكذا ((دوو مردارەوەبوو و دوو خوێنمان بۆ حەڵاڵکراوە، دوومردارەوەبووەکە حوت(ماسی) و کولە و دوو خوێنەکەش جگەر و سپڵ)).

[٤] الناسخ والمنسوخ في القرآن الكريم ص ٢٣.

[٥] نواسخ القرآن ص ٥٦.

و دوو خوێنمان بۆ حەڵاڵ بووە: ماسی و کولە لەگەڵ جگەر و سپڵ))[1] هەردوو قسەکە پووچ و بێبنەمان، چونکە خودا-سبحانه وتعالی- لەو حەرامکردنە باری زەرورەتی هەڵواردە کردووە و پێغەمبەر(ﷺ) بە تایبەتکردن هەڵواردەی کردووە، لەوەی لە فەرموودەکەدا باسی کردووە و لە هیچ روویەکەوە نەسخی تێدا نییە.

وەك ئێستا باسمان کرد پێویستە گومانی باشمان لەلا بێت بەوانەی دەڵێن ئەم ئایەتە نەسخکراوە و قسەکانیان هەڵبدەینە سەر نەسخ بە مانای گشتی لەلای پێشین، ئەگینا لەم روانەوە هەڵەیە:

١-تێکەڵییە لە نێوان نەسخ و تایبەتکردن، بۆیە ئەو فەرموودە ئاماژەبۆکراوە تایبەتکەرە نەك نەسخکەر.

٢-تێکەڵییە لە نێوان روخسەت و نەسخ تایبەت بە کەسی ناچار.

٣-قورئان بە فەرموودەی ئاحاد ناسڕێتەوە.

-ئایەتی(١٧٨): ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ كُتِبَ عَلَيْكُمُ الْقِصَاصُ فِي الْقَتْلَى الْحُرُّ بِالْحُرِّ وَالْعَبْدُ بِالْعَبْدِ وَالأُنثَى بِالأُنثَى﴾[2].

"النحاس"[3] دەڵێت لە "الضحاك"ەوە لە "ابن عباس"ەوە ئایەتی: ﴿الْحُرُّ بِالْحُرِّ وَالْعَبْدُ بِالْعَبْدِ وَالأنثَى بِالأنثَى﴾ ئەم ئایەتە نەسخی دەکاتەوە ﴿وَكَتَبْنَا عَلَيْهِمْ فِيهَا أَنَّ النَّفْسَ بِالنَّفْسِ﴾[4]، ئەوەی نامۆیە ئەوەیە "ابن سلامه" هۆی دابەزینی ئایەتەکەی[5] گواستۆتەوە کە ئاماژە دەکات بە نەبوونی هیچ جۆرە

---

[1] مسند الشافعي المطبوع على هامش الإم ٢٥٧/٦ وابن ماجة ١٠٢/٢ والدارقطني ٢٧٢/٤.

[2] سورة البقرة/١٧٨.

[3] الناسخ والمنسوخ ص ١٦.

[4] سورة المائدة/٤٥.

[5] الناسخ والمنسوخ ص ٨٠ وفيه (دوو گەڕەك کەمێك بەر لە هاتنی ئیسلام بەشەڕ هاتن یەکێکیان هێز و توانای بەسەر ئەویتریاندا زاڵتر بوو، هیچ کامیان تۆڵەی لەویتر

بەرهەڵستییەك لە نێوان نەسخكەر و نەسخكراوی بانگەشەبۆكراودا، پاشان دەڵێ: ئەهلی تەفسیر كۆدەنگیان هەیە لەسەر ئەوەی تیایدایە لە نەسخكراو كە بریتییە لە﴿الْحُرُّ بِالْحُرِّ وَالْعَبْدُ بِالْعَبْدِ وَالأنثَى بِالأنثَى﴾ لە نەسخكەرەكەیدا جیاوازیان هەیە، عێراقییەكان و دەستەیەك دەڵێن ئایەتی(٤٥) لە سورەتی "المائده" نەسخكەرەكەیەتی: ﴿وَكَتَبْنَا عَلَيْهِمْ فِيهَا أَنَّ النَّفْسَ بِالنَّفْسِ﴾، پاشان دەڵێ: گەر یەكێك بڵێت ئەمە لەسەر "بنی إسرائيل"ەكان نوسرابوو ئیتر چۆن حوكمەكەی ئێمە پابەند دەكات، ئەوا وەڵامەكەی ئەوەیە كۆتایی ئایەتەكە ئێمە پابەند دەكات كە بریتییە لەم بەشە: ﴿وَمَنْ لَمْ يَحْكُمْ بِمَا أنزَلَ اللّهُ فَأُوْلَئِكَ هُمُ الظَّالِمُونَ﴾، ئەوەی رۆشنە ئەوەیە حوكمی نەفس بە نەفس بەشێكە لە قورئان، حیجازییەكان و دەستەیەك دەڵێن: ئەو ئایەتەی كە لە سورەتی "بنی إسرائيل"دایە: ﴿وَمَنْ قُتِلَ مَظْلُومًا فَقَدْ جَعَلْنَا لِوَلِيِّهِ سُلْطَانًا فَلاَ يُسْرِفْ فِي الْقَتْلِ إِنَّهُ كَانَ مَنصُورًا﴾[1]، كوشتنی موسڵمان بە بێباوەڕ بریتییە لە ئیسراف بۆیە لای دەستەیەك لە خەڵكی دروست نییە، هەر بەو جۆرە كوشتنی ئازاد بە بەندە.

عێراقییەكان دەڵێن: دروستە، چونكە پێغەمبەر(ﷺ) موسڵمانی بە بێباوەڕێكی پەیمان لەگەڵ بەستوو كوشتووە و فەرموویەتی: من لەپێشترم لەو كەسەی وەفای بە پەیمانی خۆی كردووە[2].

"ابن حزم الأندلسي"[3] دەڵێت: (شوێنی نەسخەكە لە ئایەتەكەدا بریتییە لە "أنثى" و ئەوانیتری موحكەمن(نەسخنەكراونەتەوە) نەسخكەرەوەكەشی بریتییە لە

---

نەكردەوە تا ئیسلام هات، لایەكیان(بەهێزەكە) وتی رازی نابین تا بەرانبەر كوشتنی بەندەیەكمان كەسێكی ئازادیان لێ نەكوژینەوە هەروەها بەرانبەر كوشتنی ژنێكمان پیاوێكیان لێ نەكوژینەوە، بۆیە خودا بە حوكمەكانی قصاص یەكسانی خستە نێوانیانەوە) ئەم رووداوە لە تەفسیری الطبري ٢/١٠٣ هاتووە.

[1] سورة الاسراء/٣٣.

[2] ابن سلامة الناسخ والمنسوخ ص ٨١.

[3] الناسخ والمنسوخ في القرآن الكريم ص ٢٤.

ئایـەتی ﴿وَكَتَبْنَـا عَلَـيْهِمْ فِيهَـا أَنَّ الـنَّفْسَ بِـالنَّفْسِ﴾، هـەروەها وتـراوە نەسخکەرەوەکەی بریتییە لەوەی لـە سـورەتی "بـني إسـرائيل"دا هـاتووە: ﴿وَمَـنْ قُتِلَ مَظْلُومًا﴾[1]، کوشـتنی ئـازاد بـە بەنـدە ئیسـرافە و هـەر بـەو جـۆرە کوشـتنی موسڵمان بە بێباوەڕ)

"ابن الجوزي" دەڵێت[2]: (لەسەردەمی نەفامیدا –کەمێك پێش هـاتنی ئیسـلام– دوو گەڕەکی عەرەب لەگەڵ یەکتر کوژراو و برینـدار لـە نێوانیـان هـەبوو–واتـە پـێش هاتنی ئیسـلام– و بابـەتی تۆڵەسـەندنەوەکە یـەکلا نەبووبوویـەوە– کاتێـك بەنـدە و ژنیان کوشتبوو و خوێنیان لەیەکتر وەرنەگرتبووەوە، تا موسـڵمان بـوون، یـەکێك لـە گەڕەکەکان لە چەك و ماڵ و ساماندا بەسـەر ئەویتریانـدا هـەبوو–واتـە بـەهێزتر بـوو لەویتریان لەڕووی ژمارە و چەك و ماڵ و سامانەوە، بۆیـە مەرجـەکانی خـۆی سـەپاند بەسەر بەرانبەرە لاوازەکەدا– سوێندیان خوارد رازی نابین تا لـە خـوێنی بەندەیەکدا ئازادێك نـەکوژین لێیـان و لـە خـوێنی ئافرەتێکدا پیاوێـك نـەکوژین، بۆیـە ئایەتەکـە دابـەزی: ﴿الْحُـرُّ بِـالْحُرِّ وَالْعَبْـدُ بِالْعَبْـدِ وَالأَنثَـى بِـالأَنثَى﴾ ئـەم ئایەتـە بـە ئایـەتی "النفس بالنفس" نەسخکراوەتەوە.)

دەڵێم: ئەم قسەیە هیچ ئەرزشێکی نییە لە دوو رووەوە:

یەکەم–ئەوەی دەوترێت ئایەتەکەی سورەتی "المائـدة" لەسـەر ئـەهلی تـەورات نوسـراوە و ئێمـە پابەنـد ناکات، ئێمـە دەڵـێین لـە یـەکێك لـە دوو ریوایەتەکـەدا لای "أحمد" شەرعی پێش ئێمە شەرعی ئێمەشە گـەر نەسـخبوونەوەکەی نەسـەلمابێت، رووی داوا لە ئێمە دوای رووی داوا لە ئەوان(ئەهلی تەورات) نەسخی سەلماندووە، بۆیە ئایەتەکەی سورەتی "المائدة" لەپێشترە بە نەسـخکردنەوە بـەم ئایەتـەی سـورەتی "البقرة" تا نەسخبوونەوەی ئەم ئایەتە بەوەی سورەتی "المائدة".

---

[1] الاسراء/٣٣.

[2] نواسخ القرآن ص ٥٧.

دووەم- بەڵگەی گوتارەکە لای فەقیهەکان بەڵگەیەکی یەکلاکەرەوەیە گەر بەڵگەیەکی بەهێزتر لە ئەو بەرهەڵستی نەکات، بە وشەکانی ئایەتەکە جێگیر بووە "ئازاد بەرانبەر ئازادە"، کەوابوو ئازاد بەرانبەر بەندە لەپێشترە، پاشان سەرەتای ئایەتەکە گشتگیرە ئەوەش ئەو بەشەی ئایەتەکەیە:﴿كُتِبَ عَلَيْكُمْ الْقِصَاصُ﴾ ئەم ئایەتە دابەزیوە لەسەر ئەوانەی ئازادیان بە بەندە دەکوشت و نێریان بە مێ دەکوشت، بۆیە فەرمانیان پێکرا بە وردبوونەوە لە هاوشان و هاوتا[1].

بەڵگەی پووچی و بێبنەمایی بانگەشەی نەسخ:

وتنی نەسخی ئایەتی(١٧٨) لە سورەتی "البقرة" بە ئایەتی(٤٥) لە سورەتی "المائدة" و ئایەتی (٣٣) لە سورەتی: "الإسراء" چەندین بەڵگە لەسەر پووچی و بێبنەماییەکەی راست دەبنەوە:

١-تێکەڵییەکە لە نێوان نەسخ و تەفسیردا، چونکە ئەم بەشەی ئایەتەکە﴿أَنَّ النَّفْسَ بِالنَّفْسِ﴾ تەفسیری نەبوونی تێگەیشتنی پێچەوانە دەکات بۆ ئەم بەشەی ئایەتەکە: ﴿الْحُرُّ بِالْحُرِّ وَالْعَبْدُ بِالْعَبْدِ وَالأنثَى بِالأنثَى﴾، چونکە قورئان وەك باسمان کرد یەك "یەکە"یە و پارچە پارچەبوون قبووڵ ناکات و هەندێکی لێکدانەوە بۆ هەندێکی تری دەکات، گەر -تەنها بۆ گفتوگۆ- وا دابنێین تێگەیشتنی پێچەوانە بوونی هەیە ئەوەش ئەوەیە "ئازاد بە بەندە ناکوژرێت" و "نێر بە مێ ناکوژرێت" بەپێی تێگەیشتنی پێچەوانە لەم ئایەتە ئەوا بەرهەڵستی دەکات لەگەڵ گوزارەی راشکاوی ﴿أَنَّ النَّفْسَ بِالنَّفْسِ﴾ ئەوکات ئەوە لە دەروازەی پارسەنگدانی یەکێك لە دوو بەڵگە بەیەکتر بەرهەڵستکارەکە دەبێت واتە ﴿أَنَّ النَّفْسَ بِالنَّفْسِ﴾ بەسەر ﴿الْحُرُّ بِالْحُرِّ﴾دا و ئەوەش لە دەروازەی نەسخ نییە، هەر کەس دەڵێ لە دەروازەی نەسخە تێکەڵییەکی لا دروست بووە لە نێوان پارسەنگدان و نەسخدا، لە رێسا ئوسوڵییەکان لەسەر موجتەهید یان لەسەر قازی یان لەسەر تەفسیرکەر پێویستە لە

[1] ابن الجوزي ص ٥٧.

هەڵگرتنی بەرهەڵستیدا یەکەمجار پەنا بۆ کۆکردنەوە ببات پاشان پارسەنگدان، ئەوجا نەسخ، هەروەها لە ڕێسا ئوسوڵییەکانە گەر گوزارەی ڕاشکاو بەرهەڵستی کرد لەگەڵ تێگەیشتنی پێچەوانە یەکەمیان پێشدەخرێت.

٢-هۆی دابەزینی ئایەتەکە: ئەوەش ئەو چیرۆکەیە "ابن الجوزي" خستوویەتە ڕوو وەك پێشتر باسمان کرد بەڵگەیە لەسەر ئەوەی: ﴿الْحُرُّ بِالْحُرِّ وَالْعَبْدُ بِالْعَبْدِ وَالأَنثَى بِالأَنثَى﴾ تێگەیشتنی پێچەوانەی نییە، چونکە ئایەتەکە بۆ ئاگادارکردنەوەی هۆزێکی بەهێز هاتووە کە مافی ئەوەی نییە داوای کوشتنەوەی ئازاد بە بەندە بکات لە هۆزەکەی تر، یان داوای کوشتنی پیاو بکات بەرانبەر کوشتنی مێ.

دروست ئەوەیە پیاو تۆڵەی لێ دەکرێتەوە گەر ئافرەتێکی کوشت، و ئازاد تۆڵەی لێ دەکرێتەوە گەر بەندەیەکی کوشت، چونکە خەڵکی لەبەردەم خودادا یەکسانن و هەموومان لە ئادەمن و ئادەمیش لە خاکە.

-ئایەتی (١٨٠): ﴿كُتِبَ[1] عَلَيْكُمْ إِذَا حَضَرَ أَحَدَكُمُ الْمَوْتُ إِنْ تَرَكَ خَيْرًا الْوَصِيَّةُ[2] لِلْوَالِدَيْنِ وَالأَقْرَبِينَ بِالْمَعْرُوفِ[3] حَقًّا عَلَى الْمُتَّقِينَ﴾[4]

هەندێ پێیان وایە ئەم ئایەتە نەسخکراوەتەوە بە ئایەتی میرات، هەیانە دەڵێت ئایەتەکە نەسخکراوەتەوە بەم ئایەتە: ﴿لِلرِّجَالِ نَصِيبٌ مِمَّا تَرَكَ الْوَالِدَانِ وَالأَقْرَبُونَ وَلِلنِّسَاءِ نَصِيبٌ مِمَّا تَرَكَ الْوَالِدَانِ وَالأَقْرَبُونَ مِمَّا قَلَّ مِنْهُ أَوْ كَثُرَ نَصِيبًا مَفْرُوضًا﴾[5].

هەیانە دەڵێت بەم ئایەتە نەسخکراوەتەوە: ﴿يُوصِيكُمُ اللَّهُ فِي أَوْلَادِكُمْ لِلذَّكَرِ

---

[1] واتە فەرزکراوە لەسەرتان.

[2] واتە ماڵ و دارایی.

[3] واتە دادپەروەرانە لە سنورێکدا بە وەسێتەکە کەسوکار زیانتۆمەند نەبێت بۆ کەسانی تر.

[4] سورة البقرة/١٨٠.

[5] سورة النساء/٧.

مِثْلُ حَظِّ الأُنثَيَيْنِ﴾[1]. هەیانە دەڵێت نەسخکەرەکەی بریتییە لە فەرموودەی پێغەمبەر(ﷺ) ((خودا ماف هەموو خاوەن مافێکی داوە بۆیە وەسێت بۆ میراتگران نییە))[2].

هەشیانە دەڵێت: بە ئیجماع نەسخکراوەتەوە[3].

دروست ئەوەیە ئایەتی وەسێت گشتییە و گشتیبوونەکەی بە ئایەتی میرات تایبەتکراوە و پێغەمبەر(ﷺ) تایبەتکردنەکەی بە فەرموودەکە دووپات کردۆتەوە: ((خودا ماف هەموو خاوەن مافێکی داوە بۆیە وەسێت بۆ میراتگران نییە))، فەرموودەکە دووپاتکەرەوەی تایبەتکردنەکەیە نەك نەسخکەرەوە و دووپاتکەرەوە لە نەسخ، وتنی نەسخی ئەو ئایەتە تێکەڵییەکە لە نێوان نەسخ و تایبەتکردندا گەر مەبەست بە نەسخ ماناکەی پاشین(الخلف) بێت، و ئەوەی دراوەتە پاڵ پێشینی چاکان لە وتنی نەسخ ئەوان مەبەستیان مانا گشتییەکەی نەسخ بووە کە لە تایبەتکردندا دەستەبەر دەبێت.

بەڵگە لەسەر ئەوەی پێشینی چاکان مەبەستیان بە نەسخی ئایەتی وەسێت تایبەت کردن بووە ئەوەیە لە "ابن عباس"ەوە ریوایەت کراوە کە فەرموویەتی: لێجێماو دابەش دەکرا بەسەر میراتگراندا لە رێگەی وەسێتی واجبەوە، کاتێك ئایەتی میرات دابەزی وەسێتی بۆ دایك و باوك و کەسە نزیکەکان سڕییەوە و بۆ کەسە

---

[1] سورة النساء/١١، في الاتقان ٢/٢٢ ((وتراوە بە ئایەتی میرات، هەروەها وتراوە بە فەرموودەی (لا وصية لوارث–وەسێت بۆ واریس نییە)، وتراویشە بە ئیجماع "ابن العربي" باسی کردووە.

[2] النحاس (ابو جعفر محمد بن احمد (ت ٣٣٨هـ) في كتابه الناسخ والمنسوخ دەڵێت: ((لەسەر ئەم ئایەتە پێنج قسە هەیە، ئەوانەی دەڵێن دروستە قورئان بە سوننەت نەسخ ببێتەوە دەڵێن نەسخکەرەکەی بریتییە لە: "لا وصية لوارث–وەسێت بۆ واریس نییە")).

[3] في الاتقان ٢/٢٢ وتراوە بە ئایەتی میرات، هەروەها وتراوە بە فەرموودەی: "لا وصية لوارث"، هەروەها وتراوە بە ئیجماع، "ابن العربي" باسی کردووە.

نزیکەکان کە میرات ناگرن جێگیری کرد، "الربیع" دەڵێت: وەسێت بوو بە وەسێت بۆ خزمان کە میرات ناگرن، هەروەها لە "سفیان"ەوە لە "ابن طاوس"ەوە لە باوکیەوە دەڵێت: وەسێت پێش میرات بۆ دایك و باوك و خزم و کەس بوو، کە ئایەتی میرات دابەزی میرات ئەوانەی میراتیان دەگرت سڕییەوە و ئەوەی میراتیان نەدەگرت هێڵایەوە، "الحسن وقتادة"[1] هەر بەو جۆرە دەڵێن.

**گرنگی وەسێتی واجب[2]:**

بۆ وەسێتی واجب گرنگی گەورە هەیە لەڕووی کردارییەوە ئەمەش لە چەندین ڕووەوە، لەوانە:

أ.هەر کەس پێش مردنی باوك و دایکی بمرێت و منداڵ بەجێبهێڵێت گەر یەکێك بوونی نەبێت دایك و باوکەکە بێبەش بکات وەك کوڕ و کچ ئەوا میرات لە داپیر و باپیریان دەگرن بەبێ هیچ جیاوازییەك، بەڵام گەر بێبەشکەر بوونی هەبوو ئەوا دادپەروەری خودایی داوا دەکات لە جێگەی باوك و دایك دابنیشن و بەشی باوکەکە یان دایکەکە بەمیرات بگرن لەسەر گریمانەی مانەوە لە ژیاندا لە ڕێگەی وەسێتی واجبەوە بە مەرجێ ئەو بەشە لە وەسێت لە سێیەکی لێجێماو زیاتر نەبێت، هەر کەس بمرێت و کوڕێك و کوڕی کچێکی مردوو بەجێبهێڵێت وا دادەنرێت کچەکە لە ژیاندا بێت

---

[1] ینظر الطبري ٢/٦٨- ٦٩.

[2] یاسای باری کەسێتی وڵاتانی عەرەبی و ئیسلامی کاریان بە وەسێتی واجب کردووە، ئەوەی ڕۆشنە ئەوەیە حوکمی قازی لە هەر بابەتێکدا جیاوازی لەسەر بێت جیاوازییەکە کۆتایی پێ دەهێنێت، بۆیە پێویستە ئەوەی حاکم بڕیاری لێداوە کاری پێ بکرێت، باسی ئەوەمان کرد زۆرێك لە زانایان موسڵمان لە سەرچاوە باوەڕپێکراوەکاندا فتوایان پێداوە و قسەکانیان جێگیرکراون، لەو سەرچاوانە: المغنی لابن قدامە ٢/٦: "ابو بکر بن عبد العزیز" دەڵێت: لای کەسانی تر واجبە لەنێوان ئەوانەی میرات نابەن، ئەمەش قسەی "داود"ە و لە "مسروق وطاوس وایاس وقتادة وابن جریر"ەوەش ئەوە باس دەکەن و بە ئایەتەکە بەڵگە دەهێننەوە.

و لێجیماوەکەی بە سێیەك دابەش دەکرێت بەسەر کوڕەکە و کچەکەدا پاشان بەشی کچەکە(کچە مردووەکە) دەڕوات بۆ منداڵەکانی بۆ هەر نێرێك بەشی دوو مێ.

ب–هەرکەس بمرێ و میراتەکەی لە کوڕی برا و کچی برادا کورتبوویەوە ئەوا هەموو لێجیماوەکە بۆ کوڕی براکەیە، چونکە "عصبة"یە و کچی براکە بێبەش دەکات چونکە "ذوي الأرحام"ە، لەگەڵ ئەوەی هەردووکیان لە یەك باوك و دایکن و پلەی نزیکییەکەیان یەکێکە، ئەمە بە کۆدەنگی ئەهلی سوننەت، بەڵام لای شیعەی ئیمامی لێجیماو دابەش دەکرێت بەسەر هەردووکیاندا بۆ هەر نێرێك بەشی دوو مێ، لەم حاڵەتەدا گەر وەسێتی واجب بۆ کچی براکە بە ڕەوا ببینین ئەوا میانەگیریمان کردووە لە نێوان فیقهی سونی و فیقهی جەعفەریدا.

ج–هەر کەس بمرێت و کچی برا یان کچی خوشك یان مام یان کوڕی مام بەجێبهێڵێت ئەوا هەموو لێجیماوەکە بۆ مام یان کوڕی مامە لەباری نەبوونی مامدا چونکە لە "عصبة"ن و کچی برا و کچی خوشك بێبەش دەکەن، چونکە ئەوانە لە "ذوي الأرحام"ن، لای ئیمامییەکان بۆ کچی برا و کچی خوشکە، چونکە لە خزمانی پلە دوون، بەڵام مام و ئامۆزا لە خزمانی پلە سێن، بۆیە بە وەسێتی واجب دەتوانین تەبایی بخەینە نێوان دوو ئاراستەکەوە.

زۆربەی موسڵمانان ژنیان لە ئەهلی کتاب هێناوە و جیاوازی ئایین ڕێگرە لە میرات، بەڵام ڕێگر نییە لە وەسێت، لێرەوە وەسێتی واجب جێگەی میرات دەگرێتەوە بۆ ژنی ناموسڵمان کە بەشداری کردووە لە پێکەوەنانی لێجیماوی مێردەکەیدا بە بەشداربوونێکی چالاکانە.

بۆیە یاسادانەری جیهانی ئیسلامی و عەرەبی و ناعەرەبی بانگ دەکەم ڕای ئەوانە وەربگرن لەسەر وەسێتی واجبن و ئەم وەسێتە گشتگیر بکەن و تەنها لە کوڕەزا و کچەزادا کورتی نەکەنەوە.

-ئایەتی(١٨٣): ﴿يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا كُتِبَ عَلَيْكُمْ الصِّيَامُ كَمَا كُتِبَ عَلَى الَّذِينَ مِنْ قَبْلِكُمْ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ﴾[1].

واتە ڕۆژووتان لەسەر فەرز بووە وەك چۆن لەسەر گەلانی تر فەرزكرابوو لە یەهود و نەصارا و خەڵكانی تریش بۆ ئەوەی فێری تەقوا ببن، واتە وزەیەكی ڕۆحی بەدەستبهێنن لە هەموو ئاكارێكی تاوانكارانە بتانپارێزێت، ئەم بەشەی ئایەتەكە: ﴿لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ﴾ ڕۆشنكردنەوەی حیكمەتی پێویستكردنی ڕۆژووە وەك چۆن حیكمەتی پێویستبوونی نوێژی ڕۆشنكردۆتەوە بەوەی مرۆڤ دەپارێزێت لە لادان و ئاكاری تاوانكارانە لە ئایەتی: ﴿وَأَقِمْ الصَّلاَةَ إِنَّ الصَّلاَةَ تَنْهَى عَنْ الْفَحْشَاءِ وَالْمُنْكَرِ﴾ حوكمە داواكارییەكان لە بیروباوەڕ و عیبادەتەكان هەر هەموو كۆمەڵێك ڕێگەی خۆپارێزی و هۆكاری خۆلادانن بۆ قەلاچۆكردنی تاوانەكان لە ناو خێزانی مرۆڤایەتیدا، ئەم ئایەتە پوختەیە وەك پوختەی ئەم ئایەتە: ﴿وَأَقِيمُوا الصَّلاَةَ وَآتُوا الزَّكَاةَ﴾ هەروەها ئایەتی ﴿وَلِلَّهِ عَلَى النَّاسِ حِجُّ الْبَيْتِ مَنْ اسْتَطَاعَ إِلَيْهِ سَبِيلاً﴾

خودا-سبحانه وتعالى- پێغەمبەری(ﷺ) ڕاسپاردووە بە ڕۆشنكردنەوەی ئایەتەكانی نوێژ و زەكات و حەج بە گوفتارەكانی و ڕەفتارەكانی وەك دەفەرموێت: ((بەو جۆرە نوێژ بكەن كە من دەبینن نوێژ دەكەم)) هەروەها فەرموویەتی: ((مەناسیكی خۆتان لە منەوە وەربگرن)) هەروەها ئەو ماڵ و سامانانەی ڕۆشن كردۆتەوە زەكاتیان تێدا پێویست دەبێت لەگەڵ بڕ و ڕادە و مەرجەكانیان، بەڵام خودا-سبحانه وتعالى- ویستوویەتی پوختەی ئەم ئایەتە بە ئایەتەكانی دوای ئەو ڕۆشن بكاتەوە، ئەوانەی ڕۆژوو دەشكێنن و كات و ژمارەی ڕۆژەكان و ئەو بیانوانەی ڕۆژوویان پێ ناگیرێت و قەزاكردنەوەی ڕۆژوو گەر بیانووەكە قابیلی لادان بوو وەك لە نەخۆشیدا كە قابیلی شیفایە و لە سەفەردا، فیدیەی كردووە بە بەدەلی ڕۆژوو بۆ ئەوانەی تووشی بیانوویەكی درێژخایەن هاتوون و قابیلی لادان نییە، وەك پیری و

[1] سورة البقرة/١٨٣.

ئەفتادەیی و نەخۆشییەك قابیلی چاكبوونەوە نەبێت.

بەڵام هەندێ لە زانایانی موسڵمان لە ئوسولییەكان و ئەهلی تەفسیر و لێكرڵەران لە بابەتی نەسخ بە ئیجتیهادی هەڵەی خۆیان ئەم ئایەتانەیان خزاندووەتە ناو "الناسخ والمنسوخ"ەوە، وەك لەم ڕۆشنكردنەوەیەدا:

﴿أُحِلَّ لَكُمْ لَيْلَةَ الصِّيَامِ الرَّفَثُ[1] إِلَى نِسَائِكُمْ هُنَّ لِبَاسٌ لَكُمْ وَأَنْتُمْ لِبَاسٌ لَهُنَّ[2] عَلِمَ اللَّهُ أَنَّكُمْ كُنتُمْ تَخْتَانُونَ أَنفُسَكُمْ فَتَابَ عَلَيْكُمْ وَعَفَا عَنْكُمْ فَالآنَ بَاشِرُوهُنَّ وَابْتَغُوا مَا كَتَبَ اللَّهُ لَكُمْ وَكُلُوا وَاشْرَبُوا حَتَّى يَتَبَيَّنَ لَكُمُ الْخَيْطُ الأَبْيَضُ مِنَ الْخَيْطِ الأَسْوَدِ[3] مِنَ الْفَجْرِ ثُمَّ أَتِمُّوا الصِّيَامَ إِلَى اللَّيْلِ﴾[4].

بانگەشەی ئەوەی ئەم ئایەتە نەسخكەرەوەی ئایەتی(١٨٣)یە بانگەشەیەكی هەڵەیە بە چەندین هۆ، لەوانە:

١-بانگەشەی نەسخ لەسەر ئیجتیهادێكی هەڵە بیناكراوە كە لە تەفسیر كردنی ئەم ئایەتە پوختەدا هەندێ لە موسڵمانانی تێكەوتووە، بەر لە ڕۆشنكردنەوەی درێژەپێدانی بە ئایەتەكانی دوای ئەو، وا گومانیان بردووە تەشبیهی هاتوو لە ئایەتەكەدا: ﴿كَمَا كُتِبَ عَلَى الَّذِينَ مِنْ قَبْلِكُمْ﴾ گشتگیرە بۆ هەموو پایە و مەرجەكانی ڕۆژووگرتنی واجب لەسەر ئوممەتانی پێشوو لەڕووی ڕۆژووشكێنەكان و

---

[1] نووستن لەگەڵ هاوسەری خۆ، بە ئاشكرا ناوی نەهێناوە بەهۆی نەشیاوی ناوهێنانیەوە.

[2] ئاماژەیە بە ئامێزانبوونی ژن و پیاو لەگەڵ یەكتر یان پێویستی هەریەكەیان لەویتریاندا، وەك پێویستی بە پۆشاك.

[3] مەبەست بە داوی سپی بریتییە لە ڕۆژبوونەوە، یەكەمین ڕۆژبوونەوە بریتییە لە هەڵهاتنی بەرەبەیان، داوی ڕەش بریتییە لە شەو، یان مەبەست پێی سپێدەی بەرەبەیانە لە ڕەشی كۆتایی شەو، ئەوەی بە داو شوبهاندووە چونكە ئەو بڕەی خواردن و خواردنەوە قەدەغە دەكات لە سپێدە وەك داو وایە و هاوشێوەی خۆی لە ڕەشی لادەبات. ینظر الطبرسي ٢٨٢/٢.

[4] سورة البقرة/١٨٧.

ژمارەی رۆژەکان و کات و بیانوو و هاوشێوەکانی ئەمانە لە درێژەپێدان کە خودا- سبحانە وتعالی- لە ئایەتەکانی دوای ئەو ئایەتەدا رۆشنی کردۆتەوە، خودا هەڵەی ئەوانی رۆشن کردۆتەوە لە تێگەیشتن بەو ئایەتانەی درێژە بە بابەتەکە دەدەن.

٢-تەشبیه لە ئایەتی﴿كَمَا كُتِبَ عَلَى الَّذِينَ مِنْ قَبْلِكُمْ﴾ لە سروشتی حوکمەکەدا کورتهەڵهاتووە(فەرزبوون و پێویستبوونی ناچاری) نەك لە هەموو توخمەکان و حوکمەکاندا، زانایانی رەوانبێژی کۆدەنگیان هەیە [1] لەسەر ئەوەی رووی لێکچوون چواچێوەدار و سنووردارە، و تەشبیهکراو لەگەڵ تەشبیهپێکراو لە هەموو شتێکدا یەکسان نین ئەگینا تەشبیهی شتەکە بە خۆی پێویست دەکات، پێویست پووچ و بێبنەمایە و هەر بەو جۆرە پێویستکراویش.

٣-خودا دەفەرموێت:﴿عَلِمَ اللَّهُ أَنَّكُمْ كُنتُمْ تَخْتَانُونَ أَنفُسَكُمْ﴾ ئایا ئەم زانینە لەدوای خیانەت و سەرپێچییەکە لە رۆژووگرانەوە روویداوە یان لە کاتی دابەزینی ئایەتی یەکەم و تەشریعی حوکمی هاتوو تیایدا بوونی هەبووە، ئەگەر ئەگەری یەکەممان وەرگرت ئەوا پێویست دەکات نەزانی بدرێتە پاڵ خودا، چونکە شتێکی بۆ دەرکەوتووە کە یەکەمجار نەیزانیوە، ئەمەش خودی "البداء-بۆدەرکەوتن"ە کە زانایان کۆدەنگیان هەیە لەسەر پاکڕاگرتنی خودا لە نەزانی، پێویست بە ئیجماع پووچ و بێبنەمایە و هەربەوجۆرە پێویستکراویش، گەر ئەگەری دووەم وەربگرین بەوەی لە کاتی تەشریعی حوکمی یەکەمدا زانیویەتی ئەوان ناتوانن شان بدەنە ژێر ئەو حوکمە سەرەڕای ئەوەش بڕیاری لێداوە و پاشان سڕیویەتەوە ئەوا دانەپاڵی کاری گاڵتەجاڕی لە کار و حوکمەکانیدا بۆ خودا پێویست دەبێت، پێویست پووچ و بێبنەمایە هەر بەو جۆرە پێویستکراویش.

٤-گەر بوترێت بۆچی خودا-سبحانە- کاری هاوەڵان لە خواردن و خواردنەوە و چوونە لای هاوسەر -دوای خەوتن لە شەوانی رەمەزاندا- بە خیانەت داناوە و

---

[1] ينظر كتاب المطول لسعد الدين التفتازاني في علم البيان ص ٢٥٢ وما بعدها.

تەوبەی لێقبوولّ کردوون ئەگەر ئەوە لە یەکەمجارەوە موباح بوو بێت بۆیان و لە ئایەتەکانی دواتردا خودا ڕۆشنی کردۆتەوە؟ ئەوا ئێمە دەڵێین: شەریعەتی ئیسلام لەڕووی ئاینەوە لە مرۆڤ دەپێچێتەوە نەك لەڕووی قەزاوە گەر کارێکی ئەنجامدا و وا گومانی برد پێچەوانەی فەرمانی خودایە با هەڵەی گومانەکەشی بۆ دەربکەوێت، چونکە کەسی باوەڕدار بەم شەریعەتە مەزنە ئیسلامییە پێویستە ناوەوە و پەنهانەکانی پاك و بێگەرد بێت و دەرەوە و ناوەوەی هەماهەنگ بن، ئەم تایبەتمەندییە تایبەتمەندی شەریعەتی ئیسلامە و لە شەریعەتەکانی تر پێی جیادەبێتەوە، گەر کەسێك ماڵی خۆی دزی بە گومانی ئەوەی ماڵی کەسانی ترە لەبەردەم خودادا دادگایی دەکرێت لەسەری، چونکە بوێری بە خەرجداوە سەرپێچی فەرمانی خودا بکات لە گومانەکەیدا، با گومانەکەش لەگەڵ واقیع هەماهەنگ نەبێت.

هەرکەس بچێتە لای ژنەکەی و لە کاتی چوونە لایدا وا خەیاڵ بکات چووەتە لای فڵان ئافرەت کە لە ژنەکەی جوانترە لەبەردەم خودادا گوناهبارە، چونکە چوونە لای ئەو ئافرەتە لە واقیعدا لەسەری حەرامە، ڕێسای شانادان لەسەر نیێت ڕێسایەکی شەرعی گشتییە و لەسەر زمانی پێغەمبەر(ﷺ) هاتووە کە دەفەرموێت:((کار و کردەوەکان بە نیێتن)) بۆیە کار شوێنکەوتەی نیێتی مرۆڤە[1].

–ئایەتی (١٨٤): ﴿أَيَّاماً مَّعْدُودَاتٍ فَمَن كَانَ مِنكُم مَّرِيضاً أَوْ عَلَى سَفَرٍ فَعِدَّةٌ مِّنْ أَيَّامٍ أُخَرَ وَعَلَى الَّذِينَ يُطِيقُونَهُ فِدْيَةٌ طَعَامُ مِسْكِينٍ فَمَن تَطَوَّعَ خَيْراً فَهُوَ خَيْرٌ لَّهُ وَأَن تَصُومُواْ خَيْرٌ لَّكُمْ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ﴾[2].

خودا–سبحانه وتعالى– دەفەرموێت: ﴿لاَ يُكَلِّفُ اللَّهُ نَفْسًا إِلاَّ وُسْعَهَا﴾ هەروەها دەفەرموێت: ﴿يُرِيدُ اللَّهُ بِكُمُ الْيُسْرَ وَلاَ يُرِيدُ بِكُمُ الْعُسْرَ﴾ هەروەها: ﴿وَمَا جَعَلَ

---

[1] لە سەرخەرانی نەسخ نەبوونی: الالوسي ٢/٥٦ وابن العربي ٧٩/١ والرازي ٧٠/٥ والكياالهراسي ٦٢/١.

[2] سورة البقرة/١٨٤.

عَلَيْكُمْ فِي الدِّينِ مِنْ حَرَجٍ﴾.

بينا لەسەر ئەم ئایەتانە کە ئاماژە دەکەن بەوەی ئیسلام ئایینی فیترەت و ئایینی لێبوردن و ئایینی ئاسانکارییە ئەوەی دلوای پێ دەکرێت لە مرۆڤ خاڵی نییە لە یەکێك لەم سێ بارە:

*یان داواپێکراو لەسەرو توانای مرۆڤەوەیە بەهۆی بیانوویەکی درێژخایەن یان کوتوپڕی، لەو بارەدا ئەو داواپێکراوە بەبێ بەدەل بەردەبێتەوە(نامێنێت) وەك کەسێك یەکێك لە دوو دەستەکەی بڕاوە بەهۆی نەخۆشییەوە یان بە هەر هۆیەکی ترەوە لەو بارەدا داوای شۆردنی دەست لە دەستنوێژدا بەردەبێتەوە، چونکە جێگەی داوایەکە نەماوە، هەندێ جاریش بە بەدەل رۆژوو بەردەبێتەوە وەك پاساوی پیری و ئەفتادەیی یان نەخۆشییەك هیوای چاکبوونەوەی لێناکرێت، بۆیە خودا–سبحانە– ئەو داواپێکراوەی هەلگرتووە و لە جێگەکەی بەدەلی داناوە کە بریتییە لە فیدیە.

*هەندێ جار هەستان بە داواپێکراو لە سنووری توانای کەسەکەدایە، بەلام لەوانەیە سەلامەتی کەسەکە رووبەڕووی مەترسی بکاتەوە، و بیانووەکەش کاتییە، بۆیە لەو بارەدا و لە کاتێکی دیاریکراو بۆی وازلێهێنانی رێگە پێدراوە، و داوای قەزاکردنەوەی لێ دەکرێت دوای لاچوونی بیانووەکە، وەك لە باری سەفەر و نەخۆشی و سکپڕی و شیردان و هاوشێوەکانی ئەمانەدا، ئەمەش پێی دەوترێت روخسەت.

*بەلام گەر بارگرانییەکە لە سنووری توانای ئەودا بوو و ژیان و تەندروستی رووبەڕووی مەترسی نەدەکردەوە بەوەی ئاسایی بێت لەسەری، ئەوا لەسەر داوالێکراو پێویستە هەستێت بە داواپێکراوەکە وەکو پێویست، ئەمەش پێی دەوترێت عەزیمەت، بۆیە بارگرانی(مەشەقەت) ئاسایی وا ناکات هەڵنەستێت بە داواپێکراو، چونکە هیچ کارێك نییە مرۆڤ پێی هەستێت بۆ خۆی یان بۆ کەسانی تر جۆرێك لە ماندووبوون و بارگرانی لەگەڵ نەبێت.

هەندێ پێیان وایە ئایەتی (١٨٤)ی سورەتی "البقرة" نەسخکراوەتەوە بەم ئایەتە: ﴿فَمَنْ شَهِدَ مِنْكُمْ الشَّهْرَ فَلْيَصُمْهُ﴾[١] "ابن سلامة" دەڵێت: ئەم ئایەتەی (١٨٤) نیوەی[٢] نەسخکراوەتەوە و نیوەکەی تری[٣] موحکەمە، لە سەرەتای ئیسلامەوە کەسێك دەیتوانی بیەوێت بەڕۆژوو بێت یان بیەوێت بیشکێنێت و لە جێگەی ڕۆژەکەی خواردنی گەدایەك بدات، خودا دەفەرموێت: ﴿فَمَنْ تَطَوَّعَ خَيْرًا فَهُوَ خَيْرٌ لَهُ﴾ تا ئایەتەکەی دوای ئەو دابەزی ئەوەش:﴿فَمَنْ شَهِدَ مِنْكُمْ الشَّهْرَ فَلْيَصُمْهُ﴾ بۆیە ئەمە بوو بە نەسخکەری:﴿وَعَلَى الَّذِينَ يُطِيقُونَهُ﴾.

دانەپاڵی وتنی نەسخ بۆ زیاتر لە یەك کەس لەوانە "ابن عباس"[٤]، "النحاس"[٥] –دوای خستنەڕووی بۆچوونی ئەوانەی لەسەر نەسخن– دەڵێت: (گەر ئایەتەکە نەسخکراو بێت ئەوا بەڵگەی تێدایە(واتە دژ بەوانەی دەڵێن نەسخکراوەتەوە) کە زانایان کۆدەنگیان هەیە لەسەر ئەوەی پیاوی زۆر پیر و ژنی زۆر پیر کاتێك ناتوانن بەڕۆژوو بن یان دەتوانن و ڕووبەڕووی بارگرانییەکی گەورەیان دەکاتەوە ئەوا بۆیان هەیە بیشکێنن، "الربيعة ومالك" دەڵێن: گەر بیشکێنن هیچیان لەسەر نییە، تەنها ئەوەندەیە "مالك" وتویەتی: گەر بۆ هەر ڕۆژێك بە ئەندازەی "مد"ێك خواردنی گەدایەك بدەن لام باشترە، "أنس بن مالك و ابن عباس و قيس بن سائب و أبو هريرة" دەڵێن: فیدیەی لەسەرە، ئەم بۆچوونەش رای شافیعییە وەك شوێنکەوتنێك لە ئەوەوە بۆ رای هاوەڵان، ئەمەش بنەڕەتێکە لە بنەڕەتەکانی، بەڵگەیەکی تر بۆ ئەوانەی دەڵێن فیدیەیان لەسەرە ئەوەیە دەڵێن: ئەمە نەخۆشی نییە و لە سەفەریشدا

---

[١] سورة البقرة/١٨٥.

[٢] ئەوەش ئایەتی: (وَعَلَى الَّذِينَ يُطِيقُونَهُ فِدْيَةٌ طَعَامُ مِسْكِينٍ).

[٣] ئەوەش ئایەتی: (أَيَّامًا مَعْدُودَاتٍ فَمَنْ كَانَ مِنْكُمْ مَرِيضًا أَوْ عَلَى سَفَرٍ فَعِدَّةٌ مِنْ أَيَّامٍ أُخَرَ).

[٤] "ابن الجوزي" (نواسخ القرآن ص٦٧) دەڵێت: لە "ابن سيرين"ەوە "ابن عباس" فەرمووی: ئەم ئایەتە نەسخکراوەتەوە.

[٥] الناسخ والمنسوخ ص٢١.

نین بۆیە فیدیەیان لەسەرە بەهۆی ئەم بەشەی ئایەتەکەوە: ﴿وَعَلَى الَّذِينَ يُطِيقُونَهُ فِدْيَةٌ طَعَامُ مِسْكِينٍ﴾ بەلگەی ئەوانەی دەلێن هیچیان لەسەر نییە ئەوەیە ئەو کەسەی دەیشکێنێت لەوانەی شکاندنیان بۆ موباحکراوە تەنها قەزایان لەسەرە گەر پێیگەیشت، بەلام ئەمانە ناگەنە قەزاکردنەوە)[1].

"القرطبي"[2] دەفەرموێت: ((بە سەنەدە دروستەکان جێگیر بووە لە "ابن عباس"ەوە ئایەتەکە نەسخنەکراوەتەوە و ئایەتێکی موحکەمە دەربارەی ئەوانەی باسی کردوون))

دروست ئەوەیە ئایەتەکە موحکەمە بەم هۆیانە:

١.گەر ئایەتی(١٨٥) نەسخکەرەوەی ئەمە بێت: ﴿وَعَلَى الَّذِينَ يُطِيقُونَهُ فِدْيَةٌ طَعَامُ مِسْكِينٍ﴾ ئەوا نەسخکەرەوەی نیوەکەی تریشە: ﴿فَمَنْ كَانَ مِنْكُمْ مَرِيضًا أَوْ عَلَى سَفَرٍ فَعِدَّةٌ مِنْ أَيَّامٍ أُخَرَ﴾.

٢.ئاسانکردن(یان روخسەت) بەپێی پلەی عوزرەکەیە توندبێت یان لاواز، ئەوەی گومانی تێدا نییە ئەوەیە عوزری ئەو کەسەی لە قۆناغی پیری زۆردایە یان نەخۆشییەکەی نەخۆشییەکی درێژخایەن بوو و قابیلی چاکبوونەوە نەبوو لە عوزری سەفەر و نەخۆشی قابیل بە چاکبوونەوە و شیردانی مندال و سکپڕی توندتر و زۆرترە، بۆچی رێگە بەوانە دەدرێت بیشکێنن لەگەل قەزاکردنەوەدا دوای لاچوونی عوزرەکە لە کاتێکدا ئەو کەسەی پێویستی زۆری بە شکاندن هەیە و عوزرەکەی توندترە لە رێگەپێدان مەحروم دەبێت؟

٣.ئەوەی لە "ابن عباس"ەوە گوازراوەتەوە لەرزۆکە جارێك دەلێت نەسخ نەکراوەتەوە وجارێکیش دەلێت بەلگە راست نەبووەتەوە لەسەر سەلماندنی داواکە، گەر بۆ گفتوگۆ خۆمان رادەستی بۆچوونی نەسخ بکەین ئەوە مەبەست پێی مانای

---

[1] الناسخ والمنسوخ لأبي جعفر النحاس ص٢٢.

[2] الجامع لأحكام القرآن لأبي عبدالله محمد بن أحمد الأنصاري القرطبي: ط/٣، دار الكاتب العربي ٢/٢٨٨.

گشتی بووه وەك "القرطبي"[1] دەڵێت: ((نەسخ لەم شوێنەدا[2] مانای تایبەتکردن هەڵناگرێت زۆرجار پێشینەکان نەسخ بە مانای تایبەتکردن بەکاردەهێنن))

٤.وشەی "یطیقونه" بە هەر خوێندنەوەیەك دەخوێنرێتەوە مانای "توانین لەگەڵ بارگرانی" دەگەیەنێت، ژیان رووبەڕووی ترس دەکاتەوە، چونکە ئەوە بریتییە لە مانا زمانەوانییەکەی.

٥.حەرفی "لا مقدرة أو همزة" مانای توانینە بۆ نەرێ یان بۆ لێوەرگرتنەوەی توانین وەك لە "تفسیر الجلالین"دا هاتووە(وعلی الذین لا یطیقونه لکبر أو مرض لا یرجی برؤه[3]–لەسەر ئەوانەی نایتوانن بەهۆی پیری و نەخۆشییەکەوە چاکبوونەوەی ئەستەمە)

٦.وتنی "الناسخ والمنسوخ" لە ئایەتەکانی(١٨٣–١٨٧)ی سورەتی "البقرة"دا تێکەڵییەکە لە نێوان نەسخ و درێژەپێدانی پوختە یان لە نێوان نەسخ و روخسەتدا یان لە نێوان نەسخ و تایبەتکردندا وەك چۆن شانداان لەسەر قسەی پێشینی چاکان وەك "ابن عباس و السدي" و کەسانی تریش لە نەسخیدا تێکەڵییەکە لە نێوان نەسخ بە مانا گشتییەکەی لای پێشینی چاکان و نەسخ بە مانا تایبەتەکەی لای پاشین لە زانایانی ئوسوڵ و تەفسیر.

٧.وتنی نەسخی ئایەتی(١٨٣) بە ئایەتی(١٨٧) و ئایەتی(١٨٤) لە یەك سورەتدا و لە ماوەیەکی کەمدا مرۆڤ رووبەڕووی سەرسامی دەکاتەوە چۆن مرۆڤ رێگە بە خۆی دەدات ئەوە بداتە پاڵ خودایەك کە خاوەنی ناوی"العلي و القدیر والحکیم"ە، خودایەك "زانا" بە بە رابردوو و ئێستا و داهاتوو بەهۆی توانا و ویستی ئەوەوە بەسەر هەموو گەورە و بچووکێکی ئەم گەردوونە مەزنەدا؟

چۆن رێگە بە خۆی دەدات شتێك بۆ قورئان دانپیادا بنێت کە هیچ مرۆڤێك بۆ یاسا

---

[1] المرجع السابق.

[2] واتە لە وتنی نەسخی پاڵدراو بۆ لای "ابن عباس".

[3] تفسیر الجلالین مع حاشیة العلامة الصاوي: ٨٣/١.

دانراوەكانی زەوی دانی پیادا نانێت، لە هیچ دەوڵەتێكی جیهاندا یاسادانەرێكی یاسا زەمینییەكان نابینیتەوە ئەمڕۆ یاسایەك دابنێت و ڕۆژی دوای ئەوە بیسڕێتەوە یان لەم مانگەدا یاساڕێژی بۆ بكات و مانگەكەی دوای ئەوە بیسڕێتەوە، یان لە ساڵێكدا دابینێت و ساڵی دوای ئەوە سڕینەوەی بۆ بكات، چونكە هەر دەوڵەتێك لە جیهاندا پەلە بكات لە دەركردنی یاسادا و پاشان بەزوویی بیسڕێتەوە یان راستكردنەوەی بۆ بكات بە دەوڵەتێكی دواكەوتوو دادەنرێت لە پێگەیشتنی ئەقڵی و تێگەیشتن لە ژیان و داواكارییەكانی[1].

—ئایەتی: (١٩٠):﴿وَقَاتِلُواْ فِي سَبِيلِ اللّهِ الَّذِينَ يُقَاتِلُونَكُمْ وَلاَ تَعْتَدُواْ إِنَّ اللّهَ لاَ يُحِبِّ الْمُعْتَدِينَ﴾[2].

ناوەڕۆكی ئەم ئایەتە لەگەڵ ئایەتی:﴿فَمَنْ اعْتَدَى عَلَيْكُمْ فَاعْتَدُوا عَلَيْهِ بِمِثْلِ مَا اعْتَدَى عَلَيْكُمْ وَاتَّقُوا اللَّهَ وَاعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ مَعَ الْمُتَّقِينَ﴾[3] یەكدەگرنەوە، حوكمی هاتوو لە هەردوو ئایەتەكەدا دانپیادانانە بە یاسای مافی بەرگری ڕەوا كە هەموو یاسا دانراوەكانی زەوی دانیان پیادا ناوە و سنووریان بۆ دیاریكردووە لە تێنەپەڕاندنی سنووری بەرپەرچدانەوەی دوژمنكاری، بەڵام تا ئێستا نەگەیشتوونەتە ئەو كۆتوبەندكردنەی لەم ئایەتەدا هاتووە:﴿بِمِثْلِ مَا اعْتَدَى عَلَيْكُمْ﴾ هەروەها لە ئایەتی:﴿إِنَّ اللَّهَ لاَ يُحِبُّ الْمُعْتَدِينَ﴾ ئەم دوو گوزارە مەزنە وردە باڵایە لە ڕەوانبێژیدا لە قورئاندا راشكاوانە ئاماژە دەكەنە سەر ئەوەی بنەڕەت لە پەیوەندییەكانی نێوان تاكەكان و گەلان و ئوممەتاندا بریتییە لە ئاشتی و جەنگ هەڵاوردەیە و هەڵاواردەش بۆ زەرورەتە و زەرورەتیش بە ئەندازەی خۆی

[1] لە سەرخەرانی نەسخ نەبوونەوەی: الطبري: ٢/٧٩، والآلوسي: ٢/٥٦، القرطبي: ٢/٢٨٧، الرازي: ٥/٧٨، الكياالهرسي: ١/٦٣.
[2] سورة البقرة/١٩٠.
[3] سورة البقرة/١٩٤.

ئەندازەگیری بۆ دەکرێت.

دوای تێپەڕبوونی زیاتر لە سیازدە سەدە لەسەر دانپیادانانی بنەمای ماف بەرگری ڕەوا لە دەستووری خودادا(قورئان) و دیاریکردنی ئەم مافە بەوەی ڕادەی پێویست بۆ بەرپەرچدانەوەی دوژمنکاری تێنەپەڕێنێت، ئەگەر نە بەرگریکار دەبێتە دەستدرێژکار، وەك دەفەرموێت: ﴿وَلاَ تَعْتَدُوا إِنَّ اللّهَ لاَ يُحِبُّ الْمُعْتَدِينَ﴾ ، پەیماننامەی نەتەوە یەکگرتووەکان ئەم بنەمایە لە بەشی حەوتەم مادەی (٥١)دا ڕادەگەیەنێت کە دەقەکەی دەڵێت: ((لەم پەیماننامەدا شتێکی تێدا نییە مافی سروشتی دەوڵەتان بە تاك یان بە کۆ لاواز بکات یان کەم بکاتەوە لە بەرگری لە خۆ گەر هێزێکی چەکدار هێرشی کردە سەر یەکێك لە ئەندامانی نەتەوە یەکگرتووەکان ئەوەش تا ئەنجوومەنی ئاسایش ڕێکارە پێویستەکان بگرێتە بەر بۆ پارێزگاری ئاشتی و ئاسایشی نێودەوڵەتی[1] و ئەو تەگبیرانەی ئەندامان دەیگرنە بەر وەك بەکارهێنانی ماف بەرگری لە خۆ دەگەیەنرێتە ئەنجوومەن بەخێرایی))

لەسەر ئەم مادەیە ئەم تێبینیانە دەکرێت:

١.ماف بەرگری شەرعی لە کەسی مەعنەویدا کورتکردۆتەوە بەبێ کەسی سروشتی بە پێچەوانەی ئەوەی لە قورئاندا هاتووە.

٢.ڕەوایەتی ماف بەرگری شەرعی لەو دەستدرێژیکاریەدا کورتکردۆتەوە بۆ دەوڵەتێك ئەندام بێت لە نەتەوە یەکگرتووەکان لە کاتێکدا زۆرێك لە کەمینەکان ڕووبەڕووی جینۆساید دەبنەوە و بەرگری لە خۆیان بە یاخیبوون و تیرۆر دادەنرێت بە پێچەوانەی قورئانەوە.

٣. ئەم مادەیە سروشتی هێزی چەکداری دیارینەکردووە.

٤.پێوەرێکی دانەناوە بۆ ئەوەی پێی دەوترێت دەستدرێژی و ئەوەی پێویستە بۆ بەرپەرچدانەوەی دەستدرێژکاری.

---

[1] الصواب أن يقال الدوليين.٣.

هەندێ پێیان وایە ئایەتی(١٩٠) نەسخکراوەتەوە بەم ئایەتە:﴿وَقَاتِلُوا الْمُشْرِكِينَ كَافَّةً كَمَا يُقَاتِلُونَكُمْ كَافَّةً﴾[1].

"النحاس" دەڵێت[2]: (("ابن زيد" دەڵێت ئەوە نەسخکراوە و نەسخەکەرەشی ئەم ئایەتەیە: ﴿وَقَاتِلُوا الْمُشْرِكِينَ كَافَّةً كَمَا يُقَاتِلُونَكُمْ كَافَّةً﴾ "ابن عباس"یش دەڵێت ئایەتێکی موحکەمە)).

"ابن سلامة"[3] دەڵێت: هەموو ئەم ئایەتە موحکەمە جگە لە:﴿وَلاَ تَعْتَدُوا﴾ لەگەڵ ئەوانەش بجەنگن جەنگتان لەگەڵ ناکەن، هەموو ئەوانە لە سەرەتاوە بووە پاشان خودا ئەوانەی بە﴿وَقَاتِلُوا الْمُشْرِكِينَ كَافَّةً كَمَا يُقَاتِلُونَكُمْ كَافَّةً﴾[4]سڕیوەتەوە، هەروەها بەم ئایەتەش﴿فَاقْتُلُوا الْمُشْرِكِينَ حَيْثُ وَجَدْتُمُوهُمْ﴾ [5].

"ابن الجوزي"[6] دەڵێت: ئەهلی تەفسیر لەم ئایەتەدا جیاوازی کەوتۆتە نێوانیانەوە ئایە نەسخکراوەتەوە یان موحکەمە، ئەم جیاوازییەش بۆ دوو بۆچوون دابەشبووە:

یەکەم– ئایەتەکە نەسخکراوە، پاشان لە نەسخکراودا جیاوازیان کەوتۆتە نێوانەوە هەندێکیان دەڵێن نەسخکراوەکە لە سەرەتاکەیەوەیە، چونکە سەرەتای ئەم ئایەتە داوای ئەوە دەکات جەنگ لەگەڵ بێباوەڕی جەنگاوەردا موباحە، بەڵام ئەوانەی ناجەنگن نە جەنگیان لەگەڵ دەکرێت و نە دەکوژرێن، واتە ئەم تێگەیشتنە پێچەوانەکەی نەسخکردۆتەوە، بۆیە خودا فەرمانی کردووە بە کوشتنی هەموان، یەکسانە بەشداری کوشتنی کردبێت یان نەکردبێت، هەروەها یەکسانە ئەهلی جەنگ

---

[1] سورة التوبة/٣٦.
[2] في كتابه الناسخ والمنسوخ في القرآن الكريم ص٢٥
[3] في كتابه الناسخ والمنسوخ ص٨٥.
[4] سورة التوبة/٣٦.
[5] سورة التوبة/٥.
[6] في كتابه نواسخ القرآن ص٧٠–٧١.

بێت یان نە، وەك ژن و منداڵ و پیر و نەخۆش و هاوشێوەکانی ئەمانە، بەڵام لە نەسخکەردا بۆ چوار بۆچوون دابەشبوون:

أ.نەسخکەر بریتییە لە: ﴿وَقَاتِلُوا الْمُشْرِكِينَ كَافَّةً كَمَا يُقَاتِلُونَكُمْ كَافَّةً﴾[1].

ب.نەسخکەر بریتییە لە:﴿وَاقْتُلُوهُمْ حَيْثُ ثَقِفْتُمُوهُمْ﴾[2].

ج.نەسخکەر بریتییە لە:﴿قَاتِلُوا الَّذِينَ لاَ يُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَلاَ بِالْيَوْمِ الآخِرِ﴾[3].

د.نەسخکەر بریتییە لە:﴿فَاقْتُلُوا الْمُشْرِكِينَ حَيْثُ وَجَدْتُمُوهُمْ﴾[4].

هەیانە دەڵێت: نەسخکراو تیایدا بریتییە لە:﴿وَلاَ تَعْتَدُوا﴾ سەرخەرانی ئەم ئاراستەیە کۆکن لەسەر ئەوەی خودا یەکەمجار دەستدرێژکاریی حەرام کرد و پاشان موباحی کرد بە ئایەتی: ﴿وَقَاتِلُوا الْمُشْرِكِينَ كَافَّةً كَمَا يُقَاتِلُونَكُمْ كَافَّةً﴾ هەروەها ئایەتی ﴿فَاقْتُلُوا الْمُشْرِكِينَ حَيْثُ وَجَدْتُمُوهُمْ﴾.

پاشان ئەهلی تەفسیر جیاوازی کەوتۆتە نێوانیانەوە لەسەر مانای "الإعتداء" کە یەکەمجار حەرام بووە و پاشان نەسخکراوەتەوە[5].

---

[1] سورة التوبة/٣٦.

[2] سورة البقرة/١٩١.

[3] سورة التوبة/٢٩.

[4] سورة التوبة/٥.

[5] "ابن الجوزي" لە (الناسخ والمنسوخ ص٧١-٧٢) پێنج قسەی خستۆتە روو لە لێکدانەوەی "الاعتداو" کە حەرامکردنەکەی سڕیوەتەوە و موباحبوون جێگەی گرتۆتەوە:

١-دەستدرێژی مەکەن بە کوشتنی ژن و منداڵ، "ابن أبي طلحة" لە "ابن عباس"ەوە، هەروەها "ابن ابی نجیح" لە "مجاهد"ەوە ریوایەتیان کردووە.

٢- هەر کەس ناجەنگێت جەنگان دژ بەو کەسە دەستدرێژکارییە، "ابو العالیة وسعید بن جبیر وابن زید" ئەم قسەیان کردووە.

٣- دەستدرێژگاری بریتییە لە هەستان بە هەر شتێك خودا نەهی لێکردووە لە جەنگدا، "الحسن" ئەمەی وتووە.

٤- جەنگان لە مانگەکانی حەرامدا لە حەرەمدا/ "مقاتل" ئەمەی وتووە.

بانگەشـــەی نەســـخکرانەوەی ئایـــەتی (١٩٠) لـــە هـــەموو ئاراســـتەکانییەوە بانگەشەیەکی پووچەڵە بە چەندین هۆ، لەوانە:

١.خودا دەفەرموێت:﴿وَقَاتِلُوا الْمُشْرِكِينَ كَافَّةً كَمَا يُقَاتِلُونَكُمْ كَافَّةً﴾ گونجاوی جەنگانی لەگەڵ هاوەڵدانەران بەستۆتەوە بە جەنگانیان لەگەڵ موسڵمانان و شکاندنی پەیمانیان و دەستدرێژی بۆ سەریان، بەجۆرێك خودا تەنها نەیفەرموو:﴿وَقَاتِلُوا الْمُشْرِكِينَ كَافَّةً﴾ تا بوارێك بهێڵێتەوە بۆ بانگەشەی نەسخ.

٢.چۆن وێنا دەکرێت خودا دەستدرێژی کردنی حەرام کردبێت پاشان بە موباحکردنی نەسخی بکاتەوە، لە کاتێکدا لە سورەتی "البقرة/١٩٠"دا دەفەرموێت ﴿وَلاَ تَعْتَدُوا إِنَّ اللّهَ لاَ يُحِبُّ الْمُعْتَدِينَ﴾ لە سورة المائدة/٨٧ دەفەرموێت:﴿وَلاَ تَعْتَدُوا إِنَّ اللّهَ لاَ يُحِبُّ الْمُعْتَدِينَ﴾ لە سورة الانعام/١١٩ دەفەرموێت: ﴿وَإِنَّ كَثِيرًا لَيُضِلُّونَ بِأَهْوَائِهِمْ بِغَيْرِ عِلْمٍ إِنَّ رَبَّكَ هُوَ أَعْلَمُ بِالْمُعْتَدِينَ﴾ لە سورة الأعراف/٥٥ دەفەرموێت: ﴿ادْعُوا رَبَّكُمْ تَضَرُّعًا وَخُفْيَةً إِنَّهُ لاَ يُحِبُّ الْمُعْتَدِينَ﴾ لە سورة یونس/٧٤ دەفەرموێت: ﴿كَذَلِكَ نَطْبَعُ عَلَى قُلُوبِ الْمُعْتَدِينَ﴾.

٣.هەر چوار ئایەتە باسکراوەکە کە پێیان وایە نەسخکەرەوەی ئایەتی (١٩٠)ی سورەتی "البقرة"ن هەموویان فەرمان بە جەنگ دەکەن لە باری بەرگری رەوادا و شکاندنی پەیمان و هاوپەیمانی و دەستدرێژی کردن بۆ سەر موسڵمانان، یەکسانە ئەوانە هاوەڵدانەران بن یان کەسانی تر بن وەك چۆن لە هۆی دابەزینەکەیدا رۆشنە بۆ کەسێك بیخوێنێتەوە.

٤.وتنی نەسخی ئایەتەکە تێکەڵییەکە لە نێوان تایبەتکردن و نەسخدا، بۆیە ئەو ئایەتە ئاماژەپێدراوانەی بە نەسخکەریان تەماشا دەکەن-بەپێی بۆچوونی بانگەرانی

---

٥- جەنگان دژ بەوانەی هاوپەیمانییان لەگەڵ موسڵماناندا هەیە، "ابن قتيبە" ئەمەی وتووە.

پاشان "ابن الجوزی" دەڵێت: ئەوەی ئاشکرایە ئەوەیە ئەم ئایەتە هەمووی موحکەمە و بانگەشەی نەسخی لێ بەدوورە.

نەسخ- بریتین لە تایبەتکەر بۆ گشتێتی ئەو ئایەتانەی بانگ دەکەن بۆ ئاشتی و دەستدرێژی نەکردن.

٥.بەڵگەهێنانەوە بە قسەی پێشینی چاکان لەسەر ئەوەی ئایەتی(١٩٠) نەسخکرابێتەوە بەو ئایەتە ئامارەپێکراوانە تێکەڵییەکە لە نێوان نەسخ بە مانای گشتی لەلای پێشین و نەسخ بە مانای تایبەت لەلای پاشین.

٦.وتنی نەسخی ئەو ئایەتانەی جەنگ سنووردارەدەکەن لە باری دەستدرێژی کردن و شکاندنی پەیماننامەکان و دەستکردن بە جەنگ تیشکی سەوز هەڵدەکات بۆ دوژمنانی ئیسلام تاکو بڵێن ئیسلام ئاینی تۆقاندن و رشتنی خوێنە.

ئەوەش لە واقیعدا روویداوە، هەر کەس تەماشای دانراوەکانی رۆژهەڵاتناسان و گۆڤاری "المنار" بکات کە لە سەرەتای سەدەی بیستەوە لە میسر دەردەچوو پڕە لەوەی رۆژهەڵاتناسان تانەیان لە ئیسلام پێ دەدا و زانایانی ئەزهەر-رەحمەتی خودا لەسەر رۆحی پاکیان بێت- ئەو تانانەیان رەد دەکردەوە.

١.پێغەمبەر(ﷺ) لە هەندێ لە غەزوەکاندا کە موسڵمانان ئەنجامیاندا ئافرەتێکی کوژراوی بینی و ئەوەی لا ناپەسەند بوو، بۆیە نەهی کرد لە کوشتنی ژن و منداڵ[1].

٢."عمر بن عبدالعزیز" بۆ سەرکردەی سوپای نووسی: ژن و منداڵ و راهیبەکان لە خانەی جەنگدا مەکوژن، ئەوە دەستدرێژیکردنە و خوداش دەستدرێژیکارانی خۆشناوێت.

-ئایەتی (١٩١): ﴿وَلاَ تُقَاتِلُوهُمْ عِندَ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ حَتَّى يُقَاتِلُوكُمْ فِيهِ فَإِن قَاتَلُوكُمْ فَاقْتُلُوهُمْ كَذَلِكَ جَزَاء الْكَافِرِينَ﴾[2].

فەرمان کردن بە جەنگان لەم ئایەتەدا لە "المسجد الحرام"دا بەمەرجگیراوە دوژمن دەست بە جەنگ بکات، بۆیە ئایەتەکە تایبەتە بە باری بەرگری رەواوە، بە

---

[1] رواه مسلم.

[2] سورة البقرة/١٩١.

بەلگەی: ﴿وَلاَ تُقَاتِلُوهُمْ عِنْدَ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ حَتَّى يُقَاتِلُوكُمْ فِيهِ﴾ پاشان دووپاتکردنەوەی بەدرێژەپێدانی: ﴿فَإِنْ قَاتَلُوكُمْ فَاقْتُلُوهُمْ كَذَلِكَ جَزَاءُ الْكَافِرِينَ﴾ ئەوەی جێگەی سەرسامییە ئەوەیە "ابن حزم الأندلسي" دەڵێت ئایەتەکە نەسخکراوەتەوە و نەسخکەرەکەشی بریتییە لە ئایەتی: ﴿فَإِنْ قَاتَلُوكُمْ فَاقْتُلُوهُمْ﴾.

ئەمە تێکەڵییەکی ڕۆشنە لە نێوان تایبەتکردنی گشتیدا بەو مەرجە باسکراوە لەگەڵ نەسخکردنی، لەوانەشە مەبەستی بە نەسخ مانا گشتییەکەی بوبێت کە تایبەتکردنیش دەگرێتە خۆ.

"ابن سلامة"[1] دەڵێت: (ئەم ئایەتە نەسخکراوەتەوە بە ئایەتی "شمشێر") ئەمیش دیسان تێکەڵی لا دروست بووە لە نێوان تایبەتکردن بە ئایەتی شمشێر کە بریتییە لە باری بەرگریکردنی ڕەوا لەگەڵ نەسخ لەوانەشە مەبەستی پێی مانای گشتی بووبێت، چونکە وتنی نەسخ بە ئایەتی شمشێر لە هەر ئایەتێکدا پێیان وایە بەو ئایەتە نەسخکراوەتەوە لە کەسێکەوە دەرناچێت کەمترین زانستی بە ئوسوڵی فیقە هەبێت.

"أبو جعفر النحاس"[2] دەڵێت: ((ئەم ئایەتە لە گرانترینەکانی "الناسخ و المنسوخ"ە، دەستەیە لە زانایان پێیان وایە نەسخ نەکراوەتەوە، لەوانەی دەڵێن نەسخ نەکراوەتەوە "مجاهد وطاووس"ن بەلگە بە ئاشکرای ئایەتەکە دەهێننەوە و هەروەها بەوەی پێغەمبەر(ﷺ) لە فەتحی مەکەدا فەرموویەتی: ئەم شارە حەرامە و خودا حەرامی کردووە و جەنگی تێدا حەڵاڵ نەکردووە بەر لە من، ساتێکی بۆ حەڵاڵ کردووم کە بە حەرامبوونی خودا حەرامە[3]، مەبەستەکەی پێغەمبەر(ﷺ) بەو ساتە حەڵاڵکراوە بریتییە لە کاتی دەستدرێژی هاوەڵدانەران و کەسانی تریش بۆ سەر

---

[1] کتابه الناسخ والمنسوخ ص٨٦. "النحاس" مەیلی بەلای نەسخدا دەڕوات (ص٢٧)، لەوانەیە مەبەستی بە نەسخ مانای گشتی گشتگیر بووبێت بۆ تایبەتکردن.

[2] في كتابه الناسخ والمنسوخ في القرآن الكريم ص٢٦.

[3] رواه البخاري: ٦٥١/٢، وسنن البيهقي الكبرى: ٥٩١/٥.

موسڵمانان))

پوختەی قسان: قورئان بە هەموو ناوەرۆکییەوە ئاماژە دەکات بەوەی ڕەوایەتی جەنگ تەنها لە باری بەرگری شەرعیدایە، چونکە نابێت هیچ مرۆڤێك بەهێز یان هەڕەشەلێکردن بە بەکارهێنانی هێز دژ بە ئەو ناچار بکرێت بۆ وەرگرتنی ئیسلام بە چەندین بەڵگەی نەقلّی و ئەقلّی:

أ.لە بەڵگە گوازراوەکان ئەو ئایەتەیە خودا قسەی لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) پێدەکات:﴿وَلَوْ شَاءَ رَبُّكَ لَآمَنَ مَنْ فِي الْأَرْضِ كُلُّهُمْ جَمِيعًا أَفَأَنْتَ تُكْرِهُ النَّاسَ حَتَّى يَكُونُوا مُؤْمِنِينَ﴾ "همزه الاستفهام" بۆ "الأستفهام الانكارى"ە و لە نەهیکردن کاریگەرترە.

ب.لە بەڵگە ئەقلّییەکان ئەوەیە زۆرلێکردن بۆ وەرگرتنی ئایین سەردەکێشێت بۆ سەرهەڵدانی کۆمەڵگەیەکی دووڕوو، دووڕوو ئەو کەسەیە ڕواڵەتی پێچەوانەی ناوەوەیە، ئەو دەچێتە ناو ئیسلامەوە نەك وەك ئیمان و بیروباوەڕ بەڵکو بۆ پارێزگاری لە ژیانی، وەك دەفەرموێت: ﴿قَالَتِ الْأَعْرَابُ آمَنَّا قُلْ لَمْ تُؤْمِنُوا وَلَكِنْ قُولُوا أَسْلَمْنَا وَلَمَّا يَدْخُلِ الْإِيمَانُ فِي قُلُوبِكُمْ﴾[1]. بەڵگەنەویستە ترسناکی کەسی دووڕوو لە دوژمنی دەرەوە زۆر گەورەترە[2].

—ئایەتی(١٩٢): ﴿ فَإِنِ انتَهَوْا فَإِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾ [3]

گەر وازیان لە بێباوەڕی هێنا یان دەستبەرداری جەنگ بوون ئەوا جەنگ لەگەڵیان دروست نییە، چونکە خودا جەنگی ڕەوای لە بەرگریکردنی ڕەوا لە ئایین و ناموس و ژیان و ماڵ و ساماندا کورتکردۆتەوە گەر یەکێك لەمانە ڕووبەڕووی دەستدرێژیکردن

---

[1] سورة الحجرات/١٤.

[2] من أنصار عدم النسخ: الآلوسي: ٧٥/٢، ابن العربي: ١٠٧/١، القرطبي: ٣٥١/٢، الرازي: ١٢٨/٥، الكياالهرسي: ٨٤/١، الطبرسي: ٢٨٦/١.

[3] سورة البقرة/١٩٢.

بوويەوە.

سەرەڕای ئەوەش هەندێ پێیان وایە[1] ئەم ئایەتە بە ئایەتی شمشێر نەسخکراوەتەوە، بۆیە پێویستە بەردەوا بن لە جەنگ لەگەڵیان، یەکسانە ئەوان لەسەری بەردەوام بن یان دەستبەرداری بووبن و داوای ئاشتی بکەن.

"ابن سلامة"[2] دەڵێت: ((ئەم ئایەتە لە هەواڵەکانە کە مانای ئەمر و نەهی دەگەیەنێت، واتە لێیان ببوورن و لێیان خۆشببن پاشان ئەو لێخۆشبوونە بە ئایەتی شمشێر سڕایەوە.

لەوانەیە "ابن سلامة" مەبەستی بە نەسخ مانای گشتی گشتگیر بێت بۆ تایبەتکردن، ئەگینا ئەوە لە دەروازەی تێکەڵکردنە لە نێوان تایبەتکردن و نەسخدا، ئەسڵ ئیسلامدا ئاشتی و لێبوردن و لێخۆشبوونە، جەنگ و پەنابردن بۆ هێز هەڵواردەیەکی ڕەوایە تەنها لە باری بەرگری ڕەوادا.

پاشان گەر ئەو قسەیە ڕاست بێت هەرچی لێخۆشبوون و لێبوردن و ئاشتییە لە ئیسلامدا بە ئایەتی شمشێر سڕاونەتەوە ئەوا قسەی ڕۆژهەڵاتناسان و کەسانی تریش لە دوژمنان دروستە کە دەڵێن: کاتێك ئیسلام لاواز بوو و هیچ هێز و دەسەڵاتێکی نەبوو بانگی بۆ ئاشتی و لێبوردن و لێخۆشبوون دەکرد، کاتێکیش دەسەڵاتی پەیدا کرد و بەهێز بوو فەرمانی کرد بە جەنگ بە ڕەوا و بە ناڕەوا، هەروەها لە باری بەرگری ڕەوا و شتانی تردا بە بیانووی ئەوەی زەوی موڵکی ئیسلامە و پێویستە بە ڕشتنی خوێن[3] ڕزگار بکرێت، هەروەها دەڵێن: یەهود بە ناوی دینەوە داوای موڵکداری نێوان دوو ڕووبارەکە(نیل و فورات) دەکەن، موسڵمانانیش داوای موڵکداری هەموو زەوی دەکەن و دەڵێن پێویستە لە دەستی ناموسڵمانان دەربهێنرێت.

---

[1] ينظر الناسخ والمنسوخ لابن الجوزي ص٧٤-٧٥.
[2] كتابه الناسخ والمنسوخ ص٨٦
[3] ينظر قاموس التراث لهادي علوي ص٢٢٨.

-ئایەتی(٩٦)﴿وَلاَ تَحْلِقُواْ رُؤُوسَكُمْ حَتَّى يَبْلُغَ الْهَدْيُ مَحِلَّهُ﴾

دەڵێن[1]: بەم ئایەتە نەسخکراوەتەوە: ﴿فَمَنْ كَانَ مِنْكُمْ مَرِيضًا أَوْ بِهِ أَذًى مِنْ رَأْسِهِ فَفِدْيَةٌ مِنْ صِيَامٍ أَوْ صَدَقَةٍ أَوْ نُسُكٍ﴾[2].

ئەمەش بانگەشەیەکی پووچ و بێبنەمایە، بەم بەڵگانە:

١.نەسخکەر و نەسخکراو لێرەدا لە یەك ئایەتدایە، زۆربەی ئەوانەی بانگ بۆ نەسخ دەکەن کۆبوونەوەی نەسخکەر و نەسخکراو لە یەك ئایەتدا رەد دەکەنەوە، ئایەتەکە بریتییە لە: ﴿وَأَتِمُّوا الْحَجَّ وَالْعُمْرَةَ لِلَّهِ فَإِنْ أُحْصِرْتُمْ فَمَا اسْتَيْسَرَ مِنَ الْهَدْيِ وَلاَ تَحْلِقُوا رُءُوسَكُمْ حَتَّى يَبْلُغَ الْهَدْيُ مَحِلَّهُ فَمَنْ كَانَ مِنْكُمْ مَرِيضًا أَوْ بِهِ أَذًى مِنْ رَأْسِهِ فَفِدْيَةٌ مِنْ صِيَامٍ أَوْ صَدَقَةٍ أَوْ نُسُكٍ﴾.

٢.وتنی نەسخ لەم ئایەتەدا تێکەڵییەکە لە نێوان نەسخ و روخسەتدا کە بریتییە لە گۆڕینی حوکم لە گرانییەوە بۆ ئاسانی بە بوونی عوزرێك[3] لەگەڵ راستبوونەوەی هۆی حوکمە بنەڕەتییەکە.

٣.گەر ئەوە راست بێت کۆتایی ئەم ئایەتە سەرەتاکەی نەسخ کردبێتەوە ئەوا پێویست دەکات ئەم بەشەی ئایەتی﴿فَمَنْ كَانَ مِنْكُمْ مَرِيضًا أَوْ عَلَى سَفَرٍ فَعِدَّةٌ مِنْ أَيَّامٍ أُخَرَ﴾ نەسخکەرەوە بێت بۆ سەرەتای ئایەتەکە﴿شَهْرُ رَمَضَانَ الَّذِي أُنزِلَ

---

[1] "ابن حزم الاندلسي" (الناسخ والمنسوخ ص٢٨) دەڵێت:((نەسخکراوەتەوە بە هەڵواردنەکە(بالاستثناء) واتە ئەم بەشەی ئایەتەکە: (فَمَنْ كَانَ مِنْكُمْ مَرِيضًا أَوْ بِهِ أَذًى مِنْ رَأْسِهِ فَفِدْيَةٌ مِنْ صِيَامٍ أَوْ صَدَقَةٍ أَوْ نُسُكٍ).

[2] سورة البقرة/١٩٦.

[3] هۆی دابەزینی ئایەتەکە وەك "الطبري" لە دوای چەند ریوایەتێك ریوایەتی دەکات: ٢٣١/٢. هەروەها "ابن سلامة" المرجع السابق ص٨٦: ((ئەم ئایەتە لەسەر "كعب بن عجره الانصاري" دابەزی کە دەڵێت لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) دابەزین و من خەریکی لێنانی شتێك بووم لە مەنجەڵێکدا و ئەسپێ بەردەبوویەوە بە روخسارمدا، بۆیە پێغەمبەر(ﷺ) پێیفەرمووم: ئەی کەعب لەوانەیە ئەو گیاندارانەی سەرت ئازارت بدات، وتم: بەڵێ، پێی فەرمووم: بانگی سەرتاش بکە سەرت بتاشە، بۆیە ئەم ئایەتە دابەزی: (فَمَنْ كَانَ مِنْكُمْ مَرِيضًا..) الاية.

﴿فِيهِ الْقُرْآنُ هُدًى لِلنَّاسِ وَبَيِّنَاتٍ مِنَ الْهُدَى وَالْفُرْقَانِ فَمَنْ شَهِدَ مِنْكُمُ الشَّهْرَ فَلْيَصُمْهُ﴾[1]، پێویست پووچ و بێبنەمایە بە کۆدەنگی هەر بەو جۆرە پێویستکراویش.

-ئایەتی(٢١٥): ﴿يَسْأَلُونَكَ مَاذَا يُنفِقُونَ قُلْ مَا أَنفَقْتُم مِّنْ خَيْرٍ فَلِلْوَالِدَيْنِ وَالأَقْرَبِينَ وَالْيَتَامَى وَالْمَسَاكِينِ وَابْنِ السَّبِيلِ وَمَا تَفْعَلُواْ مِنْ خَيْرٍ فَإِنَّ اللّهَ بِهِ عَلِيمٌ﴾[2].:

ابن سلامة[3] دەڵێت: ((ئەمە پێش ئەوەی زەکات فەرز بکرێت هەبوو، کاتێك زەکات فەرز کرا خودا هەموو صەدەقەیەکی لە قورئاندا پێ سڕیەوە و دەفەرموێت: ﴿إِنَّمَا الصَّدَقَاتُ لِلْفُقَرَاء وَالْمَسَاكِينِ وَالْعَامِلِينَ عَلَيْهَا وَالْمُؤَلَّفَةِ قُلُوبُهُمْ وَفِي الرِّقَابِ وَالْغَارِمِينَ وَفِي سَبِيلِ اللّهِ وَابْنِ السَّبِيلِ فَرِيضَةً مِّنَ اللّهِ وَاللّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ﴾[4])).

پاشان دەڵێت: "أبو جعفر يزيد بن قعقاع"[5] دەڵێت: زەکات هەموو صەدەقەیەکی لە قورئانـدا نەسخکردۆتەوە و ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان هەموو ڕۆژوویەکی نەسخ کردۆتەوە و سەربڕاوی قوربانی هەموو سەربڕاوێکی تری نەسخ کردۆتەوە، بۆیە ئەم ئایەتە نەسخکەرەوەی ئایەتی پێش خۆیەتی[6].

بانگەشەی نەسخبوونەوەی هەموو خەرجکردنێك یان صەدەقەیەك لە قورئانـدا بە ئایەتی زەکات پووچ و بێبنەمایە بەم بەڵگانە:

١.نەبوونی بەرهەڵستی لە نێوان ئایەتی زەکات و ئایەتەکانی خەرجکردن و

---

(١) سورة البقرة/١٨٥.

(٢) سورة البقرة/٢١٥.

(٣) الناسخ والمنسوخ ص٨٧.

(٤) سورة التوبة/٦٠.

(٥) ناوي "عبد الله بن جحش"ە هاوەڵێکی پێغەمبەر بوو کۆچی کرد بۆ وڵاتی حەبەشە و پاشان بۆ مەدینە. الاعلام: ٢٠٣/٤.

(٦) ينظر الطبري: ٣٤٤/٢.

صەدەقەدا بەهۆی جیاوازییەوە لەمانەدا:

أ.زەکات ڕێژەیەکی سەدی دیاریکراوە بۆ چەند پۆلێکی دیاریکراو، بەڵام خەرجکردن دیارینەکراوە و بڕەکەی بۆ کەسی خەرجکەر بەجێهێڵراوە بەپێی توانا و دەسەڵاتی و بۆ هەر کەسێکی ئاتاج بیەوێت.

ب.زەکات لە ماڵ و دارایی تایبەتدایە بە پێچەوانەی خەرجکردنەوە ئەمەیان گشتییە لە هەموو ماڵ و سامانێکدا.

ج-زەکات هەند(النصاب)ی تیادا بە مەرج دەگیرێت بە پێچەوانەی خەرجکردنەوە.

د-لە زەکاتی پارە و ئاژەڵدا سوڕانەوەی ساڵێکی تێدا بە مەرج دەگیرێت، بە پێچەوانەی خەرجکردنەوە.

٢.وشەی خەرجکردن(الإنفاق) و داتاشراوەکانی (٧٢) جار لە قورئاندا هاتوون، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر گرنگی پێدانی قورئان بەم هاوکارییەی نێوان دەوڵەمەند(دەستڕۆیشتوو) و هەژار(کەسی ئاتاج)، بۆیە وتنی ئەوەی هەموو خەرجکردن یان صەدەقەیەك لە قورئاندا بە زەکات نەسخکراوەتەوە هەموو ڕوویەکی هاوکاری و کۆمەکی ئابووری و دارایی لە نێوان خەڵکیدا لەبار دەبات، ترسناکی ئەم بانگەشە پووچە شاراوە نییە لە داخستنی دەرگای هاوکاری و یارمەتی دارایی لە نێوان خەڵکیدا.

٣.ئیسلام بەوە جیادەبێتەوە فەرمانکەرە بە هاوکاری و یارمەتی و دەستگرۆیی لە هەرزانی و گرانیدا ئەمەش بەرهەڵستی دەکات لەگەڵ ئەو بانگەشە بێبنەمادا ئاماژەی پێکراوەدا.

٤.حوکمی زەکات بریتییە لە فەرز و واجبوون گەر پایەکان و مەرجەکانی فەراهەمبوون ڕێگرەکانی نەرێکران، لە کاتێکدا حوکمی خەرجکردن واجب و مەندوب و حەرام و مەکروه و موباحە بەپێی ڕەوشی خەرجکەر و ڕەوشی

لەسەرخەرجکراو(بۆخەرجکراو)[1].

–ئایەتی(٢١٦):﴿كُتِبَ عَلَيْكُمُ الْقِتَالُ وَهُوَ كُرْهٌ لَّكُمْ وَعَسَى أَن تَكْرَهُواْ شَيْئاً وَهُوَ خَيْرٌ لَّكُمْ وَعَسَى أَن تُحِبُّواْ شَيْئاً وَهُوَ شَرٌّ لَّكُمْ وَاللّهُ يَعْلَمُ وَأَنتُمْ لاَ تَعْلَمُونَ﴾[2]

"ابن الجوزي" دەڵێت[3]: ((جیاوازیان لەسەر ئەمە ئایەتە لە نێواندایە ئایا نەسخکراوەتەوە یان موحکەمە؟

دەستەیەك دەڵێن: نەسخکراوەتەوە چونکە جەنگان لەسەر هەمووان پێویست دەکات، لەبەرئەوەی گوتارەکە روو بە هەموانە و "کتب" بە مانای "فرض"یە)).

هەروەها دەڵێت: بانگکەرانی نەسخ جیاوازیان لە نێواندایە لەمەڕ نەسخکەرەوەکەی، هەیانە دەڵێت بریتییە لەم ئایەتە: ﴿لاَ يُكَلِّفُ اللّهُ نَفْسًا إِلاَّ وُسْعَهَا﴾[4] "عکرمة"ئەمە دەڵێت.

هەیانە دەڵێت نەسخکەرەوەکەی ئەم ئایەتەیە:﴿فَلَوْلاَ نَفَرَ مِن كُلِّ فِرْقَةٍ مِّنْهُمْ طَآئِفَةٌ ..الآیە﴾[5].

وتنی نەسخی ئەم ئایەتە تێکەڵییەکە لە نێوان نەسخ و تایبەتکردندا، بۆیە ئایەتی(٢١٦) گشتییە و ئایەتی(٢٨٦) و ئایەتی(١٢٢) تایبەتن و گشتاندنی ئایەتەکەیان تایبەتکردووە.

---

[1] من أنصار عدم النسخ: الطبري: ٢/٢٠٠، الآلوسي: ٢/١٠٥، ابن العربي: ١/١٤٥، القرطبي: ٣/٣٧، الرازي: ٦/٢٥، الطبرسي: ١/٣١٠.

[2] سورة البقرة/٢١٦.

[3] الناسخ والمنسوخ ص٧٩ وما بعدها.

[4] سورة البقرة/٢٨٦.

[5] سورة التوبة/١٢٢

ـئایەتی(٢١٧):﴿يَسْأَلُونَكَ عَنِ الشَّهْرِ الْحَرَامِ قِتَالٍ[1] فِيهِ قُلْ قِتَالٌ فِيهِ كَبِيرٌ[2] وَصَدٌّ عَن سَبِيلِ اللّهِ وَكُفْرٌ بِهِ[3]...﴾الآيە[4].

مەبەست بە "الشهر الحرام" بریتییە لە مانگی رەجەب، بەو ناوە ناونراوە بەهۆی حەرامبوونی جەنگ و کوشتارەوە تیایدا و مەزنی حورمەتی ئەو مانگە[5].

هەندێك پێیان وایە[6] نەسخکراوەتەوە بە ئایەتی شمشێر﴿اقْتُلُوا الْمُشْرِكِينَ حَيْثُ وَجَدْتُمُوهُمْ﴾[7] لەوانە"النحاس" کە دەڵێت:((زانایان کۆدەنگیان هەیە لەسەر نەسخبوونەوەی ئەم ئایەتە و جەنگکردن لەگەڵ هاوەڵدانەران لە مانگی حەرامدا موباحە، جگە لە "عطاء" ئەو دەڵێت ئایەتەکە موحکەمە و جەنگکردن لە مانگەکانی حەرامدا دروست نییە))[8].

بانگەشەی نەسخ تێکەڵییە لە نێوان تایبەتکردن و نەسخدا، لە رەوشی ئاساییدا جەنگان لە مانگەکانی حەرامدا حەرامکرابوو، ئایەتی شمشێر ئەم گشتبوونەی تایبەت کرد و باری دەستدرێژی هاوەڵدانەرانی بۆ سەر موسڵمانان لەو مانگەدا جیاکردەوە و جەنگان لەگەڵیان موباحە بە ئەندازەی بەرپەرچدانەوەی دەستدرێژییەکەیان بەهۆی ئایەتی:﴿فَمَنْ اعْتَدَى عَلَيْكُمْ فَاعْتَدُوا عَلَيْهِ بِمِثْلِ مَا اعْتَدَى عَلَيْكُمْ﴾[9].

---

[1] بەدەلی "اشتمال" چونکە کات ئەوەی تیایدا روودەدات لەئامێز دەگرێت.

[2] تیایدا جەنگ دروست نییە، بۆیە گوزارەی(کبیر) ئاماژەیە بە حەرامبوونی جەنگان تیایدا.

[3] واتە کوفر بە خودا.

[4] سورة البقرة/٢١٧.

[5] الطبرسي: ٢/٣١٢.

[6] النحاس ص٣١، الطبري: ٢/٢٠٥، ابن الجوزي ص٨١.

[7] سورة التوبة/٥.

[8] الناسخ والمنسوخ في القرآن الكريم ص٣٠.

[9] الآلوسي: ٢/١٠٧، ابن العربي: ١/١٤٧، القرطبي: ٣/٤٣، الرازي: ٦/٢٦.

-ئایەتی(٢١٩):﴿يَسْأَلُونَكَ عَنِ الْخَمْرِ وَالْمَيْسِرِ قُلْ فِيهِمَا إِثْمٌ كَبِيرٌ وَمَنَافِعُ لِلنَّاسِ وَإِثْمُهُمَا أَكْبَرُ مِنْ نَفْعِهِمَا...﴾[1].

هەندێ پێیان وایە[2] ئەم ئایەتە نەسخکراوەتەوە و لەسەر نەسخکەرەکەی جیاوازیان لە نێواندا هەیە، هەیانە دەڵێت ئەم ئایەتەیە: ﴿يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لاَ تَقْرَبُوا الصَّلاَةَ وَأَنْتُمْ سُكَارَى حَتَّى تَعْلَمُوا مَا تَقُولُونَ﴾[3].

هەشیانە دەڵێت بەم ئایەتە نەسخکراوەتەوە:﴿يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِنَّمَا الْخَمْرُ وَالْمَيْسِرُ وَالأَنصَابُ وَالأَزْلاَمُ رِجْسٌ مِنْ عَمَلِ الشَّيْطَانِ فَاجْتَنِبُوهُ﴾[4]

ئەم بانگەشانە و بانگەشەکانی تریش پووچ و بێبنەمان، چونکە لەسەر تێکەڵی نێوان نەسخ و قۆناغبەندی(پلە بە پلەیی) بیناکراوە، وەك لەم ڕۆشنکردنەوەیەدا:

قورئان وشەی "الخمر"ی بە مانا زمانەوانییە گشتییە گشتگیرەکەی بۆ هەموو سەرخۆشکەرێك بەکارهێناوە بەچاوداخستن لە جۆرەکەی و سروشتەکەی و کەرەستە سەرەتاییەکەی، بۆیە هەر شتێك ژێری پەکبخات و دایبپۆشێت و ناتەواوی تێدا دروست بکات بریتییە لە "خمر"، دەوترێت "خمرتِ المرأة" یان "اختمرت المرأة" واتە "خمار"ی پۆشی، "خمار" ئەوە بوو ئافرەت سەری پێ دادەپۆشی، ئیسلام هات و ئارەق لە هەموو ماڵێکدا دروست دەکرا و زۆربەی خەڵکی لە دانیشتنە گشتی و تایبەتییەکانیاندا دەیانخواردەوە و ئالوودەبوون لەسەر خواردنەوەی مادە سەرخۆشکەرەکان، خواردنەوە بوو بوو بە نەخۆشییەکی کۆمەڵایەتی درێژخایەن و نەدەتوانرا بە یەکجار دەستی بەسەردا بگیرێت، بەڵکو قەلاچۆکردنی داوای گرتنەبەری چەندین هەنگاوی پلە بە پلەی دەکرد تا خۆڕاهێنانی کۆتایی لەسەر دەبڕانی تەواو، حیکمەتی خودایی داوای دەکرد دەستگرتنەوەی تەواو لە خواردنەوەی ئارەق بە

---

[1] سورة البقرة/٢١٩.
[2] كالنحاس ص٤٠ وابن حزم ص٢٨ وابن الجوزي ص٨١ وما بعدها وابن سلامة ص٩٠.
[3] سورة النساء/٤٣.
[4] سورة المائدة/٩٠.

چوار قۆناغدا گوزەر بکات، ئەمەش مانای ئەوە نییە قورئان حوکمی موباح کردنی لە قۆناغە سەرەتاییەکانیدا هێناوە و پاشان نەسخی کردۆتەوە و لە قۆناغی کۆتاییدا بە حەرامکردن ئاڵوگۆڕی پێکردووە، بەڵکو لە قۆناغی یەکەمدا ناشیرینی لە خودی ئارەقدا راگەیاندووە، هەر شتێکیش شەرع بە ناشیرینی بزانێت حەرامکراوە، بۆیە ناتوانرێت حوکم بەسەریدا بدرێت بەوەی موباحە، وەك لەم رۆشنکردنەوەدا:

لە قۆناغی یەکەمدا، خودا روو لە مرۆڤ دەکات لە هەموو شوێن و کاتێکدا و دەفەرموێت:﴿وَمِنْ ثَمَرَاتِ النَّخِيلِ وَالأَعْنَابِ تَتَّخِذُونَ مِنْهُ سَكَرًا وَرِزْقًا حَسَنًا﴾[1].

خوێنەری ورد لەم قۆناغەدا ئاماژەیەکی شاراوەی ئەقڵی زیرەك دەبینێت کە سەرخۆشکەرەکان بە هەموو جۆرەکانییەوە لە خودی خۆیاندا ناشیرینن، بنچینەی ئەم ناشیرینییە بریتییە لە زیانی ئەقڵی و تەندروستی و کۆمەڵایەتی و ئابووری بەرهەمهاتوو لە خواردنەوەیان، ئاشکرایە خولگەی چاك و خراپ(باش و ناشیرین)ی شتەکان بریتییە لە زیان و سوود، چونکە لە مەرامەکانی شەریعەتی ئیسلام بریتییە لە راکێشانی قازانج بۆ مرۆڤ و پاڵپێوەنانی زیان، وەك قورئان دەفەرموێت: ﴿وَمَا أَرْسَلْنَاكَ إِلاَّ رَحْمَةً لِلْعَالَمِينَ﴾، رەحمەت بریتییە لە بەرژەوەندی، ئەوەش بریتییە لە قازانجی راکێشراو و زیانی پاڵپێوەنراو، هەموو بەسوودێك بۆ خودی خۆی یان بۆ جگە لە خۆی بە ترازووی شەرع رێگەپێدراوە گەر لەسەر زیانی کەسانی تر نەبێت، هەموو زیانبەخشێك بۆ خودی خۆی و جگە لە خۆی بە پێوەری شەرع حەرامکراوە گەر سوودێکی لەسەر پەیدا نەبێت گرنگتر لە زیانەکەی[2]، قورئان لەم ئایەتەدا "رزقا حسنا"ی عەتف کردۆتەوە سەر "سکرا" ئەوەش ئاماژەیە بۆ ئەوەی "السکر" جیایە لە "رزقا حسنا" بۆیە ئەوە بریتییە لە "رزق قبیح" چونکە بەرەی سێیەم بوونی نییە، لەبەرئەوەی هەموو شتێك یان لە خودی خۆیدا رزقێکی چاك و پاکە یان بۆ جگە لە خۆی رزقێکی چاك و پاکە، یاخود لە خودی خۆیدا ناشیرین و ناباشە یان بۆ جگە

---

[1] سورة النحل/٦٧.

[2] ومعيار التمييز بين النافع والضار موضوعي وليس شخصياً وهو ميزان الشرع.

لـه خـۆی ناشـیرین و ناباشـه، ، یەکسـانە "حسـن و قـبح"ی ئـەقڵی وەك بۆچـوونی موعتەزیلە وەربگرین یاخود وەك رای ئەشعەرییەکان وەریبگرین، هەر شـتێك لـەڕووی شەرعەوە باش و پەسەند بێت لەڕووی ئەقڵەوە باش و پەسەندە، نەك بە پێچـەوانەی هەمووەکییـەوە، هـەر شـتێکیش لـەڕووی شـەرعەوە قـەبیح بێـت لـە ڕووی ئەقڵـەوە قەبیحە نەك بە پێچەوانەی هەمووەکییەوە، چونکە شەریعەتی ئیسلام حوکمێکی تێدا نییە بەرهەڵستی بکات لەگەڵ ئەقڵی تەندروست و زانست و فیترەت، گەر شێوەی ئەو حوکمە ببینینەوە ئەوە لە شەریعەتی ئیسلام نییە و خزێنراوەتە ناو شەریعەتەوە.

بینا لەسەر ئەمە لەم ئایەتەدا دوور و نزیـك شـتێك نابینرێتـەوە بەڵگـەبێت لەسـەر ئەوەی قورئان دانی بە موباحبوونی خواردنەوەی مادە سەرخۆشکەرەکاندا نابێـت تـا لـە قۆناغـەکانی دواتـردا ئایـاتی حەرامکـەر بێـت و راشـکاوانە نەسـخی حـوکمی موباحبوونی قۆناغی یەکەم بکاتەوە.

لە قۆناغی دووەمدا– قورئان شێوازی گوتارەکەی لە حەرامکردنی سەرخۆشـکەردا گۆڕی، شانی لەسـەر ڕووبەڕووبوونەوەیـەکی تـر دادا. و سـەرنجی ئـەقڵی تەندروسـتی راکێشا بۆ بەراورد کردن لە نێوان سـوود و زیانـدا و هەڵسـەنگاندن لـە نێـوان قـازانج و زەرەردا کە مـرۆڤ لـە خواردنـەوەی ئارەقـەوە بەدەسـتی دەهێنێـت، خـودا–سبحانه وتعالى– دەفەرموێت: ﴿يَسْأَلُونَكَ عَنِ الْخَمْرِ وَالْمَيْسِرِ قُلْ فِيهِمَا إِثْمٌ كَبِيرٌ وَمَنَافِعُ لِلنَّاسِ وَإِثْمُهُمَا أَكْبَرُ مِن نَّفْعِهِمَا﴾[1]، مەبەست بە "إثـم" لـەم ئایەتـەدا بریتییـە لـە زەرەر بە بەڵگەی بەرانبەربوونی لەگەڵ "النفع–قازانج"، ئەم ئایەتەش دیسان ئامـاژە ناکات بە موباحبوونی ئارەق، چۆن قورئان دان بـە شـتێکدا دەنێـت زەرەرەکـەی لـە قازانجەکەی زۆرترە؟.

تەنها ئاماژە بە حـەرامبوونی مـادە سەرخۆشـکەرەکان ناکـات، بـەڵکو راشـکاوانە ئامـاژە دەکـات بـە حـەرامبوونی هـەر شـتێك زیـانی لـە سـوودی زۆرتـر بێـت وەك

[1] سورة البقرة/٢١٩.

جگەرەکێشان، چونکە خودا بە ڕۆشنکردنەوەی حوکمەکە وەڵامی پرسیارەکەی نەدایەوە، بەڵکو هۆی دەق لەسەرهاتووی حوکمەکەی وەڵام دایەوە تاکو هەموو ئەو شتانە بگرێتەوە زەرەریان لە قازانجیان گەورەترە.*

بینا لەسەر ئەمە بۆمان ڕۆشن دەبێتەوە موباحبوون لەم ئایەتەدا نابینرێتەوە تا بانگەشەکەرانی نەسخ پێیان وابێت بە ئایەتەکانی قۆناغەکانی دواتر سڕابێتەوە.

سوودەکانی مادە سەرخۆشکەرەکان یان مادییە کە لە پشتی دروست کردن و فرۆشتنیەوە قازانج بەدەست دەهێنرێت، یان مەعنەوییە کە بریتییە لە چێژوەرگرتن و ئارەقخۆرەکە هەستی پێ دەکات کاتێك ئەقڵی سووك دەکات و تەنها بیر لە خۆی دەکاتەوە، ئەوەش ماوەیەکی کاتی کەمە و کۆتایی پێ دێت وەك ئەوەی نەبووبێت، گەر ئەم سوودە مادیانە بەراورد بکرێت بە زیانە ئەقڵی و تەندروستی و کۆمەڵایەتی و ئابوورییەکان ئەوا ڕۆشن دەبێتەوە زیانی مادە سەرخۆشکەرەکان بە هەموو جۆرەکانییەوە زۆرترە لە سوود و قازانجەکەی.

لە قۆناغی سێیەمدا: خاوەن شەرع کاتی بەرتەسك کردۆتەوە لەسەر ئەوانەی مادە سەرخۆشکەرەکان دەخۆنەوە تاکو خۆی ئامادە بکات بۆ دەستکێشانەوەی کۆتایی، وەك چۆن پزیشك ئامۆژگاری نەخۆشی جگەرەکێش دەکات واز لە جگەرەکێشان بهێنێت، گەر نەخۆشەکە وتی ناتوانم ئەوا ئامۆژگاری دەکات بە کەمکردنەوەی، ئەمە مانای ئەوە نییە پزیشکەکە دان بە تەندروستی و دروستی جگەرەکێشاندا دەنێت، بەڵکو دەیەوێت لەسەر دوورکەوتنەوە و وازهێنان لە جگەرە ڕایبهێنێت، بۆیە خودا- سبحانە وتعالی- دەفەرموێت: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لاَ تَقْرَبُوا الصَّلاَةَ وَأَنْتُمْ سُكَارَى حَتَّى تَعْلَمُوا مَا تَقُولُونَ﴾[1]، ئەم ئایەتە لە نزیك و دوور ئاماژە ناکات بە دروستیی مادە سەرخۆشکەرەکان لە دەرەوەی کاتەکانی نوێژەوە نە لە پێش نوێژەکان و نە لە

---

[1] سورة النساء/٤٣.

دوای نوێژەکان[1].

قۆناغی چوارەم و کۆتایی: بریتییە لە لوتکەی پلەبەپلە و جێگیربوونی تەواوی حوکمەکە و ملکەچبوونی کۆتایی بۆی و داواکردن لە هەموو موسڵمانان بۆ جێبەجێ کردنی نەهییەکە بەبێ هیچ جۆرە سەرپێچییەك، ئەم قۆناغە ئەوەیە قورئان لەسەری دەفەرموێت: ﴿يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِنَّمَا الْخَمْرُ وَالْمَيْسِرُ وَالأَنصَابُ وَالأَزْلاَمُ رِجْسٌ مِنْ عَمَلِ الشَّيْطَانِ فَاجْتَنِبُوهُ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ، إِنَّمَا يُرِيدُ الشَّيْطَانُ أَنْ يُوقِعَ بَيْنَكُمْ الْعَدَاوَةَ وَالْبَغْضَاءَ فِي الْخَمْرِ وَالْمَيْسِرِ وَيَصُدَّكُمْ عَنْ ذِكْرِ اللَّهِ وَعَنْ الصَّلاَةِ فَهَلْ أَنْتُمْ مُنتَهُونَ﴾[2].

ئەم ئایەتە راشکاوانە جەخت لە حەرامبوونی ئامێزگرانە دەکاتەوە لە قۆناغەکانی پێشوودا و بە نەسخکەری هیچ قۆناغێك دانانرێت، چونکە نەسخ بۆ حوکمێکە پێچەوانەی حوکمی نەسخکەرەکە بێت، لەبەرئەوەی نەسخ بۆ هەڵگرتنی دژیەکی هاتووە لە نێوان نەسخکەر و نەسخکراودا.

بانگەشەی نەسخ لەسەر تێنەگەیشتن لەو ئایەتە ئاماژەبۆکراوانە بیناکراوە، چەندە تێگەیشتن لە حەقیقەت گرانە و چەندە وتنی نەسخ کارێکی ئاسانە وەك چاولێکەری بۆ کەسانی تر بەبێ بەکارهێنانی ئەقڵی تەندروست و پەیبردن بە پلە و پایەی قورئان[3].

---

[1] هەندێك بە هەڵەداچوون لەوانە(مصطفى زيد، النسخ في القرآن الكريم ص٨٣٧) کە دەڵێت: ئەم ئایەتە بە تێگەیشتن لێی ئاماژە دەکات بۆ حەڵاڵی خواردنەوەی ئارەق جگە لە کاتی نزیکبوونەوەی نوێژ.

[2] المائدة/٩٠-٩١.

[3] بۆ درێژەپێدانی زیاتر تەماشای "موانع المسؤولية الجنائية للمؤلف ص" بکە.

-ئایەتی(٢١٩): ﴿وَيَسْأَلُونَكَ مَاذَا يُنفِقُونَ قُلْ الْعَفْوَ﴾[١].

هەندێك پێیان وایە ئەم ئایەتە وەك چۆن بەشی یەكەمی:﴿يَسْأَلُونَكَ عَنْ الْخَمْرِ وَالْمَيْسِرِ قُلْ فِيهِمَا إِثْمٌ كَبِيرٌ وَمَنَافِعُ لِلنَّاسِ وَإِثْمُهُمَا أَكْبَرُ مِنْ نَفْعِهِمَا﴾ نەسخكراوەتەوە بە دوو ئایەتی(٩٠-٩١) لە سورەتی "المائدە"، بەشی دووەمی ئاماژەبۆكراوی بە ئایەتی زەكات نەسخكراوەتەوە، دەفەرموێت: ﴿خُذْ مِنْ أَمْوَالِهِمْ صَدَقَةً تُطَهِّرُهُمْ وَتُزَكِّيهِمْ بِهَا﴾[٢] ئەمەش شتێكی نامۆیە و وێناناكرێت مەگەر لە عاشقانی نەسخەوە، "ابن حزم الأندلسي" دەڵێت: (("العفو" واتە زیادە لە ماڵ و سامان، ئایەتەكە نەسخكراوەتەوە و نەسخكەرەوەكەشی بریتییە لە ﴿خُذْ مِنْ أَمْوَالِهِمْ صَدَقَةً.. الآية﴾)) "النحاس"یش دەڵێت[٣] لەسەر ئەم ئایەتە سێ بۆچوون هەیە، هەندێ لە زانایان دەڵێن بە زەكاتی فەرزكراو نەسخكراوەتەوە، هەیانە دەڵێت بریتییە لە زەكات، هەشیانە دەڵێت شتێكە فەرمانی پێكراوە جگە لە زەكات))

"ابن سلامة"[٤] دەڵێت: (("العفو" بریتییە لە زیادە لە ماڵ و سامان ئەوەش خودا لەسەری فەرزكردبوون پێش زەكات، گەر كەسێك ماڵ و سامانێكی هەبووایە هەزار درهەم یان بەهای هەزار درهەمی لێ هەڵدەگرت و ئەویتری دەبەخشی، هەندێكی تر دەڵێن: گەر ئەهلی چاندنی زەوی و ئاوەدانكردنەوەی زەوی بوونایە فەرمانی پێدەكردن ئەوەی خۆراكی ساڵێكیانە جیای بكەنەوە و ئەویتری ببەخشن، گەر لەو كەسانە بوایە بە شەكەتكردنی جەستەی خۆی خۆراكی ئەو رۆژەی پەیدا دەكرد بەشی ئەو رۆژەی هەڵدەگرت و ئەوەی مابوویەوە دەیبەخشی، ئەمەش لەسەر شانیان گران بوو تا خودا ئایەتی زەكاتی فەرزكراوی دابەزاند))

---

[١] سورة البقرة/٢١٩ تتمة الآية (٢١٩) كە سەرەتاكەی پەیوەستە بە حوكمی ئارەقخواردنەوەوە.

[٢] سورة التوبة/١٠٣.

[٣] الناسخ والمنسوخ في القرآن الكريم ص ٥٣.

[٤] الناسخ والمنسوخ ص ٩١- ٩٢.

"ابن الجوزي" بەرپەرچی ئەم قسەیە و قسە باسکراوەکانی تریش دەداتەوە لە کتێبەکەیدا[1]، پاشان لە کۆتایی قسەکانیدا دەڵێت: ((گەر بڵێین ئەم خەرجکردنە نافیلەیە یان بریتییە لە زەکات ئەوا ئایەتەکە موحکەمە، گەر بڵێین خەرجکردنێکە پێش هاتنی زەکات فەرزکرابوو ئەوا بە ئایەتی زەکات نەسخکراوەتەوە، بەڵگەی بەهێزتر ئەوەیە خەرجکردنێك بێت لە پەسەندکراوەکان(مندوبات)))

بەرانبەر ئەم بۆچوونانە ئەوەی "الطبري"–رەحمەتی خوای لێ بێت– دەیلێت دەگوێزمەوە: ئەهلی زانست لەسەر ئەم ئایەتە جیاوازیان لە نێواندایە ئایا ئایەتەکە نەسخکراوەتەوە یان حوکمەکەی لەسەر بەندەکان جێگیرە، هەندێکیان دەڵێن نەسخکراوەتەوە و نەسخکەرەوەکەشی بریتییە لە زەکاتی فەرزکراو وەك "السدي" دەڵێت.

هەندێکی تر دەڵێن حوکمەکەی جێگیرە و نەسخنەکراوەتەوە، دروست لەمەدا ئەوەیە "ابن عباس" دەیلێت لەسەر ئەوەی "ابن عطیة" ریوایەتی کردووە دەربارەی﴿قُلِ الْعَفْوَ﴾ پێویستکردنی فەرزێك نییە لە خوداوە وەك مافێك لەماڵەکەیدا، بەڵکو ئاگادارکردنەوەیە لەوەوە لەمەڕ ئەو شتانەی پێی رازییە لە خەرجکردن و ئەو شتانەی تووڕەی دەکات، وەك وەڵامێك بۆ ئەوانەی لە پێغەمبەریان پرسی دەربارەی ئەو شتانەی رازیبوونی خودای لەسەرە، ئەوەش ئەدەبێکە لە خوداوە بۆ هەموو دروستکراوەکانی لەسەر ئەوەی ئەدەبی داداون لە صەدەقەکردنی فەرزنەکراوی حوکم جێگیری نەسخنەکەر بۆ حوکمێکی پێچەوانەی پێش خۆی، هەر بەو جۆرە نەسخنەکراو بە حوکمێك لەدوای ئەو رووبدابێت، بۆیە دروست نییە هیچ کەسێکی خاوەن وەرع و ئایین لە صەدەقەکردنەکەیدا (بەخشین و پێدان و خەڵات) سنووربەزێنی ئەو سنوورە بکات پێغەمبەر(ﷺ) ئەدەبی داداون بە فەرموودەی: ((گەر لەلای یەکێك لە ئێوە زیادە هەبوو با بە خۆی دەست پێبکات پاشان

[1] الناسخ والمنسوخ ص ٨٣– ٨٤.

خانەوادەی(هاوسەرەکەی) پاشان بە کوڕەکەی[1] (منداڵەکانی) پاشان لەو زیادەدا ڕێگەی خۆی پێبگرێتە بەر کە خودا پێی ڕازییە و خۆشیدەوێت، ئەوەش وەستانە لە نێوان دەستبڵاوی و دەستنوقاویدا کە خودا لە کتێبەکەیدا باسی کردووە[2]))

بەوانەی بانگەشەی نەسخبوونەوەی دەکەن دەوترێت: چ بەڵگە و ئاماژەیەك لەسەر نەسخبوونەوەی هەیە، لە کاتێکدا هەمووان کۆدەنگیان هەیە لەسەر ئەوەی بۆ کەسێك هەیە لە ماڵەکەی صەدەقە بکات و ببەخشێت و وەسێت بە سێیەکی ماڵەکەی بکات بە مەرجێ لە سێیەکی ماڵەکەی زیاتر نەبێت، ئیتر چ شتێك ئاماژە دەکات بەوەی نەسخکراوەتەوە؟

گەر پێیان وابێت مەبەست بە نەسخبوونەوە دەرکردنی زیادە ماڵی ناپێویست بێت لەڕووی فەرزەوە بە فەرزبوونی زەکات لە ماڵ و دارایی ئەوا دەوترێت: چ بەڵگەیەك هەیە دەرکردنی ماڵی زیادە فەرزبوو بێت و فەرزی زەکان سڕیبێتییەوە؟ لێرەدا قسەکەی "الطبري" کۆتایی پێهات، بەم گواستنەوە وردە قووڵە و بەوەی پێشتر باسم کرد دەربارەی نەسخی ئایەتی سێیەمی سورەتی "البقرة"﴿وَمِمَّا رَزَقْنَاهُمْ يُنْفِقُونَ﴾ دەوەستم.

بەڵام ئەم خاڵانە دەخەمە سەر ئەوەی باسمان کرد:

١.وەك چۆن جێگیربوونی هەر ئایەتێك لە ئایەتەکانی قورئان بە تەواتورە هەر بەو جۆرە پێویستە نەسخی هەر ئایەتێك لێی بە تەواتور بێت، ئیتر چۆن سڕانەوە بە هەواڵی ئاحاد دەبێت؟

٢.دژیەکی لە کوێدایە لە نێوان صەدەقەی نافیلە و زەکاتدا، بۆچی بۆ نوێژ نەوافیل هەیە و بۆ ڕۆژوو نەوافل هەیە و بۆ حەج نەوافیل هەیە، بەڵام بۆ زەکات نابێت نەوافیل

---

[1] الحديث روي بالفاظ مقاربة لهذا اللفظ والمعنى. ينظر:- صحيح مسلم: ١٤٥٢/٣، ومسند أحمد:٣٠٥/٣، وصحيح ابن خزيمة: ١٠٠/٤.

[2] ئامارژە دەکرێت بە نموونەی ئایەتی: (والذين اذا انفقوا لم يسرفوا ولم يقتروا وكان بين ذلك قواما) سورة الفرقان/٦٧.

بوونی هەبێت، لە کاتێکدا گرنگترە لە زۆربەیان و سوود و قازانجەکەی تێدەپەڕێتە سەر دەرەوەی خۆی؟

٣-ئەو قسەیەی کە خەرجکردن(الإنفاق)ی هاتوو لە قورئاندا بە ئایەتی زەکات نەسخکراوەتەوە تیشکی سەوزی بۆ دوژمنانی ئیسلام هەڵکردووە بڵێن ئایەتی زەکات بۆ دەستەبەرکردنی بەرژەوەندییەکانی دەوڵەمەندان و دروستکردنی سیستمی چینایەتی لە کۆمەڵگەدا هاتووە، چونکە کاتێك دەوڵەمەند زەکاتی دا ئەوا بۆی هەیە چەندی بوێت لە ماڵ و سامان-بێ کۆت و بەند-[1] کۆی بکاتەوە ئەمەش درۆ و بوختانە، چونکە گەر کۆتوبەندەکانی مولکداری رەچاوبکرێن سیستمی چینایەتی سەرهەڵنادات.

٤.چۆن نەسخی قورئانێکی جێگیری نەمر بە تەواتور بە ئیجتیهادی موجتەهیدەکان نەسخ دەکرێتەوە بەبێ ئەوەی شان لەسەر بەڵگەیەکی یەکلاکەرەوەی گومانبڕ دابدەن تاکو هەموو دەرگایەك لە دەرگاکانی جیاوازی دەبخات؟

٥.بۆچوونی نەسخی چەندین ئایەتی بەدوای یەکتردا هاتوو هەڵەیەکی گەورەیە و خودا لەو کارە پاك و بێگەردە، چۆن دەبێت شتێك بدرێتە پاڵ خودا راست و دروست نییە؟

-ئایەتی(٢٢١):﴿وَلاَ تَنكِحُوا الْمُشْرِكَاتِ حَتَّى يُؤْمِنَّ﴾[2]

هەندێ پێیان وایە ئەم ئایەتە نەسخکراوەتەوە بە ئایەتی: ﴿الْيَوْمَ أُحِلَّ لَكُمْ الطَّيِّبَاتُ وَطَعَامُ الَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ[1] حِلٌّ لَكُمْ وَطَعَامُكُمْ حِلٌّ لَهُمْ وَالْمُحْصَنَاتُ[2] مِنْ

---

[1] ينظر هادي علوي من قاموس التراث ص ٨٢ / تیایدا هاتووە: نەسخی حەرامکردنی گەنجینەکردن لە ئایەتی:(وَالَّذِينَ يَكْنِزُونَ الذَّهَبَ وَالْفِضَّةَ الآية) بە ئایەتی زەکات بوو وەك دابەزینێك بۆ دەوڵەمەندان لە هاوەلان.

[2] سورة البقرة/٢٢١.

الْمُؤْمِنَاتِ وَالْمُحْصَنَاتُ مِنْ الَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ مِنْ قَبْلِكُمْ إِذَا آتَيْتُمُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ[٣] مُحْصِنِينَ غَيْرَ مُسَافِحِينَ[٤] وَلاَ مُتَّخِذِي أَخْدَانٍ[٥]...الآية﴾[٦].

ئەمەش بۆچوونێکی پووچ و بێبنەمایە، بەم بەلگانە:

١.نەبوونی هیچ جۆرە بەرهەڵستی و دژیەکییەك لە نێوان حەرامکردنی هاوسەرگیری لەگەڵ هاوەڵدانەران و حەلاڵکردنی هاوسەرگیری لە ئەهلی کیتاب، چونکە قورئان لە گوفتاری بەرانبەر ئەهلی کیتاب بە هاوەڵدانەری دانەناون، قورئان لە دەیان ئایەتدا جیاکاری کردووە لە نێوان هاوەڵدانەر و ئەهلی کیتابدا، بۆیە بابەتی دوو ئایەتەکە لەیەکتر جیاوازن، لە مەرجەکانی بەرهەڵستکاری و دژیەکی ئەوەیە یەکێتی بابەت بوونی هەبێت.

٢.گەر تەنها بۆ گفتوگۆ رای ئەوانەی پێیان وایە ئەهلی کیتاب لە هاوەڵدانەرانن وەربگرین، ئەوا وتنی نەسخ تێکەڵییەکە لە نێوان تایبەتکردن و نەسخدا، چونکە وشەی "المشركات" "جمع مؤنث سالم"ە و "أل-الإستغراق"ی چووەتە سەر کە مانای گشت دەگەیەنێت و ئەهلی کیتاب و جگە لە ئەهلی کیتاب دەگرێتەوە، قورئان ئەم گشتتاندنەی بە ئایەتی پێنجی سورەتی "المائدة" تایبەتکردووە و ئەهلی کیتابی لە گشتاندنی ئایەتی: ﴿وَلاَ تَنكِحُوا الْمُشْرِكَاتِ﴾ دەرکردووە.

٣.دروست نییە بەلگە بە قسەی "ابن عباس" بهێنرێتەوە بەوەی نەسخکراوەتەوە[١] چونکە "ابن عباس" مەبەستی بە نەسخ تایبەتکردن بووە، ئەو

---

[١] واتە گیانداری سەربڕاوی یەهود و نەصارا.

[٢] واتە پاکداوێنەکان.

[٣] مارەبییەکانیان.

[٤] واتە زینایان لێ ئاشکرا نەبووبێت.

[٥] ئەوان زیناکردن لەگەڵیان دەشارنەوە، "الاخدان" کۆی "خدن" ئەو دۆست و هاوەڵەی کە بەنهێنی زینا لەگەڵ ئافرەت دەکات.

[٦] سورة المائدة/٥.

پێیوابووه ئایەتی پێنجی سورەتی "المائدة" هەڵواردنە لە گشتاندنی ئایـەتی(٢٢١)ی سورەتی "البقرة"، هەڵواردن لە گشت بریتییە لە تایبەت کردن، هەر بەو جۆرە "ابـن حزم" گوزارەی هەڵواردن(الإستثناء) بەکاریهێناوە[2] و دەڵێت:((وشەی "المشرکات" ئافرەتی ئەهلی کیتاب و ئافرەتی بتپەرست دەگرێتەوە، پاشان لە هەموو "مشرکات" تـەنها ئـافرەتی ئـەهلی کیتـابی هـەڵواردە کـرد و بـەم ئایەتـە نەسـخی کردەوە:﴿وَالْمُحْصَنَاتُ مِنْ الَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ مِنْ قَبْلِكُمْ﴾ هـەر بـەو جـۆرە "ابـن سلامة" مەبەستی بە نەسخ تایبەتکردن بووە و دەڵێت:((هەندێ لە حوکمەکانی نەسخکردەوە لە ئافرەتانی یەهودی و ئافرەتانی نەصرانی بەو ئایەتـەی لـە سـورەتی "المائدة"دایە، چونکە پێشینی چاکان هەموو تایبەتکردنێکیان بە نەسخ داناوە، وەك چەندین جار باسمان کردووە[3].

-ئایەتی(٢٢٨):﴿وَالْمُطَلَّقَاتُ يَتَرَبَّصْنَ بِأَنفُسِهِنَّ ثَلاَثَةَ قُرُوءٍ﴾[4].

پێیان وایە ئـەو ئایەتانـەی تایبەتکـەری گشـتاندنی ئـەم ئایەتـەن هـەر هـەموویان نەسخکەرەوەن بۆی، ئەم بۆچوونە دروستە گەر مەبەستیان بـە نەسـخ مانـا گشـتییە گشتگیرەکەی بێت بۆ تایبەتکردن، قسەیەکی بێبنەمایە گـەر مەبەسـتیان بـە نەسـخ

---

[1] "النحـاس" ص/٥٦ دەڵێـت:(لەسـەر ئایـەتی "ولا تنکحـوا المشـرکات حتـی یـؤمن" زانایـان سـێ قسـەیان هەیـە، هەیانـە دەڵێـت نەسـخکراوەتەوە، هەیانـە دەڵێـت نەسخکەرە، هەشیانە دەڵێ موحکەمـە، لـە "ابـن عبـاس"ەوە ئایـەتی: "ولا تنکحـوا المشرکات حتی یؤمن" ئافرەتانی ئەهلی کیتابی لێ هەڵواردە کراوە). ئەوەی ڕۆشنە ئەوەی هەڵواردن یان بـە قسـە یـان بـە "إلا" یـان بـە یـەکێك لـە خوشـکەکانی "إلا" تایبەتکردنە.

[2] الناسخ والمنسوخ في القرآن الکریم ص ٢٩.

[3] لە سەرخەرانی نەسخ نەبوونەوەی ئایەتەکە "الطبري ٢٢٢/٢، الالوسـي ١١٨/٢، ابـن العربـي ١٥٦/١، القـرطبي ٦٧/٣، الـرازي ٦٣/٦، الکیاالهرسـي ١٢٩/١، الطبرسـي ٣١٨/١".

[4] سورة البقرة/٢٢٨.

مانا تایبەتەکەی بێت کە بریتییە لە سڕینەوە، بەکارهێنانی نەسخ وەك تایبەتکردن ڕۆشنە لە قسەکەی "ابن عباس"ەوە کاتێك وشەی "الإستثناء" لە جێگەی وشەی "النسخ" بەکاردەهێنێت، "النحاس" دەڵێت[1]: ((خودا-عز وجل- دەفەرموێت: ﴿وَالْمُطَلَّقَاتُ يَتَرَبَّصْنَ بِأَنفُسِهِنَّ ثَلاَثَةَ قُرُوءٍ﴾ لەوانەی لە "الناسخ والمنسوخ" دایدەنێن "الضحاك" لە "ابن عباس"ەوە، هەروەها "القتادة"، گوزارەکەی "ابن عباس" وتویەتی "استثنى"، بەڵام گوزارەکەی "القتادة" دەڵێت "النسخ" واتە تەڵاقدراو بەر لە چوونە لا و ئافرەتی سکپڕ و ئەوانەی لە حەیز چوونەتەوە و ئەوانەی نەچوونەتە ناو حەیزەوە لە سێ "قروء" هەڵوارده کراون[2].

هەندێ پێیان وایە[3] نەسخکراو لەم ئایەتەدا بریتییە لە: ﴿وَبُعُولَتُهُنَّ أَحَقُّ بِرَدِّهِنَّ فِي ذَلِكَ إِنْ أَرَادُوا إِصْلاَحًا﴾ هەروەها دەڵێت نەسخکەرەوەی ئەم بەشەی ئایەتەکە بریتییە لە: ﴿الطَّلاَقُ مَرَّتَانِ فَإِمْسَاكٌ بِمَعْرُوفٍ أَوْ تَسْرِيحٌ بِإِحْسَانٍ﴾[4].

هەردوو بۆچوونەکە پووچ و بێبنەمان گەر مەبەستیان بە نەسخ مانا تایبەتەکەی بێت لەلای پاشین ئەوەش بریتییە لە سڕینەوەی وەحییەکی پێشوو بە وەحییەك کە بەدوایدا دێت، ئەمەش لەبەر ئەوەی:

تێکەڵییە لە نێوان نەسخ و تایبەتکردندا، ڕۆشنکردنەوەی ئەمە:

وشەی "المطلقات" لەم بەشەی ئایەتەکە: (وَالْمُطَلَّقَاتُ يَتَرَبَّصْنَ) "جمع مؤنث سالم"ە و "أل-الإستغراق"ی چووەتە سەر و مانای گشت دەبەخشێت، بەڵام گشتاندنەکە بە مەبەست نەگیراوە، بۆیە بە چەند ئایەتێکی تر تایبەتکراوە و چوار باری تەڵاقدراوی لێ دەرکراوە کە ئەمانەن:

---

[1] الناسخ والمنسوخ.

[2] ابن الجوزي ص ٨٦.

[3] وهو ما ذهب اليه ابن حزم الاندلسي ص ٢٩.

[4] سورة البقرة/٢٢٩ هەندێکیش پێیانوایە نەسخکەرەوەکەی بریتییە لە ئایەتی: (فان طلقها فلا تحل له من بعد حتى تنكح زوجا غيره) ينظر الناسخ والمنسوخ لابن سلامة ص ٩٤.

١.باری تەڵاقدراو سکپڕ بێت، عیدەکەی بە دانانی سکەکەی تەواو دەبێت، قورئان دەفەرموێت:﴿وَأُوْلَاتُ الأَحْمَالِ أَجَلُهُنَّ أَنْ يَضَعْنَ حَمْلَهُنَّ﴾[1].

٢.باری تەڵاقدراو پێش چوونە لا بێت، لەو بارەدا عیدەی لەسەر نییە، دەفەرموێت: ﴿يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا نَكَحْتُمْ الْمُؤْمِنَاتِ ثُمَّ طَلَّقْتُمُوهُنَّ مِنْ قَبْلِ أَنْ تَمَسُّوهُنَّ فَمَا لَكُمْ عَلَيْهِنَّ مِنْ عِدَّةٍ تَعْتَدُّونَهَا﴾[2].

٣.تەڵاقدراوێت لە حەیز وەستابێتەوە و لە ریزی ئافرەتی حەیزداردا نەمابێت، ئەوا عیدەکەی بە سێ مانگ تەواو دەبێت لە بەرواری تەڵاقدانییەوە.

٤.ئەو تەڵاقدراوەی نەچووەتە ناو تەمەنی حەیزەوە بەهۆی بچووکی تەمەنییەوە، ئەمیش عیدەکەی سێ مانگە، هەر بەو جۆرەی ئەو ئافرەتانەی کە لە بنەڕەتدا حەیز ناشۆرن بەهۆی نەخۆشییەکەوە یان سروشتی دروستبوونیان بەو شێوەیە، خودا– سبحانە وتعالی– لە حوکمی هەردوو حاڵەتەکەدا دەفەرموێت:﴿وَاللاَّئِي يَئِسْنَ مِنْ الْمَحِيضِ مِنْ نِسَائِكُمْ إِنْ ارْتَبْتُمْ[3] فَعِدَّتُهُنَّ ثَلاَثَةُ أَشْهُرٍ وَاللاَّئِي لَمْ يَحِضْنَ﴾[4].

هەر بەو جۆرە ئەو کەسەی پێیوایە ئایەتی: ﴿وَبُعُولَتُهُنَّ أَحَقُّ بِرَدِّهِنَّ فِي ذَلِكَ إِنْ أَرَادُوا إِصْلاَحًا﴾ نەسخکراوەتەوە بە ئایەتی ﴿الطَّلاَقُ مَرَّتَانِ﴾ تێکەڵی لا دروستبووە لە نێوان نەسخ و تایبەتکردندا، چونکە نەسخکراوی بانگەشەبۆکراو گشتییە و هەردوو باری تەڵاقی رجعی و تەڵاقی بائین دەگرێتەوە، بە هەمان شێوە تەڵاقدراو بۆ تەنها یەك جار و دوو جار و سێ جار دەگرێتەوە.

ئەوەی رۆشنە کۆدەنگی لە نێوان فەقیهاندا لەسەر ئەوەیە تەڵاقدراو بە "تەڵاقی رجعی" بۆ مێردەکەی هەیە بەبێ گرێبەستی نوێ بیگێڕێتەوە بەر لە کۆتاهاتنی

---

[1] سورة الطلاق/٤.

[2] سورة الاحزاب/٤٩.

[3] واتە شك و گومانتان بۆ دروست بوو و بڕی عیدەکەتان نەزانی، کۆتوبەندەکە تێگەیشتنی پێچەوانەی بۆ نییە.

[4] سورة الطلاق/٤.

ماوەی عیدەکەی، چونکە دوای کۆتاهاتنی عیدەکەی دەبێت بە تەڵاقی بائین، تەڵاقدراو بۆ جاری یەکەم و دووەم تەڵاقی بائینە و مێردەکە مافی ئەوەی هەیە بە گرێبەستێکی نوێ بیگێڕێتەوە، بەڵام تەڵاقدراو بۆ جاری سێیەم بۆی حەڵاڵ نییە تا شوو بە مێردێکی تر نەکاتەوە بە هاوسەرگیرییەکی ئاسایی و بچێتە لای پاشان گەر ئەو پیاوە مرد یان تەڵاقیدا ئەوا بۆ مێردی یەکەم حەڵاڵە پەیوەندی هاوسەرگیری بە گرێبەستێکی نوێ لەگەڵی گرێبداتەوە، ئەمەش بەپێی ئایەتی: (فَإِن طَلَّقَهَا) واتە بۆ جاری سێیەم بۆی حەڵاڵ نابێت تا مێردێکی تر نەکات ﴿فَلاَ تَحِلُّ لَهُ مِن بَعْدُ حَتَّى تَنكِحَ زَوْجاً غَيْرَهُ﴾ بینا لەسەر ئەمە ئایەتی: ﴿الطَّلاَقُ مَرَّتَانِ...﴾ تایبەتکەری ئەم ئایەتەیە: ﴿وَبُعُولَتُهُنَّ أَحَقُّ بِرَدِّهِنَّ﴾[1]

-ئایەتی(٢٢٩): ﴿وَلاَ يَحِلُّ لَكُمْ أَنْ تَأْخُذُوا مِمَّا آتَيْتُمُوهُنَّ شَيْئًا إِلاَ أَنْ يَخَافَا أَلاَ يُقِيمَا حُدُودَ اللَّهِ فَإِنْ خِفْتُمْ أَلاَ يُقِيمَا حُدُودَ اللَّهِ فَلاَ جُنَاحَ عَلَيْهِمَا فِيمَا افْتَدَتْ بِهِ﴾.

ابن حزم الاندلسی[2] پێیوایە ئەم ئایەتە: ﴿وَلاَ يَحِلُّ لَكُمْ أَنْ تَأْخُذُوا مِمَّا آتَيْتُمُوهُنَّ شَيْئًا﴾ نەسخکراوەتەوە بە "الإستثناء" لە هەمان ئایەتدا کە ئەم بەشەی ئایەتەکەیە: ﴿ إِلاَ أَنْ يَخَافَا أَلاَ يُقِيمَا حُدُودَ اللَّهِ﴾ ابن سلامە[3] لەگەڵ ئەم ئاراستەیەدا هاوڕایە کاتێك دەڵێت: ئەم بەشەی ئایەتەکە ﴿وَلاَ يَحِلُّ لَكُمْ أَنْ تَأْخُذُوا مِمَّا آتَيْتُمُوهُنَّ شَيْئًا[4]﴾ پاشان "إستثناء" کراوە بەم بەشەی ئایەتەکە: (إِلاَ أَنْ يَخَافَا أَلاَ يُقِيمَا حُدُودَ اللَّهِ){یخافا واتە یعلما} -دەزانن ناتوانن حدودی خودا

---

[1] لە سەرچاوەکانی نەسخ نەبوونەوەی: ٢/١٣٠، ابن العربي١/١٨٥، القرطبي٣/١١٣، الرازي٦/٨٥، الكيا الهراسي ١/١٥٢

[2] الناسخ والمنسوخ في القرآن الكريم ص ٢٩.

[3] الناسخ والمنسوخ ص ٩٤.

[4] واتە لەو مارەییەی ژنەکە شایستەیەتی بە هاوسەرگیرییەکە.

رابگرن" ئەوا بەم هەڵواردنە( الإستثناء) فیدیەی بۆ حەڵاڵ بووە، دروست نییە بۆ پیاوەکە زیاتر لەوەی پێیداوە لە مارەیی لێی وەربگرێتەوە، بۆیە ئەم ئایەتە بوو بە نەسخکەر بۆ حوکمەکەی کە بریتییە لە نەگونجاویی وەرگرتنی شتێك لە مارەیی بە "إستثناء"ەکە.

لە کاتێکدا "ابن الجوزی"[1] دەڵێت: -دوای ئەوەی دڵنیا دەکاتەوە ئەم ئایەتە لای زانایان بەگشتی موحکەمە- هەر کەس بۆچوونی لەسەر نەسخی ئایەتەکەیە ئەوەی بە نەسخکەری ئایەتەکە دادەنرێت دیسان ئەویش بەم ئایەتە نەسخکراوەتەوە(واتە ئایەتە نەسخکەرەکەش نەسخکراوەتەوە): ﴿وَإِنْ أَرَدْتُمُ اسْتِبْدَالَ زَوْجٍ مَكَانَ زَوْجٍ وَآتَيْتُمْ إِحْدَاهُنَّ قِنطَارًا فَلاَ تَأْخُذُوا مِنْهُ شَيْئًا﴾، کاتێك دەڵێت: ئەم ئایەتە ڕۆشنکەرەوەی حوکمی "خلع"ە، تەنها دوای تێکچوونی بار جیابوونەوە لە نێوان ژن و پیاوەکەدا دروست دەبێت، بۆیە قورئان گونجاوی "خلع"ی بەستۆتەوە بە ترس لە وازهێنانی هەستان بە پارێزگاری سنوورەکانی خودا، ئەمەش فەرمانێکی جێگیرە و ئایەتەکە لای زانایان بەگشتی موحکەمە، پاشان بەردەوام دەبێت لە وتن لە "أبي الصهباء"ەوە دەڵێت: پرسیارم لە "بكر بن عبدالله" کرد دەربارەی پیاوێك ژنەکەی داوای "خلع"ی لێ دەکات، وتی: دروست نییە پیاوەکە هیچی لێ وەربگرێتەوە، پێم وت: خودا دەفەرموێت: ﴿فَلاَ جُنَاحَ عَلَيْهِمَا فِيمَا افْتَدَتْ بِهِ﴾ وتی: نەسخ کراوەتەوە، وتم ئەی خراوەتە کوێ؟ وتی: سورەتی "النساء"﴿وَإِنْ أَرَدْتُمُ اسْتِبْدَالَ زَوْجٍ مَكَانَ زَوْجٍ وَآتَيْتُمْ إِحْدَاهُنَّ قِنطَارًا فَلاَ تَأْخُذُوا مِنْهُ شَيْئًا﴾[2].

هەروەها بانگەشەکەی نەسخ پووچ و بێبنەمان بەم بەڵگانە:

١. "الإستثناء"ەکە بە نەسخکەر ناژمێررێت لە کەلامی خاوەن شەرعدا مەگەر مەبەستی بە نەسخ تایبەتکردن بێت، چونکە تایبەتکردن ڕۆشنکردنەوەیە و نەسخ

---

[1] نواسخ القرآن.

[2] سورة النساء/٢٠.

سڕانەوەیە، گەر لە دوای حوکمێکی گشتی "الإستثناء" بە "إلا" یان بە ئامرازێکی تر هات یان بە رستەیەکی کەلامی ئەوا بە تایبەتکردن دادەنرێت نەك بە نەسخ.

٢.بانگەشەی نەسخی فیدیەش لە "خلع"دا بە ئایەتی گۆڕینی هاوسەرێك(ژنێك) لە جێگەی هاوسەرێکی تر هیچ بەرهەڵستییەك لە نێوان دوو ئایەتەکەدا بوونی نییە تا بە نەسخ یەکێکیان ئەویتریان هەڵبگرێت.

النحاس[1] –دوای گواستنەوەی ئەوەی "ابن الصهباء" ریوایەتی کردووە– دەربارەی نەسخی﴿فَإِنْ خِفْتُمْ أَلاَّ يُقِيمَا حُدُودَ اللَّهِ فَلاَ جُنَاحَ عَلَيْهِمَا فِيمَا افْتَدَتْ بِهِ﴾ بە ئایەتی ﴿وَإِنْ أَرَدْتُمْ اسْتِبْدَالَ زَوْجٍ...الآيَة﴾ دەڵێت: ئەمە قسەیەکی ناڕاستە و لە ئیجماع دەرچووە و یەکێك لە دوو ئایەتەکە دژیەکی ئەوی تریان هەڵناگرێت هەتا نەسخ روویدات، ئایەتی: ﴿فَإِنْ خِفْتُمْ أَلاَّ يُقِيمَا حُدُودَ اللَّهِ﴾ لانەبراوە، گەر لەمە بترسن پیاوەکە ناچێتە ناو ﴿وَإِنْ أَرَدْتُمْ اسْتِبْدَالَ زَوْجٍ﴾ چونکە ئەمە تایبەتە بە پیاوان، لەو هەڵە گەورانەی لەمەدا گوازراوەتەوە ئەوەیە کە لە "سعید بن جبیر" و "محمد بن سیرین" و "الحسن"ەوە ریوایەتکراوە گوایە: خولع تەنها بە فەرمانی دەسەڵاتدار(السلگان) دروستە.

خولع:

رێکەوتنی ژن و مێردەکە یان ئەو کەسانەی نوێنەرایەتی ئەو دوانە دەکەن لەسەر کۆتاهێنان بە پەیوەندی ژن و مێردی، ئەم هەڵسوکەوتە رێکەوتنییە وەك چۆن پێی دەوترێت "خولع" پێشی دەوترێت فیدیە، و سوڵح و پاکئەستۆیی(موبارەئە)، هەندێ لە فەقیهان جیاکاریان کردووە لە نێوان ئەم زاراوانەدا، مالیکییەکان[2] و ئیبازییەکان[3] دەڵێن: بریتیدان لە خولعدا یەکسانە بەوەی لە ئەوەوە(مێردەکە) بە ئەو(ژنەکە) گەیشتووە، وەك تەڵاق لەسەر هەموو مارەییەکەی، لە سوڵحدا کەمتر لەوە، و لە

---

[1] الناسخ والمنسوخ في القرآن الكريم/٦٨.

[2] المدونة الكبرى ٥/٢٨ القرطبي ٣/١٤٥.

[3] شرح النيل ٢/٤٨٠.

فیدیەدا زۆرتر لەوە، لە پاکنەستۆیشدا(موبارەئە) بەریوونەوەی مافی ژنەکەیە لەسەر مێردەکەی، "الطوسي"[1] دەڵێت: لە خولعدا ئەوەی ژن و مێردەکە لەسەری ڕێکدەکەون کەم یان زۆر دروستە، بەڵام لە موبارەئەدا دەبێت بەدەلەکە کەمتر بێت لە مارەیی.

لە دیدی منەوە پەندوەرگرتن بە بەکارهێنانی شێوازی گوزارەکە نییە، بەڵکو گرنگ ڕازیبوونی تەواوە و ژنەکە ئەهلی بەخشین بێت، چونکە ئەوەی ژنەکە بە مێردەکەی دەدات بەرانبەر بە تەڵاقدانی بەرانبەرێکی ماڵی و دارایی بۆ نییە، بۆیە پابەندبوونی ژنەکە بە پێدانی وەك بەخشین وایە[2].

**سەرچاوەکانی ڕەوایەتی خولع:**

أ.قورئان دەفەرموێت:﴿وَلاَ يَحِلُّ لَكُمْ أَنْ تَأْخُذُوا مِمَّا آتَيْتُمُوهُنَّ شَيْئًا إِلاَّ أَنْ يَخَافَا أَلاَّ يُقِيمَا حُدُودَ اللَّهِ فَإِنْ خِفْتُمْ أَلاَّ يُقِيمَا حُدُودَ اللَّهِ فَلاَ جُنَاحَ عَلَيْهِمَا فِيمَا افْتَدَتْ بِهِ تِلْكَ حُدُودُ اللَّهِ فَلاَ تَعْتَدُوهَا وَمَنْ يَتَعَدَّ حُدُودَ اللَّهِ فَأُولَئِكَ هُمُ الظَّالِمُونَ﴾[3].

ب.سوننەتی پێغەمبەر(ﷺ): لە "ابن عباس"ەوە-خوایان لێی ڕازی بێت- ((ژنەکەی "ثابت بن قیس" وتی: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) هیچ نەنگییەکی لە ئەخلاق و لە دیندا تێدا نابینمەوە، بەڵام دوای چوونە ناو ئیسلام ڕقم لە کوفرە[4]، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ئایا باخەکەی بۆ دەگێڕییەوە[5]؟ فەرمووی: بەڵێ، پێغەمبەر بە "ثابت"ی فەرموو: باخەکە قبووڵ بکە و یەك تەڵاقی بدە[6])) ئەوانەش

---

[1] الخلاف في الفقه للطوسي٢/٢٢٢. الكافي٦/١٤٢

[2] الطلاق في الشريعة والقانون خلال اربعة الاف سنة للمؤلف ٢/١٢٨.

[3] سورة البقرة/٢٢٩.

[4] واتە بێباوەڕی کەمتەرخەمی لەوەی پێویستە بۆ مێردەکەی.

[5] باخەکە لە مارەیی ژنەکەدا بوو.

[6] رواه البخاري ومسلم نيل الاوطار ٦/٢٧٦.

كـه دەڵـێن دروسـت نییـه فیدیـه لـه مـارەیی زیـاتر بێـت بـەم فەرموودەیـه بەڵگـه دەهێننەوە، بەڵام فەرموودەكە ڕێگری لە زیادەی لێ ناخوێنرێتەوە.

**حوكمی خولع:**

هــەر كــەس دەڵێــت[1]: ئایــەتی:﴿فَــلاَ جُنَــاحَ عَلَيْهِمَــا فِيمَــا افْتَــدَتْ بِــهِ﴾ نەسخكراوەتەوە بە: ﴿وَإِنْ أَرَدْتُمْ اسْتِبْدَالَ زَوْجٍ﴾ دەڵێت خولع دروست نییە، بـەڵام ئەم بۆچوونە لەسەر بانگەشەیەكی پووچ و بێبنەما بینـاكراوە كـە بریتییـە لـە نەسـخ بەهۆی نەبوونی هیچ جۆرە بەرهەڵستییەك یان دژیەكییەك لـە نێـوان دوو ئایەتەكـەدا، چونكە ئایەتی دووەم لەسەر مەرجی وەرگرتن بەبێ ڕازیبوونی ژنەكە بیناكراوە، بۆیـە نە بەرهەڵستكاری و نە دژیەكی بوونیان نییە بەهۆی جیاوازی مەرجەكەوە.

دەسـتەیەك دەڵـێن[2]: خولــع تــەنها لــەلای دەســەڵاتدار(وەلی ئــەمر یــان قــازی) دروستە، ئەم بۆچوونە شان لەسەر بەڵگەیەكی شەرعی جێگیر دانادەن.

حەنەفییەكان دەڵـێن[3]: دروسـتە گـەر هۆیەكـە لـە هەردووكیانـەوە بێـت یـان لـە ژنەكەوە بێت بەهۆی ئایەتی:(فَلاَ جُنَاحَ عَلَيْهِمَا فِيمَا افْتَدَتْ بِهِ)، بەبێ هۆ، یـان بـە هۆیــەك لــە مێردەكـەوە كـە دەیویسـت ئـازاری ژنەكـەی پێبـدات تـا تـەڵاق لەسـەر مارەییەكەی یان لەسەر شتی تر وەربگرێت دروست نییـە، بـە ئایـەتی: ﴿وَإِنْ أَرَدْتُـمْ اسْتِبْدَالَ زَوْجٍ مَكَانَ زَوْجٍ وَآتَيْتُمْ إِحْدَاهُنَّ قِنطَارًا فَلاَ تَأْخُذُوا مِنْهُ شَيْئًا﴾.

مالیكییەكان دەڵێن[4]: بۆ پیاوەكە دروست نییـە هـیچ لـە ژنەكـە وەربگرێـت گـەر "نشـوز" لـە پیاوەكـەوە بـوو، دروسـتە گـەر "نشـوز" لـە ژنەكـەوە بـوو، لەمـەدا شافیعییەكان لەگەڵیان هاودەنگن[5].

---

[1] وەك "أبي بكر بن عبد الله المزني"

[2] ئەوەش بۆچوونی "الحسن البصري وابن سيرين وسعيد بن جبير"ە.

[3] شرح فتح القدير ٣/١٩٩.

[4] المدونة الكبرى ١٢/٦ وما بعدها.

[5] المهذب ٧١/٢.

حەنبەلییەکان دەڵێن[1]: گەر ژیان لە نێوان ژن و پیاوەکەدا سروشتی بوو، دروست نییە پیاوەکە هیچ لە ژنەکە وەربگرێت بەڵام لە ریوایەتێکدا تەڵاقی دەکەوێت، و لە ریوایەتێکی تردا ناکەوێت.

ئیمامییەکان دەڵێن[2] حەز لێنەبوونی ژنەکە یان هەردووکیان مەرجی بنچینەییە بۆ دروستی خولع، لەمەدا زەیدییەکان[3] لەگەڵیان هاوڕان بە بەڵگەی ئایەتی: ﴿لاَ يَحِلُّ لَكُمْ أَنْ تَأْخُذُوا مِمَّا آتَيْتُمُوهُنَّ شَيْئًا﴾.

زاهیرییەکانیش دەڵێن[4]: بۆ دروستی فیدیەدان حەزنەکردنی ژنەکە لە مێردەکەی یان دەترسا ئەو رقی لێی بێت و وەفا بە مافەکانی نەکات بە مەرج دەگیرێت، بۆیە تەنها لە باری زانست بە وەفا نەکردن بە پابەندبوونەکانی هاوسەرداری سەرئەنجامەکە دروستە.

ئیبازییەکان دەڵێن: ئەوەندە بەسە نشوز لە یەکێکیانەوە سەرهەڵبدات[5]

لە کتێبەکەمدا(الطلاق في الشريعة والقانون خلال أربعة آلاف سنة) [6] پارسەنگی دروستنەبوونی فیدیەدانم داوە بەرەهایی و پێموایە –وەك چاولێکەری بۆ کەسانی تر– ئەم ئایەتە: ﴿فَإِنْ خِفْتُمْ أَلاَّ يُقِيمَا حُدُودَ اللَّهِ فَلاَ جُنَاحَ عَلَيْهِمَا فِيمَا افْتَدَتْ بِهِ﴾ نەسخکراوەتەوە بە ئایەتی ﴿وَإِنْ أَرَدْتُمُ اسْتِبْدَالَ زَوْجٍ مَكَانَ زَوْجٍ وَآتَيْتُمْ إِحْدَاهُنَّ قِنطَارًا فَلاَ تَأْخُذُوا مِنْهُ شَيْئًا﴾ ئەوکات من بە هەڵەدا چووبووم، وەك چۆن پارسەنگدانەکەم بەرهەڵستی دەکات[7] لەگەڵ ئەو قسەیەم بە نەسخ

---

[1] الانصاف ٣٨٣/٨ وما بعدها.

[2] الخلاف للطوسي ٢١٣/٢ وما بعدها الكافي ١٣٩/٦ وما بعدها.

[3] التاج المذهب ١٧٧/٢ وما بعدها البحر الزخار ١٧٦/٣.

[4] المحلى ٢٤٥/١٠.

(٥) في ص ١٤٣.

(٦) شرح النيل ٤٨٠/٣.

(٧) في ص ١٤٩.

نەبوونەوە[1] بەهۆی نەبوونی بەرهەڵستی لە نێوان دوو ئایەتەکەدا، و کەماڵ تەنها بۆ خودایە[2]

—ئایەتی(٢٣٣)﴿وَالْوَالِدَاتُ يُرْضِعْنَ أَوْلاَدَهُنَّ حَوْلَيْنِ كَامِلَيْنِ﴾[3]

هەندێ پێیان وایە ئەم بەشەی ئایەتەکە نەسخکراوەتەوە بە بەشێکی تری کە بریتییە لە: ﴿فَإِنْ أَرَادَا فِصَالاً عَنْ تَرَاضٍ مِنْهُمَا وَتَشَاوُرٍ فَلاَ جُنَاحَ عَلَيْهِمَا﴾.

ابن سلامة[4] دەڵێت: خودا فەرمانی بە دایکان کردووە بە شیردان لە دوو ساڵی کامڵدا، پاشان دوو ساڵەکەی بەم ئایەتە نەسخکردەوە: ﴿فَإِنْ أَرَادَا فِصَالاً عَنْ تَرَاضٍ مِنْهُمَا وَتَشَاوُرٍ فَلاَ جُنَاحَ عَلَيْهِمَا﴾ بۆیە ئەم ئایەتە بوو بە نەسخکەر بۆ دوو ساڵی تەواو بە ڕێکەوتن.

ابن حزم الاندلسی[5] دەڵێت: ئایەتی ﴿وَالْوَالِدَاتُ يُرْضِعْنَ أَوْلاَدَهُنَّ حَوْلَيْنِ كَامِلَيْنِ﴾ نەسخکراوەتەوە بە ئایەتی ﴿فَإِنْ أَرَادَا فِصَالاً عَنْ تَرَاضٍ﴾ بە ڕێکەوتن ئەم ئایەتە بوو بە نەسخکەرەوەی دوو ساڵی تەواو، لەگەڵ ئەوەی لە کتێبەکەیدا"الناسخ والمنسوخ"[6] هەڵواردن(الاستثناء) بریتی نییە لە نەسخ.

بانگەشەی نەسخ لەم ئایەتەدا پووچ و بێبنەمایە لەبەر نەبوونی بەرهەڵستکاری نێوان نەسخکەر و نەسخکراو لەسەر بۆچوونی ئەوان، چونکە فەرمان بە شیردان دوو ساڵی تەواو لە سەرەتاوە هەڵبژاردەیی بوو، بەجێهێڵرا بۆ ئازادی دایك و باوکەکە بە مەرجێ منداڵەکە ڕووبەڕووی زیان نەبێتەوە، چونکە خودا دوو ساڵی تەواوی بە

---

(١)٢/١٤٣.

(٢) لە سەرخەرانی نەسخ نەبوونەوە: "الطبري ٢/٢٨٨، الالوسي ٢/١٣٧، ابن العربي ١/١٩١، القرطبي ٣/١٢٥، الرازي ٦/٩٩، الكياالهرسي ١/١٦٤.

(٣) سورة البقرة/٢٣٣.

(٤) الناسخ والمنسوخ ص ٩٤.

(٥) الناسخ والمنسوخ في القرآن الكريم ص ٢٩.

(٦) ص ٨.

کۆتوبەندێك سنووردار کردووە ئەویش: ﴿لِمَنْ أَرَادَ أَنْ يُتِمَّ الرَّضَاعَةَ﴾، بەرهەڵستییەکە لە کوێدایە تا بە نەسخ هەڵبگیرێت، سەرباری دەستەبەرکردنی مافی منداڵەکە، بۆیە ڕێکەوتن نابێت زیان بە منداڵەکە بگەیەنێت و گەرەکە لەسەر بنچینەیەکی دروست بیناکرابێت، وەك فەراهەمبوونی سەرچاوەی خۆراکی تر بۆ منداڵەکە جگە لە شیر و یارمەتینەدانی تەندروستی ژنەکە و نەبوونی شیری پێویست لای دایکی منداڵەکە یان شتانی تر.

لە هەمان ئایەتدا(٢٣٣) جیاوازی لە نێوانیاندا هەیە لەمەڕ نەسخبوونەوەی: ﴿وَعَلَى الْوَارِثِ مِثْلُ ذَلِكَ﴾ [١].

ابو جعفر النحاس[٢]: ئەوەی دەدرێتە پاڵ فەقیهان لە هاوەڵان و شوێنکەوتووان لەمەڕ نەسخی ئەم بەشەی ئایەتە باسکراوەکە دەگوێزێتەوە، "ابن الجوزي"ش[٣] هەمان ئەو بۆچوونانە دووبارە دەکاتەوە(دەڵێتەوە) بەبێ باسکردنی خاوەنەکانیان.

پوختەی ئەوەی "النحاس" دەیڵێت:

"مالك بن أنس" دەڵێت: پیاو خەرجی برا یان خزمی نزیك یان کەسی نزیك لەئەستۆ ناگرێت چونکە ئایەتی: ﴿وَعَلَى الْوَارِثِ مِثْلُ ذَلِكَ﴾ نەسخکراوەتەوە، بەبێ ئەوەی نەسخکەر باس بکات، "النحاس" قسەکەی ئەوی تەئویل کردووە بەوەی نەسخکراوەتەوە بەوەی ئایەتی "نفقة" و شوێنی نیشتەجێبوونی ئافرەتی مێرد مردووی نەسخکردەوە، ئەوەش ئایەتی: ﴿وَالَّذِينَ يُتَوَفَّوْنَ مِنْكُمْ وَيَذَرُونَ أَزْوَاجًا

---

[١] تەواوی ئایەتەکە: (وَالْوَالِدَاتُ يُرْضِعْنَ أَوْلَادَهُنَّ حَوْلَيْنِ كَامِلَيْنِ لِمَنْ أَرَادَ أَنْ يُتِمَّ الرَّضَاعَةَ وَعَلَى الْمَوْلُودِ لَهُ رِزْقُهُنَّ وَكِسْوَتُهُنَّ بِالْمَعْرُوفِ لاَ تُكَلَّفُ نَفْسٌ إِلاَّ وُسْعَهَا لاَ تُضَارَّ وَالِدَةٌ بِوَلَدِهَا وَلاَ مَوْلُودٌ لَهُ بِوَلَدِهِ وَعَلَى الْوَارِثِ مِثْلُ ذَلِكَ فَإِنْ أَرَادَا فِصَالاً عَنْ تَرَاضٍ مِنْهُمَا وَتَشَاوُرٍ فَلاَ جُنَاحَ عَلَيْهِمَا وَإِنْ أَرَدْتُمْ أَنْ تَسْتَرْضِعُوا أَوْلاَدَكُمْ فَلاَ جُنَاحَ عَلَيْكُمْ إِذَا سَلَّمْتُمْ مَا آتَيْتُمْ بِالْمَعْرُوفِ وَاتَّقُوا اللَّهَ وَاعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ).

[٢] الناسخ والمنسوخ في القرآن الكريم ص ٧٠ وما بعدها.

[٣] نواسخ القرآن ص ٩٠.

وَصِيَّةً لأَزْوَاجِهِمْ﴾[1] پێیان وایه به ئایەتی(٢٣٤) نەسخکراوەتەوە، وەك دواتر باسی لەبارەوە دەکەین.

جگە لە ئەو کەسانێکی تر لە هاوەڵان و شوێنکەوتووان و ئەوانەی بەدوای ئەواندا هاتن دەڵێن: ئایەتەکە موحکەمە، بەڵام جیاوازییان لە نێواندایە لە مەبەست بە "الوارث" لەم ئایەتەدا:﴿وَعَلَى الْوَارِثِ مِثْلُ ذَلِكَ﴾ بە شێوەی درێژەپێدان بەپێی ئەوەی "النحاس" دەیڵێت:

١."ابن عباس و مجاهد و الشعبي" دەڵێن: مەبەست بە "الوارث" بریتییە لە پشتیوانان و سەرخەران(الأنصار).

٢."عمر بن الخطاب" دەڵێت: لەسەر میراتگری باوکی مردوو خەرجی و پۆشاك پێویستە وەك چۆن لەسەر باوکەکە پێویست بوو.

٣."قبیصة بن ذؤیب"دەڵێت: مەبەست خودی منداڵەکەیە، بۆیە خەرجی و پۆشاکی دایکەکەش لەسەر باوکەکەیە هەروەك خەرجی و پۆشاکی منداڵەکە.

٤."سفیان الثوري" دەڵێت: "الوارث" بریتییە لەوانەی لە دایك و باوکی منداڵ ماونەتەوە کە دایکە.

٥."زید بن ثابت" دەڵێت: مەبەست پێی میراتگری منداڵەکەیە، هەندێ لە فەقیهان لەوانە "ابن حزم الظاهري"[2] ئەمەیان وەرگرتووە، سەرخەرانی ئەم رایە میراتیان گرێداوە بە خەرجکردنەوە، بۆ هەر هەژارێکی بێتوانا لە بەدەستهێناندا خەرجی بۆ هەیە لەلایەن ئەوانەی میراتگری ئەون لەسەر گریمانەی مردنی پێش ئەوان، بینا لەسەر رێسای "الغنم بالغرم" یان "الغرم بالغنم"، "ابن حزم" جیاوازی کردووە لە نێوان بنەرەتەکان(ئوسول) و هاوسەرەکان(الزوجات) لەلایەکەوە لەگەڵ پەراوێزەکان(الحواشي) لەلایەکی ترەوە، بۆ خەرجکردن لەسەر پەراوێزەکان سێ مەرجی داناوە:

---

[1] سورة البقرة/٢٤٠.

[2] المحلی: ١٠١/١٠ وما بعدها.

أ.کەسەکان لە کەسوکاری مەحرەم بێت، یەکسانە میراتگری ببینرێتەوە یان نە، یان میراتگری لە نێوانیان جێگیر ببێت بەجۆرێك گەر یەکێك لەو دوانە بمرێت ئەویتریان میراتی لێ بگرێت بەبێ ئەوەی کەسێك هەبێت بێبەشی بکات یەکسانە مەحرەمی بوون هەبێت یان نەبێت.

ب.میراتگری لە نێوانیان جێگیر ببێت بە خزمایەتی نزیك، بەجۆرێك گەر یەکێکیان بمرێت ئەویتریان میراتی لێبگرێت.

ج.کەسی بۆخەرجکراو(لەسەرخەرجکراو) نەتوانێت هەستێت بە کارێك یان کەسابەتێك یا ئەو کار و کەسابەتەش شیاوی ئەو نەبێت، بە پێچەوانەی خەرجکردنی بنەرەتەکان(الأصول) بۆ لقەکان ئەوان داوای ئەوەیان لێ ناکرێت.

ئەوانەی میرات و خەرجکردنیان پێکەوە گرێداوە بۆچوونەکەیان بیناکردووە لەسەر ئەوەی رێژەی خەرجکردن وەك رێژەی میرات وایە، بۆیە برایەکی هەژار کە برایەکی دەوڵەمەند و خوشکێکی دەوڵەمەندی لەڕووی داراییەوە هەیە خەرجکردنەکە لەسەریان پێویست دەبێت بە دابەشکردنی بۆ سێ بەش، دوو بەشی لەسەر برا دەوڵەمەندەکە و بەشێکی لەسەر خوشکە دەوڵەمەندەکە، چونکە گەر برا هەژارەکە دەوڵەمەند بوایە و بەر لەوان بمردبایە و ماڵ و سامان(لێجێماو)ی بەجێبهێڵابایە بۆ سێ بەش دابەش دەکرا[1].

"ابن حزم" بۆچوونەکەی خۆی لەسەر گرێدانی خەرجکردن بە میراتەوە بیناکردووە، پێیوایە خەرجکردن بۆ مێردی هەژار پێویست دەبێت لەسەر ژنی دەوڵەمەند، چونکە میراتگری پیاوەکەیەتی، یاسادانەری یاسای وڵاتە عەرەبییەکان لە یاسای باری کەسێتیدا[2] ئەمەی وەرگرتووە، بەڵام "ابن حزم" رێژەی خەرجکردنی وەك رێژەی میرات لێ نەکردووە و دەڵێت: (گەر میراتگران زۆربوون تەنها بەسەرژمێر خەرجکردن بۆ کەسی ئاتاج پێویست دەبێت نەك لەسەر بڕی میراتەکەیان، چونکە

---

[1] النحاس الناسخ والمنسوخ في القرآن الكريم ص ٧٢.

[2] المجلة العربية للفقه والقضاء العدد الثاني السنة الثانية تشرين اول/١٩٨٥.

دەقەکە بە پێویستبوونی ئەوە یەکسانی خستۆتە نێوانیانەوە، بۆیە جیاکاری لە نێوانیان دروست نییە)[1][2].

لەسەر لێکدانەوەی "الوارث" لە ئایەتی: ﴿وَعَلَى الْوَارِثِ مِثْلُ ذَلِكَ﴾ جیاوازی سەریهەڵداوە، جیاوازییەکە لەوەدایە خەرجی بۆ کێیە و لەسەر کێیە، بەڵام جیاوازی نییە لە پێویستبوونی خەرجکردنی باوك و دایکی راستەوخۆ لەسەر منداڵی پشتی خۆیان و پێچەوانەکەشی، بە مەرجی هەژاری و پێویستی لەسەرخەرجکراو(بۆ خەرجکراو) و توانا و دەسەڵاتی دارایی خەرجکەر(دایك و باوکەکە).

بەدەر لەمانە جیاوازیان لە نێوانەیە بەم شێوەیە:

١.مالیکییەکان[3] و شافیعییەکان و هەندێ لە فەقیهانی ئیمامییەکان و هەندێ لە ئیبازییەکان لەسەر پێویست نەبوونی خەرجکردنن بۆ پەراوێزەکان(الحواشي)، بەڵام مالیکییەکان خەرجکردنیان چوارچێوەدار کردووە لە نێوان دایك و باوکی راستەوخۆ و منداڵی پشتی خۆ، بە پێچەوانەی شافیعییەکان و ئیمامییەکان و زەیدییەکانەوە ئەوان خەرجکردن پێویست دەکەن لەسەر بنەرەتەکان با بەرزیش ببنەوە بۆ لقەکان یان دابەزن، هەر بەو جۆرە بە پێچەوانەوە.

---

[1] المحلى ١٠/١٠٧.

[2] لە سەرخەرانی نەسخ نەبوونەوە: الالوسي ٢/١٤٥، ابن العربي ١/٢٠٥، والقرطبي ٣/١٦٩ ، "الرازي" دەڵێت:((لە "مالك"ەوە نەسخی گوازراوەتەوە، پاشان بە قسەیەك رەدی دەکاتەوە کە لە "ابن العربي"ەوە دەیگوێزێتەوە، "على الوارث مثل ذلك" "ابن القاسم" لە "مالك"ەوە دەڵێت: نەسخکراوەتەوە، ئەمەش قسەیەکە دڵی بێئاگایان دەتۆرێنێتەوە و دەروازەی شازان دەگرێتە بەر، ئەوەش لەبەر ئەوەی زانا پێشووەکان بە تایبەتکردنیان دەوت نەسخ چونکە هەڵگرتنی هەندێك لەوەبوو گشت لەخۆی دەگرت وەك لێبووردنێك، ئەمەش بەسەر زمانیاندا گوزەری کرد تا تەمومژی لەسەر هەندێکیان دروست کرد)). الرازي الجزء السادس٧١.

[3] شرح الخرشي: ٤/٢٠٣.

٢.لە بۆچوونێکی بەناوبانگیاندا ئیمامییەکان دەڵێن: خەرجکردن بۆ پەراوێزەکان پەسەند(مستحب)ە[١].

٣.حەنەفییەکان[٢] دەڵێن خەرجکردن بۆ پەراوێزەکان پێویست دەبێت تەنها لە باری راستبوونەوەی خزمایەتی مەحرەمداریدا، وەك خوشك و برا بەدەر لە منداڵەکانیان، مام و پوور(خوشکی باوك) و خاڵ و پوور(خوشکی دایك) بەدەر لە منداڵەکانیان بەهۆی دروستی هاوسەرگیری نێوان منداڵەکانیان.

٤.حەنبەلییەکان[٣] لە بۆچوونێکی بەناوبانگیاندا پێویستبوونی خەرجکردن لەسەر خزمی نزیکی میراتگر بۆ خزمە نزیکەکەی بە پێویست دەبینن، یەکسانە مەحرەمبوون بوونی هەبێت یان نە، ئەمەش بۆ گشتاندنی ئایەتەکە دەگەڕێتەوە: ﴿وَعَلَى الْوَارِثِ مِثْلُ ذَلِكَ﴾.

٥."ابن حزم الظاهري"[٤] هەردوو رایەکەی سێیەم و چوارەمی کۆکردۆتەوە و خەرجکردنی خزمی نزیك بۆ خزمە نزیکەکەی بە پێویست دەبینێت گەر میراتگری یان خزمایەتی مەحرەمبوون لە نێوانیاندا بینرایەوە، یا میراتیش نەبات بەوەی کەسێك بوونی هەبێت بیبەشی بکات.

لە دیدی منەوە پارسەنگدراو بریتییە لە بۆچوونەکەی "ابن حزم" بەهۆی گشتگیرییەکەیەوە و بوونی دادپەروەری تیایدا و نزیکی لە رۆحی هاوکارییەوە کە شەریعەتی ئیسلام لە ئایەتەکانی قورئاندا پێداگری لەسەر کردووە.

- ئایەتی(٢٤٠):﴿وَالَّذِينَ يُتَوَفَّوْنَ مِنكُمْ وَيَذَرُونَ أَزْوَاجاً وَصِيَّةً لِّأَزْوَاجِهِم مَّتَاعاً إِلَى الْحَوْلِ غَيْرَ إِخْرَاجٍ فَإِنْ خَرَجْنَ فَلاَ جُنَاحَ عَلَيْكُمْ فِي مَا فَعَلْنَ فِي أَنفُسِهِنَّ مِن

---

[١] الخلاف في الفقه للطوسي: ٢/٢٣٤.

[٢] المبسوط: ٥/٢٢٣ تبيين الحقائق: ٣/٦٤.

[٣] المغني لابن قدامة: ٨/٢١٣.

[٤] المحلى: ١٠/١٠٠ وما بعدها.

مٌعروف واللهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ﴾[1])) دەڵێن ئەم ئایەتە بە ئایەتەکەی پێش خۆی لە ڕیکخستنی قورئانیدا نەسخبووەتەوە بە شەش ژمارە واتە ئایەتی(٢٣٤) ﴿وَالَّذِينَ يُتَوَفَّوْنَ مِنْكُمْ وَيَذَرُونَ أَزْوَاجًا يَتَرَبَّصْنَ بِأَنفُسِهِنَّ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ وَعَشْرًا فَإِذَا بَلَغْنَ أَجَلَهُنَّ فَلاَ جُنَاحَ عَلَيْكُمْ فِيمَا فَعَلْنَ فِي أَنفُسِهِنَّ بِالْمَعْرُوفِ وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ﴾[2][3].

"النحاس" دەڵێت[4] زۆربەی زانایان لەسەر ئەوەن ئایەتی(٢٤٠)ی سوورەتی "البقرة" بە ئایەتی(٢٣٤)ی هەمان سورەت نەسخکراوەتەوە، هەندێکیان دەڵێن: لە ئایەتی نەسخکەر چوار مانگ و دە ڕۆژ بۆ ئافرەتی سکپڕ بەهۆی تەوابوونی عیدەکەیەوە بە دانانی سکەکەی، هەندێك دەڵێن عیدەکەی بریتییە لە کۆتایی دوو ماوەکە، هەندێکی تر دەڵێن: لەمەدا نەسخ بوونی نییە، بەڵکو ناتەواوییە لە سوڕی ساڵێکدا.

هەندێکی پێیان وایە: ئەو دوو ئایەتە دوو ئایەتی موحکەمن، ئاماژە بەوە دەکەن کە ئافرەتەکە نەهیلێکراوە لە شەومانەوە لە ماڵێکدا جگە لە ماڵی مێردەکەی خۆی، "ابن حزم الأندلسي"[5]دەڵێت: ئایەتی: (٢٤٠) نەسخکراوەتەوە و نەسخکەرەکەشی بریتییە لە ئایەتی(٢٣٤)، "ابن الجوزي"[6]دەڵێت: ئەهلی تەفسیر دەڵێن خەڵکی سەردەمی نەفامی گەر کەسێکیان لێ بمردبایە ساڵێك ژنەکەی لە ماڵەوە دەمایەوە و لە میراتەکەی(میراتی پیاوەکە) خەرجی دەکێشرا، کە ساڵەکە تەواو دەبوو دەچوو بۆ دەرگای ماڵەکەی و سمی وڵاخێکی دەخستە بەردەم سەگێك بەوەش لە عیدەکەی دەهاتە دەرەوە، مانای فڕێدانی سمی وڵاخ ئەوە بوو دەیوت مانەوەم لە ماڵی

---

[1] سورة البقرة/٢٤٠.

[2] سورة البقرة/٢٣٤

[3] لە سەرخەرانی نەسخ نەبوونەوەی: القرطبي: ٣/٢٢٦، الرازي:٦/١٥٨

[4] الناسخ والمنسوخ في القران الكريم ص٧٣.

[5] الناسخ والمنسوخ في القران الكريم ص٩٠.

[6] نواسخ القران ص٩٠-٩١.

مێردەکەم—لەدوای مردنی مێردەکەم— لەسەرم ئاسانترە لە فڕێدانی ئەم سمی وڵاخە، دواتر ئیسلام هات و دانی بەوەدا تا ئافرەت ساڵێك لە ماڵی مێردەکەی بمێنێتەوە بەم ئایەتە، پاشان ئەم ئایەتە بە ئایەتەکەی پێشتری لە ڕێکخستنی قورئانیدا واتە ئایەتی(٢٣٤) سڕایەوە.

هەندێ دەڵێن ئایەتی(٢٤٠) ئایەتی میرات نەسخی کردۆتەوە لەسەر ئەو بنچینەی ژنی مێردمردوو خەرجی و پۆشاکی لە لێجێماوی مێردەکەی بۆ هەیە و بەشێك لە میراتی بۆتەرخانکراو جێگەی ئەوەی گرتەوە.

بەڵگەی پووچەڵبوونەوەی بانگەشەی نەسخ:

بەڵگەی شەرعی و مەنتقی و ئەقڵی زۆر بوونیان هەیە بە ڕۆشنی ئاماژە دەکەنە سەر پووچی داوای نەسخی ئایەتی(٢٤٠) بە ئایەتی (٣٣٤)، گرنگترینیان ئەمانەن:

جیاوازی بابەتی دوو ئایەتەکە، ئایەتی (٢٤٠) مافێك لە مافەکانی هاوسەری ئافرەتی مێردمردوو ڕۆشن دەکاتەوە لە دوای مردنی مێردەکەی، بە بەڵگەی:﴿وَصِيَّةً لأَزْوَاجِهِمْ﴾ مافەکە ئەم بەشەی ئایەتەکە لێکدانەوەی بۆ دەکات:﴿مَتَاعًا إِلَى الْحَوْلِ غَيْرَ إِخْرَاجٍ﴾ مافی ئافرەتەکە لە نیشتەجێبوون و خەرجی بەوەی پێش مردن لەسەری بوو لە ماڵی مێردەکەیدا، لەگەڵ پێدانی ئازادی بە ژنەکە و مافی چوونە دەرەوە و بوونی هەڵبژاردن بۆی و پابەندنەکردنی بە مانەوە و خۆشیوەرگرتن لە خانەی هاوسەرداری بە بەڵگەی ئەم بەشەی ئایەتەکە: ﴿غير إِخْرَاجٍ فَإِنْ خَرَجْنَ فَلاَ جُنَاحَ عَلَيْكُمْ فِي مَا فَعَلْنَ فِي أَنفُسِهِنَّ مِنْ مَعْرُوفٍ﴾.

لە کاتێکدا ئایەتی (٢٣٤) ئەرکێك لە ئەرکەکانی هاوسەرداری لەسەر ئافرەتی مێردمردوو ڕۆشن دەکاتەوە و ناچاری دەکات پابەند بێت پێیەوە و ویستی کۆتوبەند دەکات بەو ئەرکەوە.

گەر ئافرەتەکە سکی هەڵنەگرتبوو پێویستە چوار مانگ و دە ڕۆژ چاوەڕوان بێت، گەر سکپڕ بوو چاوەڕوانی دانانی سکەکەی دەکات لەلای جمهوری فەقیهان یان تەواوبوونی دوورترین دوو ماوەکە لە دانانی سکەکە و چاوەڕوان بوونی چوار مانگ و

ده رۆژ لەلای هەندێ لـە فـەقیهان، گـەر بابـەتی دوو ئایەتەکـە لەیـەکتر جیـاواز بێـت بەرهەڵستی و دژیـەکی لـە کوێدایـە؟ لەگـەڵ ئـەوەی نەسـخ لقێکـە لـە دژیـەکی و بـۆ هەلگرتنی ئەو دژیەکییە دێت[1].

٢.حوکمی هاتوو لە ئایەتەکـەی یەکەمـدا پەیوەسـتە بـە مافـەکانی خەڵکـەوە کـە چووەتە ژێر ویستی بەنـدەوە و هەڵبـژاردن و ئـازادی بـۆ هەیـە لـە قبـوولکردن و رەد کردنەوەیدا.

لە کاتێکدا حوکمی هاتوو لە ئایەتی دووەمدا مافێکە لە مافـەکانی خـودا و ناچـێتە ژێـر ویسـتی مرۆڤــەوە و دەسـتکاری و گـۆڕین قبـووڵ ناکـات، ئـەوەش بریتییـە لـە واجبوونی چاوەڕوانی و شوو نەکردن تـا چـوار مـانگ و دە رۆژ تـەواو دەبێـت یـان تـا دانانی سکەکەی تایبەت بە ئافرەتی مێردمـردوو وەك هـەموو جۆرەکـانی تـری عیـدە تایبەت بە تەڵاقدراو لە دانانی سکەکە، وەك: ﴿وَأُوْلاَتُ الأَحْمَـالِ أَجَلُهُـنَّ أَنْ يَضَـعْنَ حَمْلَهُنَّ﴾ و سێ "قروء" وەك: ﴿وَالْمُطَلَّقَاتُ يَتَرَبَّصْنَ بِأَنفُسِهِنَّ ثَلاَثَةَ قُـرُوءٍ﴾ یـان سێ مانگ لە ئایەتی﴿وَاللاَّئِي يَئِسْنَ مِنْ الْمَحِيضِ مِنْ نِسَائِكُمْ إِنْ ارْتَبْـتُمْ فَعِـدَّتُهُنَّ ثَلاَثَةُ أَشْهُرٍ وَاللاَّئِي لَمْ يَحِضْنَ﴾ عیدە بە هەموو جۆرەکانییەوە مافی رووتی خودان، لە کاتێکدا مانەوەی ژن لە ماڵی هاوسەرداریدا لە مافە تایبەتەکانی بەندەکانن.

بەرهەڵستی و دژیەکی لە کوێدایە تا بـە نەسـخ هـەڵبگیرێت؟ لـە رێسـا ئوسـوڵی و مەنتقییەکان بەرهەڵستی و دژیەکی لەدوای یەکێتی بابەت و ناوەڕۆك راست دەبێتەوە.

٣.ئایەتی نەسخکەرەوە(٢٣٤) لـە رێکخسـتنی قورئانیـدا بـە شـەش ئایـەت پـێش کەوتووە، چ نهێنییەك لەم پێشخستن و دواخستنەدا هەیە سەرەڕای ئەوەی نەسخکەر لـە دوای نەسـخکراوەوە دێـت بـەپێی دابەزینەکـەی گـەر لـە یـەك سـورەتدا بـوون و پەیوەستبوون بـە یـەك بابەتـەوە، ئـەم پێشـکەوتن و دواکەوتنـە سـەرەڕای نـەبوونی زەرورەتی رەچاوکردنیان نیمچە ئاماژەیەکە لەسەر نەبوونی نەسخ.

---

[1] ينظر أصول الفقه للشيخ محمد الخضري ص٢٥٢.

٤.زۆربەی ئافرەتانی جیهانی ئیسلامی حوکمی دوو ئایەتەکە کۆدەکەنەوە، ئافرەتی مێردمردوو بەزۆری ساڵێك یان زیاتر لە ماڵی مێردەکانیاندا لە دوای مردنی هاوسەرەکانیان دەمێننەوە، شوێنی نیشتەجێبوون هەر ئەوەیە و خەرجی هەمان خەرجی سەرباری پابەندبوونیان بە عیدەی مردنەکە، ئایا کەسێك هەیە بانگ بۆ پێچەوانەی ئەوە بکات و داوا لە ژنەکە بکات لە ماڵی هاوسەرەکەی بچێتە دەرەوە و تیایدا نیشتەجێ نەبێت و خەرجی لە لێجێماوەکە بۆ نەکرێت بە بەڵگەی ئەوەی ئەو کارە نەسخکراوەتەوە لە ئایەتەکەدا؟

وەڵامەکە: نەخێر، بۆ زانینت هەردوو حوکمی نەسخکەرەوە و نەسخکراو پێویستە دژ بەیەکتر بن و دروست نییە پێکەوە کۆبکرێنەوە وەك چۆن دروست نییە هەردووکیان پێکەوە هەڵبگیرێن.

٥.جێگیربوونی ئایەتی(٢٤٠) لە قورئاندا بۆ خوێندنەوە ئاماژەیەکی ترە بۆ نەسخ نەبوونەوەی[1] چونکە زۆرینەی زانایان نایانەوێت دان بنێن بە پارێزگاری لە خوێندنەوە و سڕینەوەی حوکمی ئایەت و بە دروستی دانانێن[2] وەك پێشتر باسمان کرد.

بەهێزترین بەڵگە لەم بەڵگانەی واڵامان کردن بریتییە لە جیاوازی بابەتی دوو ئایەتەکە، ئایەتی(٢٤٠) بریتییە لە "ماف" لە کاتێکدا بابەتی ئایەتی(٢٣٤) بریتییە لە پابەندبوون، بابەتی نەسخکەر و نەسخکراو پێویستە یەك بابەت بێت.

---

[1] "القرطبي في تفسيره ٢٢٦/٢ دەڵێت: "البخاري" ریوایەتی کردووە لە "ابن الزبير"ەوە دەڵێت: وتم بە "عیمان" ئەم ئایەتە کە لە سورەتی "البقرە"دایە نەسخکراوەتەوە بە ئایەتێکی تر نەنوسرابێتەوە؟ فەرمووی: برازای خۆم هیچ شتێك لە جێگەی خۆی ناگۆڕم.

[2] "الطبري ٣٦٢/٢ دەڵێت: ((لە "مجاهد"ەوە ئەم ئایەتە موحکەمە و نەسخی تێدا نییە، عیدە جێگیر بووە بە چوار مانگ و دە ڕۆژ، پاشان خودا وەسێتی بۆ ئافرەتان دابین کرد، نیشتەجێبوونی حەوت مانگ و بیست شەو، گەر بیەوێت دەمێنێتەوە، ئەگەر نە دەتوانێت بڕوات.

- ئایەتی(٢٥٦):﴿لاَ إِكْرَاهَ فِي الدِّينِ قَدْ تَبَيَّنَ الرُّشْدُ مِنْ الغَيِّ﴾[1].

النحاس[2] دەڵێت: ((هەندێ لە زانایان دەڵێن نەسخکراوەتەوە، چونکە پێغەمبەر(ﷺ) عەرەبی ناچارکرد لەسەر ئایینی ئیسلام و لەگەڵیان جەنگا و تەنها ئیسلامی لێ قبووڵ کردن، لەو کەسانەی بۆچوونیان لەسەر ئەمەیە "سلیمان بن موسى"یە، دەڵێت ئایەتی: ﴿يَاأَيُّهَا النَّبِيُّ جَاهِدِ الْكُفَّارَ وَالْمُنَافِقِينَ﴾ نەسخی کردۆتەوە، هەندێ لە زانایان دەڵێن نەسخ نەکراوەتەوە، بەڵام "لا إكراه في الدين" بۆ ئەهلی کیتاب دابەزیوە، ئەوان لەسەر ئیسلام ناچار ناکرێن گەر جزیە بدەن، ئەوانەی ناچار دەکرێن بریتین لە بتپەرستان.

ابن سلامة[3] دەڵێت: خودا بە ئایەتی "شمشێر" نەسخی کردەوە.

ابن حزم الاندلسي[4] دەڵێت: ئایەتی: ﴿لاَ إِكْرَاهَ فِي الدِّينِ﴾ نەسخکراوەتەوە و نەسخکەرەوەکەشی بریتییە لە :﴿فَاقْتُلُوا الْمُشْرِكِينَ حَيْثُ وَجَدْتُمُوهُمْ﴾[5].

ابن الجوزي[6] دەڵێت: زانایان جیاوازیان لە نێواندایە ئایا ئەم بەشەی ئایەتکە موحکەمە یان نەسخکراو، هەندێك پێیان وایە موحکەمە، پاشان لەسەر رووی مەحکەمییەکەی جیاوازی کەوتۆتە نێوانیانەوە بە دوو بۆچوون:

یەکەمیان: گشتییە و مەبەست پێی تایبەتییە کە بریتییە لە ئەهلی کیتاب ئەوان هەڵبژاردەیان بۆ هەیە لە نێوان پێدانی جزیە و ناچارکردنیان لەسەر ئیسلام.

قسەی دووەم: مەبەست بە "الدين" بریتییە لەوەی دڵی لەسەر دادەمەزرێت.

بەڵگەکانی پووچی بانگەشەی نەسخ:

---

[1] سورة البقرة/٢٥٦.

[2] الناسخ والمنسوخ ص٧٩.

[3] الناسخ والمنسوخ ص٩٦.

[4] المرجع السابق.

[5] سورة التوبة/٥.

[6] نواسخ القران ص٩٢.

١.ئـەوەی ڕۆشـنە ئەوەیـە قورئـان یەکەیەکـە بـەش بـەش ناکرێـت و هەنـدێکی هەنـدێکی تـری شـرۆڤە دەکـات، سـەدان ئایـەت هەیـە لەگـەڵ بۆچـوونی نەسـخی زۆرلێکردن لە ئاییندا دژ بەیـەکتر دەوەسـتنەوە، و پشـتیوانی مانـەوەی ئـەو حوکمـە دەکەن بۆ هەتا هەتایە، لەو ئایەتانە:

أ.ئایەتی لۆمەکردنی ئاراستەکراو بە پێغەمبەر(ﷺ) کاتێك ویسـتی هەنـدێك کـەس لەسـەر ئیسـلام ناچـار بکـات وەك ڕەحمـەتێك بـە ئەوانـە، خـودا بـە پرسـیارێکی ڕەخنەگرانە فەرمووی:﴿وَلَوْ شَاءَ رَبُّكَ لآمَنَ مَنْ فِي الأَرْضِ كُلُّهُمْ جَمِيعًا أَفَأَنْتَ تُكْرِهُ النَّاسَ حَتَّى يَكُونُوا مُؤْمِنِينَ﴾[1].

ب.خودا–سبحانه وتعالى– دەفەرموێت:﴿ادْعُ إِلَى سَبِيلِ رَبِّكَ بِالْحِكْمَةِ وَالْمَوْعِظَةِ الْحَسَنَةِ وَجَادِلْهُمْ بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ إِنَّ رَبَّكَ هُوَ أَعْلَمُ بِمَنْ ضَلَّ عَنْ سَبِيلِهِ وَهُوَ أَعْلَمُ بِالْمُهْتَدِينَ﴾[2]

ج.کورتهەڵهێنانی هاتوو لە ئایەتی:﴿وَأَطِيعُوا اللَّهَ وَأَطِيعُوا الرَّسُولَ وَاحْذَرُوا فَإِنْ تَوَلَّيْتُمْ فَاعْلَمُوا أَنَّمَا عَلَى رَسُولِنَا الْبَلاَغُ الْمُبِينُ﴾[3].

د.کورتهەڵهێنانی هاتوو لە ئایەتی:﴿وَإِنْ تَوَلَّوْا فَإِنَّمَا عَلَيْكَ الْبَلاَغُ﴾[4].

بوونی دەیان ئایەت کە پێداگری لە:﴿لاَ إِكْرَاهَ فِي الدِّينِ﴾ دەکەنەوە، بۆیە وتنی نەسخی ئەو ئایەتە نەسخی هەموو ئەو ئایەتانە پێویست دەکات، پێویست پووچەڵە و هەر بەو جۆرە پێویستکراو.

٢. سەرباری ئەو بەڵگە گوازراوانە بەڵگەی ئەقڵی و مەنتقی و زانستی ناچارکردن لە ئاییندا ڕەد دەکەنەوە، چونکە ئایین باوەڕێکی جێگیر و دامەزراوە لە دڵدا و پڕاوپـڕە بە واقیـع، باوەڕبوونـە بـە بـوونی خـودا و پێغەمبەرایـەتی محمـد(ﷺ) و ئـەوەی لـەو

---

[1] سورة يونس/٩٩.

[2] سورة النحل/١٢٥.

[3] سورة المائدة/٩٢.

[4] سورة آل عمران/٢٠.

دوانەوە سەرچاوە وەردەگرن لە تەواوی باوەڕەکانی تر و کرداری چاکە، باوەڕ تەنها شایەتمان و نیشاندانی ئیسلام نییە لە رووالەتدا، ئەم باوەڕە قەناعەتێکی تاکە کەسی خودییە لە دڵدا، بۆیە بە هێز و ناچارکردن ناسەپێنرێت بەسەر هیچ کەسێکدا، هەموو ناچارکردنێك بە پێچەوانەی ئەم بیروباوەڕە ناوەکییە سەردەکێشێت بۆ سەرهەڵدانی چینێك لە دووڕووان لە هەموو کۆمەڵگەیەکدا، ئەوەی رۆشنە ئەوەیە هەڕەشە و ترسی دووڕوو لەسەر کۆمەڵگە زۆر زیاترە لە هەڕەشە و ترسی دوژمنی ئاشکرا.

٣.ئایەتی شمشێر و هەر ئایەتێکی تری فەرمانکەر بە جەنگان تایبەتن بە باری بەرگری رەوا لە ئیسلام و موسڵمانان[١].

—ئایەتی(٢٨٢):﴿يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا تَدَايَنتُمْ بِدَيْنٍ إِلَى أَجَلٍ مُسَمًّى فَاكْتُبُوهُ..﴾[٢]پاشان لە هەمان ئایەتدا دەفەرموێت:﴿وَأَشْهِدُوا إِذَا تَبَايَعْتُمْ﴾ پاشان لەو ئایەتەی بەدوایدا دێت دەفەرموێت:﴿وَإِنْ كُنتُمْ عَلَى سَفَرٍ وَلَمْ تَجِدُوا كَاتِبًا فَرِهَانٌ مَقْبُوضَةٌ﴾[٣].

قورئان لەم دوو ئایەتەدا فەرمانی کردووە بە متمانەگری لە قەرز و مامەڵە داراییەکاندا، ئەمەش بۆ بەدوورگرتنی دوو کەسە گرێبەستکارەکە یان میراتگرانیان لە ناکۆکی و دوژمنایەتی، ئەمەش بە یەکێك لەم سێ رێگەیە: یان تۆمارکردنی قەرزەکە، یان گرێبەستەکە لای نووسەری داد، وەك جێبەجێ کردنی فەرمانی خودا: ﴿وَلْيَكْتُبْ بَيْنَكُمْ كَاتِبٌ بِالْعَدْلِ﴾ یان وەرگرتنی شایەت لەسەر فرۆشتنەکە بەپێی ئایەتی:﴿وَأَشْهِدُوا إِذَا تَبَايَعْتُمْ﴾ لەباری نەبوونی "نووسەری داد"دا گرێبەست و قەرزەکە بە بارمتە متمانەگیری بۆ دەکرێت، ئەمەش وەك پارێزگاری دەستەبەرکردنی

---

[١] لە سەرخەرانی نەسخ نەبوونەوە: ابن العربي: ٢٣٣/١، الآلوسي: ١٣/٣، الطبري: ١٢/٣، القرطبي: ٢٨٠/٣، الرازي: ١٤/٧، الكياالهراسي: ٢٢٣/١.

[٢] سورة البقرة/٢٨٢.

[٣] سورة البقرة/٢٨٣.

مافی قەرزدەر، گەر قەرزدار وەفای نەکرد بە گێڕانەوەی قەرزەکە ئەوا بارمتەکە دەفرۆشرێت و قەرزەکە لەسەر نەرخەکەی وەردەگیرێتەوە، بەپێی ئایەتی: ﴿وَإِنْ كُنتُمْ عَلَى سَفَرٍ وَلَمْ تَجِدُوا كَاتِبًا فَرِهَانٌ مَقْبُوضَةٌ﴾ ئەم مەرجە تێگەیشتنی پێچەوانەی بۆ نییە، بۆیە وەرگرتنی بارمتە لە سەفەر و لە نیشتەجێبووندا دروستە، بە بەڵگەی ئەوەی دایکی باوەڕداران عائشە -خوا لێی رازی بێت- ریوایەتی کردووە: ((پێغەمبەر(ﷺ) لە پیاوێکی یەهودی خواردنی بە "نسیئة"[1] کڕی و بۆ ئەو مەبەستە دورعێکی وەك بارمتە پێدا)) [2].

ئەم رێکارانە لە تۆمارکردنی قەرز و شایەت وەرگرتن لەسەر فرۆشتنەکان و متمانەگری بۆ قەرزەکان بە وەرگرتنی بارمتە یاسا و یاساناسان گوزارەی "الشكلية- شێوەگری"یان بۆ داناوە، جێگەی ئەم شێوەگرییە لە یاسادا لە وڵاتێکەوە بۆ وڵاتێکی تر جیاوازە، لە عێراقدا هەر هەڵسوکەوتێك لە خانووبەر و زەویوزاردا- بە هەڵواردەی وەسێت- پووچەڵە گەر لە فەرمانگەی تۆماری خانووبەرە تۆمار نەکرابێت.

لە کاتێکدا لە یاسای میسری و یاسای کاریگەر بە ئەو فرۆشتنی خانووبەرە و هەر هەڵسوکەوتێکی خانووبەرەی تر لە دەرەوەی فەرمانگەی فەرمییەوە دادەمەزرێت و پابەندبوون سەرهەڵدەدات لەسەر شانی خاوەن خانووبەرە بە تۆمارکردنی گرێبەستەکە لە فەرمانگەی ئاشکراکردنی خانووبەرە، بەڵام مولکداری ناگوێزرێتەوە بۆ لایەکەی(کەسەکەی) تر لە دوای تۆمارکردن نەبێت.

## هەڵوێستی فەقیهانی شەریعەت لەو شێوەگرییە باسکراوە:

زانایانی ئیسلام لە ئوسوڵییەکان و فەقیهان و ئەهلی تەفسیر لەم بابەتەدا جیاوازیان تیایدا هەیە لە دوو رووەوە:

---

[1] بيع النسيئة- فرۆشتن بە نەسیئە: بریتییە لە فرۆشتن بە نرخێکی دواخراو.

[2] صحيح مسلم: ٣/١٢٢٦ تحت عنوان باب الرهن وجوازه في الحضر والسفر.

یەکـەمیان: جیـاوازی لـە مانـەوەی فەرمانـە هاتووەکـان لـە دوو ئایەتـە ئاماژەبۆکراوەکاندا ئایا موحکەمن یان نەسخکراو.

دووەم: بـەکارهێنانی ئـەو فەرمانانـە لـە مانـای راسـتەقینەی شـەرعیدا ئایـا پێویستبوونە(الوجوب) یـان لـە مانـای مەجازیـدا ئایـا پەسـەندبوونە(الندب) وەك لـەم رۆشنکردنەوەدا:

یەکەم- مانەوەی بە موحکەمی یان نەسخکراوەتەوە:

هەندێ پێیان وایە[1] ئـەم شـێوەگرییە نەسـخکراوەتەوە بـە ئایـەتی:﴿فَإِنْ أَمِنَ بَعْضُكُمْ بَعْضًا فَلْيُؤَدِّ الَّذِي اؤْتُمِنَ أَمَانَتَهُ﴾[2].

دووەم: ئەو فەرمانانەی باسکراون بۆ پێویستبوونە یان پەسەندبوون و رێنموونین:

أ.جمهـوری زانایـانی موسـڵمان لـە فـەقیهان و ئوسـوڵییەکان و ئـەهلی تەفسـیر پێیانوایە ئەو فەرمانە هاتووانەی ناو دوو ئایەتەکە بۆ پەسەندبوون و رێنموونیین نـەك بۆ پێویستبوون و پابەندکردن، سەرەڕای ئەو قسەیان کە دەڵێن ئەمر لە راستەقینەیدا بۆ پێویستبوونە و لە مەجازیدا بۆ شتانی ترە، لەگەڵ ئەوەش لە مانـای راسـتەقینەی خۆیدا بەکارنەهێنراوە لە هەر یەك لە تۆمارکردن و شایەت وەرگـرتن و بارمتـە لـە دوو ئایەتە ئاماژەبۆکراوەکەدا، بە ئاماژەی کاری پێشینی چاکان کاتێك لە قەرزی ماوە بۆ دیاریکراو و گرێبەستە داراییەکانـدا خۆیـان بـەو شـێوەگرییەوە پابەنـد نـەکرد بـوو، ئەوان زیاتر لـە ئێمـە پابەنـدبوونیان بـە شـەریعەتی ئیسـلامەوە هـەبووە و پیادەیـان کردووە، کارەکەی ئەوان ئاماژەیە بەوەی ئـەو فەرمانانـە لـە مانـای راسـتەقینەدا کـە بریتییە لە پێویستبوون بەکارنەهێنراون.

---

[1] النحاس المرجع السابق ص٨٢-٨٤. ابن سلامة المرجع السـابق ص٩٦. ابـن الجـوزي المرجع السابق ص٩٤-٩٦. ابن حزم الاندلسي المرجـع السـابق ص٣٠ ئـەم ئایەتـەی تێدایە: (وَأَشْهِدُوا إِذَا تَبَايَعْتُمْ) منسوخة وناسخها (فَإِنْ أَمِنَ بَعْضُكُمْ بَعْضًا فَلْيُؤَدِّ الَّذِي اؤْتُمِنَ أَمَانَتَهُ).

[2] البقرة/٢٨٣.

ئەم بەڵگەهێنانەوەیە بە چەندین بەڵگە بەرپەرچ دەدرێتەوە، لەوانە:

١.گیانی ئایینی لەلای پێشین زاڵ بوو بەسەر لایەنی مادیدا و متمانە دەسەڵاتدار بوو بەسەر دوو گرێبەستکارەکەدا و ئەمانەت راوەستاو بوو لەلای هەر قەرزدارێك، بۆیە پێویستی بە متمانەگری نەدەکرد بە وەرگرتنی شێوەگری.

٢.ژیان لە سەردەمەکانی پێشوودا سادە و ساکار بوو بەجۆرێك قەرزەکان برەکانیان کەم بوو، پێویستی بە تۆمار کردن نەدەکرد، هەروەها جێگەی گرێبەست بەزۆری لەو شتانە بوو بەها و نرخێکی زۆری هەبێت.

بینا لەسەر ئەوە کارەکەیان بە وازهێنان لە تۆمارکردن و شایەت وەرگرتن و بارمتە نابێتە بەڵگەی ئەوەی ئەو فەرمانانە لە مانا مەجازییەکانیاندا کە بریتییە لە پەسەندبوون و رێنموونی و شتانی تر بەکارهێنراون و وەك مانای راستەقینە لە کاتی پێویستدا بەکارنەهێنراون.

ب.هەندێ لە هاوەڵان و شوێنکەوتووان و ئیمامانی مەزهەبە فیقهییەکان پێیانوایە ئەو فەرمانانە لە مانای راستەقینەدا بەکارهێنراون کە بریتییە لە پێویستبوون و پابەندکردن.

لە هاوەڵان "عبدالله بن عمر" و "أبو موسی الأشعري"[1].

لە شوێنکەوتووانیش: "محمد بن سیرین و أبو قلابة، و الضحاك و جابر بن زید و مجاهد" توندترین کەسیان لەم بابەتەدا: "عطاء"ە دەڵێت: گەر بفرۆشم شایەت وەردەگرم، گەر بە درهەمێك یان نیو درهەم یان کەمتر لەوە بکڕم شایەت وەردەگرم، خودا دەفەرموێت: ﴿وَأَشْهِدُوا إِذَا تَبَايَعْتُمْ﴾.

لە "مغیرة بن إبراهیم"ەوە دەڵێت: گەر بفرۆشم و بکڕم شایەت وەردەگرم، با دەسکێك پاقلەش بێت[2].

---

[1] ابو جعفر النحاس الناسخ والمنسوخ ص٨٢.

[2] المرجع السابق ص٨٣.

له ئیمامانی مەزهەبە فیقهییەکان"ابن حزم الظاهري"[1] دەڵێت: ((فەرزە لەسەر فرۆشیار و کڕیار بۆ کەم و زۆر دوو شایەتی پیاو لەسەر سەوداکەیان وەربگرن یان پیاوێك و دوو ژن لە کەسانی دادپەروەر، گەر کەسی دادپەروەریان نەبینییەوە فەرزی شایەتییەکە بەردەبێتەوە، گەر شایەت وەرنەگرن و دەیانتوانی شایەت وەربگرن ئەوا لە خودا یاخیبوون، فرۆشتنەکە تەواوە، گەر فرۆشتنەکە بە نرخێك بوو بۆ ماوەیەکی دیاریکراو ئەوا لەسەریان فەرزە لەگەڵ شایەتی ئاماژەبۆکراودا پێویستە بینووسن، گەر نەینووسن لە خودا یاخیبوون، فرۆشتنەکەش تەواوە، گەر نووسەریان دەست نەکەوت لەسەر هەردووکیان فەرزی نووسینەکە بەردەبێتەوە)) بەڵگەی ئەوە ئایەتی:﴿يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا تَدَايَنتُمْ بِدَيْنٍ إِلَى أَجَلٍ مُسَمًّى فَاكْتُبُوهُ وَلْيَكْتُبْ بَيْنَكُمْ كَاتِبٌ بِالْعَدْلِ﴾.

پاشان دەڵێت: ئەم فەرمانانە توند و پێ لەسەرداگیراون و تەئویل قبووڵ ناکەن بە نووسین لە قەرزدا بۆ ماوەیەکی دیاریکراو، هەروەها بە شایەت وەرگرتن لەوەدا لە بازرگانی ئاڵوگۆڕ، و شتانی تریش.

پاشان دەڵێت: "مجاهد" دەڵێت: "ابن عمر" گەر بە نەقد بیفرۆشتایە شایەتی وەردەگرت، گەر بە "نسيئة-دواخستن" بیفرۆشتبایە دەینووسی و شایەتی وەردەگرت.

زۆریەی بەڵگەی ئەوان ئەوەیە فەرمانی هاتوو بە تۆمارکردن و شایەت وەرگرتن لە مانا راستەقینەکەیدا بەکارهێنراوە کە بریتییە لە "پێویستبوون" و دروست نییە هەڵبدرێتە سەر مانای مەجازی کە بریتییە لە پەسەندبوون و رێنموونی، هەروەها لەبەر نەبوونی نیمچەبەڵگەی لادەر لە مانا راستەقینەکەی.

لە کاتێکدا جمهور بەڵگەیان هێناوەتەوە لەسەر بەکارهێنانی لە مانا مەجازییەکەیدا بە ئاماژەی کاری پێشینی چاکان.

---

[1] المحلى: ٣٤٤/٨ وما بعدها.

له دیدی منەوە زیادەڕەوی لە هەردوو ئاراستە باسکراوەکەوە بوونی هەیە، بەرهەمی گۆڕان و پێشکەوتنەکانی ژیانی ئابووری و لاوازی گیانی ئایینی و کەمی متمانە و ئەمانەت پێویستە ناوەندی نێوان دوو بۆچوونەکەی پێشوو بگرین، چونکە شەریعەتی ئیسلام لە هەموو شتێکدا دانی بە ناوەنددا ناوە[1] و زیادەڕەوی و کەمرەوی دوورخستۆتەوە، گەر قەرزەکە بڕێکی زۆر بوو پێویستە تۆمار بکرێت بە پێچەوانەی بڕە کەمەکانەوە، گەر جێگەی گرێبەستەکە ماڵێکی بەنرخ بوو وەك خانووبەرە و زەوی و زار و باخ و بێستان پێویستە لە فەرمانگەی تۆماری خانووبەرە یان فەرمانگەیەکی تر بەرانبەر بەوە تۆمار بکرێت.

گەر جێگەی گرێبەستەکە ئۆتۆمبێلێك بوو پێویستە لە فەرمانگەی هاتووچۆ تۆمار بکرێت، گەر فڕۆکە یان کەشتی بوو پێویستە لە فەرمانگەیەکی فەرمی تۆمار بکرێن، ئەوەش وەك خۆ بەدوورگرتن لە ناکۆکی و نەیارییەکان لە نێوان دوو کەسە گرێبەستکارەکەدا یان لە نێوان میراتگرانیاندا، قورئانی مەزن پێش یاساڕێژییە دانراوەکانی جیهان کەوتووە لە دانان بە شێوەگریدا وەك دەستەبەرییەك بۆ مافی دوو کەسە گرێبەستکارەکە و یەکەمین شەریعەتە لە دونیادا نووسەری دادی زانیوە.

پێشنیار دەکەم یاسادانەری وڵاتانی عەرەبی ئاراستەی شەریعەتی ئیسلام وەربگرن لە دامەزرانی گرێبەستدا لە دەرەوەی فەرمانگەی فەرمی و پاشان پابەندکردنی دوو گرێبەستکارەکە بە تۆمارکردن لە لایەنی فەرمییەوە وەك چۆن لە یاسای میسری و یاسا کاریگەرەکان پێی زانراوە[2].

---

[1] قال سبحانه وتعالى (وَكَذَلِكَ جَعَلْنَاكُمْ أُمَّةً وَسَطًا لِتَكُونُوا شُهَدَاءَ عَلَى النَّاسِ) البقرة/١٤٣.

[2] لە سەرچاوەکانی نەسخ نەبوونەوە:الطبري: ٧٩/٣، الالوسي: ٥٧/٣، ابن العربي: ١٦٢/١، القرطبي: ٣٧٦/٣، الرازي: ١١٠/٧، الكياالهراسي: ٢٣٧/١.

– ئایەتی(٢٤٨): ﴿وَإِنْ تُبْدُوا مَا فِي أَنفُسِكُمْ أَوْ تُخْفُوهُ يُحَاسِبْكُمْ بِهِ اللَّهُ﴾[١].

النحاس[٢] دەڵێت: (لە "ابن عباس"ەوە سێ قسەی لەسەرە: یەکەمیان ئەو ئایەتە نەسخکراوەتەوە بە ئایەتی:﴿لاَ يُكَلِّفُ اللَّهُ نَفْسًا إِلاَّ وُسْعَهَا﴾[٣].

دووەمیان: ئایەتەکە نەسخ نەکراوەتەوە و گشتییە و باوەڕدار و بێباوەڕ و دووڕوو دادگایی دەکرێن لەسەر ئەوەی ئاشکرایان کردووە و شاردوویانەتەوە، خودا لە باوەڕدار خۆشدەبێت و سزای بێباوەڕ و دووڕوو دەدات.

سێیەم: ئایەتەکە تایبەتکراوە و لە شاردنەوەی شایەتی و ئاشکراکردنیدایە، بەم جۆرە "زید بن أبي زیاد" لە "مقسم"ەوە لە "ابن عباس"ەوە ریوایەتی کردووە).

ابن حزم الاندلسي[٤] دەڵێت: دابەزینی ئەم ئایەتە بارگرانی لەسەر شانیان دروست کرد، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ((وەکو یەهود مەڵێت: "بیستمان و یاخیبووین" بەڵکو بڵێن "بیستمان و گوێڕایەڵبووین")) کاتێک خودا زانی بە خۆڕادەستکردنی ئەوان بە فەرمانی خۆی نەسخکەرەوەی ئەم ئایەتەی دابەزاند کە بریتییە لە:﴿لاَ يُكَلِّفُ اللَّهُ نَفْسًا إِلاَّ وُسْعَهَا﴾ "الوسع"یشی ئاسان کرد بە ئایەتی: ﴿يُرِيدُ اللَّهُ بِكُمُ الْيُسْرَ وَلاَ يُرِيدُ بِكُمُ الْعُسْرَ﴾[٥].

ابن سلامة[٦] دەڵێت: ((ئەهلی تەفسیر لە ماناکەیدا جیاوازیان لە نێواندا هەیە، لە "عائشة"ەوە–خوا لێی رازی بێت– ریوایەتکراوە فەرمووی: خودا لە رۆژی دواییدا هەواڵ بە خەڵکی دەدات لەوەی لە دونیادا ئەنجامیان داوە بە نهێنی و بە ئاشکرا، ئەوەی باوەڕداران شاردوویانەتەوە لێیان خۆشدەبێت و بێباوەڕانیش سزا دەدات)) پاشان دەڵێت: (("ابن مسعود"–خوا لێی رازی بێت– دەفەرموێت: ئەوە بۆ هەموو

---

[١] البقرة/٢٨٤.

[٢] المرجع السابق ص٨٥ وما بعدها.

[٣] سورة البقرة/٢٨٦.

[٤] المرجع السابق ص٣٠.

[٥] سورة البقرة/١٨٥.

[٦] المرجع السابق ص٩٧.

ئەهلی قیبلەیە، لێکۆڵەران دەڵێن: کاتێك ئەم ئایەتە دابەزی موسڵمانان وتیان: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) ناتوانین، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: وەك یەهود مەڵێن: بیستمان و یاخیبووین، بەڵکو بڵێن: بیستمان و گوێڕایەڵبووین، بۆیە ئەم ئایەتە دابەزی:(لاَ يُكَلِّفُ اللّهُ نَفْسًا إِلاَّ وُسْعَهَا).

ابن الجوزی[1] دەڵێت: پوختەی هاتوو لەسەر ئەم ئایەتە:﴿وَإِنْ تُبْدُوا مَا فِي أَنفُسِكُمْ أَوْ تُخْفُوهُ يُحَاسِبْكُمْ بِهِ اللّهُ﴾ دوو قسەیە:

یەکەمیان: بەم ئایەتە نەسخکراوەتەوە:﴿لاَ يُكَلِّفُ اللّهُ نَفْسًا إِلاَّ وُسْعَهَا﴾ لە "ابن مسعود"ەوە نەسخکەرەوەکەی بریتییە لە ئایەتی:﴿لَهَا مَا كَسَبَتْ وَعَلَيْهَا مَا اكْتَسَبَتْ﴾.

قسەی دووەم: ئایەتەکە نەسخ نەکراوەتەوە، پاشان سەرخەرانی ئەم قسەیە بۆ سێ قسە دابەشبوون:

یەکەمیان: جێگیرە بۆ ئەوانەی لێیان دەگیرێت بەگشتی، هەر کەسێکی ویست لێیدەگرێ و هەر کەسێکی ویست لێیخۆشدەبێت، ئەمە لە "ابن عباس"ەوە ریوایەت کراوە.

دووەم: گرتن بەوە روودەدات، بەڵام ماناکەی بریتییە لە پێنیشاندانی کارە خراپەکان بە بەندە.

سێیەم: دادگایی کردنی بەندە بەوە بریتییە لە داباریینی خەم و پەژارە و دڵتەنگی و سزادان و ئازار و مەینەتی پێی لە دونیادا، ئەمە بریتییە لە قسەی "عائشة"-خوا لێی رازی بێت-.

ئەوەی لەم بابەتەدا دەیبینم بریتییە لەم درێژەیە:

هەموو ئەوەی شاراوەیە لە ناخی مرۆڤ و ناوەوەیدا لە یەکێك لەم سێ بارانە دەرناچێت، بەم جۆرە:

---

[1] المرجع السابق ص٩٦ وما بعدها.

یەکەم: سیفەتی غەریزی ژێریارنەبوو بۆ ویستی مرۆڤ جا سیفەتی چاك و پاك بن یان سیفەتی خراپ و ناباش، ئەوانە سیفەتگەلێکن مرۆڤ لەسەریان پرسیاریان لێ ناکرێت و لەسەریان دادگایی ناکرێت، چونکە خودا تەنها بەوە داوا لە مرۆڤ دەکات دەکەوێتە ژێر ویست و توانایەوە، بەپێی ئایەتی: ﴿لاَ يُكَلِّفُ اللّهُ نَفْسًا إِلاَّ وُسْعَهَا﴾.

دووەم: سیفەتی غەریزی ژێربار بۆ ویستی مرۆڤ و هەڵبـژاردنی وەك حەسوودی و خۆپەرستی و لەسنووردەرچوون و رق و کینەی بێجێ و سیفەتەکانی تریش لە سیفەتە ناباشەکان کە لە ژێر دەسەڵات و هەڵبژاردنی مرۆڤدان، گەر بیەوێت دەستیان لێ دەکێشێتەوە، ئەم سیفەتە شاراوە حەشاردراوانە لە ناخی مرۆڤەکاندا مرۆڤ لێیان بەرپرسیارە بە کۆدەنگی زانایان، چونکە پێویستە ناوەوەی مرۆڤی موسڵمان پاك و بێگەرد بێت هەروەك دەرەوەی، ترازوی ئیسلام ئەوەیە تەماشای رووالەتی مرۆڤەکان ناکات، بەڵکو تەماشای دڵیان دەکات، ئەم بەشە ئەوەیە لەم ئایەتەدا بە مەبەستگیراوە: ﴿وَإِنْ تُبْدُوا مَا فِي أَنفُسِكُمْ أَوْ تُخْفُوهُ يُحَاسِبْكُمْ بِهِ اللّهُ﴾.

باری سێیەم: بریتییە لە نییەتی خراپ بۆ ئەنجامدانی یاخیبوون و تاوان، وەك ئەو کەسەی نییەتی دزی هەیە و خۆی بۆ ئامادە دەکات، یان کەسێك نییەتی کوشتنی کەسێکی بێگوناهی هەیە و هۆکارەکانی جێبەجێ کردنی بۆ دەگرێتە بەر، یان کەسێك نییەتی زیناکردن لەگەڵ ئافرەتێك دەهێنێت و پیلانرێژی بۆ دەکات، بەم جۆرە ئەم نییەتە پیس و خراپانە مرۆڤ تەنها لە بارێکدا دادگایی دەکرێت لەسەریان دەستی بە ئەنجامدانی ئەو تاوانە کردبێت کە نییەتی لێهێناوە.

ئەوەی دەکەوێتە ناو دەروونەوە لە مەرامی یاخیبوون(یان تاوان) بەم قۆناغانەدا گوزەر دەکات:

أ. "الهاجس": ئەوەیە دەکەوێتە ناو دەروونەوە و بە کۆدەنگی زانیان و ژیرمەندان مرۆڤی لەسەر ناگیرێت، چونکە لە کرداری بەویستی ئەو نییە، بەڵکو شتێکە رووی لێکردووە بەبێ بوونی توانایەك بۆ رێگری لێکردنی.

ب."الخاطر": ئـەوەش بریتییـە لـە جـاریبوونی ئـەوەی لـە دەروونـدایـە، قۆنـاغی دووەمە لە دوای "الهاجس" بۆیە بە کۆدەنگی لەسەری کەسەکە ناگیرێـت بـە هـەمان هۆ کە باسمان کرد.

ج-قسەی دەروون: ئەوەش ئەوەیە تێیدەکەوێت لە دڵەڕاوکێ ئایا بچێتە پێشـەوە لە تاوانەکە یان نە، ڕێسای گشتی لە شەریعەتی ئیسلامدا سزا نییە بۆ قسەی دەروون لـە تاوانـدا پـێش ئەنجامـدانی، چـونکە پێغەمبـەر(ﷺ) دەفـەرموێت: ((خـودا لـە ئوممەتەکەم بووراوە لەوەی نەفسی قسەی پێ دەکات گەر نەیکات بـە قسـە یـان بـە کردان))[1].

د-"الهم": بریتییە لە پارسەنگدانی مەبەستی کارێك، فەرمودەی سەحیح ڕۆشنی کردۆتەوە "الهم الحسنة" بە چاکە دەنوسرێت و "الهم السیئة" بە خراپە نانوسرێت، تەماشـا دەکرێـت گـەر وازی لێهێنـا چـاکەیەکی بـۆ دەنوسـرێت، گـەر ئـەنجامی دا خراپەیەکی بۆ دەنوسرێت.

هـ-"العزم": ئەمەش بەهێزترە لە "الهم"، لێکۆڵەران لە فەقیهانی شەریعەت لەسەر ئەوەن کەسەکە پێی دەگیرێت بەپێی فەرمودەی پێغەمبەر(ﷺ): ((گەر دوو چەکدار بە شمشـێرەکانیان ڕووبـەڕووی یـەکتر بوونەوە(لـە ریوایەتێکدا بەیـەکتر گەیشـتن) و یەکێکیان ئەویتریانی کوشـت ئـەوا بکـوژ و کـوژراو هـەردوو لـە ئـاگردان، وتـرا: ئەمـە بکوژەکەیە، ئـەی بۆچـی کوژراوەکـە؟ فـەرمووی: ئـەویش دەیویسـت بەرانبەرەکـەی بکوژێت))[2].

و-ئامادەکاری بۆ کارەکـە: ئـەوەش بریتییـە لـە ڕووالـەتی دەرەکـی "العـزم" بـۆ ئەنجامدانی تاوانێك، ئەسڵ لە شەریعەتی ئیسلامدا ئەوەیە لەسەری ناگیرێـت گـەر لـە خـودی خۆیـدا یـاخیبوون نـەبێت، ئـەوکات تـەمبێکردنی بـۆ هەیـە بـا تـاوانی نیێـت

[1] رواه البخاري، نيل الاوطار للشوكاني: ٧/٥٥.

[2] متفق عليه. نيل الاوطار: ٧/٥٢، وفي لفظ البخاري : ئەویش سووربوو لەسـەر کوشـتنی هاوەڵەکەی.

لێهێنراویش ئەنجام نەدرابێت[١].

دوای ئەم لێکۆڵینەوە و بەدواداچوونە لە بابەتەکە بۆمان ڕۆشن دەبێتەوە ئایەتی: ﴿لاَ يُكَلِّفُ اللّهُ نَفْسًا إِلاَّ وُسْعَهَا﴾ تایبەتکەری ئایەتی: ﴿وَإِنْ تُبْدُوا مَا فِي أَنفُسِكُمْ أَوْ تُخْفُوهُ يُحَاسِبْكُمْ بِهِ اللّهُ﴾ وتنی نەسخ لە پێشینی چاکانەوە مەبەستیان تایبەتکردن بووە، هەر کەس مەبەستی شتێکی تر بێت ئەوا تێکەڵی لا دروست بوە لە نێوان نەسخ و تایبەتکردندا، خودا لێیان ببورێت، چونکە بە نیێتی باش ئەوەیان وتووە، ئایەتی یەکەم گشتییە و لە ڕوواڵەتیدا ئاماژە دەکات بە دادگایی کردنی مرۆڤ لەسەر ئەو سیفەتە خراپە بەویست و نەویستانەی لە ناخیدا شاراونەتەوە و ئەو نیێتە ناپاشانەی لە دەروونیدایە با تاوانە نیێت بۆهێنراوەکەش جێبەجێ نەکات.

ئایەتەکەی دووەم ئەم گشتاندنەی تایبەتکردووە و کورتی کردۆتەوە لە سیفەتە خراپەکاندا کە لەگەڵ پێویستبوونی پاکی و بێگەردی ناخی مرۆڤ بەرهەڵستی دەکەن و دەکەونە ژێر ویستی مرۆڤەوە[٢] هەروەها ئەوەی دەیشارێتەوە لەو شتانەی پێویستە دەریان بخات لە شایەتیدانێك پێویست بێت رابگەیەنرێت، چونکە پەیوەستە بە جێگیرکردنی مافێك لە مافە گشتییە یان تایبەتەکانەوە، بۆیە شاردنەوەی شایەتی

---

[١] ينظر المسؤولية الجنائية في الشريعة الاسلامية دراسة مقارنة بالقانون للمؤلف ص٤١-٤٢.

[٢] "الطبرسي (مجمع البيان:٢/٤٠١) دەڵێت: وتراوە ئەم ئایەتە نەسخکراوەتەوە بە ئایەتی: (لاَ يُكَلِّفُ اللّهُ نَفْسًا إِلاَّ وُسْعَهَا) لەوەشدا ریوتیەتێکی لاوازیان گێڕاوەتەوە، ئەمەش دروست نییە چونکە داوایەك لە تواناندا نەبێت گونجا و شیاو نییە ئیتر چۆن نەسخ دەبێتەوە، بەڵکو مەبەست بە ئایەتەکە ئەوەیە ئەمر و نەهی دەیگرنەوە لە بیروباوەڕ و ویستەکان و شتانی تر لەوانەی لە ئێمە شاراونەتەوە، بەڵام ئەوەی ناچێتە ناو داواوە لە وەسوەسە و خایلە و ختوورە و مرۆڤ ناتوانێ خۆیانی لێ بپارێزێت لەوە بەدەرە بە بەڵگە و ئاماژەی ئەقڵ.

سەردەکێشێت بۆ تیابردنی ئەو مافە بە بەڵگەی ئایەتەکەی پێشوو: ﴿وَلاَ تَكْتُمُوا الشَّهَادَةَ وَمَنْ يَكْتُمْهَا فَإِنَّهُ آثِمٌ قَلْبُهُ وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ عَلِيمٌ﴾[1].[2]

له کۆتایی قساندا لەمەڕ نەسخی بانگەشەبۆکراوی ئایەتەکانی سورەتی "البقرة" ئەوەی پێشتر وتم دووبارەی دەکەمەوە: هەموو ئەو ئایەتانەی پێیان وایە نەسخکراو بن بە ئایەتی شمشێر لەم سورەتەدا و له هەموو سورەتەکانی تردا گشتین لەڕووی رەوش و کات و باری جەنگ و ئاشتییەوە، و ئایەتی شمشێر تایبەتکەری ئەو گشتاندنەیە، بۆیە لەو بار و رەوشانە باری دەستدرێژکاری هاوەڵدانەران بۆ سەر ئیسلام و موسڵمانان جیادەکرێتەوە، چونکه لەو کات و بارەدا بەرگری رەوا پێویست دەبێت بەپێی ئایەتی: ﴿فَمَنْ اعْتَدَى عَلَيْكُمْ فَاعْتَدُوا عَلَيْهِ بِمِثْلِ مَا اعْتَدَى عَلَيْكُمْ﴾.

گەر بانگەشەی بانگەشەکەران راست بێت ئەوا پێویست دەکات بوترێت ئیسلام ئایینی جەنگ و کوشتار و خوێنرێژییە لە هەموو بار و رەوش و کاتەکاندا، لەگەڵ ئەوەی ئەم ئاراستەیە هەڵەیەکی گەورەیە و سەرچاوەکەی هەرچییەك بێت لێبوردنی بۆ نییە، چونکه لەسەر ئیجتیهادێکی هەڵە بیناکراوە لەگەڵ واقیعی قورئاندا پێچەوانە دەوەستێتەوە کە بانگ بۆ لێبوردن و ئاشتی و هاوکاری و پەنانەبردن دەکات بۆ بەکارهێنانی هێز مەگەر بۆ بەرگری رەوا لە ئاین و ژیان و نامووس و ماڵ و هەڵگرتنی فیتنە و لادانی فەساد و تێکچوون.

---

[1] سورة البقرة/٢٨٣.

[2] الطبري: ٣/٩٩، الالوسي: ٣/٦٤، القرطبي: ٣/٣٧٦، الرازي: ٧/١٢٦.

# نەسخی بانگەشەبۆکراو لە سورەتی "آل عمران"دا

﴿وَإِنْ تَوَلَّوْا فَإِنَّمَا عَلَيْكَ الْبَلاَغُ﴾ (٢٠)

﴿لاَ يَتَّخِذْ الْمُؤْمِنُونَ الْكَافِرِينَ أَوْلِيَاءَ مِنْ دُونِ الْمُؤْمِنِينَ وَمَنْ يَفْعَلْ ذَلِكَ فَلَيْسَ مِنْ اللَّهِ فِي شَيْءٍ وَيُحَذِّرُكُمْ اللَّهُ نَفْسَهُ وَإِلَى اللَّهِ الْمَصِيرُ﴾ (٢٨)

﴿كَيْفَ يَهْدِي اللَّهُ قَوْمًا كَفَرُوا بَعْدَ إِيمَانِهِمْ وَشَهِدُوا أَنَّ الرَّسُولَ حَقٌّ وَجَاءَهُمْ الْبَيِّنَاتُ وَاللَّهُ لاَ يَهْدِي الْقَوْمَ الظَّالِمِينَ، أُوْلَئِكَ جَزَاؤُهُمْ أَنَّ عَلَيْهِمْ لَعْنَةَ اللَّهِ وَالْمَلاَئِكَةِ وَالنَّاسِ أَجْمَعِينَ، خَالِدِينَ فِيهَا لاَ يُخَفَّفُ عَنْهُمْ الْعَذَابُ وَلاَ هُمْ يُنْظَرُونَ﴾ (٨٦ – ٨٨)

﴿وَلِلَّهِ عَلَى النَّاسِ حِجُّ الْبَيْتِ﴾ (٩٧)

﴿يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِ﴾ (١٠٢)

﴿لَنْ يَضُرُّوكُمْ إِلاَّ أَذًى﴾ (١١١)

﴿وَمَنْ يُرِدْ ثَوَابَ الدُّنْيَا نُؤْتِهِ مِنْهَا وَمَنْ يُرِدْ ثَوَابَ الآخِرَةِ نُؤْتِهِ مِنْهَا﴾ (١٤٥)

﴿وَإِنْ تَصْبِرُوا وَتَتَّقُوا فَإِنَّ ذَلِكَ مِنْ عَزْمِ الأُمُورِ﴾ (١٨٦)

ئایەتی (٢٠): ﴿وَإِنْ تَوَلَّوْا فَإِنَّمَا عَلَيْكَ الْبَلاَغُ﴾ [١]

ابن سلامة[٢] دەڵێت: سورەتی "آل عمران" سورەتێکی مەدەنییە، دە ئایەتی نەسخکراوی تێدایە، ئایەتی یەکەمیان:﴿فَإِنْ أَسْلَمُوا فَقَدْ اهْتَدَوا﴾ ئەمە موحکەمە و نەسخکراو بریتییە لە: ﴿وَإِنْ تَوَلَّوْا فَإِنَّمَا عَلَيْكَ الْبَلاَغُ﴾ ئایەتی شمشێر نەسخی کردۆتەوە.

النحاس[٣] دەڵێت: دوای پشکنینێکی ورد بۆ ئەوەی باسیان کردووە لە "الناسخ والمنسوخ"دا تەنها سێ ئایەتمان لەم سورەتەدا بینییەوە، گەر ئەو بەڵگەیەمان نەبوایە کە کتێبەکە هەموو ئەوەی باسکراوە لەخۆدەگرێت ئەوا قسە تیایدا ئەوە بوو کە نە نەسخکەرە و نە نەسخکراو.

ابن حزم الاندلسی[٤]دەڵێت: ((سورەتی "آل عمران" مەدەنییە و پێنج ئایەتی تێدایە نەسخکراوە، یەکەمیان بریتییە لە:﴿وَإِنْ تَوَلَّوْا فَإِنَّمَا عَلَيْكَ الْبَلاَغُ﴾ نەسخکەرەکەی بریتییە لە:﴿فَاقْتُلُوا الْمُشْرِكِينَ حَيْثُ وَجَدْتُمُوهُمْ﴾ الآية[٥])).

ابن الجوزي[٦] دەڵێت:((ئەو ئایەتانەی بانگەشەی نەسخی بۆ دەکرێت لە سورەتی "آل عمران"دا ئایەتی یەکەم:﴿وَإِنْ تَوَلَّوْا فَإِنَّمَا عَلَيْكَ الْبَلاَغُ﴾.

پاشان دە ئایەت باس دەکات کە پێیانوایە لەم سورەتەدا نەسخکراونەتەوە، پاشان دەڵێت: هەندێ لە ئەهلی تەفسیر پێیانوایە ئەم کەلامە(مەبەستی ئایەتەکەیە)

---

[١] سورة آل عمران/٢٠.

[٢] المرجع السابق ص٩٨.

[٣] المرجع السابق ص٨٧.

[٤] المرجع السابق ص٣٠.

[٥] سورة التوبة/٥.

[٦] المرجع السابق ص ١٠٤.

داوای کورتهـەڵهاتن لەسـەر "تبلیـغ-پێڕاگەیانـدن" دەکـات بـەبێ جـەنگان پاشـان نەسخکراوەتەوە بە ئایەتی شمشێر.

**بەڵگەکانی پووچەڵبوونەوەی بانگەشەی نەسخ:**

١.ئەم بانگەشەیە بیناکراوە لەسەر تێکەڵی نێوان نەسخ و تایبـەتکردن وەك چۆن چـەندین جـار باسمـان کـرد، بۆیـە ئایـەتی(٢٠) گشـتییە و لـە ئاشـکرایدا ئامـاژە بـە نەگونجای دەدات لە پەنابردنی پێغەمبەر(ﷺ) و هاوەڵانی و ئەوانەی بـەدوای ئەوانـدا هاتن بۆ بەکارهێنانی هێز بەرەهایی، هەرچەند لـە بـاری دەسـتدرێژیدا بێـت بـۆ سـەر ئیسلام و موسڵمانان، بەڵام ئەم گشـتاندنە بـە چـەند ئایـەتی تـر تایبـەتکراوە لەوانـە ئایەتی شمشێر کە تایبەتە بە بەرگری رەواوە، لـەو ئایەتانـە:﴿فَمَنْ اعْتَدَى عَلَيْكُمْ فَاعْتَدُوا عَلَيْهِ بِمِثْلِ مَا اعْتَدَى عَلَيْكُمْ﴾.

٢.چەمکی پێچـەوانەی کورتهـەڵهێنان مانـای نـەگونجاوی جـەنگان ناگەیـەنێت لـە هەموو بارەکاندا، بـەڵکو مەبەسـت پێـی ئـەرك و کـاری پێغەمبـەر(ﷺ) لـە گەیانـدنی پەیامەکەیدا بریتییە لە هیدایـەت بـە مانـای ئیرشـاد بـۆ لای حـەق و رۆشـنکردنەوەی رێگە، نەك گەیاندنیان بە ئامانج و داواکراوەکە، چونکە ئەوە دەچێتە ژێـر دەسـەڵاتی خوداوە، وەك دەفەرموێت:﴿إِنَّكَ لاَ تَهْدِي مَنْ أَحْبَبْتَ وَلَكِنَّ اللَّهَ يَهْدِي مَنْ يَشَاءُ وَهُوَ أَعْلَمُ بِالْمُهْتَدِينَ﴾[1].

هیدایەت لە قورئاندا بە دوو مانا هاتووە:

یەکەمیان: ئیرشاد و رێنموونی بۆ سەر رێگەی راست و دروست، ئەمەش لە ئەرکی پێغەمبەران و هەموو ئەو کەسانەیە دەبنە میراتگری ئەوان لە گەیانـدنی ئـەم ئەرکـەدا لە چاکسازان و ئەهلی زانست و بانگخوازانی خێر و چاکە، ئەم ئیرشادەش لـە رێگـەی پێڕاگەیاندنەوەیـە(التبلیغ) هەنـدێ جـار رێگەکـەی لـێ ون دەبێـت و هەنـدێ جـاریش دەگاتە ئامانجی داواکراو.

---

[1] سورة القصص/٥٦.

دووەم: هیدایەت بە مانای گەیاندن بە ئامانجی داواکراو بەوەی هەرگیز ڕێگە بزر نەکات، ئەم جۆرە هیدایەتە دەکەوێتە ژێر ویستی خوداوە بەتەنها وەك دەفەرموێت: ﴿فَإِنَّ اللَّهَ يُضِلُّ مَنْ يَشَاءُ وَيَهْدِي مَنْ يَشَاءُ﴾[1].

وتراوە: پێوەری جیاکاری نێوان دوو ماناکە ئەوەیە فەرمانی داتاشراو لە "الهداية" گەر تێپەڕی بۆ سەر بەرکاری دووەم بە "حرف الجر" بە مانای ئیرشاد و نیشاندانی ڕێگەیە، وەك لە ئایەتی: ﴿إِنَّ هَذَا الْقُرْآنَ يَهْدِي لِلَّتِي هِيَ أَقْوَمُ﴾[2]، واتە خەڵکی هیدایەت دەدات بۆ سەر ڕاستترین ڕێگە لە ڕاستی و دروستی.

بەڵام گەر فەرمانەکە بەبێ "حرف الجر" تێپەڕی بۆ سەر بەرکاری دووەم ئەوا بە مانای گەیاندنە بە ئامانجی داواکراو، ئەمە ئەوەیە هەندێك دەیڵێن.

بەڵام لە دیدی منەوە هەر فەرمانێکی داتاشراو لە وشەی "الهداية" گەر بدرێتە پاڵ خودا بە مانای گەیاندنە بە ئامانجی داواکراو، گەر بدرێتە پاڵ کەسێکی تر جگە لە خودا لە پێغەمبەران و کەسانی تر بە مانای ئیرشاد و گەیاندن(تبليغ) و نیشاندانی ڕێگەیە، بە مانای گەیاندن بە ئامانجی داواکراو ئایەتی: ﴿إِنَّكَ لاَ تَهْدِي مَنْ أَحْبَبْتَ وَلَكِنَّ اللَّهَ يَهْدِي مَنْ يَشَاءُ﴾.

ئەو پێوەرەی پێشوو هەڵدەوەشێتەوە بەو ئایەتەی تیایدا خودا بە ئیبراهیم –عليه السلام– دەفەرموێت: ﴿يَاأَبَتِ إِنِّي قَدْ جَاءَنِي مِنْ الْعِلْمِ مَا لَمْ يَأْتِكَ فَاتَّبِعْنِي أَهْدِكَ صِرَاطًا سَوِيًّا﴾[3]

فەرمانەکە تێپەڕیوە بۆ سەر دوو بەرکار بەبێ بوونی "حرف جر"، لە کاتێکدا بە مانای ئیرشاد و گەیاندن(تبليغ) و نیشاندانی ڕێگەیە بەبێ گەیاندن[4] بە ئامانجی داواکراو چونکە ئەوەیان دەکەوێتە ژێر دەسەڵاتی خوداوە.

---

[1] سورة فاطر/٨.

[2] سورة الاسراء/٩.

(٣) سورة مريم/٤٣.

[4] من أنصار عدم النسخ: الطبري: ١٤٤/١ والرازي: ١٦٠/٧.

- ئایەتی(٢٨): ﴿إِلاَّ أَن تَتَّقُواْ مِنْهُمْ تُقَاةً﴾ لە ئایەتی:﴿لاَّ يَتَّخِذِ الْمُؤْمِنُونَ الْكَافِرِينَ أَوْلِيَاءَ مِن دُونِ الْمُؤْمِنِينَ وَمَن يَفْعَلْ ذَلِكَ فَلَيْسَ مِنَ اللَّهِ فِي شَيْءٍ وَيُحَذِّرُكُمُ اللَّهُ نَفْسَهُ وَإِلَى اللَّهِ الْمَصِيرُ﴾ [1]

ابن سلامە[2] دەڵێت: ئایەتی دووەم کە بریتییە لە:﴿لاَّ يَتَّخِذِ الْمُؤْمِنُونَ الْكَافِرِينَ أَوْلِيَاءَ مِن دُونِ الْمُؤْمِنِينَ﴾ ئەمە موحکەمە و نەسخکراو تەنها ئەم بەشەی ئایەتەکەیە:﴿إِلاَّ أَن تَتَّقُوا مِنْهُمْ تُقَاةً﴾.

ئایەتی شمشێر ئەو بەشەی نەسخکردۆتەوە بەبێ ئەوەی هیچ جۆرە بەرهەڵستییەك لە نێوان دوو ئایەتەکەدا ڕۆشن بکاتەوە یان مانای بەمەبەستگیراو لەم بەشەی ئایەتەکەدا﴿إِلاَّ أَن تَتَّقُوا مِنْهُمْ تُقَاةً﴾ ڕۆشن بکاتەوە، وەك ئەوەی نەسخ لە قورئاندا کردەیەکی ئیجتیهادی بێت، یان کردەیەکی چۆناندن بێت، گەر ویستی حوکم بکات بە نەسخی ئایەتەکە و هەرکاتیش ویستی بیهێڵێتەوە و بە موحکەمی دابنێت، ئەگەریش ویستی پارچە پارچەی بکات و پارچەیەکی بکات بە موحکەم و پارچەیەکی تری بە نەسخکراو.

ئەم شێوازە بریتییە شێوازی "ابن الجوزي" لە هەموو ئەو ئایەتانەدا حوکمی نەسخی بەسەردا داون و دەستی نەبردووە بۆ هۆی نەسخبوونەوەیان نە لە دوور و نە لە نزیك، کەمێکی زۆر کەم نەبێت، بۆیە کتێبەکەی "نواسخ القرآن" پێویستە شانی لەسەر دانەدرێت، چونکە پلە و پایەی قورئانی مەزنی شێواندووە کە بنچینەیەکی سەرەکییە لە شەریعەتی ئیسلامدا هەرچەند نییەتی چاك و پاك بووە.

لەم ئایەتەدا دوور و نزیك فەرمان بە دەستدرێژیکردن بۆ سەر ناموسڵمانەکان بوونی نییە تەنها لەبەر ئەوەی ئەوان ناموسڵمانن، بەڵکو دەستدرێژی سنووردارکراوە لە چوارچێوەی ئایەتی: ﴿فَمَنِ اعْتَدَى عَلَيْكُمْ فَاعْتَدُوا عَلَيْهِ بِمِثْلِ مَا اعْتَدَى عَلَيْكُمْ﴾، بەڵکو مەبەست لەو ئایەتە باسکراوەدا بریتییە لە نەهیکردن لە کردنی

---

[1] سورة آل عمران/٢٨.

[2] المرجع السابق ص٩٩

بێباوەڕان بە سەرخەر بۆ خۆیان لەلایەن باوەڕدارانەوە و هاوکاری لەگەڵیان دژ بە بەرژەوەندی ئیسلام و موسڵمانان، ئەم هاوکارییە حەرامە تەنانەت لەگەڵ موسڵمانانیش بەپێی ئایەتی: ﴿وَلاَ تَعَاوَنُوا عَلَى الإِثْمِ وَالْعُدْوَانِ﴾.

ئەو هەڵواردەی لەم ئایەتەدا هاتووە: ﴿إِلاَّ أَنْ تَتَّقُوا مِنْهُمْ تُقَاةً﴾ هەمان مانای ئایەتی: ﴿إِلاَّ مَنْ أُكْرِهَ وَقَلْبُهُ مُطْمَئِنٌّ بِالإِيمَانِ﴾[1]ی هەیە، لە باری زەرورەتدا گونجاوە زیانی گەورەتر بە زیانی بچووکتر لابدرێت، ئەوەش لە سنووری زەرورەتدا، چونکە زەرورەت بە ئەندازەی خۆی ئەندازەگیری بۆ دەکرێت[2]، دەگونجی بە پێچەوانەی راستییەوە وانیشانبدات لە باری زەرورەتدایە و سنووری زەروورەتی تێنەپەڕاندووە، بەڵام ناگونجێت بێدەنگبوون لە دەستدرێژکاری لەباری بۆ گونجاندا، بۆیە بەرهەڵستی لە نێوان ئەم ئایەتە و ئایەتی شمشێردا بوونی نییە[3]

– ئایەتەکانی(٨٦–٨٨)﴿كَيْفَ يَهْدِي اللَّهُ قَوْمًا كَفَرُوا بَعْدَ إِيمَانِهِمْ وَشَهِدُوا أَنَّ الرَّسُولَ حَقٌّ وَجَاءَهُمُ الْبَيِّنَاتُ وَاللَّهُ لاَ يَهْدِي الْقَوْمَ الظَّالِمِينَ﴾[4] ﴿أُولَئِكَ جَزَاؤُهُمْ أَنَّ عَلَيْهِمْ لَعْنَةَ اللَّهِ وَالْمَلاَئِكَةِ وَالنَّاسِ أَجْمَعِينَ، خَالِدِينَ فِيهَا لاَ يُخَفَّفُ عَنْهُمُ الْعَذَابُ وَلاَ هُمْ يُنْظَرُونَ﴾[5]

هەندێ پێیان وایە[6] ئەم سێ ئایەتە نەسخکراوەتەوە بەو هەڵواردنەی تیایدا هاتووە: ﴿إِلاَّ الَّذِينَ تَابُوا مِنْ بَعْدِ ذَلِكَ وَأَصْلَحُوا فَإِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَحِيمٌ﴾[7].

---

[1] سورة النمل/١٠٦.

[2] ينظر: الطبري: ١٥٢/٣ والطبرسي: ٤٢٩/٢ وتفسير ابن عطية: ٧٤/٣ والكشاف للزمخشري: ٤٢٢/١ والرازي: ١٤/٨.

[3] لە سەرخەرانی نەبوونی نەسخ: الرازي: ١٥/٨ والطبري: ١٥٤/٣.

[4] سورة آل عمران/٨٦.

[5] سورة آل عمران/٨٨.

[6] ابن حزم: الناسخ والمنسوخ في القرآن الكريم ص٣١،ابن سلامة ص٩٩،ابن الجوزي ص١٠٥.

[7] سورة آل عمران/٨٩.

ئەم بۆچوونە پووچ و بێبنەمایە، چونکە تێکەڵییە لە نێوان نەسخ و تایبەتکردنی گشتاندنی ئایەتەکانی پێشوو بەو هەڵواردنە.

ئەوەی نامۆیە ئەوەیە لە بانگەشەکەرانی نەسخکردنەوەکە "ابن حزم الأندلسي"ە ئەو لە کتێبەکەیدا: "الناسخ والمنسوخ في القرآن"دا/ (ص(٨))دا دەڵێت: ((هەڵواردن نەسخ نییە، هەندێ کەس هەڵواردن و تایبەتکردن بە نەسخ ناودەبەن)) پاشان لە (ص٣١)دا دەڵێت: ((ئەم ئایەتانە لەسەر شەش دەستە دابەزی کە لە ئیسلام پاشگەزبوونەوە دوای ئەوەی ئیمانیان لە رووالەتدا نیشاندا پاشان یەکێك لەو شەش دەستەیە کە بریتی بوو لە "سوید بن الصامت- هەڵواردەکرا و فەرمووی: ﴿إِلاَّ الَّذِينَ تَابُوا مِنْ بَعْدِ ذَلِكَ وَأَصْلَحُوا﴾ ئەم ئایەتە نەسخکەرە بۆی))

ئەوەی رۆشنە ئەوەیە هەڵواردن بریتییە لە رۆشنکردنەوەی گشتاندنێك بە مەبەست نەگیراوە، نەسخیش سڕینەوەی حوکمێکە بە مەبەستگیراوە، ئیتر چۆن لە نێوان ئەو دوانەدا تێکەڵی دروست دەبێت؟[1]

-ئایەتی(٩٧):﴿وَلِلَّهِ عَلَى النَّاسِ حِجُّ الْبَيْتِ﴾ [2]

پێیانوایە[3] لە هەمان ئایەتدا بەم بەشە نەسخکراوەتەوە:﴿مَنِ اسْتَطَاعَ إِلَيْهِ سَبِيلاً﴾ لەوانەیە ئەوانەی قسە لە نەسخی ئایەتەکە دەکەن مەبەستیان مانای گشتی گشتگیر بوویێت بۆ تایبەتکردنی گشتاندنەکە، ئەگینا گەر مەبەستیان پێی مانا ئوسولییەکەی بێت ئەوا جێگەی قبووڵ نییە، چونکە وشەی (من) بەدەلە لە جێگەی وشەی "الناس"، لە جۆری بەدەلی "البعض من الکل" بۆیە لە رێگەکانی تایبەتکردنە بە بەڵگە پەیوەستەکان.

ابن الجوزي دەڵێت:(("السدي" دەڵێت: ئەم کەلامە حەج لەسەر هەموو کەسێك، دەوڵەمەند و هەژار، توانادار و بێتوانا و دەستەوسان پێویست دەکات، پاشان لە پای

---

[1] من انصار عدم النسخ: الرازي: ١٢٦/٨.

[2] سورة آل عمران/٩٧.

[3] لە بانگەشەکەرانی نەسخی ئایەتەکە: السدي وابن سلامة الناسخ والمنسوخ: ص١٠٠.

بێ توانایان نەسخکرایەوە بە ئەم بەشەی ئایەتەکە: ﴿مَنْ اسْتَطَاعَ إِلَيْهِ سَبِيلاً﴾ دەڵێم ئەمە قسەیەکی ورد نییە، پێشخستنی رایەکە شان دانادات لەسەر زانینی زمانی عەرەبی کە قورئانی پێ دابەزیوە لەمەڕ بڕیاردان لە نەسخی قورئان))[1][2].

–ئایەتی(١٠٢):﴿يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِ﴾[3]

لە "ابن مسعود"ەوە –خوا لێی رازی بێت– لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا فەرموویەتی: (گوێڕایەڵی لێ بکرێت و لێی یاخی نەبن، یادی بکرێت و لەبیر نەکرێت، شوکری بکرێت کوفری پێ نەکرێت)[4].

ابن سلامة[5] دەڵێت: ((کاتێك دابەزی تەئویلەکەیان نەزانی تا پرسیاریان لە پێغەمبەر(ﷺ) کرد و وتیان "حق تقاته" چییە؟ فەرمووی: گوێڕایەڵی لێ بکرێت و لێی یاخی نەبن، یادی بکرێت و لەبیر نەکرێت، شوکری بکرێت کوفری پێ نەکرێت[6] دابەزینی لەسەر شانیان گران بوو، وتیان ناتوانین، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (وەك یەهودیەکان مەبن، بەڵکو بڵێن: بیستمان و گوێڕایەڵ بووین) پاشان ئەم ئایەتە دابەزی:﴿وَجَاهِدُوا فِي اللَّهِ حَقَّ جِهَادِهِ﴾[7] ئەمەش لەوەی یەکەم زۆر گەورەتر بوو لەسەریان تا خودا ئەوەی ئاسان کرد و ئەمەی دابەزاند:﴿فَاتَّقُوا اللَّهَ مَا اسْتَطَعْتُمْ﴾[8] بۆیە بوو بە نەسخکەرەوەی ئەوی پێش خۆی.

دەستەیەك لەسەر نەسخی ئایەتەکەن[9].

---

[1] الناسخ والمنسوخ لابن الجوزي ص١٠٦.

[2] لە سەرخەرانی نەسخ نەبوونەوە: الرازي: ٢٤٥/١٠، والالوسي: ١١٧/٥.

[3] سورة آل عمران/١٠٢ تەواوکاری ئایەتەکە: (ولا تموتن إلا وأنتم مؤمنون).

[4] ابو جعفر النحاس: الناسخ والمنسوخ ص٨٨.

[5] المرجع السابق ص١٠٠.

[6] نقله الطبري: ٢٨/٤ عن عبد الله بن مسعود.

[7] سورة الحج/٧٨.

[8] سورة التغابن/١٦.

[9] لەوانە: محمد بن كعب. ابن الجوزي:١٠٨ وابن حزم الاندلسي:٣١ هەروەها لەوانە: قتادة، الطبري:٣٠/٤.

بانگەشەی نەسخ پووچ و بێ بنەمایە بەم بەڵگانە:

١. هەر ئەمرێك لە قورئاندا هاتووە و تیایدا داوا لە مرۆڤ کراوە بە کارێك هەڵبستێ ئەوا گشتاندنەکەی تایبەتکراوە بە ئایەتی: ﴿لاَ يُكَلِّفُ اللّهُ نَفْسًا إِلاَّ وُسْعَهَا﴾. وتنی نەسخ تێکەڵییە لە نێوان نەسخ و تایبەتکردندا گەر مەبەست پێی مانا گشتییەکە نەبێت لای پێشینی چاکان.
٢. ئەوەی لە "معاذ"ەوە ریوایەت کراوە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ئایا دەزانی مافی خودا لەسەر بەندەکان چییە؟ وتی: خودا و پێغەمبەر زاناترن، فەرمووی: ئەوەیە بیپەرستن و هیچ هاوەڵێکی بۆ بڕیار نەدەن، ئەمەش ناکرێت نەسخ بووبێتەوە.
٣. مانای:(اتَّقُوا اللّهَ حَقَّ تُقَاتِهِ) واتە: وەك وەك ئەوەی شایستەیەتی تەقوای بکرێت، ئەوەش بە دوورکەوتنەوە لە هەموو یاخیبوونەکان، نموونەی ئەمە گونجاو نییە نەسخ بووبێتەوە، چونکە موباحکردنی هەندێ یاخیبوونە.
٤. دروست نییە(حَقَّ تُقَاتِهِ) تەفسیر بکرێت بەوەی ناتوانرێت شان بدرێتە ژێری لە تەقوا، چونکە خودا—سبحانە— بەڵێنی داوە داوایەك لە نەفسێك نەکات بەپێی توانای خۆی نەبێت، "الوسع" جیاوازە لە "الطاقة"[1].

ابن الجوزي[2] دەڵێت:(("ابن عقيل" دەڵێت: نەسخنەکراوەتەوە، ئەم بەشەی ئایەتەکە:﴿مَا اسْتَطَعْتُم﴾ ڕۆشنکردنەوەیە بۆ "حق تقاته" چونکە ئەوە لە توانینی مرۆڤدایە، بۆیە هەر کەس ڕۆشنکردنەوەی قورئان ناوبنێت نەسخ بەهەڵەداچووە[3].

---

[1] ينظر: تفسير الرازي: ٤/١٧٦.

[2] المرجع السابق ص١٠٩.

[3] لە سەرخەرانی نەسخ نەبوونەوە: الطبري (٤/٢٠) والالوسي (٤/١٠٢) والرازي (٨/١٦١) والقرطبي (٤/١٧٧). نەسخ نەبوونەوەی پارسەنگ کردووە بەهۆی توانینی کۆکردنەوە لە نێوان ئەم ئایەتە و ئایەتی: (فَاتَّقُوا اللّهَ مَا اسْتَطَعْتُمْ) بەوەی ئەوەی دواییان ڕۆشنکردنەوەی ئەوەی یەکەمیانە نەك نەسخکەرەوە بێت بۆی، بۆیە

-ئایەتی(١١١):﴿لَنْ يَضُرُّوكُمْ إلاَّ أذًى﴾[1].

واتە: زیانێك نەماوەتەوە بیانەوێت بە جەستەتانی بگەیەنن، یان دەفەرموێت: تەنها شتێکی ئاسانە و خێرا تیادەچێت و لەسەری پاداشت وەردەگرن.

هەندێ پێیانوایە[2] ئەم ئایەتە نەسخکراوەتەوە بەم ئایەتە:﴿قَاتِلُوا الَّذِينَ لاَ يُؤْمِنُونَ بِاللهِ وَلاَ بِالْيَوْمِ الآخِرِ﴾[3].

بانگەشەی نەسخ پووچ و بێبنەمایە بەم بەڵگانە:

١. نەبوونی هیچ بەرهەڵستییەك لە نێوان دوو ئایەتەکەدا، ئایەتی دووەم حوکمەکەی تایبەتە بە باری دەستدرێژی بۆ سەر موسڵمانان و بەرپەرچدانەوەی دەستدرێژییەکە، یەکەمیان رۆشنکردنەوەی شاندانەژێر هەندێ ئازارە لە کەسانی ترەوە که ئاگاتە پلەی هەڕەشە بۆ سەر ئایین و ژیان و نامووس و ماڵ و سامان، ئەمەش پێویستە لە ئاکاری هەموو مرۆڤێکی موسڵمان و ناموسڵماندا بوونی هەبێت، چونکە ئەسڵ بریتییە لە ئاشتی و جەنگ هەڵواردەیە.

٢. ئایەتی یەکەم لە هەواڵەکانە، هەواڵەکانیش ناچنە ژێر نەسخەوە[4].

---

ماناکەی: لە خودا بترسن بە حەقی ترساندن هەتا دەتوانن، دەڵێت ئەمە دروسترینیانە.

[1] سورة آل عمران/١١١.

[2] لەوانە "السدی" دەڵێت: ئاماژە بۆ ئەهلی کیتابە بەر لەوەی فەرمان بە جەنگان بکرێت لەگەڵیان، هەروەها لەوانە: ابن سلامة ص١٠١.

[3] سورة التوبة/٢٩.

[4] لە سەرچاوەکانی نەسخ نەبوونەوە: الصاوي: ١/١٧٣ والرازي: ٨/١٨١.

-ئایەتی(١٤٥):﴿وَمَنْ يُرِدْ ثَوَابَ الدُّنْيَا نُؤْتِهِ مِنْهَا وَمَنْ يُرِدْ ثَوَابَ الآخِرَةِ نُؤْتِهِ مِنْهَا﴾[١]

هەندێ پێیانوایە[٢] نەسخکراوەتەوە بە ئایەتی:﴿مَنْ كَانَ يُرِيدُ الْعَاجِلَةَ عَجَّلْنَا لَهُ فِيهَا مَا نَشَاءُ لِمَنْ نُرِيدُ﴾[٣].

بانگەشەی نەسخ پووچ و بێبنەمایە بەم بەڵگانە:

١. ئایەتەکە لە هەواڵەکانە و هەواڵیش نەسخ قبوول ناکات، چونکە درۆی نەسخکراوەکە پێویست دەکات، ئەمەش لەڕووی شەرعەوە محاڵە، پێویست بۆ محاڵیش محاڵە.

٢. گەر تەنها بۆ گفتوگۆ خۆمان رادەستی ئەوە بکەین لە هەواڵدا نەسخ دروستە، ئەوا نەسخ بە بوونی بەرهەڵستکاری راستدەبێتەوە، بەڵکو بە بوونی دژیەکی، هیچ جۆرە بەرهەڵستکارییەك لە نێوان دوو ئایەتەکەدا بوونی نییە، چونکە ناوەرۆکی ئایەتی یەکەم ئەوەیە هەر کەسێك لە دونیادا بەشێکی بڕاوە و دیاریکراوی تایبەت بە خۆی هەیە، ئەوەی بۆی دابەشکراوە لەدەستی ناچێت، هەر کەس ویست و خەم و پەژارەی پاداشتی دونیایە ئەوا لە دونیادا لەو بەشەی بۆی بڕابوویەوە خودا بەشی دەدات، ئەوەش ئەوەیە خودا دەیەوێت، هەرئەوەش مانای ئەم ئایەتەیە:﴿عَجَّلْنَا لَهُ فِيهَا مَا نَشَاءُ لِمَنْ نُرِيدُ﴾ نەیفەرموو ئەو چەندەی بیەوێت پێی دەدات[٤][٥].

---

[١] سورة آل عمران/١٤٥.

[٢] لەوانە: السدي، ابن الجوزي ص١١٠.

[٣] سورة الاسراء: ١٨.

[٤] ابن الجوزي: ١١٠.

[٥] لە سەرخەرانی نەسخ نەبوونەوە: الرازی: ٢٢/٩.

-ئایەتی(١٨٦):﴿وَإِنْ تَصْبِرُوا وَتَتَّقُوا فَإِنَّ ذَلِكَ مِنْ عَزْمِ الأُمُورِ﴾[١]
هەندێ پێیان وایە نەسخکراوەتەوە بە ئایەتی شمشێر[٢] هەندێکیش لایان وایە نەسخکراوەتەوە بە ئایەتی:﴿قَاتِلُوا الَّذِينَ لاَ يُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَلاَ بِالْيَوْمِ الآخِرِ﴾[٣].
هەردوو بۆچوونەکە پووچ و بێبنەمان بەم بەڵگانە:

١. لە گرنگترین سیفەتەکانی باوەڕدار ئەوەیە بە سیفەتی ئارامگرتن و خۆپارێزی(الصبر والتقوى) خۆی برازێنێتەوە، گەر ئەو دوانە بسڕێنەوە دوو سیفەتی ناباش جێگەیان دەگرنەوە، ئەو دوانەش بریتین لە سکاڵا لە ئازاری بەڵا لەگەڵ یاخیبوون، سەرەڕۆیی دژ بە حیلمە و سکاڵا دژ بە ئارامگرتن و یاخیبوونیش دژ بە تەقوا.
٢. نەبوونی هیچ بەرهەڵستکارییەك لە نێوان ئارامگرتن و بەرپەرچدانەوەی دوژمنکاری بۆ هەر کەسێك رووبەڕووی ببێتەوە چونکە لایدەبات لەسەر خۆی با بە کوشتنیش بێت[٤].

---

[١] سورة آل عمران/١٨٦.
[٢] ئایەتی پێنجەم لە سورەتی "التوبە"، "ابن الجوزي" ئەم بانگەشەی گواستۆتەوە: ف ص١١٠.
[٣] سورة التوبة/٢٩.
[٤] لە سەرخەرانی نەسخ نەبوونەوە: الرازي: ١٢٨/٩، الصاوي: ١٩٥/١.

# نەسخی بانگەشەبۆکراو لە سورەتی "النساء"

﴿وَمَنْ كَانَ غَنِيًّا فَلْيَسْتَعْفِفْ وَمَنْ كَانَ فَقِيرًا فَلْيَأْكُلْ بِالْمَعْرُوفِ﴾ (٦)

﴿لِلرِّجَالِ نَصِيبٌ مِمَّا تَرَكَ الْوَالِدَانِ وَالأَقْرَبُونَ وَلِلنِّسَاءِ نَصِيبٌ مِمَّا تَرَكَ الْوَالِدَانِ وَالأَقْرَبُونَ مِمَّا قَلَّ مِنْهُ أَوْ كَثُرَ نَصِيبًا مَفْرُوضًا﴾ (٧)

﴿وَإِذَا حَضَرَ الْقِسْمَةَ أُوْلُوا الْقُرْبَى وَالْيَتَامَى وَالْمَسَاكِينُ فَارْزُقُوهُمْ مِنْهُ وَقُولُوا لَهُمْ قَوْلاً مَعْرُوفًا﴾ (٨)

﴿وَاللاَّتِي يَأْتِينَ الْفَاحِشَةَ مِنْ نِسَائِكُمْ فَاسْتَشْهِدُوا عَلَيْهِنَّ أَرْبَعَةً مِنْكُمْ فَإِنْ شَهِدُوا فَأَمْسِكُوهُنَّ فِي الْبُيُوتِ حَتَّى يَتَوَفَّاهُنَّ الْمَوْتُ أَوْ يَجْعَلَ اللَّهُ لَهُنَّ سَبِيلاً، وَاللَّذَانِ يَأْتِيَانِهَا مِنْكُمْ فَآذُوهُمَا فَإِنْ تَابَا وَأَصْلَحَا فَأَعْرِضُوا عَنْهُمَا إِنَّ اللَّهَ كَانَ تَوَّابًا رَحِيمًا﴾ (١٥ و١٦)

﴿وَلاَ تَنكِحُوا مَا نَكَحَ آبَاؤُكُمْ مِنَ النِّسَاءِ إِلاَّ مَا قَدْ سَلَفَ﴾ (٢٢)

﴿وَأَنْ تَجْمَعُوا بَيْنَ الأُخْتَيْنِ﴾ (٢٣)

﴿فَمَا اسْتَمْتَعْتُمْ بِهِ مِنْهُنَّ فَآتُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ فَرِيضَةً﴾ (٢٤)

﴿يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لاَ تَأْكُلُوا أَمْوَالَكُمْ بَيْنَكُمْ بِالْبَاطِلِ﴾ (٢٩)

﴿وَلِكُلٍّ جَعَلْنَا مَوَالِيَ مِمَّا تَرَكَ الْوَالِدَانِ وَالأَقْرَبُونَ وَالَّذِينَ عَقَدَتْ أَيْمَانُكُمْ فَآتُوهُمْ نَصِيبَهُمْ إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ شَهِيدًا﴾ (٣٣)

﴿يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لاَ تَقْرَبُوا الصَّلاَةَ وَأَنْتُمْ سُكَارَى﴾ (٤٣)

﴿أُوْلَئِكَ الَّذِينَ يَعْلَمُ اللَّهُ مَا فِي قُلُوبِهِمْ فَأَعْرِضْ عَنْهُمْ وَعِظْهُمْ وَقُلْ لَهُمْ (٦٣)

في أنفسهمْ قَوْلاً بَليغًا﴾

﴿ولَوْ أنَّهُمْ إِذْ ظَلَمُوا أنفُسَهُمْ جَاءُوكَ فَاسْتَغْفَرُوا اللَّهَ وَاسْتَغْفَرَ لَهُمْ الرَّسُولُ لَوَجَدُوا اللَّهَ تَوَّابًا رَحِيمًا﴾ (٦٤)

﴿يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا خُذُوا حِذْرَكُمْ فَانفرُوا ثُبَاتٍ أَوْ انفرُوا جَمِيعًا﴾ (٧١)

﴿مَنْ يُطِعْ الرَّسُولَ فَقَدْ أَطَاعَ اللَّهَ وَمَنْ تَوَلَّى فَمَا أَرْسَلْنَاكَ عَلَيْهِمْ حَفِيظًا﴾ (٨٠)

﴿فَأَعْرِضْ عَنْهُمْ وَتَوَكَّلْ عَلَى اللَّهِ وَكَفَى بِاللَّهِ وَكِيلاً﴾ (٨١)

﴿فَقَاتِلْ فِي سَبِيلِ اللَّهِ لاَ تُكَلَّفُ إِلاَّ نَفْسَكَ وَحَرِّضْ الْمُؤْمِنِينَ عَسَى اللَّهُ أَنْ يَكُفَّ بَأْسَ الَّذِينَ كَفَرُوا وَاللَّهُ أَشَدُّ بَأْسًا وَأَشَدُّ تَنكِيلاً﴾ (٨٤)

﴿إِلاَّ الَّذِينَ يَصِلُونَ إِلَى قَوْمٍ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَهُمْ مِيثَاقٌ أَوْ جَاءُوكُمْ حَصِرَتْ صُدُورُهُمْ أَنْ يُقَاتِلُوكُمْ أَوْ يُقَاتِلُوا قَوْمَهُمْ وَلَوْ شَاءَ اللَّهُ لَسَلَّطَهُمْ عَلَيْكُمْ فَلَقَاتَلُوكُمْ فَإِنْ اعْتَزَلُوكُمْ فَلَمْ يُقَاتِلُوكُمْ وَأَلْقَوْا إِلَيْكُمْ السَّلَمَ فَمَا جَعَلَ اللَّهُ لَكُمْ عَلَيْهِمْ سَبِيلاً﴾ (٩٠)

﴿سَتَجِدُونَ آخَرِينَ يُرِيدُونَ أَنْ يَأْمَنُوكُمْ وَيَأْمَنُوا قَوْمَهُمْ كُلَّمَا رُدُّوا إِلَى الْفِتْنَةِ أُرْكِسُوا فِيهَا فَإِنْ لَمْ يَعْتَزِلُوكُمْ وَيُلْقُوا إِلَيْكُمْ السَّلَمَ وَيَكُفُّوا أَيْدِيَهُمْ فَخُذُوهُمْ وَاقْتُلُوهُمْ حَيْثُ ثَقِفْتُمُوهُمْ وَأُوْلَئِكُمْ جَعَلْنَا لَكُمْ عَلَيْهِمْ سُلْطَانًا مُبِينًا﴾ (٩١)

﴿وَإِنْ كَانَ مِنْ قَوْمٍ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَهُمْ مِيثَاقٌ فَدِيَةٌ مُسَلَّمَةٌ إِلَى أَهْلِهِ﴾ (٩٢)

﴿وَمَنْ يَقْتُلْ مُؤْمِنًا مُتَعَمِّدًا فَجَزَاؤُهُ جَهَنَّمُ خَالِدًا فِيهَا وَغَضِبَ اللَّهُ عَلَيْهِ وَلَعَنَهُ وَأَعَدَّ لَهُ عَذَابًا عَظِيمًا﴾ (٩٣)

﴿إِنَّ الْمُنَافِقِينَ فِي الدَّرْكِ الأَسْفَلِ مِنْ النَّارِ وَلَنْ تَجِدَ لَهُمْ نَصِيرًا﴾ (١٤٥)

-ئایەتی(٦):﴿وَمَنْ كَانَ غَنِيًّا فَلْيَسْتَعْفِفْ وَمَنْ كَانَ فَقِيرًا فَلْيَأْكُلْ بِالْمَعْرُوفِ﴾[١]

هەندێك پێیان وایە ئەم بەشەی ئایەتەكە نەسخكراوەتەوە، لەمەڕ نەسخكەرەوەكەی جیاوازی كەوتۆتە نێوانیانەوە، هەندێكیان دەڵێن نەسخكەرەوەكەی بریتییە لە:﴿لاَ تَأْكُلُوا أَمْوَالَكُمْ بَيْنَكُمْ بِالْبَاطِلِ﴾[٢] ئەم قسەیە دراوەتە پاڵ "ابن عباس"[٣].

هەیانە دەڵێ نەسخكەرەوەكەی بریتییە لە:﴿إِنَّ الَّذِينَ يَأْكُلُونَ أَمْوَالَ الْيَتَامَى ظُلْمًا إِنَّمَا يَأْكُلُونَ فِي بُطُونِهِمْ نَارًا وَسَيَصْلَوْنَ سَعِيرًا﴾[٤] ئەم قسەش دیسان دراوەتە پاڵ "ابن عباس"[٥].

تەواوكەری ئایەتەكە كە پێیانوایە نەسخكەی تێدایە:﴿وَابْتَلُوا[٦] الْيَتَامَى[٧] حَتَّى إِذَا بَلَغُوا النِّكَاحَ[٨] فَإِنْ آنَسْتُمْ مِنْهُمْ رُشْدًا[٩] فَادْفَعُوا إِلَيْهِمْ[١٠] أَمْوَالَهُمْ وَلاَ تَأْكُلُوهَا إِسْرَافًا

---

(١) سورة النساء/٦.

(٢) سورة البقرة/١٨٨.

(٣) ابن الجوزي ص١١٣.

(٤) سورة النساء/١٠.

(٥) ابن الجوزي: المرجع السابق ص١١٤.

(٦) واتە تاقیانبكەنەوە

(٧) هەتیو ئەو كەسەیە باوكی نییە و نەگەیشتۆتە تەمەنی باڵغبوون

(٨) واتە بە باڵغبوون شایستەی هاوسەرگیری بوون.

(٩) واتە پێگەیشتن و شایستەبوون لە ئایین و ماڵ و دارایییان.

(١٠) گوتارەكە ڕوو بە سەرپەرشتیارانی ناكانانە.

وَبِدَارًا أَنْ يَكْبَرُوا وَمَنْ كَانَ غَنِيًّا فَلْيَسْتَعْفِفْ وَمَنْ[1] كَانَ فَقِيرًا فَلْيَأْكُلْ بِالْمَعْرُوفِ[2] فَإِذَا دَفَعْتُمْ إِلَيْهِمْ أَمْوَالَهُمْ فَأَشْهِدُوا عَلَيْهِمْ وَكَفَى بِاللَّهِ حَسِيبًا﴾[3].

ئەهلی تەفسیر لە مەبەستی ئەم ئایەتە بۆ چوار بۆچوون دابەش بوون[4]:

أ.هەیانە دەڵێت: سەرپەرشتیار لە ماڵی ناکامان قەرز دەکات، گەر دەرووی لێکرایەوە بەوەی ماڵ و سامانی بۆ پەیدا بوو با ئەوەی قەرزی کردووە بیگێڕێتەوە ئەوەش بریتییە لە خواردنی ماڵی هەتیو بە چاکە (بە مەعروف)[5].

ب.هەیانە دەڵێت: خواردن بە مەعروف ئەوەیە بە ئەندازەی پێویستی خۆی لێی بخوات بەبێ دەستدرێژی و دەستبڵاوی[6].

ج.هەیانە پێیان وایە ماڵی هەتیو وەك مردارەوەبوو وایە، بۆیە خواردنی بۆ کەسی ناچار روخسەتی پێدراوە و پێویستە بۆی بیگێڕێتەوە لە بارێکدا توانای دارایی هەبێت، ناچاربوون ماڵەکە موباح ناکات و نەرێکەری دەستەبەرکردنی نییە، و

---

(١) واتە لە سەرپەرشتیاران.

(٢) واتە بە ئەندازەی کرێی کارکردن بۆ ناکام.

(٣) سورة النساء/٦.

(٤) ينظر: جامع البيان للطبري: ١٦٨/٤ وما بعدها. مجمع البيان للطبرسي: ٨/٣ وما بعدها. التفسير الكبير للرازي: ١٦٤/٥ وما بعدها. تفسير الكشاف للزمخشري: ٥٠٠/١ وما بعدها. المحرر الوجيز لابن عطية: ٤٩٨/٣ وما بعدها. احكام القرآن للكيا الهراسي: ٣٢٩/٢ وما بعدها. الصاوي على الجلالين: ٢٠٤/١ وما بعدها. الناسخ والمنسوخ النحاس ص٩٢.

(٥) ئەم بۆچوونە دراوەتە پاڵ "ابن عباس" (ابن الجوزی ص١١١) لە عومەری کوڕی خەتابەوە ریوایەت کراوە فەرموویەتی: جێگەی ماڵی خودا لەلای من وەك ماڵی هەتیو وایە گەر بێنیاز بووم خۆمی لێ دەپارێزم، گەر هەژاریم هەبوو لێی دەخۆم و پاشان دەیگێڕمەوە. الطبري: ١٧١/٤ السنن الكبرى: ٦/٤.

(٦) "الحسن وعطاء او مكحول" دەڵێن: ئەوەندە وەردەگرێت برسێتی پێ بشکێنێت و عەورەتی پێ داپۆشێت، گەر بووە بوو نایگێڕێتەوە.

زەرورەت بە ئەندازەی خۆی ئەندازەگیری بۆ دەکرێت، بۆ سەرپەرشتیار هەیە لە ماڵی ناکام بخوات کە لەژێر سەرپەرشتیاری ئەودایە لە باری پێویستی و ناچاربووندا[1].

د.هەیانە پێیانوایە خواردنی بە مەعروف ئەوەیە سەرپەرشتیار بە ئەندازەی خۆی کرێ وەربگرێت گەر کارێکی بۆ هەتیوەکە ئەنجامدا[2].

بانگەشەی نەسخ پووچەڵە چونکە تێکەڵییەکە لە نێوان نەسخ و تایبەتکردندا، خواردنی ماڵی ناکام کە لەلایەن سەرپەرشتیارەوە لەژێر چاودێریدایە گەر بە رێگەی ستەم بێت دەبێتە خواردنی بە ناحەق، ئەوەش بە کۆدەنگی زانایانی ئیسلام حەرامە لەدوای حەرامکردنی لە قورئان و سوننەتی پێغەمبەردا(ﷺ) بۆیە بابەتەکە لە دەرەوەی "الناسخ والمنسوخ"ەوەیە.

پاشان ئەم تایبەتکردنە تەنها کورتنابێتەوە لەسەر خواردنی ماڵی ناکامان لەلایەن سەرپەرشتیارانەوە بەڵکو هەموو ماڵێکی بەموڵککراو دەگرێتەوە لەلایەن ئەوانەی خاوەنی ماڵەکە نین، بۆیە دەبێت کارەکە بە ستەم و دەستدرێژکاری و خواردنی ناحەق نەبێت، پاشان ئەوەی لە "ابن عباس"ەوە گوازراوەتەوە-گەر دروست بێت- ئەوە مەبەستی پێی تایبەتکردن بووە بە گوزارەی پێشینی چاکان، ئەوەی نامۆیە ئەوەیە بانگکەرانی نەسخ دەڵێن ئایەتی نەسخکەری دەیەمیش بەم ئایەتە نەسخکراوەتەوە: ﴿وَيَسْأَلُونَكَ عَنِ الْيَتَامَى قُلْ إِصْلَاحٌ لَهُمْ خَيْرٌ وَإِنْ تُخَالِطُوهُمْ فَإِخْوَانُكُمْ﴾[3][4]

کامەیە ئەو بەرهەڵستییە لە نێوان دوو ئایەتەکەدا؟ بۆچی چوار ئایەتی بەدوای یەکتردا هاتوو لە یەك سورەتدا نەسخی بەسەردا گوزەر دەکات لە کەمترین ماوەدا؟

---

(١) لەوانەی ئەم بۆچوونەیان هەیە: الشعبي.

(٢) ومن القائلين به احمد بن حنبل (رحمه الله) فتح الباري: ٣٠٩/٩.

(٣) سورة البقرة/٢٢٠.

(٤)سورة النساء/٧.

-ئایەتی(٧):﴿لِلرِّجَالِ نَصِيبٌ مِمَّا تَرَكَ الْوَالِدَانِ وَالأَقْرَبُونَ وَلِلنِّسَاءِ نَصِيبٌ مِمَّا تَرَكَ الْوَالِدَانِ وَالأَقْرَبُونَ مِمَّا قَلَّ مِنْهُ أَوْ كَثُرَ نَصِيبًا مَفْرُوضًا﴾[1]

هەندێك پێیانوایە[2] ئەم ئایەتە نەسخكراوەتەوە بە ئایەتی:﴿يُوصِيكُمْ اللَّهُ فِي أَوْلاَدِكُمْ لِلذَّكَرِ مِثْلُ حَظِّ الأُنثَيَيْنِ﴾[3].

ئەم بانگەشە پووچ و بێبنەمایە چونكە تێكەڵییە لە نێوان درێژەدان بە پوختە و نەسخدا، ئایەتی یەكەم پوختەیە و ئەم بەشەی ئایەتی میرات تەفسیری كردووە:﴿لِلذَّكَرِ مِثْلُ حَظِّ الأُنثَيَيْنِ﴾.

چونكە هۆی دابەزینی ئایەتەكە وەك "ابن عباس" دەڵێت: ئەم رووداوەیە: "أوس بن ثابت الأنصاري" كۆچی دوایی كرد و سێ كچ و ژنەكەی بە ناوی "أم كجة"[4] بەجێهێڵا، دوو پیاو لە ئامۆزاكانی "أوس" هاتن و لێجێماوەكەیان برد[5] ژنەكەی لای پێغەمبەر(ﷺ) سكاڵای كرد، پێی فەرموو: بگەڕێرەوە بۆ ماڵەكەت تا بزانم خودا لە بارەتەوە چی دەفەرموێت، بۆ ئەو مەبەستە ئەم ئایەتە دابەزی، بە راشكاوانە ئاماژە دەكات بۆ ئەوەی بۆ پیاوان بەشی خۆیان هەیە و بۆ ژنانیش هەر بەو جۆرە، بەڵام خودای موتەعال لەم ئایەتەدا بڕی بەشی هەردوو لای رۆشن نەكردبووەوە، بۆیە پێغەمبەر(ﷺ) ناردی بۆ لای دوو پیاوە وەسێتدارەكە و فەرمووی: لە كەمترین شتی ماڵەكەی "أوس" نزیك مەبنەوە، پاشان ئەوەی ماوەتەوە لە ئایەتی میرات دابەزی كە بریتییە لە: ﴿يُوصِيكُمْ اللَّهُ فِي أَوْلاَدِكُمْ﴾[6].

---

(١) سورة النساء/٦.

(٢) لەوانە: ابن سلامة. الناسخ والمنسوخ ص١٠٢.

(٣) سورة النساء/١١.

(٤) ينظر الاصابة في تمييز الصحابة: ٤٦٤/٤.

(٥) ئەوە نەریتی سەردەمی نەفامییان بوو: ينظر تفسير الطبري: ١٧٦/٥.

(٦) ينظر: تفسير الرازي: ٢٠١/٥، تفسير الطبري: ١٧٦/٥، تفسير الطبرسي: ١٠/٣.

–ئایەتی(٨):﴿وَإِذَا حَضَرَ الْقِسْمَةَ أُوْلُوا الْقُرْبَى وَالْيَتَامَى وَالْمَسَاكِينُ فَارْزُقُوهُمْ مِنْهُ وَقُولُوا لَهُمْ قَوْلاً مَعْرُوفًا﴾[1].

هەندێك پێیانوایە[2] ئەم ئایەتە بە ئایەتی میرات نەسخکراوەتەوە کە بریتییە لە:﴿يُوصِيكُمْ اللَّهُ فِي أَوْلَادِكُمْ لِلذَّكَرِ مِثْلُ حَظِّ الأُنثَيَيْنِ﴾.

بانگەشەی نەسخ پووچە بەم بەڵگانە:

١.نەبوونی هیچ جۆرە بەرهەڵستییەك لە نێوان دوو ئایەتەکەدا، نەسخ بریتییە لە لقی بەرهەڵستی، "الطبري" دەفەرموێت[3]: ((لەمەدا نزیکترین قسەیەك لە راستییەوە قسەی ئەو کەسەیە دەڵێت: ئەم ئایەتە موحکەمە و نەسخنەکراوەتەوە، مەبەست پێی وەسێتە بۆ خزمانی نزیکی وەسێتکەر، ئێمە بۆیە ئەوە دەڵێین چونکە لە چەندین جێی ئەم کتێبەمان و شوێنانی تریش رۆشنمان کردۆتەوە و وتومانە شتێك لە حوکمەکانی خودا–تبارك وتعالى– کە جێگیری کردبن یان لەسەر زمانی پێغەمبەرەکەی(ﷺ) رۆشنی کردبێتەوە دروست نییە تیایدا بوترێت نەسخکەرە بۆ حوکمێکی تر یان نەسخکراوەتەوە بە حوکمێکی تر، مەگەر ئەو دوو حوکمەی بڕیار دەدرێت یەکێکیان نەسخکەر بێت و ئەویتریان نەسخکراو یەکتری نەرێ بکەن و کۆبوونەوەی دوو حوکمەکە لە یەك کاتدا لە روویەك لە رووەکانەوە گونجاو نەبێت))

٢.خودا–سبحانه وتعالى– حوکمەکەی پەیوەست کردووە بە مەرجی ئامادەبوونەوە و دەفەرموێت: ﴿وَإِذَا حَضَرَ الْقِسْمَةَ﴾ ئەمەش مانای وایە بە رێگەی واجبوون و پابەندکردن نییە تا ئەو مافەیان بۆ هەبێت ئامادەبن یان ئامادە نەبن،

---

[1] سورة النساء/٨.

[2] ئەوە قسەی "ابن حزم الاندلسي"ـە، الناسخ والمنسوخ ص٣١ "الصاوي" هەڵبژاردووە (حاشية الصاوي على الجلالين: ١/٢٠٥ "ابن سلامة" ص١٠٣ گواستوویەتەوە بەبێ پارسەنگدان) "ابن حزم" دەڵێت: سورەتی "النساء" مەدەنییە و بیست و چوار ئایەتی نەسخکراوی تێدایە یەکەمیان ئەم ئایەتەیە: (وَإِذَا حَضَرَ الْقِسْمَةَ أُوْلُوا الْقُرْبَى ) الآية.

[3] جامع البيان في تفسير القرآن: ٤/١٧٨.

ئەمەش بەسەر دابەشکردنی شتانێکدا جگە لە لێجێماوەکاندا گوزەر دەکات، وەك خاوەن بەروبوومە کشتوکاڵییەکان لە کاتی دابەشکردنی بەروبوومەکەدا لە نێوان هاوبەشەکاندا یان گواستنەوەی بۆ ماڵەوە، لەو بارەدا سەرباری واجبی زەکات بەشێك لە بەروبوومەکەیان دەبەخشن بەوانەی ئامادە دەبن یەکسانە خزمانی نزیك یان ناسراوان یان هەژاران بن، چونکە ئیسلام ئایینی دەستگرۆیی و کۆمەکی و یارمەتی کۆمەڵایەتی و ئابوورییە.

"أبو جعفر النحاس"[1] دەڵێت: ((لەوانەی دەڵێن موحکەمە و ئایەتەکەیان لەسەر "ندب-پەسەندبوون" تەئویل کردووە ئەمانەن: "عبیدة، و عروة، و سعید بن جبیر، ومجاهد، وعطاء، والحسن، والزهري، والشعبي، ویحیی بن یعمر هەروەها لە "ابن" عباس" ریوایەتکراوە" هەموو دەڵێن: خودا-سبحانه وتعالی- فەرمانی کردووە بە باوەڕداران لە کاتی دابەشکردنی میراتەکانیاندا بەشی خزمان و هەتیوان و نەدارانیان لە ئەهلی وەسیێت بدەن، یا وەسیێتیشیان لە میرات پێ نەگەیشتبێت، پاشان دەڵێت: ئەمە باشترین قسەیەکە لەسەر ئایەتەکە وترابێت، ئەوەش لێکدانەوەیەتی بە "الندب والترغیب" لە کاری چاکە و شوکری خودا-جل ثناؤه- خودا فەرمانی بەوانە کرد میراتیان بۆ فەرزکراوە گەر ئامادەی دابەش کردنەکە بوون و لەگەڵیان خزمان و هەتیوان و نەداران ئامادەبوون بەشی ئەوانیش بدەن وەك شوکرێك بۆ خودا لەوەی بۆی فەرز کردوون))

٣.ئایەتەکە نەسخ نایگرێتەوە یەکسانە دابەشکردنەکە بە دابەشکردنی میرات یان دابەشکردنی وەسیێت لێکبدرێتەوە، وەك ئەوەی هەندێ لە گەورە زانایان لە فەقیهان و ئەهلی تەفسیر دەیڵێن، "الطبرسي"[2] دەڵێت: ((هەیانە ئەوەی بە وەسیێت تەفسیر کردووە، ڕووی گوتاری ئایەتەکە لەو کەسەیە مردن بۆی ئامادە دەبێت و دەیەوێت وەسیێت بکات، فەرمانی پێکراوە وەسیێت بکات بە شتێك لە ماڵ و ساماناکەی بۆ

---

[1] الناسخ والمنسوخ في القرآن الكريم ص٩٥.
[2] مجمع البيان في تفسير القرآن للطبرسي: ١١/٢.

ئەوانـەی مـیرات نایانگرێتـەوە، ئەمـەش هەڵبـژاردەی "ابـن عبـاس" و "سـعید بـن جبیر"ە))

"الـرازي"[1] دەڵێـت: ((قسـەی دووەم لـە تەفسـیری ئایەتەکـەدا مەبەسـت بـە "القسمة" بریتییە لە وەسێت، گەر ئەوانەی میرات نایانگرێتەوە لە خزمان و هـەتیوان و نەداران ئامادەبوون خودا فەرمانی کردووە بەشێکیان بۆ دیاریبکرێت لەو "القسمة" لەگەڵ قسەی خۆش و باش لەگەڵیان تـاکو ببێتـە هـۆی گەیشـتنی سـروور و خۆشـی پێیان لەو کاتە و لە داهاتوودا))

"الرازي" پارسەنگی تەفسیری دابەشکردنی لێجێمـاوی داوە بـە بەڵگـەی ئـەوەی باسی میرات پێشتر کراوە بەبێ وەسێت.

٤.دانـەپاڵی قسـەی نەسـخ بـۆ لای "ابـن عبـاس" رەدکراوەیـە بـەهۆی چـەندین ریوایەتەوە کـە لێیـەوە ریوایـەتکراون و دەڵێـت نەسـخ نەکراوەتـەوە، لەوانـە ئەوەیـە "الرازي" گواستوویەتەوە.

"ابن عباس" لە ریوایەتەکەی "عكرمە" دەڵێت: ئایەتەکە موحکەمـە و نەسـخکراو نییە، ئـەوەش مەزهـەبی "أبـي موسـى الأشـعري و إبـراهیم النخعـي و الزهـري و مجاهد و الحسن و سعید بن جبیر"ە ئەوانە بەشـی ئـەو کەسـانە دەدەن ئامـادەی دابەشکردنی لێجێماو دەبن.

ریوایەت کراوە "عبدالله بن عبدالرحمن بن أبي بكر الصدیق" میراتەکەی باوکی دابەش کرد و "عائشة" زیندوو بوو، بۆیە هیچ کەسێکی لە ماڵەکەدا بێبـەش نـەکرد و بە هەموویانی دا و پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە))[2].

---

[1] تفسیر الفخر الرازي الشهیر بالتفسیر الكبیر: ٢٠٤/٥.

[2] الرازي المرجع السابق: ٢٠٣/٥.

ـئایەتی (١٥ و ١٦):﴿وَاللاَّتِي يَأْتِينَ الْفَاحِشَةَ مِنْ نِسَائِكُمْ فَاسْتَشْهِدُوا عَلَيْهِنَّ أَرْبَعَةً مِنْكُمْ فَإِنْ شَهِدُوا فَأَمْسِكُوهُنَّ فِي الْبُيُوتِ حَتَّى يَتَوَفَّاهُنَّ الْمَوْتُ أَوْ يَجْعَلَ اللَّهُ لَهُنَّ سَبِيلاً﴾[١]

﴿وَاللَّذَانِ يَأْتِيَانِهَا مِنْكُمْ فَآذُوهُمَا فَإِنْ تَابَا وَأَصْلَحَا فَأَعْرِضُوا عَنْهُمَا إِنَّ اللَّهَ كَانَ تَوَّابًا رَحِيمًا﴾[٢]

زۆرێك لە ئەهلی تەفسیر و لێکۆڵەران پێیان وایە ئەم دوو ئایەتە لەڕووی حوکمەوە نەسخکراونەتەوە و خوێندنەوەیان ماوەتەوە، بەڵام لە دیاریکردنی نەسخکەردا بۆ دوو ئایەتەکە جیاوازیان کەوتۆتە نێوانەوە، بەم جۆرە:

النحاس[٣] دەڵێت: لەسەر دوو ئایەتەکە سێ قسە بۆ ئەوانە هەیە کۆدەنگیان لەسەر نەسخیان هەیە:

یەکەمیان: ئایەتی (١٥) بە ئایەتی (١٦) نەسخکراوەتەوە، کە سزاکەی بریتییە لە بەندکردن تایبەت بە هەر نێر و مێیەك زینا دەکەن، مێیەکە مێردی کردبێت یان کچ بێت، حوکمەکەیان بوو بە ئازاردانیان لە جێگەی بەندکردن، پاشان ئایەتی (١٦) نەسخکرایەوە بە ئایەتی:﴿الزَّانِيَةُ وَالزَّانِي فَاجْلِدُوا كُلَّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا مِائَةَ جَلْدَةٍ وَلاَ تَأْخُذْكُمْ بِهِمَا رَأْفَةٌ فِي دِينِ اللَّهِ إِنْ كُنتُمْ تُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ وَلْيَشْهَدْ عَذَابَهُمَا طَائِفَةٌ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ﴾[٤].

حوکمی زینای پیاوێك ژنی نەهێنابێت و ئافرەتێك مێردی نەبێت بوو بە جەلدکردن(دارلێدان) بەپێی ئەم ئایەتە و رەجم بەپێی سوننەتی پێغەمبەر(ﷺ) (واتە سوننەتی کرداری)، ئەوەش بریتییە لە قەزاوەتی پێغەمبەر(ﷺ) بە رەجم کردنی

---

[١] سورة النساء/١٥.
[٢] سورة النساء/١٦.
[٣] الناسخ والمنسوخ ص٩٦.
[٤] سورة النور/٢.

هەندێك پیاو كە ژنیان هەبوو وەك "ماعز" و هەندێ ئافرەت كە مێردیان كرد بوو وەك "الغامدیة" ئەم قسەیە بریتییە لە مەزهەبی "عكرمة".

قسەی دووەم: حوكمی پیاو و ژنی خاوەن ژن و خاوەن مێرد بریتییە لە بەندكردن تا مردن، و پیاوێك ژنی نەهێنا بێت و ژنێك مێردی نەكردبێت بریتییە لە ئازاردان، ئەمە بریتییە لە قسەی "قتادة".

قسەی سێیەم: ئایەتی یەكەم تایبەتە بە ئافرەتان و گشتییە بۆ هەموو ئافرەتێكی زیناكاری شوو نەكرد و خاوەن مێرد، ئایەتی دووەم تایبەتە بە پیاوان و گشتییە بۆ هەر پیاوێكی زیناكاری خاوەن ژن یان بێ ژن، ئەمەش بریتییە لە قسەی "مجاهد" و لە "ابن عباس" گێڕراوەتەوە و "النحاس" پارسەنگی داوە و دەڵێت: دروستترین قسەیە[1].

"ابن سلامة"دەڵێت: [2] ئایەتی﴿وَاللاَّتِي يَأْتِينَ الْفَاحِشَةَ﴾ تا دەگاتە ﴿أَوْ يَجْعَلَ اللَّهُ لَهُنَّ سَبِيلاً﴾ مەبەست پێی پیاو ژن لە سەرەتای ئیسلامەوە كە زینایان دەكرد بەند دەكران و بەرنەدەدران تا دەمردن، ئەم ئایەتە بە سوننەت نەسخكراوەتەوە نەك بە قورئان خودا ناوی ئافرەتی هێناوە لە جێگەی ئافرەتان و پیاوان، بۆیە پێغەمبەر(ﷺ) هاتە دەرەوە و فەرمووی: ((لە منی وەربگرن، لە منی وەربگرن، خودا رێگەی بۆ كردنەوە، پیاوێك ژنی نەهێنا بێت لەگەڵ ژنێك مێردی نەكردبێت هەریەك سەد داریان لێ دەدرێت و سالێك دوور دەخرێنەوە، پیاوێك ژنی هێنابێت لەگەڵ ژنێك مێردی كردبێت بریتییە لە رەجم))[3] ئەم سوننەتە بوو بە نەسخكەری ئایەتەكە[4].

---

[1] النحاس المرجع السابق ص٩٧.

[2] الناسخ والمنسوخ ص١٠٤ قارن قتادة بن دعامة بن قتادة الناسخ والمنسوخ في كتاب الله تحقيق د.حاتم صالح الضامن ص٣٦.

[3] رواه مسلم: ١٣١٦/٣، وأحمد: ٤٧٦/٣، وأحمد بن محمد بن سلامة في شرح معاني الآثار:١٣٨/٣.

[4] الناسخ والمنسوخ ص١٠٥.

"ابن حزم الأندلسي"[1] دەڵێت: ئایەتی(١٥) هەندێکی نەسخکراوەتەوە بە قورئان ئەوەش ئەو ئایەتەیە کە دەفەرموێت:﴿أَوْ يَجْعَلَ اللَّهُ لَهُنَّ سَبِيلاً﴾ واتە کۆتاییەکەی سەرەتاکەی نەسخ کردۆتەوە، ئەوەی ماوەتەوە(واتە ئەوەی لە ئایەتە نەسخکەرەکە ماوەتەوە) کە بریتییە لە:﴿أَوْ يَجْعَلَ اللَّهُ لَهُنَّ سَبِيلاً﴾ نەسخکراوەتەوە بە سوننەتی پێغەمبەر(ﷺ) (لە منی وەربگرن، خودا رێگەی بۆ کردنەوە) ئەوەی نامۆیە ئەوەیە ئەم فەرموودەیە-بەپێی بۆچوونی ئەوان- تەفسیری ئایەتی:﴿أَوْ يَجْعَلَ اللَّهُ لَهُنَّ سَبِيلاً﴾ ئیتر چۆن دەبێت بە نەسخکەر بۆی؟

ابن الجوزي[2] دەڵێت: زانایان لە نەسخی ئەم دوو حوکمەدا جیاوازیان لە نێواندا نییە(بەندکردن لە ئایەتی یەکەمدا و ئازاردان لە ئایەتی دووەمدا)، بەڵکو جیاوازی کەوتۆتە نێوانیانەوە لە دیاریکردنی ئەوەی نەسخیان دەکاتەوە، ئایا ئەم ئایەتەیە:﴿الزَّانِيَةُ وَالزَّانِي فَاجْلِدُوا كُلَّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا مِائَةَ جَلْدَةٍ﴾؟

هەندێ دەڵێن: رەجم بە سوننەت و دارلێدان بە ئایەت نەسخی ئایەتی یەکەمیان کردۆتەوە، ئایەتی دووەمیش بەم ئایەتە نەسخکراوەتەوە(الزَّانِيَةُ وَالزَّانِي).

دەستەیەکیش دەڵێن: ئەم دوو حوکمە نەسخکراونەتەوە بە فەرموودەکەی "عبادة بن الصامت"(لە منی وەربگرن، لە منی وەربگرن)فەرموودەکە.

الطبرسي[3] دەڵێت: بەندکردن نەسخکراوەتەوە، بەڵام ئازاردان نەسخ نەکراوەتەوە.

"الصاوي" بە پێچەوانەی ئەوانەوە لەسەر ئەم ئایەتە[4] جیاوازە و دەڵێت بە ئایەتەکەی سورەتی "النور" نەسخکراوەتەوە یان درێژەپێدەریەتی ئەوەش راست و رەوایە.

---

[1] الناسخ والمنسوخ في القرآن الكريم ص٣١.
[2] الناسخ والمنسوخ ص١٢١.
[3] مجمع البيان للطبرسي: ٢١/٣.
[4] واتە ئایەتی (١٥).

لــە "تفســير الجلالــين"[1]دا ئايــەتی (١٥) نەســخكراوەتەوە بــە حــەد، بــەلاّم ديارينــەكردووە مەبەســت بــە "حــەد" چــييە ئايــا حــەدی دارلێدانــە يــان حــەدی رەجمكردن.

بەڵگەی پووچی بۆچوونی نەسخ لە ئايەتی(١٥ و ١٦)دا:

١.دەقێــك لــە قورئــان و فــەرموودەی پێغەمبــەر(ﷺ) و كــۆدەنگی هــاوەلاّن نابينرێتەوە –لە چاخی وەحيدا ژيابن و هەموو شتێك تێگەيشتبن لـەوەی پەيوەنـدی بە قورئانـەوە هەيـە– بەڵگـە بێـت لەسـەر نەسـخبوونەوەی ئـەم دوو ئايەتـە، هـەموو ئەوەی لە قورئاندا جێگير بووە لەڕووی خوێندنەوە و حوكمەوە لادانی تەنها بە يەكێك لەو سێ بەڵگەيە دەبێت(قورئان و فەرموودە و كۆدەنگی هاوەلاّن).

٢.ئەو بۆچوونانەی لە سەرچاوە باسكراوەكانەوە ئاماژەم پێكردن قسەی ئاحـادن و ئيجتيهـادی تاكەكەسـين و تـەنها "گومـان" دەگەيـەنن، دوو ئايەتەكـەی(١٥ و ١٦) بـڕاوەن لــە جێگيربــوون و ئامــاژە بــە حوكمەكە(ســزادان)، زانايــانی كــۆن و نــوێ كۆدەنگيان هەيە لەسەر ئەوەی هەر شتێك بە يـەقين جێگيربووبێـت تـەنها بـە يـەقين دەسڕێتەوە.

٣.پێشــتر ســەلماندمان ناكرێــت قورئــان بــە ســوننەتی پێغەمبــەر(ﷺ) نەسخكرابێتەوە، با سوننەتەكەش متەواتير بێت بەهۆی كـۆدەنگی زانايانـەوە لەسـەر ئـەوەی پلـەی سـوننەت لـە حوجـەت و بەڵگەهێنانـەوە و سەرچـاوەگريدا بـۆ حـوكم دەكەوێتە دوای پلەی قورئانەوە، نەسخكەريش دەبێت بەهێزتر بێت لە نەسخكراو يان پێی يەكسان بێت، نەسخكردنەوەی قورئان بە سوننەت دابەزاندنی پلـەی قورئانـە بـۆ پلەی سوننەت يان بەرزكردنەوەی پلەی سوننەتە بۆ پلەی قورئان، پێويست پووچەڵە و هەر بەو جۆرە پێويستكراو.

---

[1] ١/٢٠٩.

٤.هەر ئایەتێك لەو سێ ئایەتە(١٥ و ١٦)ی سورەتی "النساء" ئایەتی (٢)ی سورەتی "النور" لەڕووی بابەت و لەڕووی حوکمەوە لەوانی تر سەربەخۆیە، هەر یەکێك لەو ئایەتانە تاوانێکی تایبەت چارەسەر دەکات کە لە سزاکەیدا سەربەخۆیە وەك لەم ڕۆشنکردنەوەدا:

أ.ئایەتی یەکەم(١٥) تایبەتە بە ڕۆشنکردنەوەی سزای "السحاق-ژن لەگەڵ ژن" شازبوونەوەی ڕەگەزی لە نێوان ئافرەتاندا بە لە یەکدانی ئەندامی مێیینەیان لەیەکتر وەك داوایەك بۆ چێژی هاوبەش لە نێوانیاندا[1]، ئەمە تاوانێکی تایبەتە بە ئافرەتان و پیاو بەشداری تێدا ناکات، بۆیە قورئان دەربڕینێکی تایبەتی بە ئافرەتان بەکارهێناوە کە نە لە حەقیقەت و نە لە مەجازدا بۆ نێر بەکارناهێنرێت ئەوەش بریتییە لە "اللاتي" کە بریتییە لە کۆی "التي" زانایانی نەحو کۆدەنگیان هەیە لەسەر ئەوەی "اللاتي" بۆ نێر بەکارناهێنرێت.

مانای ئایەتەکە دەفەرموێت: "الساحقات" کە کاری خراپە(الفاحشة) ئەنجام دەدەن ئەوەش بریتییە لە کاری "سیحاق" سزاکەیان بریتییە لە ڕێگەنەدان بە هاتنە دەرەوە تا رادێنەوە لەسەر پاکێتی یان خودا دەرورویەکیان لێ دەکاتەوە کە بریتییە لە ڕێگەی هاوسەرگیری بەوەی مێرد بکەن و غەریزەی ڕەگەزی خۆیان لەو ڕێگە ڕەوایەوە تێر بکەن[2].

ئەم حوکمە دەمێنێتەوە بە درێژایی مانەوەی ژیان لەسەر هەسارەی زەوی، هەر کەسێك کەمێك لە جوامێری تێدا بێت ڕێگە نادات بە ژنەکەی یان بە کچەکەی یان خوشکەکەی یان هەر کەسێك دەدرێتە پاڵ خێزانەکەی ئەو بچێتە دەرەوە گەر بە بەڵگە سەلمێنرا ئافرەتەکە لەسەر کاری سحاق ڕاهاتووە.

---

[1] الصحاح في اللغة والعلوم مادة سحق.

[2] گەورە تەفسیرکەرانی قورئان کە تێگەیشتنی قووڵیان هەیە لە قورئان وشەی "السبیل-ڕێگە یان دەروو"یان بە "الزواج-هاوسەرگیری" لێکداوەتەوە، التفسیر الکبیر والزمخشري في الکشاف وغیرهما.

لەوانەیە تەنها بەندکردنی بەس نەبێت، بەڵکو پەلاماری کوشتنی دەدات، ئیتر چۆن دەوترێت حوکمی بەندکردن نەسخکراوەتەوە، پاشان سیحاق تاوانێکی تەمبێکردنە و سزاکەی بەندکردنە، چۆن تاوانە تەمبێکارییەکان سزای حەدیان تێدا بەکاردەهێنرێت کە بریتییە لە دارلێدان و رەجم؟

ب.ئایەتی دووەم(١٦) تایبەتە بە رۆشنکردنەوەی حوکمی نێربازی تەنها لە نێوان دوو نێردا بە بەڵگەی وشەی "اللذان" کە بریتییە لە دووی "الذي" ئەم دارشتەیە تایبەتە بە نێر و بۆ ئافرەتان بەکارناهێنرێت بە کۆدەنگی زانایانی نەحو، نێربازی لای زۆربەی فەقیهانی ئیسلام تاوانێکی تەمبێکارانەیە نەك حەدی و سزاکەی بریتییە لە ئازاردانیان، سزای تەمبێکارانە لە نێوان سەرەکۆنەکردن و لە سێدارەداندایە، بۆیە قورئان گوزارەی "ئازاردان"ی بۆ بەکارهێنا تاکو گشتی بێت و بچێتە ژێر ئەندازەگیری خاوەن ئەمرەوە(ولي الأمر) بەپێی رەوشی هەر پرسێك لە نێربازی، ئەم حوکمە ئافرەتانی تێدا بەشدار نین نە لە تاوانەکە و نە لە سزاکەیدا، سزای دارلێدان یان رەجمکردن سزایەکی حەدییە و بەسەر تاوانە تەمبێکارانەکاندا پیادە ناکرێت، سزای ئازاردان بۆ نێربازی دەمێنێتەوە هەتا ژیان بەردەوام بێت.

ج.ئایەتی سێیەم(٢) کە لە سورەتی "النور"دا هاتووە تایبەتە بە تاوانی هاوبەشی نێوان نێر و مێ کە پێی دەوترێت زینا[1].

سزای پیاوێك ژنی نەهێنابێت و ئافرەتێك مێردی نەکردبێت بریتییە لە سەد دار بە

---

[1] التفسير الكبير للرازي: ٩/١٢٧ وما بعدها، الزمخشري الكشاف: ١/٥١١ تیایدا هاتووە: (او يجعل الله لهن سبيلا) بریتییە لە شووکردن کە بێنیازیان دەکات لە سیحاق. الکیا الهراسي احکام القرآن: ٢/٣٧٥ تیایدا هاتووە: ((خودا یەکەمجار دەفەرموێت:(واللاتي يأتين الفاحشة من نسائكم) ئەمە باس لە فاحیشەیەکی تایبەت دەکات ژنان پێی هەڵدەستن، هەروەها دەفەرموێت:(واللذان يأتيانها منكم) ئەمەش فاحیشەیەکی تایبەتە بە پیاوان، یەکەمیان فاحیشەیە لە نێوان ژناندا و دووەمیان فاحیشەیە لە نێوان پیاواندا، لەسەر ئەمەی باسکرا ئایەتەکەی سورەتی "النور" نەسخکەری فاحیشەی یەکەمیان نییە، چونکە دارلێدانی پێوە پەیوەست نابێت)).

کۆدەنگی زانایانی کۆن و نوێ، بابەتی دوورخستنەوەی ساڵێك لە دەرەوەی حەدەکەوەیە و سزایەکی تەمبێکارانەیە دەکەوێتە ژێر دەسەڵاتی خاوەن ئەمرەوە.

سزای رەجم بابەتێکە جیاوازی تێدایە، سەرچاوەی جیاوازییەکەش ئەوەیە رەجم بە سوننەتی پێغەمبەر(ﷺ) و قەزاوەتی ئەو جێگیر بووە، هەروەها بە کۆدەنگی لەسەر ئەو سوننەتە کرداریە و قەزاوەتی پێغەمبەرە(ﷺ) ئایا پێش دابەزینی ئایەتی (٢)ی سورەتی "النور" ﴿الزَّانِيَةُ وَالزَّانِي فَاجْلِدُوا كُلَّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا مِائَةَ جَلْدَةٍ﴾ ئەوکات بەم ئایەتە سوننەتەکەی پێغەمبەر(ﷺ) سڕاوەتەوە یاخود بەردەوام بووە پێش ئایەتەکە و دوای ئایەتەکە، ئەوکات بوویێتە تایبەتکەر بۆ گشتاندنی ئایەتە باسکراوەکە، بەدەرکردنی پیاوی ژندار و ژنی مێرددار لە حوکمەکەی بەهۆی چوونە ژێر باری حوکمی سوننەتی پێغەمبەرەوە(ﷺ) بینا لەسەر ئەوە دوو حەد دەبینرێتەوە حەدی رەجم بۆ زیناکەری ژندار و مێرددار لەگەڵ حەدی دارلێدان بۆ پیاوی بێ ژن و ئافرەتی بێ پیاو، زانستەکە لای خودایە و یەکێك لە دوو بارەکە بە بەڵگەیەك نەسەلماوە تاکو جیاوازییەکە هەڵبگرێت.

لە سەحیحی "البخاري"دا بە شەرحی "الفتح الباري"ەوە هاتووە[1] ((إِسْحَاق[2] بۆی باسکردم، خَالِدٌ[3] بۆی باسکردین، لە "الشَّيْبَانِي"[4]ەوە پرسیارم لە "عبدالله بن أبي أوفى" کرد ئایا پێغەمبەر(ﷺ) کەسی رەجم کردووە، وتی: بەڵێ، پرسیم: پێش سورەتی "النور" یان دوای سورەتی "النور" وتی: نازانم)) [5]

"العسقلاني"[6] لە شەرحی ئەم فەرموودەیەدا دەڵێت: (سوودی ئەم پرسیارە

---

[1] فتح الباري شرح صحيح البخاري للامام ابي عبد الله محمد بن اسماعيل البخاري تأليف الامام الحافظ احمد بن علي بن حجر العسقلاني: ١٢/١١٧.
[2] وهو ابن شاهين الواسطي.
[3] هو ابن عبد الله الطحان.
[4] هو ابو اسحاق سليمان مشهور بكفتيه.
[5] الحديث ٦٨١٣ طرقه في ٦٨٤٠.
[6] فتح الباري:١٢/١٢٠.

ئەوەیە گەر رەجم پێش دابەزینی ئایەتەکەی سورەتی "النور" روویدابێت ئەوا دەتوانرێت بوترێت رەجم بە ئایەتەکە نەسخکراوەتەوە بەو دەقەی تێیدایە کە حەدی زینا بریتییە لە دارلێدان(واتە بەرەهایی تایبەت بە ژندار و مێردداری لە نێر و مێ) گەر رەجم دوای دابەزینی ئایەتەکە روویدابێت ئەوا دەتوانرێت بەڵگە بهێنرێتەوە بە نەسخبوونەوەی دارلێدان لە حەقی زیناکەری ژندار و مێرددارردا، بەڵام نەسخکردنەوەی قورئانە بە سوننەت و جیاوازی تێدایە، وەڵام دەدرێتەوە کە نەسخی قورئان بە سوننەت قەدەغەیە گەر فەرموودەکە لە رێگەی ئاحادەوە بوو، بەڵام سوننەتی مەشهور وا نییە، کەوابوو نەسخ نییە بەڵکو بریتییە لە تایبەتکردن بە پیاوی بێ ژن و ئافرەتی بێ مێرد).

٥.گەر راستبێت دوو ئایەتی(١٥ و ١٦)ی سورەتی "النساء" نەسخکرابنەوە بە ئایەتی (٢)ی سورەتی "النور" و سوننەتی کرداری پێغەمبەر(ﷺ) [1] کەوابوو پێویستە هەمان حوکمی نەسخکەر پیادە بکرێت بەسەر سیحاق و نێربازیدا بە کۆدەنگی فەقیهانی شەریعەتی ئیسلام بە هۆی کۆدەنگیانەوە لەسەر ئەوەی سزای سیحاق و نێربازی سزای تەمبێکارانەیە وەك لە ئایەتی(١٥)دا، بەڵام حوکمەکە لە فیقهی ئیسلامیدا هیچ گۆڕانێکی بەسەردا نەهاتووە وەك لەم ئایەتەدایە، بەڵکو فەقیهانی شەریعەت کۆدەنگیان هەیە لەسەر ئەوەی بەندکردن لە ئیسلامدا سزایەکی تەمبێکارانەیە.

جمهوری فەقیهان لەسەر ئەوەن نێربازیش سزای تەمبێکارانەیە، نەك سزای حەدی، تایبەت بە ژندار و بێ ژن، بەڵام ئەم سزایە رادەی باڵا(ئاستی سەرەوە) وەردەگیرێت کە بریتییە لە کوشتن لای هەندێك [2]، و کەمترین رادەشی لای هەندێکی

[1] قەزاوەتی ئێغەمبەر(ﷺ) بە رەجم کردنی ئیاوی ذندار و ذنی مێردداری زیناکار.

[2] ئەوەش قسەی شێعەی زەیدییەکانە، المنتزع المختار: ٣٣٦/٤ (مەزهەبی "القاسم"، نێرباز دەکوژرێت ژنی هێنابێت یان نە، ئەوەش بۆچوونی "الناصر و مالك" و یەکێك لە بۆچوونەکانی شافیعییە، شێعەتی ئیمامییەکان لە "الخلاف للطوسي: ٤٤٤/٢

تر[1]، هەردوو رادەکە دەچنە ژێر تێگەیشتن لە "ئازاردان"ەوە وەك لە ئایەتەکەدا هاتووە، چونکە ئازاردان سزایەکی تەمبێکارانەیە لە نێوان کەمترین رادە کە لۆمە و سەرزەنشتە و زۆرترین رادە کە بریتییە لە سێدارەدان.

هەندێکیش[2] دەڵێن حوکمی بەسەردا جێبەجێ دەکرێت.

٦.گەر مەبەست بەم بەشەی ئایەتەکە:﴿أَوْ يَجْعَلَ اللَّهُ لَهُنَّ سَبِيلاً﴾ سزای حەد بوایە کە پێغەمبەر(ﷺ) بە فەرموودەی(خُذُوا عَنِّي خُذُوا عَنِّي-لە منی وەربگرن، لە منی وەربگرن) رۆشنی کردۆتەوە، هەروەها بە ئایەتەکە کە قورئان رۆشنی کردۆتەوە:﴿الزَّانِيَةُ وَالزَّانِي﴾ وەك بانگەرانی نەسخ بانگەشەی دەکەن ئەوا خودا-سبحانە وتعالی- نەیدەفەرموو(لهن) بەڵکو دەیفەرموو(عليهن)، چونکە "لام"ەکە بۆ سوود و قازانجە و "على" بۆ زیان و زەرەرە، وەك خودا دەفەرموێت:﴿لَهَا مَا كَسَبَتْ وَعَلَيْهَا مَا اكْتَسَبَتْ﴾ بینا لەسەر ئەمە مەبەست بەم بەشەی ئایەتەکە:﴿أَوْ يَجْعَلَ اللَّهُ لَهُنَّ سَبِيلاً﴾ بریتییە لە هاوسەرگیری[3].

---

"اگەر پیاوێك نێربازی کرد و بردییە ژوورەوە ئەوا کوشتنی واجبە، ئیمام هەڵبژاردەی بۆ هەیە بە شمشێر بیکوژێت یان لە شوێنێکی بەرز بیخەنە خوارەوە"

[1] ئەوەش بۆچوونی حەنەفییەکانە سزای تەمبێکارانەی بریتییە لە ئازاردان وەك لە ئایەتەکەدا هاتووە، بەڵام ناگاتە رادەی کوشتن، بەڵکو بۆ ئەندازەگیری ئیمام بەجێدەهێڵرێت، کەسەکە زندار بێت یان بێ ژن. ينظر فتح القدير: ٤/١٥٠، حاشية ابن عابدين: ٣/١٥٣ وما بعدها، تبيين الحقائق: ٣/١٦٤ وما بعدها.

[2] ئەوەش یەکێکە لە بۆچوونەکانی شافیعی و هەندێ لە مالیکییەکان: المغني: ٨/١٨٧، المهذب: ٢/٢٨٦.

[3] "الرازي" لە التفسير الكبير: ٩/١٢٩ دەڵێت((ئەوانەی دەڵێن ئەم ئایەتانە لەسەر زینا دابەزیون ئەم ئایەتەیان(أَوْ يَجْعَلَ اللَّهُ لَهُنَّ سَبِيلاً) بە رەجم و سزادان لێکداتەوە، ئەمەش دروست نییە چونکە رەجم و سزادان "عليهن-لەسەریان"ی بۆ بەکاردەهێنرێت نەك لە "لهن-بۆیان" وەك لە ئایەتەکەدا دەفەرموێت: (لَهَا مَا كَسَبَتْ وَعَلَيْهَا مَا اكْتَسَبَتْ) ئێمە ئەوە لێکدەدەینەوە بەوەی خودا بە دامرکاندنەوەی حەز لە رێگەی هاوسەرگیرییەوە ئاسانکاریان بۆ دەکات)).

-ئایەتی(٢٢):﴿وَلاَ تَنكِحُوا مَا نَكَحَ آبَاؤُكُمْ مِنْ النِّسَاءِ إِلاَّ مَا قَدْ سَلَفَ﴾[١]

ئـەم ئایەتـە حـوکمی حـەرامکردنی هاوسـەرگیری بـەهۆی خزمایەتییـەوە هێنـاوە سەرباری رەچەڵەك و شیردان، هەر کەس هاوسەرگیری لەگەڵ ژنێك بکات ئەوا ژنەکـە لە بنەڕەتـەکان و لقـەکان حـەرام دەبێـت بـە حـەرامبوونێکی هەتاهـەتایی، یەکسـانە چووبێتە لای یان نە، هەر کەس ژنی بـاوکی لـە دوای تەڵاقـدانی یـان لـە دوای مردنـی باوکی بخوازێت هاوسەرگیرییەکەی پووچەڵە و سزا دەدرێت بە سـزای تـەمبێ کـردن، ئەو بەشەی ئایەتەکە﴿إِلاَّ مَا قَدْ سَلَفَ﴾ ئەم هەڵواردنەکردنە لە ئیسلامدا بۆ دروستی هاوسەرگیری لەگەڵ ژنی باوك نەهاتووە گەر پـێش چوونە لای بێـت، بـەڵکو گـەر لـە رابردوودا روویدابێت ئەوا لە یەکتر جیادەکرێنەوە کاتێك موسڵمان دەبن، بەڵام سزایان نادرێت، چونکە فەرمانەکانی خودا و نەهیکردنەکانی ئەسەری گەڕاوەیان نییە تایبـەت بە سزاکان، وەك ئەوەی بفەرموێت گەر ئەو کارەتان ئەنجامدا دوای موسڵمان بوونیان سزا دەدرێن، بەڵام ئەوەی تێپەڕی ئێوە لەسەری سزا نادرێن.

هەندێ[٢] پێیان وایە حوکمی ئەم ئایەتە نەسخکراوەتەوە بـەو هەڵواردنـەی تیایـدا هاتووە.

ئەمە تێکەڵییەکە لە نێوان نەسـخ و تایبەتکردنـدا، گـەر مەبەسـت بـە نەسـخ مانـا ئوسـوڵییەکەی بێـت ئـەوە هەڵەیـە، چـونکە هـەڵواردن بـۆ تایبەتکردنـە نـەك بـۆ نەسخکردن.

"ابـن الجـوزی"[١] دەڵێـت: (هەنـدێك-لـە کـەمی تێگەیشـتنیانەوە- پێیانوایـە هەڵواردن(الإستثناء) بریتییە لە نەسخی پێش خۆی، ئەمە بریتییـە لـە تێکـەڵکردنێك کە بەرهەمی لێ بەدەست نایەت و دروست نییە لا بەلایدا بکرێتەوە، لە دوو رووەوە:

---

[١] سورة النساء/٢٢.

[٢] ابن سلامة الناسخ والمنسوخ ص١١٦، الناسخ والمنسوخ لابن حـزم الاندلسـي ص٣٣، نواسخ القرآن لابن الجوزي ص١٢٣.

یەکەم—هەڵواردن نەسخ نییە.

دووەم—هەڵواردن دەگەڕێتەوە بۆ شاراوەیەك كە تەقدیرەكەی "فإن فعلتم عوقبتم إلا ما قد سلف فإنكم لا تعاقبون علیە—گەر ئەوە ئەنجام بدەن سزا دەدرێن، جگە لەوەی تێپەڕی لەسەر ئەوە سزا نادرێن" بۆیە لێرەدا مانا بۆ نەسخ نییە).

—ئایەتی(٢٣):﴿وَأَنْ تَجْمَعُوا بَيْنَ الأُخْتَيْنِ﴾[٢]

هەندێك پێیانوایە[٣] ئەم ئایەتە وەك پێشووەكان بە هەڵواردن(الإستثناء) نەسخكراوەتەوە، هەندێكی تر دەڵێن[٤] مارەبڕینی دوو خوشك—لە یەك كاتدا—شەرعی پێش شەرعی ئێمەیە، خودا لە شەرعی ئێمەدا نەسخی كردۆتەوە بە﴿إِلاَّ مَا قَدْ سَلَفَ﴾ واتە: دوو خوشك پێكەوە كۆمەكەنەوە "إلا ما قد سلف" ماناكەی "ولا ما قد سلف" ئەوەش نە گۆزەری كردووە.

بەرپەرچی بانگەشەی نەسخ بە هەڵواردن دەدرێتەوە بەوەی بەرپەرچدرایەوە لە بۆچوونەكەی پێشوو لەسەر ئایەتی(٢٢): ﴿وَلاَ تَنكِحُوا مَا نَكَحَ آبَاؤُكُمْ مِنْ النِّسَاءِ إِلاَّ مَا قَدْ سَلَفَ﴾ بۆچوونی ئەوەی رەوابووە لە شەریعەتەكانی پێشوودا لە كۆكردنەوەی دوو خوشك و نەسخبوونەوەی لە شەریعەتی ئێمەدا قسەیەكە بەرهەڵستی لەسەر نییە، بەڵام ئەوە تەنها لە شەریعەتی گەورەمان ئادەمدا—علیە السلام— رەوا بووە لەبەر زەرورەت، چونكە هەموو ئایینەكان ئەم كۆكردنەوەیە بە حەرام دادەنێن.

---

[١] نواسخ القرآن ص١٢٣.

[٢] سورة النساء/٢٣.

[٣] لەوانە ابن حزم الاندلسي الناسخ والمنسوخ ص٣٣.

[٤] وەك ابن سلامة الناسخ والمنسوخ ص١٠٧.

-ئایەتی(٢٤):﴿فَمَا اسْتَمْتَعْتُمْ بِهِ مِنْهُنَّ فَآتُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ فَرِيضَةً ﴾[1]

ئەهلی تەفسیر لە مانای بەمەبەستگیراو لەم ئایەتەدا تیایدا جیاوازیان هەیە، هەندێکیان دەڵێن: هاوسەرگیری ئاسایی شەرعی کات بۆ دیارینەکراو.

الطبري[2] دەڵێت:(هەندێکیان دەڵێن ئەوانەیان مارەیان دەبڕن لە ئافرەتان مافی فەرزکراوی خۆیانیان بدەنێ، واتە مارەیی، هەندێکیش دەڵێن مەبەست تیایدا موتعەیە).

الطبرسي[3] دەڵێت:(وتراوە مەبەست پێی هاوسەرگیری موتعەیە، ئەوەش بریتییە لە هاوسەرگیرییەکی دامەزراوی دیارینەکراو بۆ ماوەیەکی ئاشکرا، لە "ابن عباس و السدي، وابن سعيد" و دەستەیەك لە شوێنکەوتووانەوە باسکراوە، ئەوەش مەزهەبی هاوەڵانی ئێمەیە لە ئیمامییەکان).

الكياالهراسي[4] دەڵێت:(هەندێ گومانبەر وا گومان دەبەن ئەم ئایەتە لە هاوسەرگیری موتعەدا هاتووە، لە "ابن عباس"ەوە گوازراوەتە کە تەئویلی ئەم ئایەتەی کردووە﴿فَمَا اسْتَمْتَعْتُمْ بِهِ مِنْهُنَّ فَآتُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ﴾ دەڵێت نەسخکراوەتەوە بەم ئایەتە:﴿إِذَا طَلَّقْتُمُ النِّسَاءَ﴾ الآية هەروەها لێیەوە ریوایەتکراوە کە لەو قسە گەڕاوەتەوە(پەشیمان بووەتەوە) بەهۆی کۆمەڵێك فەرموودەوە کە لە نەهیکردنی موتعەدا هاتووە، پاشان دەڵێت: ئەم ئایەتە مانای موتعە هەڵناگرێت، بۆیە وشەی "الأجر" بە مانای "المهر-مارەیی" دێت).

---

[1] ئەمە بەشێکە لە ئایەتی (٢٤) کە بریتییە لە: (وَالْمُحْصَنَاتُ مِنَ النِّسَاءِ إِلاَّ مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُكُمْ كِتَابَ اللَّهِ عَلَيْكُمْ وَأُحِلَّ لَكُمْ مَا وَرَاءَ ذَلِكُمْ أَنْ تَبْتَغُوا بِأَمْوَالِكُمْ مُحْصِنِينَ غَيْرَ مُسَافِحِينَ فَمَا اسْتَمْتَعْتُمْ بِهِ مِنْهُنَّ فَآتُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ فَرِيضَةً وَلاَ جُنَاحَ عَلَيْكُمْ فِيمَا تَرَاضَيْتُمْ بِهِ مِنْ بَعْدِ الْفَرِيضَةِ إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَلِيمًا حَكِيمًا)النساء/٢٤.

[2] التفسير: ٥/٨-٩ .

[3] المرجع السابق: ٣٢/٣.

[4] ٤١٢/١.

"القـرطبي"[1] دەڵێـت: (زانایـان لـە مانـای ئایەتەکـەدا جیاوازیـان لـە نێواندایـە، هەندێکیان دەڵێن مەبەست هاوسەرگی دروستە، و "الأجور" بە مانای مارەیی دێت، هەشیانە دەڵێت: مەبەست پێی موتعەیە، "الرازي" ئەم جیاوازییە ئاماژەبۆکراوەی لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا باسکردووە، پاشان دەڵێت: کاتێك خەڵکی لـە فتواکـەی "ابـن عباس"دا لەمەڕ موتعە هۆنراوەیان هۆنییەوە، فەرمووی: خودا بیانکوژێت، من فتـوای موباحکردنیم نەداوە بە رەهایی، بەڵام وتم: ئەوە بۆ کەسی ناچار دروستـە وەك چـۆن خوێن و گۆشتی بەراز بۆی حەڵاڵ دەبێت)

"النحـاس"[2] دەڵێـت: (زانایـان لەمـەدا جیـاوازی کەوتۆتـە نێوانیانـەوە لـەدوای کۆدەنگی ئەوانەی کە بەڵگە راستدەکەنەوە لە قورئان و فـەرموودەی پێغەمبـەر(ﷺ) و قسـەی خەلیفـەکانی راشـیدین-خوایـان لـێ رازی بێـت- جیـاوازی نییـە لـە نێـوان زانایاندا لە دروستی ئەو دانەپاڵەی بۆ "علي بن أبي طالب"-خوا لێی رازی بێـت- و دروستی رێگەی ریوایەتەکەی لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) لە حـەرامکردنی موتعـەدا، پاشـان لــە "ابـن عبـاس"ەوە ریوایــەتکراوە وتوویــەتی ئــەم ئایەتــە نەســخی کردۆتەوە:﴿يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ إِذَا طَلَّقْتُمُ النِّسَاءَ فَطَلِّقُوهُنَّ لِعِدَّتِهِنَّ﴾ هەروەها لە "سعید بن المسیب"ەوە ریوایەتکراوە دەڵێت موتعە بە ئایەتی میرات نەسخکراوەتەوە﴿وَلَكُمْ نِصْفُ مَا تَرَكَ أَزْوَاجُكُمْ﴾ چونکە موتعە میراتی تێـدا نییـە، دەستـەیەکیش دەڵـێن: هەموو موتعەیەك بە قورئان و فەرموودە نەسخکراوەتەوە)

ابـن سـلامة[3] پێیوایـە:(مەبەسـت لـە ئایەتەکـە موتعەیـە، بـەڵام بـە سـوننەت نەسخکراوەتەوە، پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت: ((من ئەم موتعەیەم بۆ حـەڵاڵ کـردن، بزانن خودا و پێغەمبەر لەسەر ئێوەی حەرام کردووە)، با ئەوانـەی ئامـادەن بیگەیـەنن

---

[1] ٥/١٢٩.

[2] الناسخ والمنسوخ ص١٠٣.

[3] الناسخ والمنسوخ ص١٠٧.

بەوانەی لێرە نین))[1] حەرامکردنەکەی شوێنی بێبەشبوونی چارەك و هەشتیەك[2] "الشافعي" دەڵێت شوێنی حەرامبوونەکەی لەم ئایەتەدایە:﴿وَالَّذِينَ هُمْ لِفُرُوجِهِمْ حَافِظُونَ، إِلاَّ عَلَى أَزْوَاجِهِمْ أَوْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُهُمْ فَإِنَّهُمْ غَيْرُ مَلُومِينَ، فَمَنْ ابْتَغَى وَرَاءَ ذَلِكَ فَأُوْلَئِكَ هُمْ الْعَادُونَ﴾ [3] لەسەر ئەوە کۆدەنگن موتعە نە هاوسەرە نە "ملك اليمين").

ابن حزم الاندلسی[4] پێشی ابن سلامە کەوتووە لە وتنی ئەوەدا.

ابن الجوزي[5] لەسەر ئایەتی(٢٤)ی سورەتی "النساء" دەڵێت: دوو شوێنی نەسخکراون:

یەکەمیان: ئەم بەشەیە:﴿وَأُحِلَّ لَكُمْ مَا وَرَاءَ ذَلِكُمْ﴾ ئەمە لەلای کۆی زانایان وشەیەکی گشتییە(مەبەستی وشەی "ما"ی "الموصولة"یە) تایبەتکراوە بە نەهی پێغەمبەر(ﷺ) لەوەی ئافرەت بەسەر خوشکی باوکیدا یان بەسەر خوشکی دایکیدا بهێنرێت، ئەمە نەسخ کردن نییە، بەڵکو تایبەتکردنە، دەستەیەك کە تێگەیشتنیان نییە پێیانوایە حەڵاڵ کردنی ئاماژەپێدراو لە ئایەتەکەدا بەم فەرموودەیە نەسخکراوەتەوە، ئەمە لە تێنەگەیشتنی "الناسخ والمنسوخ"ەوەیە، هەروەها لە نەزانییەوەیە بە مەرجەکانی و کەمی مەعریفە بە جیاوازی نێوان تایبەتکردن و نەسخ.

شوێنی دووەم: ئەم ئایەتەیە:﴿فَمَا اسْتَمْتَعْتُمْ بِهِ مِنْهُنَّ فَآتُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ﴾ زانایان جیاوازیان هەیە لە مەبەست بە "الإستمتاع" لەسەر دوو بۆچوون:

یەکەم: بریتییە لە هاوسەرگیری و "الأجور" بریتییە لە مارەیی، ئەمە مەزهەبی "ابن عباس" و مجاهد و جمهورە.

---

[1] سنن ابن ماجة: ٦٣١/١.

[2] واتە نەسخبوونەوەی لە قورئاندا روویداوە، شوێنی باسکردنی میراتی ژن هەشتیەك و چواریەکە بەڵام ئەو لەوەدا بەشی نییە.

[3] سورة المؤمنون/٥-٧.

[4] الناسخ والمنسوخ ص٣٣.

[5] نواسخ القرآن ص١٢٤.

دووەم: بریتییە لە موتعە کە لە سەرەتاوە پیاوێك ئافرەتێکی مارە دەکرد بۆ ماوەیەکی دیاریکراو و دوو شایەتی دەگرت، کاتێك ماوەکە تەواو دەبوو هیچ مافێکی بەسەریەوە نەدەما، دەستەیەك ئەمەیان وتووە لەوانە "السدي"

پاشان جیاوازی کەوتۆتە نێوانیانەوە ئایا ئایەتەکە موحکەمە یان نەسخکراوەتەوە، دەستەیەك دەڵێن:

موحکەمە و دەستەیەکیش دەڵێن نەسخکراوەتەوە، ئەوانەش کە دەڵێن نەسخکراوەتەوە جیاوازی کەوتۆتە نێوانیانەوە بە چی نەسخکراوەتەوە، ئەمەش دوو قسەیە:

یەکەم– بە واجبوونی عیدە لە ئایەتی: ﴿يَاأَيُّهَا النَّبِيُّ إِذَا طَلَّقْتُمْ النِّسَاءَ فَطَلِّقُوهُنَّ لِعِدَّتِهِنَّ﴾[1] ﴿وَالْمُطَلَّقَاتُ يَتَرَبَّصْنَ﴾[2] الآيه

﴿وَاللاَّئِي يَئِسْنَ مِنْ الْمَحِيضِ﴾[3] الآية.

دووەم– بە نەهی پێغەمبەر(ﷺ) لە موتعە نەسخکراوەتەوە، ئەم قسەیە وەرناگیرێت لە دوو رووەوە:

یەکەمیان: ئایەتەکەی پێشوو بۆ رۆشنکردنەوەی گرێبەستی هاوسەرگیرییە بە بوونی وشەی "محصنين" واتە هاوسەردارانی گرێبەستکاری هاوسەرگیری، بۆیە مانای ئایەتەکە﴿فَمَا اسْتَمْتَعْتُمْ بِهِ مِنْهُنَّ﴾ لەرووی ئەو هاوسەرگیرییە وەسفکراوەوەیە(واتە ناسراو لە شەریعەتدا کە بریتییە لە هاوسەرگیری ئاسایی بۆ درێژایی ژیان) ئەوانە مارەییەکانیان بدەنێ، پێویست بە زۆر لەخۆکردن ناکات، موتعە بە سوننەتی پێغەمبەر(ﷺ) دروست بووە و بە سوننەتی پێغەمبەر(ﷺ) رێگری لێکراوە.

---

[1] سورة الطلاق/١.

[2] سورة البقرة/٢٢٨.

[3] سورة الطلاق/٤.

**دەرئەنجام:**

لەم خستنەرووەوە لە مانای بەمەبەستگیراوی ئایەتی: ﴿فَمَا اسْتَمْتَعْتُمْ بِهِ مِنْهُنَّ فَآتُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ﴾ دوو قسە هەیە:

یەکەمیان: مەبەست بەم ئایەتە بریتییە لە هاوسەرگیری شەرعی هەمیشەیی ناسراو کە بە ئەرێکردن و قبوولْ کردن تەواو دەبێت و ئامادەبوونی دوو شایەت و مارەیی بەبێ دیاریکردنی کات یان مەرج، ئەم هاوسەرگیرییە هەموو مافەکان و ئەرکەکانی هاوسەرداری لەسەر پەیدا دەبێت، لەوانە مافی خەرجی و پابەندبوون بە عیدە دوای جیابوونەوە، هەروەها مافی میرات و رەچەڵەکی شەرعی و شتانی تر، ئەم ئاراستەیە راست و دروستە بەم هۆیانە:

١.ئایەتەکە﴿فَمَا اسْتَمْتَعْتُمْ بِهِ مِنْهُنَّ فَآتُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ﴾ لە میانەی خستنەرووی توخمەکان و حوکمەکانی هاوسەرگیری شەرعی هەمیشەییدا هاتووە.

٢.خودا چێژوەرگرتنی شەرعی و حەڵاڵبوونی تێکەڵی لە هاوسەرگیری دروستی هەمیشەیی و "ملك اليمين"دا داناوە، هەر رێگەیەکی تری سێیەم بۆ چێژوەرگرتنی رەگەزی دەستدرێژیکردنە بۆ سەر خودا و شەریعەتی خودا، لە ئایەتی: ﴿وَالَّذِينَ هُمْ لِفُرُوجِهِمْ حَافِظُونَ، إِلاَّ عَلَى أَزْوَاجِهِمْ أَوْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُهُمْ فَإِنَّهُمْ غَيْرُ مَلُومِينَ، فَمَنْ ابْتَغَى وَرَاءَ ذَلِكَ فَأُولَئِكَ هُمْ الْعَادُونَ﴾[1]

پێشتر چەندین جار باسی ئەوەمان کردووە قورئان یەك "یەکە"یە و پارچە پارچە ناکرێت و هەندێکی تر تایبەتی دەکات یان سنوورداری دەکات یان تەفسیری دەکات و هاوشێوەکانی ئەمانە بە چاوداخستن لە سورەت و جێگەی ئایەتەکە، بۆیە "هم العادون" بەڵگەیە لەسەر ئەوەی گرتنەبەری رێگەی سێیەم بۆ چێژوەرگرتنی رەگەزی جگە لە هاوسەرگیری دروستی ئاسایی هەمیشەیی و "ملك اليمين" کە رۆڵی بەسەرچووە بە بەزاندنی سنوورەکانی خودا-سبحانه وتعالى- دادەنرێت و

---

[1] سورة المؤمنون/٥-٧ "هم العادون"بۆ کورتهەڵهێنانە بە نیمچەبەڵگەی "ضمیر الفصل" واتە ئەوانەی سنووربەزێنی دەکەن بۆ ئەو شتانەی بۆیان حەڵاڵ نییە.

دەفەرموێت: ﴿تِلْكَ حُدُودُ اللّهِ فَلاَ تَعْتَدُوهَا وَمَن يَتَعَدَّ حُدُودَ اللّهِ فَأُوْلَـئِكَ هُمُ الظَّالِمُونَ﴾[1]

بۆیە کاری موتعە بەزاندنی سنووری خودایە و بەزێنەر ستەمکارە لە خۆی کاتێك خۆی رووبەرووی سزا دەکاتەوە بەهۆی سەرپێچی لە فەرمانی خوداوە، هەروەها ستەمکارە لە ئافرەتێك کە کاری سەرجێیی لەگەڵ ئەنجام دەدات بۆ چەند کاتژمێرێکی کەم یان چەند رۆژێك لە رێگەی کاری موتعەوە و پاشان بۆ کەسانی تری بەجێدەهێڵێت، ئیتر بەم جۆرە تا داهاتووی ئەو ئافرەتە دەروخێنرێت کاتێك دەکەوێتە قۆناغی پیرێتییەوە و کەس ئارەزووی بۆی نامێنێت، هەروەها ستەمکارە لەو منداڵەی کە لە رێگەی هاوسەرگیری موتعەوە دروست دەبێت کاتێك دەبێت بە ئاوارەیەك و بارێك بەسەر کۆمەڵگەوە، هەروەها ستەمکارە لە لاوان کە گەنجێتیان لە رێگەی موتعەوە بەسەر دەبەن بەبێ دروستکردنی خێزان لە گەنجییەوە، هەر بەو جۆرە ستەمکارە لە کۆمەڵگە کە فەسادی رەگەزی تیایدا بڵاو دەکاتەوە.

ئاراستەی دووەم: لە مەبەستی ئایەتی: ﴿فَمَا اسْتَمْتَعْتُم بِهِ مِنْهُنَّ فَآتُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ﴾ بریتییە لە موتعە، سەرخەرانی ئەم ئاراستەیە بەسەر دوو قسەدا دابەشبوون:

یەکەم: قورئان لە ئایەتەکەدا بە دەق رێگەی داوە بە موتعە و نەسخ نەکراوەتەوە چونکە قورئان بە فەرموودەی ئاحاد نەسخ نابێتەوە و نەسخەکەی لە بابەتی موتعە لە قورئاندا جێگیر نەبووە، و ئایەتی عیدە و میرات نابنە نەسخکەر بۆ خودی موتعە، بەڵکو نەسخکارن بۆ هەندێ لە حوکمەکانی کە بریتییە لە عیدە و میرات، چونکە هاوسەرگیری موتعە میراتی پێ جێگیر نابێت، گەر یەکێك لە دوو کەسەکە(دوو کەسە موتعەکارەکە) لە کاتی ماوەی دیاریکراوی موتعەدا مرد ئەویتریان میراتی لێ ناگرێت، وەك چۆن ماوەکە گەر تەواو بوو عیدەی لەسەر پێویست نابێت، ئەم قسەیە لای

[1] سورة البقرة/٢٢٩.

ئیمامیەکان باوە وەك "الطبرسي" دەڵێت و پێشتر لە خستنەڕووی ئەم بابەتەدا لێیەوە گواستمانەوە.

قسەی دووەم: موتعە بە فەرموودەی ئاحاد نەسخکراوەتەوە یان بە ئایەتی میراتگری ژن یان بە ئایەتی عیدە بەپێی ئەو جیاوازیانەی پێشتر باسکران.

دروست ئەوەیە موتعە لە سەرەتاوە بە سوننەتی پێغەمبەر(ﷺ) جێگیر بووە بەهۆی زەرورەتەوە و پاشان بە سوننەتی پێغەمبەر(ﷺ) نەسخکراوەتەوە کاتێك ئەو حاڵەتانە کۆتاییان پێهات و سەرئەنجامە ناباشەکانی ئەم کارە سێکسییە بەدەرکەوتن لەوانەی باسمان کرد: ستەم لە ئافرەتەکە و منداڵ و گەنجێتی و کۆمەڵگە هەروەها بوون بە هۆی بڵاوەکردنی نەخۆشی ترسناك لە پێش هەموویانەوە نەخۆشی ئایدز.

—ئایەتی(٢٩):﴿يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لاَ تَأْكُلُوا أَمْوَالَكُمْ بَيْنَكُمْ بِالْبَاطِلِ ﴾[1]

ابن سلامة[2] دەڵێت: کاتێك ئەم ئایەتە دابەزی لەوەی خواردن لە باشترین ماڵ و سامانە، چونکە پەیکەری مرۆڤی پێوە راوەستاوە بۆیە هاوەڵان بارگران بوون لەوەی خواردن لەگەڵ کوێر و شەل و نەخۆشدا بخۆن و وتیان: کوێر تەماشای خۆشییەکانی خواردن ناکات و شەل ناتوانێت بەجوانی دابنیشێت و خواردنەکەی بەخۆشی و بەباشی بخوات و نەخۆشیش پێشمان ناکەوێت لە خواردن و قووتداندا بۆیە خۆیان گرتەوە لە خواردن لەگەڵیان تا خودا لە سورەتی "النور"دا ئەم ئایەتەی دابەزاند[3] ﴿لَيْسَ عَلَى الأَعْمَى حَرَجٌ﴾ ماناکەی بارگرانی لەسەر ئەو کەسە نییە لەگەڵ کوێر نان بخوات، بارگرانی هەڵگیراوە لەسەری، هەر بەو جۆرە لەگەڵ شەل، واتە بارگرانی لەسەر ئەو کەسە نییە گەر بیەوێت لەگەڵ کەسێکی شەل نان بخوات، هەروەها لەسەر

---

[1] سورة النساء/٢٩.

[2] الناسخ والمنسوخ ص١٠٨.

[3] الآية/٦١ (ليس على الاعمى حرج ولا على الاعرج حرج ولا على المريض حرج) الآية.

نەخۆش بارگرانی نییە، بۆیە ئەم ئایەتە بوو بە نەسخکەرەوەی ئەو بارگرانییەی بۆیان روویدابوو.

"ابن حزم[1] الاندلسی" پێش ئەوە کەوتووە "ابن سلامە" دەیڵێت.

ئەم بۆچوونە لەو دوو کەسەوە و لەوانەی لەگەڵ ئەوان هاوڕان پـووچ و بێبنەمایـە، بەم بەڵگانە:

١.نەبوونی هیچ بەرهەڵستییەك لە نێوان دوو ئایەتەکـەدا، نەسـخ بریتییـە لـە لقـی بەرهەڵستکاری، "ابن الجوزي"[2] دەڵێت: هەندێ لەوانەی خۆیان بە ئەهلی تەفسیر و بانگەشەکەری زانسـتی "الناسـخ والمنسـوخ" دادەنـێن پێیانوایـە ئـەم ئایەتـە کاتێـك دابەزی بارگرانیان بۆ دروست بوو لـەوەی خـواردن لەگـەڵ کـوێر و شـەل و نەخۆشـدا بخۆن، چونکە کوێر تەماشای خۆشییەکانی خواردن ناکات و شەل ناتوانێت بـەجوانی دابنیشێت و خواردنەکەی بەخۆشی و بەباشی بخوات و نەخۆشیش پێشمان ناکـەوێت لـە خـواردن و قووتدانـدا بۆیـە خـودا ﴿لَـيْسَ عَلَـى الأَعْمَـى حَـرَجٌ﴾ دابەزانـد و ئـەو ئایەتەی سڕییەوە، ئەم قسەیە بێبنەمایە و هیچ نەرێکارییەك لە نێوان دوو ئایەتەکـەدا بوونی نییە.

تـەئویلی دوور کـە بانگـەرانی نەسـخی ئـەم ئایەتـە بـۆی دەچـن لـە مەبەسـت لـە ئایەتی:﴿لَيْسَ عَلَـى الأَعْمَـى حَـرَجٌ﴾ بـارگرانی بـۆ کەسـێك نییـە لەگـەڵ کـوێر نـان بخوات، هەروەها مانای ﴿وَلَا عَلَى الْأَعْرَجِ حَرَجٌ﴾ واتە بارگرانی لەسەر کەسێك نییـە لەگەڵ شەل نان بحوات[3] هەروەها مەبەست بە:﴿وَلاَ عَلَى الْمَرِيضِ حَرَجٌ﴾ بارگرانی لەسەر کەسێك نییە لەگەڵ نەخۆش نان بخوات، تەئویلێکە ژێری تەندروسـت قبـووڵی ناکات، چونکە ئایەتەکە دەقێکی بڕاوەیە لە نەرێکردنی بارگرانی لەسەر کەسی کوێر و

---

[1] الناسخ والمنسوخ في القرآن الكريم ص٣٣-٣٤.

[2] نواسخ القرآن ص١٢٦.

[3] من انصار عدم النسخ الصاوي: ٢١٦/١ والرازي: ٧٠/١٠.

شەل و نەخۆش لە هەموو شتێکدا ئەو حاڵەتانە دەبنە عوزر بۆیان، بۆیە دەقەکە شان ناداتە ژێر ئەو جۆرە تەئویلە و بە کۆدەنگی تەئویلێکی پووچەڵە.

پووچەڵبوونەوە بریتییە لە بانگەشەی نەسخی ئایەتی (٢٩)ی سورەتی "النساء" و تەئویلی ناماقووڵی باسکراو، بەپێی ئەو تەفسیرە باوەڕپێکراوانەی خوێندوومەتەوە پشتیوانی نەسخبوونەوەی ناکرێت، بەڵکو زۆربەیان باسی بابەتی نەسخی ئەو ئایەتەیان نەکردووە.

ئایەتەکە گشتی و گشتگیرە بۆ خواردنی هەر ماڵێك بە رێگەی ناڕەوا، یەکسانە خواردنی ماڵەکە ماڵی خۆی بێت وەك خەرجکردن لە یاخیبووندا یان کەسانی تر خاوەنی بن بە ناحەق لە رێگەی داگیرکردنەوە بێت یان دزی یان غەش یان ناپاکی لە ئەمانەت و هاوشێوەکانی ئەمانە.

٤-مەبەست بە "خواردن" لەم ئایەتە و هاوشێوەکانی ئەم ئایەتە مانا زمانەوانییەکە نییە وەك بانگەشەکەرانی نەسخ بۆی دەچن، بەڵکو مەبەست پێی مانا عورفییە شەرعییەکەیەتی کە بریتییە لە هەر دەستدرێژییەك بۆ سەر ماف کەسانی تر بەبێ پاساو یەکسانە خواردن بە مانا زمانەوانییەکەی بێت یان دەستدرێژکاری بۆ سەر ماف کەسانی تر بەبێ پاساو، بۆیە داگیرکەر بریتییە لە بخۆری ماڵی داگیرکراو، یەکسانە ماڵە داگیرکراوەکە خواردن بێت یان خانووبەرە یان شمەك یان پارە و شتانی تریش، هەر بەو جۆرە دز و هەر دەستدرێژکارێك بۆ سەر ماف کەسانی تر بەبێ هۆیەکی رەوا.

-ئایەتی(٣٣):﴿وَلِكُلٍّ جَعَلْنَا مَوَالِيَ مِمَّا تَرَكَ الْوَالِدَانِ وَالأَقْرَبُونَ وَالَّذِينَ عَقَدَتْ أَيْمَانُكُمْ فَآتُوهُمْ نَصِيبَهُمْ إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ شَهِيدًا﴾[1]

الطبري[2] دەڵێت: (لەسەر حوكمەكەیان جیاوازیان هەیە، ئایا نەسخكراوەتەوە یان نەسخ نەكراوەتەوە، گونجاو نییە بڕیار بەسەریدا دەربكەیت بەوەی نەسخكراوەتەوە لەگەڵ جیاوازی بۆچوونەكان لەسەری، بۆ واجبوونی حوكمەكەی و نەرێكردنی نەسخ لێی ڕوویەكی دروست بوونی هەیە، مەگەر بە بەڵگەیەك پێویست بێت خۆتی پێ ڕادەست بكەیت، تەئویلەكە ئەوەیە "عَقَدَتْ أَيْمَانُكُمْ" بریتییە لە سوێند، "فَآتُوهُمْ نَصِيبَهُمْ" لە سەرخستن و كۆمەكی و ئامۆژگاری)

"الطبرسي"[3] دەڵێت: (لە سەردەمی نەفامیدا پیاوێك لەگەڵ پیاوێكی تر گرێبەستی دەبەست و دەیوت: خوێنی من خوێنی تۆیە و جەنگی من جەنگی تۆیە و ئاشتی من ئاشتی تۆیە و میراتگرانت میراتگری منن، خوێن وەرگرتنی من خوێن وەرگرتنی تۆیە، ئەو كات كەسە هاوپەیمانەكە شەش یەكی لە كەسە هاوپەیمانەكەی تر لە میرات دەبرد، پاشان ئەمە بەم ئایەتە نەسخكرایەوە:﴿وَأُولُوا الأَرْحَامِ بَعْضُهُمْ أَوْلَى بِبَعْضٍ﴾ "مجاهد" دەڵێت: ماناكەی بەشی خۆیان لە سەرخستن و ڕاوێژ و پەیوەندی و پێبەخشین پێ بدە نەك میرات، لەسەر ئەمە ئایەتەكە نەسخ نەكراوەتەوە و ئەم ئایەتە پشتیوانی دەكات:﴿أَوْفُوا بِالْعُقُودِ﴾ هەروەها فەرموودەی پێغەمبەر(ﷺ) ((ئەوەی پەیمانی سەردەمی نەفامییە دەستی پێوە بگرن، چونكە ئەوە زیاتر توندكراوەتەوە))

القرطبي[4]دەڵێت: دەستەیەك دەڵێن ئەم ئایەتە:﴿وَالَّذِينَ عَقَدَتْ أَيْمَانُكُمْ﴾ موحكەمە و نەسخ نەكراوەتەوە، بەڵكو خودا فەرمانی بە باوەڕداران كردووە

---

[1] سورة النساء/٣٣.

[2] جامع البيان في تفسير القرآن: ٣٧/٥.

[3] مجمع البيان: ٤٢/٣.

[4] الجامع لاحكام القرآن: ١٦٦/٥.

سەرخستن و ئامۆژگاری و هاوشێوەکانی ئەمانە بە هاوپەیمانەکانیان ببەخشن، "الطبري" لە "ابن عباس"ەوە باسی کردووە)

"النحاس"[1] باسی جیاوازی لە نەسخبوونەوەی ئایەتەکە دەکات و دەڵێ: (لەوانەی وتوویانە ئایەتەکە موحکەمە "مجاهد و سعید بن جبیر"ن، "مجاهد" دەڵێ: "فآتوهم نصیبهم" لە ژیری و راوێژ و پەیوەندی و پێبەخشین... "سعید بن جبیر" دەفەرموێت: "فآتوهم نصیبهم" لە کۆمەکی و سەرخستن)

پاشان "النحاس" پارسەنگی ئەم ئاراستەی داوە و دەڵێت: ئەمە لەپێشترە لەوەی لەسەر ئایەتەکە وتراوە موحکەمە بە دوو هۆ:

یەکەمیان: ئەوە وادەکات مانای نەسخ تەنها لەو رێگەیەوە و لەوەی نەرێکراو بێت تێر و تەواو بێت، بەڵام ئەوەی ماناکەی دروستە –کە ئەوەیە خوێنراوەتەوە– دوورە لە "الناسخ والمنسوخ".

هۆی دووەم– بریتییە لە فەرموودەکەی پێغەمبەر(ﷺ) ((لە ئیسلامدا هاوپەیمان نییە {واتە لەناو موسڵماناندا} هەر هاوپەیمانییەك لە نەفامیدا هەبووبێت ئیسلام زیاتر توندی دەکاتەوە)) بەم فەرموودەیە رۆشنی کردەوە هاوپەیمانی نەسخ نەکراوەتەوە[2]، تەفسیری "الكشاف" فەرموودەیەکمان لە رێگەیەکی ترەوە بۆ دەگوێزێتەوە کە بریتییە لە: ((هەر هاوپەیمانییەك لە سەردەمی نەفامیدا هەبووە دەستی پێوە بگرن، چونکە ئیسلام زیاتر توندی کردۆتەوە))[3].

"الرازي"[4]دەڵێت: (ماناکەی ئەوەی بەجێماوە(لە میرات) لەوانەوە هاوپەیمانیتان لەگەڵیان دامەزراوە و کەسەکە میراتگری خۆی هەیە ئەو لەپێشترە بە میراتەکە، خودا میراتگری بە "مولى" ناوبردووە، ماناکەی ماڵ و سامان مەدەن بە هاوپەیمان بەڵکو

---

[1] الناسخ والمنسوخ ص١٠٦.

[2] المرجع السابق ص١٠٧.

[3] ٥٢٣/١.

[4] التفسير الكبير: ٨٨/١٠.

بیدەن بە "المولی" واتە میراتگر لەسەر ئەم بۆچوونە نەسخ لە ئایەتەکەدا بوونی نییە)

دەرئەنجام:

لەم خستنەرووەوە ئەم خاڵانە وەردەگیرێن:

١.نەبوونی دژیەکی لە نێوان دوو ئایەتەکەدا، بەڵکو دەتوانرێت هەردووکیان کۆبکرێنەوە بەوەی "الرازي" دەڵێت: ئەوانەی پەیمانتان لەگەڵیان دامەزراوە ئەوەی بەجێی دەهێڵن و میراتگرانیان هەیە ئەوا ئەوانە لەپێشترن پێی، نەسخ لقە، بۆیە گەر ئەسڵەکە نەرێ کرا لقەکە(شوێنکەوتەکە)ش نەرێ دەکرێت.

٢.فەقیهانی شەریعەتی ئیسلام کۆدەنگیان هەیە لەسەر ئەوەی هەر کەس هاوپەیمانی لەگەڵ کەسێك بەست کە پەیوەندی خزمایەتی یان هاوسەرگیری پێکیانەوە نابەستێتەوە بەوەی ببێت بە میراتگری ئەو لەدوای مردنی کەسەکە پەیمانبەستنەکە پووچەڵ دەبێتەوە لە رووی میراتەوە و دەگۆڕرێت بۆ وەسێت[1].

٣- یان مەبەست بە "وآتوهم نصیبهم" لە وەسێت وەك النحاس[2]باسی کردووە لە "ابن عباس"ەوە کە دەڵێت ئایەتی:﴿وَالَّذِينَ عَقَدَتْ أَيْمَانُكُمْ فَآتُوهُمْ نَصِيبَهُمْ﴾ پیاوێك هاوپەیمانی لەگەڵ پیاوێکی تر دەبەست هەر کامیان مرد پێش هاوەڵەکەی ئەویتریان دەبووە میراتگری، بۆیە خودا ئەم ئایەتەی دابەزاند:﴿وَأُوْلُوا الأَرْحَامِ بَعْضُهُمْ أَوْلَى بِبَعْضٍ فِي كِتَابِ اللَّهِ مِنْ الْمُؤْمِنِينَ وَالْمُهَاجِرِينَ إِلاَّ أَنْ تَفْعَلُوا إِلَى أَوْلِيَائِكُمْ مَعْرُوفًا﴾ ئەوەیە وەسێتی بۆ بکات، چونکە ئەوە لە سێیەکی ماڵی مردوودا دروستە و کارێکی زانراوە.

٤.وتنی نەسخ تێکەڵییە لە نێوان نەسخ و تایبەتکردندا، چونکە ئایەتی: ﴿وَالَّذِينَ عَقَدَتْ أَيْمَانُكُمْ﴾ گرێبەست لەسەر میرات و شتانی تر دەگرێتەوە، بۆیە خودا بەم

---

[1] الناسخ والمنسوخ ص١٠٦.

[2] الناسخ والمنسوخ ص١٠٦.

ئایەتـە﴿وَأُوْلُـوا الأرْحَـامِ بَعْضُـهُمْ أوْلَـى بِـبَعْضٍ﴾ میراتـی لـیْ دەرکـرد، ئـەوەی "القرطبي"[1] گواستوویەتەوە پاڵپشتی ئەمە دەکات کە دەڵێت: دەسـتەیەك دەڵـێن ئایەتی:﴿وَالَّـذِينَ عَقَـدَتْ أَيْمَـانُكُمْ﴾ موحکەمـە و نەسـخ نەبووەتـەوە، بـەڵکو خـودا فەرمانی کردووە بە باوەڕداران بەشی خۆیانی پیْ بدەن لە سەرخستن و ئامۆژگـاری و هاوشێوەکانی ئەمانە، الطبري لە "ابن عباس"ەوە باسی کردووە ﴿وَالَّـذِينَ عَقَـدَتْ أَيْمَانُكُمْ فَآتُوهُمْ نَصِيبَهُمْ﴾ واتە لە سەرخستن و ئامۆژگاری و پەیوەندی و پاڵپشـتی و پێبەخشین[2] و وەسێت بۆ کردنیان، میرات کۆتـایی پێهـاتووە، ئەمـەش بۆچـوونی "مجاهد والسدي"، دەڵێم هەڵبژاردەی "النحاس"یشە و لە "سعید بن جـبیر"ەوە دەیگێڕێتەوە، نەسخ دروست نییە، چونکە کۆکردنـەوە گونجـاوە وەك "ابـن عبـاس" ڕۆشنی کردۆتەوە لەوەی "الطبري" باسی کردووە، هەروەها "البخاري" لـە "کتـاب التفسیر"دا لێیەوە گێڕاویەتەوە[3].

٥.هـەموو بەشـێکی قورئـان بـە تـەواتور و بەڵگـەی بـڕاوە جـێگیر بـووە، ئـەوەی جێگیربوونەکـەی بـڕاوە بێـت تـەنها بـە بەڵگـەی بـڕاوە دەسـڕێتەوە، ئەگـەرەکان و جیاوازییـەکان و ئیجتیهـادە باسـکراوەکان بەڵگـەی گومانئـامێزن و دروسـت نییـە بەڵگەیان پیْ بهێنرێتەوە بۆ نەسخی ئەوەی بـوونی بـە بەڵگـەی بـڕاوە جـێگیر بـووە، سـەرباری ئـەوە ڕێسـای گشـتی داوا دەکـات گـەر "إحتمـال–ئەگـەر" لـە شـتێکدا سەریهەڵدا بەڵگە پیْ هێنانەوەی پووچ دەبێتەوە.

٦.مانەوەی ئایەتەکە لەڕووی خوێندنەوەوە بەڵگەیە لەسەر مانەوەی حوکمەکەی، چونکە وتنی دابەشکردن بۆ ئەوانەی حوکمەکانیان سڕاوەتەوە بـەبیْ خوێندنـەوەیان یان بە پێچەوانەوە بە شایەتی ئەهلی خۆی پووچەڵمان کردەوە.

---

[1] الجامع لاحكام القرآن: ١٦٦/٥.

[2] بكسر الراء العطاء والصلة.

[3] لـــە ســـەرخەرانی نەســـخ نەبوونـــەوەی: الـــرازي:٨٥/١٠ والالوســـي:١٩/٥ والكياالهراسي:٤٤٤/٢ والطبري:٣٧/٥.

-ئایەتی(٤٣):﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لاَ تَقْرَبُوا الصَّلاَةَ وَأَنْتُمْ سُكَارَى[1]﴾

بانگکەرانی نەسخ پێیانوایە[2] خودا خواردنەوەی مادە مەستکەرەکانی لەسەریان حەرامکردووە لە کاتەکانی نوێژدا، پاشان حەرامکردنەکەی نەسخ کردۆتەوە لە هەموو کاتێکدا بە ئایەتی:﴿فَاجْتَنِبُوهُ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ﴾[3] هەندێکی تر دەڵێن ئەم بەشەی ئایەتی("٩١"ی سورەتی "المائدة") نەسخی کردۆتەوە:﴿فَهَلْ أَنْتُمْ مُنتَهُونَ﴾[4].

پێشتر ئەوەمان سەلماند بانگەشەی نەسخ لە حوکمەکانی ئارەقدا بانگەشەیەکی پووچە و تێکەڵییە لە نێوان پلە بە پلەیی و نەسخدا[5].

-ئایەتی(٦٣):﴿أُوْلَئِكَ الَّذِينَ يَعْلَمُ اللَّهُ مَا فِي قُلُوبِهِمْ فَأَعْرِضْ عَنْهُمْ وَعِظْهُمْ وَقُلْ لَهُمْ فِي أَنفُسِهِمْ قَوْلاً بَلِيغًا﴾[6]

بانگەشەکەرانی نەسخ پێیانوایە[7] ئەمە لە سەرەتای ئیسلامەوە بووە و بە ئایەتی شمشێر نەسخکراوەتەوە.

---

[1] سورة النساء/٤٣.

[2] الناسخ والمنسوخ لابن سلامة ص١٠٩. الناسخ والمنسوخ للنحاس ص١٠٨.

[3] سورة المائدة/٩٠.

[4] سورة المائدة/٩١.

[5] لە سەرخەرانی نەسخ نەبوونەوە: الرازي:١١٠/١٠ والالوسي: ٣٤/٥ والصاوي: ٢٢٢/١ والكياالهراسي: ٤٥٨/٢.

[6] سورة النساء/٦٣.

[7] ابن سلامة المرجع السابق ص١١٠، وابن حزم الاندلسي الناسخ والمنسوخ ص٣٤، ابن الجوزي نواسخ القرآن ص١٣١ تيايدا ئەهلی تەفسیر دەڵێن: (لەم ئایەتەکە پێشخستن و دواخستن هەیە کە تەقدیرەکەی: "فعظهم فإن امتنعوا عن الاجابة فاعرض عنهم- ئامۆژگارییان بکەن گەر نەیانویست وەڵام بدەنەوە پشتیان لێ بکەن" ئەمە پێش فەرمان کردن بوو بە جەنگان، پاشان ئەوە بە ئایەتی شمشێر نەسخ کرایەوە).

ئەمە بانگەشەیەکی پووچ و بێبنەمایە بە کۆمەڵێك هۆ و بەڵگە پێشتر باسمان کردن، لەوانە:

١.تێکەڵییە لە نێوان نەسخ و تایبەتکردندا، بۆیە هەر ئایەتێك پێیانوایە نەسخکراوەتەوە بە ئایەتی شمشێر تایبەتکەری ئایەتەکەیە.

٢.ئایەتی شمشێر تەنها لە باری دەستدرێژی کردنە سەر ئیسلام و موسڵمانان لە ئایین یان ژیان یان نامووس یان ماڵ و سامانیان پیادە دەکرێت، چونکە ئەسڵ لە ئیسلامدا بریتییە لە ئاشتی و جەنگ هەڵواردەیە و تەنها لەباری بەرگری رەوا و زەرورەتدا رەوایە، زەرورەتیش بە ئەندازەی خۆی ئەندازەگیری بۆ دەکرێت[١].

—ئایەتی(٦٤):﴿وَلَوْ أَنَّهُمْ إِذْ ظَلَمُوا أَنفُسَهُمْ جَاءُوكَ فَاسْتَغْفَرُوا اللَّهَ وَاسْتَغْفَرَ لَهُمُ الرَّسُولُ لَوَجَدُوا اللَّهَ تَوَّابًا رَحِيمًا[٢]﴾.

بانگکەرانی نەسخ[٣] دەڵێن نەسخکراوەتەوە بەم ئایەتە:﴿اسْتَغْفِرْ لَهُمْ أَوْ لاَ تَسْتَغْفِرْ لَهُمْ إِنْ تَسْتَغْفِرْ لَهُمْ سَبْعِينَ مَرَّةً فَلَنْ يَغْفِرَ اللَّهُ لَهُمْ﴾[٤] پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت: (زیاتر لە حەفتا دەکەم)[٥] خودا ئەم ئایەتەی دابەزاند﴿سَوَاءٌ عَلَيْهِمْ أَاسْتَغْفَرْتَ لَهُمْ أَمْ لَمْ تَسْتَغْفِرْ لَهُمْ لَنْ يَغْفِرَ اللَّهُ لَهُمْ﴾[٦] بۆیە ئەمە بوو بە نەسخکەرەوەی ئەوەی پێش خۆی.

---

[١] من انصار عدم النسخ الرازي: ١٠/١٥٨ والصاوي: ١/٢٢٧.

[٢] سورة النساء/٦٤.

[٣] منهم ابن سلامة المرجع السابق ص١١٠.

[٤] سورة التوبة/٨٠.

[٥] ذكره ابن كثير في تفسيره: ٢/٣٧٦ ونصه: عن ابن عباس: كاتێك ئەم ئايەتە دابەزى ثێغەمبەر(ﷺ) فەرمووي:((خودا روخسەتي ثێداوم، سوێند بە خودا زياتر لە حەفتا جار داواي لێخۆشبوونيان بۆ دەكەم بەڵكو خودا لێيان خۆش ببێت)).

[٦] سورة المنافقون/٦.

بانگەشەی نەسخ پووچەڵە بەم بەڵگانە:

یەکەم—نەبوونی هیچ بەرهەڵستییەك لە نێوان ئایەتی(٦٤)ی سورەتی "النساء" و ئایەتی(٨٠)ی سورەتی "التوبة"دا بەهۆی جیاوازی مەرجەوە، ئایەتی یەکەم بەردەوام نەبوونیان لەسەر دووڕوویی تیادا بەمەرجگیراوە، ئایەتی دووەم بەردەوامبوونیان لەسەر دووڕوویی تیادا بەمەرجگیراوە، بۆیە تەقدیری دوو ئایەتەکە بەم جۆرەیە:

﴿وَلَوْ أَنَّهُمْ إِذْ ظَلَمُوا أَنفُسَهُمْ﴾ وازیان لە دووڕوویی هێنا و بە گوفتار و بە کردار و بە ناوەوە و بە دەرەوە تەوبەیان کرد﴿جَاءُوكَ﴾ بە دڵێکی تەندروستەوە ﴿فَاسْتَغْفَرُوا اللَّهَ﴾ بە داوای لێخۆشبوونی راستەقینەوە ﴿وَاسْتَغْفَرَ لَهُمُ الرَّسُولُ﴾ سەرباری تەوبەکەیان و پاکبوونەوەی پەنهانیان ﴿لَوَجَدُوا اللَّهَ تَوَّابًا رَحِيمًا﴾.

"الرازي" دەڵێت: لە حیکمەتی داوای لێخۆشبوونی پێغەمبەر بۆیان لە پاڵ تەوبەکەیاندا:

کەسێك بۆی هەیە بڵێت: ئایا گەر داوای لێخۆشبوونیان بکردبایە و بە رێگەیەکی دروست تەوبەیان بکردبایە تەوبەکەیان قبوڵ نەدەبوو، چ سوودێك هەیە لە خستنەپاڵی داوای لێخۆشبوونی پێغەمبەر(ﷺ) بۆ داوای لێخۆشبوونی ئەوان، وەڵامەکەی لە چەند روویەکەوە:

یەکەم—ئەو گەڕانەوەیان بۆ لای حوکمی تاغوت[1] سەرپێچی بووە بۆ حوکمی خودا و خراپەکاری بووە لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) و خەم کردن بووە بە دڵیدا، هەر کەس گوناهەکەی بەو جۆرە بێت ئەوا بەو گوناهە داوای لێبوردن لەسەری پێویست دەبێت بەرانبەر کەسانی تر، بۆ ئەو مەبەستە پێویستە لەسەریان داوا لە پێغەمبەر(ﷺ) بکەن داوای لێخۆشبوونیان بۆ بکات.

---

[1] ئاماژەیە بە ئایەتی: (أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ يَزْعُمُونَ أَنَّهُمْ آمَنُوا بِمَا أُنزِلَ إِلَيْكَ وَمَا أُنزِلَ مِنْ قَبْلِكَ يُرِيدُونَ أَنْ يَتَحَاكَمُوا إِلَى الطَّاغُوتِ وَقَدْ أُمِرُوا أَنْ يَكْفُرُوا بِهِ وَيُرِيدُ الشَّيْطَانُ أَنْ يُضِلَّهُمْ ضَلَالًا بَعِيدًا)سورة النساء/٦٠.

دووەم—ئەو دەستەیە کاتێك رازی نەبوون بە حوکمی پێغەمبەر(ﷺ) ئەو یاخیبوونەوەیان لێوەشایەوە، گەر تەوبە بکەن پێویستە لەسەریان کارێك بکەن ئەو یاخیبوونەیان لەسەر بسڕێتەوە.

ئەوەش بەوە دەبێت بچن بۆ خزمەتی پێغەمبەر(ﷺ) و داوای لێ بکەن داوای لێخۆشبوونیان لە خودا بۆ بکات.

سێیەم—لەوانەیە گەر تەوبە بکەن بە رێگەیەکی ناتەواو کارەکە ئەنجام بدەن، گەر داوای لێخۆشبوونی پێغەمبەری(ﷺ) بخرێتە پاڵ شایستە دەبێت بە قبووڵ کردن.

دانانی ئایەتی دووەم بە نەسخکەر—بەپێی بۆچوونی ئەوان—: گەر ئەهلی دووڕوویی بێن و داوای لێبوردنت لێ بکەن و ناخ و ناوەوەیان پەردەپۆش بکەن و لەسەر دووڕووییان لە ناوەوە بەردەوام بن [1] و بێنە لات﴿اسْتَغْفِرْ لَهُمْ أَوْ لاَ تَسْتَغْفِرْ لَهُمْ إِنْ تَسْتَغْفِرْ لَهُمْ سَبْعِينَ مَرَّةً فَلَنْ يَغْفِرَ اللّهُ لَهُمْ ذَلِكَ بِأَنَّهُمْ كَفَرُوا﴾ لە رابردوودا و تاکو ئێستاش بەردەوامن لەسەر بێباوەڕییان لە ناوەوە﴿بِاللّهِ وَرَسُولِهِ وَاللّهُ لاَ يَهْدِي الْقَوْمَ الْفَاسِقِينَ﴾ هەتا ئەوان پارێزگاری لە لادان و دووڕوویی خۆیان بکەن لە ناوەوە.

دووەم—ئایەتی(٦)ی سورەتی "المنافقون" رۆشنکردنەوەی مەرامی ئایەتی(٨٠)یە بەوەی ژمارەی هاتوو تیایدا بریتییە لە﴿إِنْ تَسْتَغْفِرْ لَهُمْ سَبْعِينَ مَرَّةً﴾ تێگەیشتنی پێچەوانەی نییە.

وتنی نەسخکەرەوەی ئایەتی (٦)ی سورەتی "المنافقون" بۆ ئایەتی(٨٠)ی سورەتی "التوبة" تێکەڵییەکە لە نێوان درێژەدان بە پوختە و نەسخدا[2].

---

[1] ابن الجوزي، نواسخ القرآن: ص١٣١.

[2] لە بانگەشەکەرانی نەسخ نەبوونەوە: الكياالهراسي:٢/٤٦٠ فما بعدها، والرازي:١٠/١٥٩، والصاوي:١/٢٢٨.

-ئایەتی(٧١): ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا خُذُوا حِذْرَكُمْ فَانفِرُوا ثُبَاتٍ أَوْ انفِرُوا جَمِيعًا﴾[1]

واتە حەزەری خۆتان لە دوژمنەکەتان وەربگرن، واتە خۆتان بپارێزن و بەئاگابن(فَانفِرُوا) واتە راپەڕن بۆ جەنگان لەگەڵیان(ثُبَاتٍ) واتە دەستەی جیاجیا و سریە لە دوای سریە(أَوْ انفِرُوا جَمِيعًا) واتە بەکۆ و هەمووتان پێکەوە، ئەم هەڵبژاردانە بۆ خاوەن ئەمر و سەرکردەی سوپایە بەپێی ئیجتیهادیان لەبەر رۆشنایی رەوشی راستبوووەوە.

بانگکەرانی نەسخ پێیانوایە[2] ئەم ئایەتە نەسخکراوەتەوە بەم ئایەتە:﴿وَمَا كَانَ الْمُؤْمِنُونَ لِيَنفِرُوا كَافَّةً فَلَوْلاَ نَفَرَ مِنْ كُلِّ فِرْقَةٍ مِنْهُمْ طَائِفَةٌ لِيَتَفَقَّهُوا فِي الدِّينِ وَلِيُنذِرُوا قَوْمَهُمْ إِذَا رَجَعُوا إِلَيْهِمْ لَعَلَّهُمْ يَحْذَرُونَ﴾[3].

ئەم بۆچوونە نادروستە لەبەر نەبوونی بەرهەڵستی نێوان دوو ئایەتەکە، بۆ پیادەکردنی هەر یەکێك لەوانە رەوشی تایبەت بەخۆی هەیە، لەوانەیە رەوشێك داوا بکات هەموو باوەڕداران پێویست بکات بجەنگن، یان لەوانەیە رەوشی جەنگەکە بخوازێت یان بەرگرییە رەواکە داوا بکات دەستە دەستە بجەنگن، باری تێکۆشەران بەپێی جیاوازی هێزی دوژمن چەك و ژمارەیان گۆڕانی بەسەردا دێت، هەروەها بەپێی ستراتیژی مەیدانی جەنگەکە و توانای باوەڕدارانی تێکۆشەر، خەملاندنی هەموو ئەمانە دەچێتە ژێر دەسەڵاتی پلاندانانی سەرکردەکانی سوپاوە یان بۆچوونی سەرکردەی گشتی هێزە چەکدارەکان.

پاشان گەر خۆمان رادەستی ئەوە بکەین ئەم ئایەتە نەسخکراوەتەوە ئەوا پێویست دەکات نەسخی هەموو ئایەتە هاوشێوەکانی بکەین، لەوانە: ﴿إِلاَّ تَنفِرُوا

---

[1] سورة النساء/٧١.

[2] لەوانە: ابن سلامة ص ١١١ ابن حزم الاندلسي ص ٣٤.

[3] سورة التوبة/١٢٢.

يُعَذِّبْكُمْ عَذَابًا أَلِيمًا﴾[1] هەروەها ﴿انفِرُوا خِفَافًا وَثِقَالاً﴾[2] هاوشێوەکانی ئەمانە، پێویست پووچەڵە و هەر بەو جۆرە پێویستکراویش.

—ئایەتی(٨٠):﴿مَنْ يُطِعِ الرَّسُولَ فَقَدْ أَطَاعَ اللَّهَ وَمَنْ تَوَلَّى فَمَا أَرْسَلْنَاكَ عَلَيْهِمْ حَفِيظًا﴾[3]

واتە تۆمان وەك موحاسەبەكەری ئەوان رەوانە نەكردووە، هەروەها تۆمان نەكردووە بە چاودێر بەسەریانەوە لێیان بپێچیتەوە، هەر بەو جۆرە تۆمان رەوانە نەكردووە وەك پارێزگار لەسەر كار و كردەوەكانیان، بەڵكو تۆمان وەك ترسێنەر رەوانە كردووە و كار و باری ئەوان بۆ لای ئێمە دەگەڕێتەوە تاكو پاداشت و سزای خۆیان وەربگرن.

بانگكەرانی نەسخ پێیانوایە[4] هەندێ لەم ئایەتە بە ئایەتی شمشێر نەسخكراوەتەوە كە ئەم بەشەیە:﴿وَمَنْ تَوَلَّى فَمَا أَرْسَلْنَاكَ عَلَيْهِمْ حَفِيظًا﴾.

ئەم بۆچوونە هەر لە سەرەتاوە پووچ و بێبنەمایە، بۆیە ئاتاج بە بەڵگە ناكات لەبەر نەبوونی بەرهەڵستكاری لە نێوان پیادەكردنی ئایەتی شمشێر كاتێك دەستدرێژكاری بوونی هەبێت و پیادە كردنی ئایەتی(٨٠)ی سورەتی "النساء" لە رەوشی ئاساییدا، ئەوە لە دەروازەی تێكەڵییە لە نێوان نەسخ و تایبەتكردندا[5].

---

[1] سورة التوبة/٣٩.

[2] سورة التوبة/٤١.

[3] سورة النساء/٨٠.

[4] منهم ابن سلامة المرجع السابق ص١١١ وابن حزم الاندلسي المرجع السابق ص٣٤ وعبد الرحمن بن زيد ابن الجوزي ص١٣٢.

[5] من انصار عدم النسخ الرازي: ١٠/١٧٦.

—ئایەتی(٨١):﴿فَأَعْرِضْ عَنْهُمْ وَتَوَكَّلْ عَلَى اللَّهِ وَكَفَى بِاللَّهِ وَكِيلاً﴾[1]
بانگکەرانی نەسخ دەڵێن[2] ئەم بەشەی ئایەتەکە:﴿فَأَعْرِضْ عَنْهُمْ﴾ بە ئایەتی شمشێر نەسخکراوەتەوە.

ئەم بۆچوونە رەد دەکرێتەوە بە نەبوونی بەرهەڵستکاری لە نێوان پشتهەڵکردن لەم ئایەتەدا و جەنگان لە ئایەتی شمشێردا، ئەمەش بەهۆی جیاوازی رەوشەکانەوە، پشتهەڵکردن دوای بانگەواز و راگەیاندن و وەڵامنەدانەوەیە بۆ راگەیاندنەکە، چونکە کاری سەرەکی پێغەمبەر(ﷺ) بریتییە لە پێڕاگەیاندن و بانگکردن بۆ لای حەق نەك ناچارکردنی لەسەر ئەوەی بانگی بۆ دەکات، لەبەرئەوەی بانگبۆکراو ئیمان و بیروباوەڕە، بیروباوەڕیش بە شمشێر بەسەر مرۆڤدا ناسەپێت، چونکە قەناعەتی مرۆڤ پەیوەندی بە دڵەوەیە وەك پێشتر باسمان کرد.

شمشێر لەباری بەرگری رەوا و بەرپەرچدانەوەی دەستدرێژکاری بۆ سەر ئیسلام و موسڵمان بەکاردەهێنرێت.

—ئایەتی(٨٤):﴿فَقَاتِلْ[3] فِي سَبِيلِ اللَّهِ لاَ تُكَلَّفُ إِلاَّ نَفْسَكَ[4] وَحَرِّضِ الْمُؤْمِنِينَ عَسَى اللَّهُ أَنْ يَكُفَّ بَأْسَ الَّذِينَ كَفَرُوا وَاللَّهُ أَشَدُّ بَأْسًا وَأَشَدُّ تَنْكِيلاً﴾[5]
بانگکەرانی نەسخ دەڵێن[6] ئەم بەشەی ئایەتەکە ﴿لاَ تُكَلَّفُ إِلاَّ نَفْسَكَ﴾ نەسخکراوەتەوە بە ئایەتی شمشێر.

---

[1] سورة النساء/٨١.

[2] لەوانە: ابن سلامة المرجع السابق ص١١١ وابن حزم الاندلسي الناسخ والمنسوخ ص٣٤ تیایدا هاتووە(پشتهەڵکردن لێیان بە ئایەتی شمشێر نەسخکراوەتەوە).

[3] گوتارەکە تایبەتە و ئاراستەی پێغەمبەر(ﷺ) کراوە، بەڵام مەرامەکەی گشتە، واتە گوتارەکە تایبەتە و مەبەستی گشتە.

[4] واتە گرنگی مەدە بە دواکەوتنیان لە تۆ.

[5] سورة النساء/٨٤.

[6] الناسخ والمنسوخ لابن سلامة ص١١١ الناسخ والمنسوخ لابن خزيمة ص٢٦٥. الناسخ والنسوخ لابن حزم الاندلسي ص٣٥.

ئەم بۆچوونە پووچە بەهۆی نەبوونی بەرهەڵستکارییەوە لە نێوان نەسخکەر و نەسخکراودا، "ابن الجوزي"[1] دەڵێت: (ئەهلی تەفسیر دەڵێن: ماناکەی تەنها داوای تێکۆشانت لێکراوە بە نەفسی خۆت و کاری کەسانی تر تۆ پێیەوە پابەند نیت، ئەمە موحکەمە، هەندێ لە بەناو ئەهلی تەفسیر پێیانوایە نەسخکراوەتەوە بە ئایەتی شمشێر، وەك ئەوەی هەستی کردبێت مانای ئایەتەکە بەم جۆرەیە: داوات لێنەکراوە لەگەڵ کەس بجەنگی، بەڵام بەو شێوە نییە، بەڵکو ماناکەی تەنها بە کاری خۆت لە تێکۆشان داوات لێکراوە)

"الرازي"[2]: دەڵێت: (ماناکەی تەنها بە کار و کردەوەکانی خۆت دەگیرێیت نەك بە کار و کردەوەکانی کەسانی تر، گەر کاری خۆت ئەنجامدا و داوات لێ ناکرێت لە ئەرکی کەسانی تر) ئەمە یاسایەکی نەگۆڕە و ماوەتەوە تا ژیان بەردەوام بێت لەسەر هەسارەی زەوی، هیچ کەس پابەند نابێت بە کار و کردەوەی کەسانی تر، ئەو ڕێسایە هەموو یاساناسانی یاسای دانراو کۆدەنگیان هەیە لەسەری.

—ئایەتی(٩٠):﴿إِلاَّ الَّذِينَ يَصِلُونَ إِلَى قَوْمٍ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَهُمْ مِيثَاقٌ أَوْ جَاءُوكُمْ حَصِرَتْ صُدُورُهُمْ أَنْ يُقَاتِلُوكُمْ أَوْ يُقَاتِلُوا قَوْمَهُمْ وَلَوْ شَاءَ اللَّهُ لَسَلَّطَهُمْ عَلَيْكُمْ فَلَقَاتَلُوكُمْ فَإِنِ اعْتَزَلُوكُمْ فَلَمْ يُقَاتِلُوكُمْ وَأَلْقَوْا إِلَيْكُمُ السَّلَمَ فَمَا جَعَلَ اللَّهُ لَكُمْ عَلَيْهِمْ سَبِيلاً﴾[3]

ئەم هەڵواردنە دوای فەرمانکردن بە جەنگان دژ بە هاوەڵدانەران هاتووە، ئەوانەی کە لە نێوان ئەوان و موسڵماناندا پەیمان هەبووە و پەیمانەکەیان شکاندووە و دەستدرێژیان کردۆتە سەر موسڵمانان، خودا فەرمانیان پێ دەکات بە بەرپەرچدانەوەی ئەو دەستدرێژکارییە بۆیە داوای جەنگانی لێ کردن و

---

[1] نواسخ القرآن ص٣٥.

[2] لە سەرخەرانی نەسخ نەبوونەوە: الرازي: ١٩٦/١٠ والصاوي: ٢٣٢/١.

[3] سورة النساء/٩٠.

فەرمووی: ﴿فَإِنْ تَوَلَّوْا فَخُذُوهُمْ وَاقْتُلُوهُمْ حَيْثُ وَجَدْتُمُوهُمْ وَلاَ تَتَّخِذُوا مِنْهُمْ وَلِيًّا وَلاَ نَصِيرًا﴾[1] هەڵواردنەکە لەم بەشەی ئایەتەکەدایە ﴿إِلاَّ الَّذِينَ يَصِلُونَ إِلَى قَوْمٍ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَهُمْ مِيثَاقٌ﴾ هەر کەس چووە ناو پەیمانی کەسێکەوە کە پەیمانی لەگەڵ ئێوە هەیە ئەوە چووەتە ناو پەیمانەکەی ئێوەوە ﴿أَوْ جَاءُوكُمْ حَصِرَتْ صُدُورُهُمْ أَنْ يُقَاتِلُوكُمْ أَوْ يُقَاتِلُوا قَوْمَهُمْ﴾ واتە یان ئەوانەی هاتن بۆ لاتان و سینەیان تەسك بووبووەیەوە لەوەی لەگەڵ هۆزەکەیاندا دژ بە ئێوە بجەنگن ﴿أَوْ يُقَاتِلُوا قَوْمَهُمْ﴾ یان لەگەڵ ئێوە دژ بە هۆزەکەیان بجەنگن، واتە خۆیانگرتەوە لە جەنگان دژ بە ئێوە و دژ بە هۆزەکەیان ئەوا دەستیان بۆ مەبەن نە بە گرتنیان و نە بە جەنگ لەگەڵیان، گەر خودا زاڵکردنی ئەوانەی بویستبایە ﴿لَسَلَّطَهُمْ عَلَيْكُمْ﴾ بەوەی دڵیان بەهێز بکات ﴿فَلَقَاتَلُوكُمْ﴾ بەڵام خودا نەیویست و ترسی هەڵدایە ناو دڵیانەوە ﴿فَإِنِ اعْتَزَلُوكُمْ فَلَمْ يُقَاتِلُوكُمْ وَأَلْقَوْا إِلَيْكُمُ السَّلَمَ﴾ واتە سولح و ئاشتی گەر گەردنکەچ بوون ﴿فَمَا جَعَلَ اللَّهُ لَكُمْ عَلَيْهِمْ سَبِيلاً﴾ واتە ڕێگەیەك بە گرتنیان و جەنگان لەگەڵیان.

بانگکەرانی نەسخ پێیانوایە ئەم ئایەتەی کە وەك هەڵواردنێك لە حوکمی ئایەتەکەی پێش خۆی هاتووە بە ئایەتی شمشێر نەسخکراوەتەوە.

ئەم بۆچوونە پووچە بەم هۆیانە:

١.وتنی نەسخ بەرهەڵستی دەکات لەگەڵ زۆرێك لە ئایەتی تری قورئان:

أ.ئایەتی: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا ادْخُلُوا فِي السِّلْمِ كَافَّةً وَلاَ تَتَّبِعُوا خُطُوَاتِ الشَّيْطَانِ إِنَّهُ لَكُمْ عَدُوٌّ مُبِينٌ﴾[2] بەکارهێنانی هێز دژ بە موسڵمان و ناموسڵمان بە شوێنکەوتنی هەنگاوەکانی شەیتان دانا کە دوژمنی مرۆڤە گەر لایەکەی تر دەستدرێژکار نەبێت.

---

[1] سورة النساء/٨٩.

[2] سورة البقرة/٢٠٨.

ب.ئایەتی:﴿وَإِنْ جَنَحُوا لِلسَّلْمِ فَاجْنَحْ لَهَا وَتَوَكَّلْ عَلَى اللَّهِ﴾[1].

٢.خودا–سبحانە وتعالی– لە ئایەتی(٩١) باس لەوە دەكات جەنگان لەگەڵیان تەنها لە باری دەستدرێژیكردندایە:﴿فَإِنْ لَمْ يَعْتَزِلُوكُمْ وَيُلْقُوا إِلَيْكُمُ السَّلَمَ وَيَكُفُّوا أَيْدِيَهُمْ فَخُذُوهُمْ وَاقْتُلُوهُمْ حَيْثُ ثَقِفْتُمُوهُمْ وَأُولَئِكُمْ جَعَلْنَا لَكُمْ عَلَيْهِمْ سُلْطَانًا مُبِينًا﴾.

٣.هەروەها ئایەتی:﴿فَإِنِ اعْتَزَلُوكُمْ فَلَمْ يُقَاتِلُوكُمْ وَأَلْقَوْا إِلَيْكُمُ السَّلَمَ فَمَا جَعَلَ اللَّهُ لَكُمْ عَلَيْهِمْ سَبِيلاً﴾ ئەمە بەڵێنێكە لە خوداوە گەر دوژمن لە جەنگ كەناریگرت و نەجەنگا و داوای ئاشتی و سوڵحی كرد، لەسەر موسڵمانان قبوولكردنی ئەو داوایە پێویستە، لەو بارەدا خودا رێگەیەكی بۆ موسڵمانان نەهێڵاوەتەوە بۆ جەنگان دژ بە ئەوان و ئازاردانیان، گەر ئەم بەڵێنە بە ئایەتی شمشێر نەسخكرابێتەوە ئەمە مانای پێچەوانەی بەڵێن دەگەیەنێت، و خوداش–سبحانە وتعالی– پاك و بێگەردە لەو جۆرە كارانە.

٤. ﴿فَمَا جَعَلَ اللَّهُ لَكُمْ عَلَيْهِمْ سَبِيلاً﴾ رستەیەكی فەرمانیی رابردووی راگەیاندنییە(جملة فعلية ماضية خبرية) سەرباری ئەوەی بەڵێنە، وەك چۆن بەڵێن ناچێتە ژێر نەسخەوە هەر بەو جۆرە هەواڵیش ناچێتە ژێر نەسخەوە.

٥.گەر كارمان بەو نەسخە كرد و وتمان پێویستە لەگەڵ ناموسڵماندا لە هەموو بارێكدا بجەنگێین دەستدرێژكار بێت یان ئاشتیخواز، داوای جەنگ بكات یان كەناری لێ گرتبێت، داوای پێكهاتن بكات یان رەدی بكاتەوە، ئەوا ئێمە تیشكی سەوزمان بۆ دوژمنانی ئیسلام هەڵكردووە تاكو بڵێن ئیسلام ئایینی رشتنی خوێنە لەهەردوو بارێكی جەنگ و ئاشتیدا.

٦.چ سوودێك هەیە لە بەكارهێنانی شمشێر و هێز دژ بە ناموسڵمان كاتێك بانگ دەكات بۆ ژیانی ئاشتیخوازانە لەگەڵ موسڵمان، گەر وتمان سوودەكەی بریتییە لە سەپاندنی ئایینی ئیسلام بەسەریدا، ئەوا ئەو كارە رەفزكراوە، چونكە ئیمان یان

---

[1] سورة الانفال/٦١.

ئاین بیروباوەڕی دڵە و بە هێز ناسەپێت بەسەر هیچ کەسێکدا، چونکە هێز زاڵ ناکرێت بەسەر دڵدا با بەسەر جەستەشدا زاڵ بکرێت.

گەر بڵێین تەنها لەبەر ئەوەی موسڵمان نییە با ئاشتیخوازیش بێت ئەم لۆژیکە ئیسلام رەدی دەکاتەوە، چونکە بنەڕەت لە ئیسلامدا ئاشتییە و جەنگ هەڵواردەیە، هەڵواردنیش تەنها بۆ زەرورەتە و زەرورەتیش بە ئەندازەی خۆی ئەندازەگیری بۆ دەکرێت.

٧.وتنی نەسخبوونەوەی ئەم ئایەتە بە ئایەتی شمشێر تەنها ئیجتیهادە و بەڵگەیەك لەسەری راست نابێتەوە لە قورئان یان سوننەتی پێغەمبەر(ﷺ) یان کۆدەنگی هاوەڵان یان شوێنکەوتووان ، ئیجتیهاد گەر هەڵە نەبێت تەنها گومان دەبەخشێت، قورئانیش بە یەقین جێگیر بووە، ئەوەش بە جێگیربوونی یەقینی جێگیر بووە تەنها بە یەقین دەسڕێتەوە.

–ئایەتی(٩١):﴿سَتَجِدُونَ آخَرِينَ يُرِيدُونَ أَنْ يَأْمَنُوكُمْ[١] وَيَأْمَنُوا قَوْمَهُمْ[٢] كُلَّمَا رُدُّوا إِلَى الْفِتْنَةِ[٣] أُرْكِسُوا[٤] فِيهَا فَإِنْ لَمْ يَعْتَزِلُوكُمْ وَيُلْقُوا إِلَيْكُمُ السَّلَمَ وَيَكُفُّوا أَيْدِيَهُمْ فَخُذُوهُمْ وَاقْتُلُوهُمْ حَيْثُ ثَقِفْتُمُوهُمْ وَأُولَئِكُمْ جَعَلْنَا لَكُمْ عَلَيْهِمْ سُلْطَانًا مُبِينًا﴾[٥]

هەندێك لە سەرخەرانی نەسخ پێیاوایە ئەم ئایەتەش بە ئایەتی شمشێر نەسخکراوەتەوە[٦].

---

[١] بە دەرخستنی ئیمان لەلای ئێوە.

[٢] بە بێباوەڕی کاتێك دەگەڕێنەوە بۆ لایان ئەوانە بریتی بوون لە: اسد وغگفان.

[٣] بانگ بکرێن بۆ هاوەڵدان

[٤] بە خراپترین شێوە تێیدەکەون

[٥] سورة النساء/٩١.

[٦] لە سەرخەرانی ئەم بانگەشەیە: ابن سلامة الناسخ والمنسوخ ص١١٢ تیایدا هاتووە(ئەمەش دیسان بە ئایەتی شمشێر نەسخ کراوەتەوە) وابن حزم الاندلسي الناسخ والمنسوخ ص٣٥ تیایدا هاتووە (خودا بە ئایەتی شمشێر نەسخی کردەوە)

بانگەشەی نەسخی ئایەتی(٩١) وەك بانگەشەی نەسخی ئایەتی(٩٠)ە، بۆیە ئەم بانگەشەیە رەد دەکرێتەوە بەوەی باسمان کرد لە رەدکردنەوەی بانگەشەی نەسخی ئایەتی یەکەم(٩٠)، لەگەڵ خستنەسەری ئەم دوو خاڵە:

١.لە هەمان ئایەتدا فەرمان کراوە بە جەنگان لەگەڵیان گەر پەیمانەکانیان شکاند و دەستدرێژییان کردە سەر موسڵمانان، ئەمەش هەمان ئەو شتەیە ئایەتی شمشێر ئاماژەی پێدەکات، ئیتر چۆن ئایەتێك نەسخ دەکرێتەوە کە فەرمان دەکات بە ناوەرۆکی ئەوەی ئایەتی شمشێر فەرمانی پێکردووە؟!

٢.ئەم هەڵانە لە هەندێ لە موجتەهیدانەوە لە وتنی نەسخی ئایەت لە دوای ئایەت، چی دەوترێت بە مرۆڤێك گەر نموونەی ئەم هەڵسوکەوتەی لێبوەشێتەوە، بەوەی حوکمێك دەربکات و پاشان لە کەمترین ماوەدا بیسڕێتەوە، حیکمەتی دانەپاڵی ئەم کارە بۆ لای خودا چییە لە کاتێکدا گەر بدرێتە پاڵ مرۆڤ ناتەواوییە بۆی؟!

–ئایەتی(٩٢):﴿وَإِنْ كَانَ مِنْ قَوْمٍ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَهُمْ مِيثَاقٌ فَدِيَةٌ مُسَلَّمَةٌ إِلَى أَهْلِهِ﴾[1]

---

وابن الجوزي نواسخ القرآن ص١٣٤ تیایدا هاتووە (ماناکەی ئەوەیە رازیبوون بۆ هەردوو دەستەکە نیشان دەدەن بۆ ئەوەی لە هەردوو دەستەکە سەلامەت بن، خودا فەرمانی کرد وازیان لێ بهێنن گەر کەناریان گرت و سەلامەتیان لێوەشایەوە کە بریتییە لە ئاشتەوایی هەر بەو جۆرە فەرمانی کردووە بە وازهێنان لەوانەی چاکەدەکەن لەگەڵ دەستەیەك کە هاوپەیمانی موسڵمانانن، پاشان ئەوە نەسخکرایەوە بەم ئایەتە: (اقْتُلُوا الْمُشْرِكِينَ حَيْثُ وَجَدْتُمُوهُمْ) سورة النور/٥.

[1] هذا جزء من آية (٩٢) من سورة النساء التي نصها (وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ أَنْ يَقْتُلَ مُؤْمِنًا إِلَّا خَطَأً وَمَنْ قَتَلَ مُؤْمِنًا خَطَأً فَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مُؤْمِنَةٍ وَدِيَةٌ مُسَلَّمَةٌ إِلَى أَهْلِهِ إِلَّا أَنْ يَصَّدَّقُوا فَإِنْ كَانَ مِنْ قَوْمٍ عَدُوٍّ لَكُمْ وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مُؤْمِنَةٍ وَإِنْ كَانَ مِنْ قَوْمٍ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَهُمْ مِيثَاقٌ فَدِيَةٌ مُسَلَّمَةٌ إِلَى أَهْلِهِ وَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مُؤْمِنَةٍ فَمَنْ لَمْ يَجِدْ فَصِيَامُ شَهْرَيْنِ مُتَتَابِعَيْنِ تَوْبَةً مِنَ اللَّهِ وَكَانَ اللَّهُ عَلِيمًا حَكِيمًا) ماناکەی: بۆ هیچ باوەڕدارێك نییە باوەڕدارێکی تر بکوژێت مەگەر بە هەڵە، "ما کان" لەسەر نەرێکردن نییە، چونکە

بانگکەرانی نەسخ پێیان وایە ئایەتی:﴿فَإِنْ كَانَ مِنْ قَوْمٍ عَدُوٍّ لَكُمْ﴾ تا کۆتایی ئایەتەکە نەسخکراوەتەوە بە ئایەتەکەی سورەتی "التوبه" کە ئەم ئایەتەیە:﴿بَرَاءَةٌ مِنْ اللَّهِ وَرَسُولِهِ إِلَى الَّذِينَ عَاهَدْتُمْ مِنْ الْمُشْرِكِينَ﴾[1].

ابن سلامة[2] دەڵێت: ئەوە بەم ئایەتە سڕاوەتەوە:﴿بَرَاءَةٌ مِنْ اللَّهِ﴾الآية، ئەمەش هەمان گوزارەی"ابن حزم الاندلسي"ە[3] و دووبارەی دەکاتەوە، "ابن الجوزي"[4] دەڵێت:(جمهوری ئەهلی زانست لەسەر ئەوەن -ئاماژە بەم ئایەتە- ئەو کەسەی بە هەڵە دەکوژرێت لەسەر بکوژەکەی خوێندان و کەفارەت هەیە، ئەمە بریتییە لە قسەی "ابن عباس، و الشعبي، و قتادة، و الزهري، و أبي حنيفة، و الشافعي" و قسەی هاوەڵانی ئێمە، ئایەتەکە لەسەر ئەمە موحکەمە و نەسخنەکراوەتەوە.

هەندێ لە ئەهلی تەفسیر پێیانوایە مەبەست پێی هەر کەس لە هاوەڵدانەران لە نێوان ئەو و پێغەمبەردا هودنەیەك هەبوویێت بۆ ماوەیەکی دیاریکراو، ئەوە نەسخکراوەتەوە بە ئایەتی:﴿بَرَاءَةٌ مِنْ اللَّهِ وَرَسُولِهِ﴾الآية، یان بە ئایەتی:﴿وَإِمَّا تَخَافَنَّ مِنْ قَوْمٍ خِيَانَةً فَانْبِذْ إِلَيْهِمْ عَلَى سَوَاءٍ إِنَّ اللَّهَ لاَ يُحِبُّ الْخَائِنِينَ﴾[5].

---

ئەوەی خودا نەهی لێبکات بوونی شیاو و گونجاو نییە، "الدية" ئەوەیە وەك قەرەبوو دەدرێت لە خوێنی کوژراوەکەدا بە کەسوکاری یان بە میراتگرانی، قورئان بڕی ئەوەی دەدرێت دیاری نەکردووە هەروەها ئەو کەسانەی دیاری نەکردووە لەسەریان پێویست دەبێت، ئایا لەسەر بکوژەکەیە یان لەسەر کەسوکارەکەی، بەڵکو هەموو ئەوانە بە سوننەتی پێغەمبەر(ﷺ) دیاریکراوە، ئەو بەشەی ئایەتەکە کە دەفەرموێت: (وَإِنْ كَانَ مِنْ قَوْمٍ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَهُمْ مِيثَاقٌ) ئەمە بۆ ئەهلی زیمە و هاوپەیمانە کە بە هەڵە دەکوژرێت، بۆیە دیە و کەفارەت پێویست دەبێت.

[1] سورة التوبة/١.

[2] الناسخ والمنسوخ ص ١١٢.

[3] ص٣٥.

[4] نواسخ القرآن ص١٣٤.

[5] سورة الانفال/٥٨.

بانگەشەی نەسخ دروست نییە بەم بەڵگانە:

١.نەبوونی بەرهەڵستکاری لە نێوان دوو ئایەتەکەدا، چونکە مەبەست لەم ئایەتە: ﴿وَإِنْ كَانَ مِنْ قَوْمٍ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَهُمْ مِيثَاقٌ﴾ ئەوەیە لە نێوان ئەو قەومە و موسڵماناندا پەیمان و پەنا بوونی هەبێت و لە ئەهلی جەنگ نەبن[1] لە کاتێکدا مەبەست بە هاوەڵدانەران لە ئایەتەکەی سورەتی "التوبة"دا بریتییە لە ئەهلی جەنگ، هەر بەو جۆرە لە ئایەتی "الأنفال"دا وەك ڕۆشنە، بۆیە بابەتی دوو ئایەتەکە جیاوازە، لە مەرجەکانی نەسخیش دژیەکییە و لە مەرجەکانی دژیەکیش یەکێتی بابەتە.

٢.ئایەتەکە ڕێسایەکی گشتی هێناوە و تایبەت نییە بەو هاوەڵدانەرانەی لە هودنەدا بوون لەگەڵ پێغەمبەری خودا(ﷺ) ڕێسای ئوسوڵی گشتیش داوا دەکات پەندوەرگرتن بە گشتاندنی دەقەکە بێت نەك بە تایبەتکردنی هۆیەکە، بۆیە لە نێوان دوو ئایەتەکەدا بەرهەڵستکاری بوونی نییە لەم ڕووەوە[2].

–ئایەتی(٩٣):﴿وَمَنْ يَقْتُلْ مُؤْمِنًا مُتَعَمِّدًا فَجَزَاؤُهُ جَهَنَّمُ خَالِدًا فِيهَا وَغَضِبَ اللَّهُ عَلَيْهِ وَلَعَنَهُ وَأَعَدَّ لَهُ عَذَابًا عَظِيمًا ﴾[3]

هەندێك پێیاوایە[4] ئەم ئایەتە نەسخکراوەتەوە، لەسەر نەسخکەرەکەی جیاوازیان هەیە، هەیانە دەڵێت ئەم ئایەتەیە:﴿إِنَّ اللَّهَ لاَ يَغْفِرُ أَنْ يُشْرَكَ بِهِ وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَلِكَ لِمَنْ يَشَاءُ﴾[5] الآية، کەسانێکی دەڵێن نەسخکەرەوەکەی بریتییە لەم ئایەتە:﴿وَالَّذِينَ لاَ يَدْعُونَ مَعَ اللَّهِ إِلَهًا آخَرَ وَلاَ يَقْتُلُونَ النَّفْسَ الَّتِي حَرَّمَ اللَّهُ إِلاَّ

---

[1] الطبرسي: ٩١/٣.

[2] سەرخەرانی نەسخ نەبوونەوە: الرازي: ٢٢٦/١٠ والآلوسي:١١٤/٥ أحكام القرآن لابن العربي:٤٧١/١.

[3] سورة النساء/٩٣.

[4] وەك ابن سلامة ص١١٢ وابن حزم الاندلسي ص٣٥.

[5] سورة النساء/٤٨.

بِالْحَقِّ وَلاَ يَزْنُونَ وَمَنْ يَفْعَلْ ذَلِكَ يَلْقَ أَثَامًا، يُضَاعَفْ لَهُ الْعَذَابُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَيَخْلُدْ فِيهِ مُهَانًا، إِلاَّ مَنْ تَابَ وَآمَنَ وَعَمِلَ عَمَلاً صَالِحًا فَأُولَئِكَ يُبَدِّلُ اللَّهُ سَيِّئَاتِهِمْ حَسَنَاتٍ وَكَانَ اللَّهُ غَفُورًا رَحِيمًا﴾[1].

بانگەشەی نەسخی ئەو ئایەتە پووچە، چونکە لە دەروازەی تێکەڵییە لە نێوان نەسخ و تایبەتکردندا، بەوەندە دەوەستم "الرازي" وتویەتی لەم مەیدانەدا[2] (لە "ابن عباس"ەوە گوازراوەتەوە فەرموویەتی: تەوبەی ئەو کەسەی کوشتنی بەئەنقەستی دوژمنکارانەی کردووە قبووڵ نییە، جمهوری زانایان دەڵێن قبووڵکراوە، چەند روویەك بەڵگەن لەسەری:

بەڵگەی یەکەم–کوفر گەورەترە لە کوشتن گەر تەوبە لە کوفر قبووڵ بێت ئەوا تەوبە لە کوشتن لەپێشترە بە قبووڵبوون.

بەڵگەی دووەم– ئەم ئایەتەیە: (وَالَّذِينَ لاَ يَدْعُونَ مَعَ اللَّهِ إِلَهًا آخَرَ)الآيـة، گەر تەوبەی ئەو کەسەی بە کوشتن هەڵدەستێت لەگەڵ تەوبەی هەموو گوناهە گەورە باسکراوەکاندا لەم ئایەتەدا قبووڵ بێت، ئەوا تەوبەی بکوژ بەتەنها لەپێشترە بە قبووڵ بوون.

بەڵگەی سێیەم–ئایەتی: ﴿وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَلِكَ لِمَنْ يَشَاءُ﴾ بەڵێنی لێبوردنی داوە لە هەموو گوناهێك جگە لە کوفر(هاوەڵدانان)، کەوابوو لێبوردن لە کوشتن دوای تەوبەکردن لەپێشترە بە قبووڵ[3].

---

[1] سورة الفرقان/٦٨–٧٠.

[2] التفسير الكبير: ١٠/٢٤٦.

[3] سەرچاوەی نەسخ نەبوونەوە: الرازي ١٠/٢٣٧ والآلوسي ٥/١١٧.

-ئایەتی(١٤٥):﴿إِنَّ الْمُنَافِقِينَ فِي الدَّرْكِ الأَسْفَلِ مِنْ النَّارِ وَلَنْ تَجِدَ لَهُمْ نَصِيرًا[١]﴾

ابن حزم الاندلسي[٢] و ئەوانەی لە بانگکەرانی نەسخ لەگەڵ ئەون دەڵێن: خودا هەندێکی بە هەڵواردن نەسخ کردۆتەوە بەم ئایەتە:﴿إِلاَّ الَّذِينَ تَابُوا وَأَصْلَحُوا وَاعْتَصَمُوا بِاللَّهِ وَأَخْلَصُوا﴾[٣].

ئەم بۆچوونە پووچە، گەر مەبەست بە نەسخ تایبەتکردن نەبێت.

ابن الجوزي[٤] دەڵێت: (هەندێك لە کەمی تێگەیشتنییەوە پێیوایە ئەو ئایەتە بە هەڵواردن نەسخکراوەتەوە کە بریتییە لە:﴿إِلاَّ الَّذِينَ تَابُوا﴾ لە چەندین شوێن ڕۆشنمان کردۆتەوە هەڵواردن نەسخ نییە[٥]).

---

[١] سورة النساء/١٤٥.

[٢] الناسخ والمنسوخ ص٣٥ ابن سلامة ص١١٢.

[٣] سورة النساء/١٤٦.

[٤] نواسخ القرآن ص١٣٩.

[٥] سەرخەرانی نەسخ نەبوونەوە: الرازي ١١/٨٧.

# نەسخی بانگەشەبۆکراو لە سورەتی "المائدة"دا

"ابن الجوزي" دەڵێت: (هەندێك دەڵێن لە سورەتی "المائدة"دا نەسخکراو بوونی نییە، لە "ابن إسحاق"ەوە لە "عامر بن شرحبيل"ەوە دەڵێت: سورەتی "المائدة" نەسخکراوی تێدا نییە، ، لە "ابن عون"ەوە دەڵێت: وتم بە "الحسن" نەسخ لە سورەتی "المائدة"دا هەیە وتی: نەخێر)

"أبو جعفر النحاس"[1] دەڵێت: (زانایان لەم سورەتەدا جیاوازیان لە نێواندایە، هەیانە دەڵێن هیچی لێ نەسخنەکراوەتەوە، هەیانە بەڵگە دەهێنێتەوە بەوەی کۆتا سورەتێکە دابەزی بێت، بۆیە دروست نییە نەسخکراوی تێدا بێت)، هەروەها دەڵێت لە "أبي إسحاق"ەوە لە "أبي ميسرة"ەوە دەڵێت: هیچ لە سورەتی "المائدة" نەسخنەکراوەتەوە، لە "جبير بن نضير"ەوە دەڵێت: حەجم کرد و چوومە بۆ لای دایکە "عائشة"–خوا لێی رازی بێت– وتی: سورەتی "المائدة" دەخوێنییەوە، وتم: بەڵێ، وتی: ئەوە دوایین سورەتێکە دابەزی بێت، ئەوەی تیایدا بینیتان حەڵاڵکرابوو ئێوەش بە حەڵاڵی بزانن، ئەوەی بینیتان تیایدا حەرامکرابوو بە حەرامی بزانن) ئەمە بەڵگەیە لەسەر نەبوونی حوکمی نەسخکراوە تیایدا.

---

[1] الناسخ والمنسوخ في القرآن الكريم ص١١٥.

هەنـدێك لــە بانگکـەرانی نەسـخ پێیانوایـە[1]سـورەتی "المائـدة" نـۆ ئایـەتی نەسخکراوی تێدایە.

ئایەتەکان ئەمانەن:

﴿يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لاَ تُحِلُّوا شَعَائِرَ اللَّهِ وَلاَ الشَّهْرَ الْحَرَامَ وَلاَ الْهَدْيَ وَلاَ الْقَلاَئِدَ وَلاَ آمِّينَ الْبَيْتَ الْحَرَامَ يَبْتَغُونَ فَضْلاً مِنْ رَبِّهِمْ وَرِضْوَانًا وَإِذَا حَلَلْتُمْ فَاصْطَادُوا وَلاَ يَجْرِمَنَّكُمْ شَنَآنُ قَوْمٍ أَنْ صَدُّوكُمْ عَنْ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ أَنْ تَعْتَدُوا وَتَعَاوَنُوا عَلَى الْبِرِّ وَالتَّقْوَى وَلاَ تَعَاوَنُوا عَلَى الإِثْمِ وَالْعُدْوَانِ وَاتَّقُوا اللَّهَ إِنَّ اللَّهَ شَدِيدُ الْعِقَابِ﴾ (٢)

﴿الْيَوْمَ أُحِلَّ لَكُمْ الطَّيِّبَاتُ وَطَعَامُ الَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ حِلٌّ لَكُمْ وَطَعَامُكُمْ حِلٌّ لَهُمْ﴾ (٥)

﴿فَبِمَا نَقْضِهِمْ مِيثَاقَهُمْ لَعَنَّاهُمْ وَجَعَلْنَا قُلُوبَهُمْ قَاسِيَةً يُحَرِّفُونَ الْكَلِمَ عَنْ مَوَاضِعِهِ وَنَسُوا حَظًّا مِمَّا ذُكِّرُوا بِهِ وَلاَ تَزَالُ تَطَّلِعُ عَلَى خَائِنَةٍ مِنْهُمْ إِلاَّ قَلِيلاً مِنْهُمْ فَاعْفُ عَنْهُمْ وَاصْفَحْ إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُحْسِنِينَ﴾ (١٣)

﴿إِنَّمَا جَزَاءُ الَّذِينَ يُحَارِبُونَ اللَّهَ وَرَسُولَهُ وَيَسْعَوْنَ فِي الأَرْضِ فَسَادًا أَنْ يُقَتَّلُوا أَوْ يُصَلَّبُوا أَوْ تُقَطَّعَ أَيْدِيهِمْ وَأَرْجُلُهُمْ مِنْ خِلاَفٍ أَوْ يُنفَوْا مِنْ الأَرْضِ ذَلِكَ لَهُمْ خِزْيٌ فِي الدُّنْيَا وَلَهُمْ فِي الآخِرَةِ عَذَابٌ عَظِيمٌ﴾ (٣٣)

﴿فَإِنْ جَاءُوكَ فَاحْكُمْ بَيْنَهُمْ أَوْ أَعْرِضْ عَنْهُمْ﴾ (٤٢)

﴿مَا عَلَى الرَّسُولِ إِلاَّ الْبَلاَغُ﴾ (٩٩)

﴿يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا عَلَيْكُمْ أَنفُسَكُمْ لاَ يَضُرُّكُمْ مَنْ ضَلَّ إِذَا اهْتَدَيْتُمْ﴾ (١٠٥)

﴿يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا شَهَادَةُ بَيْنِكُمْ إِذَا حَضَرَ أَحَدَكُمْ الْمَوْتُ حِينَ الْوَصِيَّةِ اثْنَانِ ذَوَا عَدْلٍ مِنْكُمْ أَوْ آخَرَانِ مِنْ غَيْرِكُمْ إِنْ أَنْتُمْ ضَرَبْتُمْ فِي الأَرْضِ فَأَصَابَتْكُمْ مُصِيبَةُ الْمَوْتِ﴾ (١٠٦)

---

[1] کابن حزم الاندلسي المرجع السابق ص٣٥.

ئایەتی(٢) ﴿يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لاَ تُحِلُّوا شَعَائِرَ اللَّهِ[١] وَلاَ الشَّهْرَ الْحَرَامَ[٢] وَلاَ الْهَدْيَ[٣] وَلاَ الْقَلاَئِدَ[٤] وَلاَ آمِّينَ الْبَيْتَ الْحَرَامَ يَبْتَغُونَ فَضْلاً مِنْ رَبِّهِمْ وَرِضْوَانًا وَإِذَا حَلَلْتُمْ فَاصْطَادُوا[٥] وَلاَ يَجْرِمَنَّكُمْ[٦] شَنَآنُ قَوْمٍ[٧] أَنْ صَدُّوكُمْ عَنْ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ[٨] أَنْ تَعْتَدُوا وَتَعَاوَنُوا عَلَى الْبِرِّ وَالتَّقْوَى وَلاَ تَعَاوَنُوا عَلَى الإِثْمِ وَالْعُدْوَانِ وَاتَّقُوا اللَّهَ إِنَّ اللَّهَ شَدِيدُ الْعِقَابِ﴾[٩]

بانگەشەکەرانی نەسخ پێیانوایە[١٠] ئەم ئایەتە نەسخکراوەتەوە، بەڵام لەسەر نەسخکەرەوەکەی جیاوازیـان لـە نێواندایـە، هەیانـە دەڵێـت بـە ئایـەتی شمشێر

---

[١] نیشانەکانی ئاماژەکار لەسەر ئایینەکەی لە فەرمانپێکراوەکان و نەهیلێکراوەکان.

[٢] واتە کوشتن لە مانگی حەرامدت حەڵاڵ مەکەن.

[٣] واتە پەلاماری ئەوە مەدەن دەکرێتە دیاری بۆ "بیت الله الحرام" لە وشتر و وڵاخی رەش و سپی وەك نزیکبوونەوە لە خودا، حەڵاڵی مەکەن بۆ خۆتان و لەدەست خاوەنەکانیان وەربگرن، بۆیە پەلاماری ئەو هەدیانە و خاوەنەکانیان مەدەن.

[٤] کۆی "قلادە"ئەوەش ئەوە بوو لە داری "حرم" پیایدا هەڵدەواسرا، پێش ئیسلام کاتێك "حرم"یان دەویست داری "حرم"یان بە خۆیاندا هەڵدەواسی بۆیە کەس پەلاماری نەدەدان، هەر بەو جۆرە پەلاماری ئەوانە مەدەن مەبەستیان سەردانکردنی "بیت الله الحرام"ە، الآية ١٣.

[٥] ئەمرەکە بۆ موباحکردنە چونکە ئەمر لەدوای قەدەغەکردن دەیگێڕێتەوە بۆ دۆخی ئەوەی لەسەری بوو.

[٦] واتە واتان لێنەکات(هەڵتان نەنێت بۆ ئەو کارە)

[٧] واتە بوغز و کینە، واتە بوغز و کینەی پێشینە بۆ دەستەیەك واتان لێ نەکات دەستدرێ بکەنە سەری.

[٨] رۆشنکردنەوەیە بۆ هۆی هەڵوەشاندنەوەکە، ئەوەش ئەوە بوو ناموسڵمانەکان موسڵمانانیان رێگری دەکرد لە "بیت الله الحرام".

[٩] هەرکەس دروشمەکانی خودا حەڵاڵ دەکات واجب واز لێدەهێنێت و کاری حەرام ئەنجام دەدات.

[١٠] وەك: ابن حزم الاندلسی الناسخ والمنسوخ ص٣٥ تیایدا هاتووە (پاشان بە ئایەتی شمشێر سڕایەوە) ابن سلامة ص١١٦ لەطەڵێ هاوڕایە.

ســــڕاوەتەوە، هەیانـــە دەڵێـــت بـــە ئایـــەتی بەرائـــەت لــــە ســــورەتی "التوبــة"ســـڕاوەتەوە:﴿بَـرَاءَةٌ مِـنْ اللَّـهِ وَرَسُـولِهِ إِلَـى الَّـذِينَ عَاهَـدتُّمْ مِـنْ الْمُشْرِكِينَ﴾[1].

هەیانە دەڵێت: بە زیاتر لە ئایەتێك سڕاوەتەوە[2].

هەندێك پێیانوایە هەندێکی موحکەمە و هەندێکی سڕاوەتەوە.

هەندێکیش دەڵێن: ئایەتە موحکەمە و نەسخی تێدا نییە[3].

بەڵگەیەك لە قورئـان و سـوننەتی پێغەمبـەر(ﷺ) و ئیجمـاعی هـاوەڵان و قسـەی نووسەرانی وەحی نابینرێتەوە بەڵگـە بێـت لەسـەر ئـەم بانگەشـەیە لـە نەسـخی ئـەم ئایەتەدا، هەمووی تەنها ئیجتیهادە و تەنها گومان دەبەخشـێت، و ئـەوەی بـە یـەقین جـێگیر بووبێـت تـەنها بـە یـەقین دەسـڕێتەوە، ئـەم ئایەتـە پـیرۆزە بـە گـوزارەی راشکاوانەی خۆی چەند حوکمێك لەخۆ دەگرێت کـە هـەموویان موحکەمـە ئەوانـەش بریتین لەم نەهیکردن و فەرمانانەی دروشمەکانی خودا:

١.دروشمـەکانی خـودا حـەڵاڵ مەکـەن، ئـەوەی خـودا حـەرامی کـردووە حـەڵاڵی مەکـەن، و ئـەوەی حـەڵاڵی کـردووە حـەرامی مەکـەن، حـەڵاڵکردن بـەوە دەبێـت سەرپێچی لـە فەرمانـەکانی خـودا بکرێـت لـە رێگـەی وازلێهێنانیـان و سەرپێچی لـە نەهیکراوەکان بە ئەنجامدانیان.

٢.هەروەها مانگی حەرام(الشهر الحرام) حـەڵاڵ مەکـەن: واتـە جـەنگان لـە مـانگی حەرام و مانگەکانی تردا حەڵاڵ مەکەن، مەگەر لەباری هەڵواردندا وەك بەرگرییـەك لـە بیروباوەڕ و ژیان و ناموس و ماڵ و سامان، ئەم "معطـوف"ە و "معطـوف"ەکانی تریش هـەر هـەموو "عطـف" کراونەتـەوە سـەر "شعائر الله" ئـەوەش لـە دەروازەی

---

[1] من تفسير الجلالين ٢٦٥/١ (ئەمە نەسخکراوەتەوە بە ئایەتی: براءة).

[2] لە تفسير الصاوي على الجلالين وقولـه بآية براءة واتە نەسخی کردۆتەوە کە نەسخکەر چونکە نەسخکەر زیاتر لە ئایەتێکە.

[3] الناسخ والمنسوخ في القرآن الكريم لابي جعفر النحاس ص١١٥-١١٦.

"عطف"ی تایبەتە لەسەر "عطف"ی گشتی، چونکە هەرهەموو لە دروشمەکانی خودان.

٣."هەدی"ش حەڵاڵ مەکەن، واتە ئەو هەدیانەی بۆ جێگە پیرۆزەکان دەبرێن لەپێش هەموویانەوە "بيت الله الحرام" حەڵاڵی مەکەن، بەوەی بە داگیرکردن ببیەن بۆ خۆتان، هەروەها دەستدرێژی مەکەنە سەر ئەوانەی هەدیەکان پێشکەش دەکەن، دەستدرێژی بۆ سەر ئەو کەسانەی دروشمەکان لە ئایینی خۆیاندا پێشکەش دەکەن لە ئیسلامدا حەرامە، چونکە ئازادی ئایین لە ئیسلامدا پارێزگاری لێکراوە لەگەڵ بانگەواز بە حیکمەت و ئامۆژگاری چاك و پاك بۆ ئەو شتەی راست و دروستە.

٤.هەر بەو جۆرە "قلائد"یش حەڵاڵ مەکەن، واتە حەڵاڵی مەکەن بە دەستدرێژیکردنە سەر ئەو و خاوەنەکەی.

٥.دەستدرێژی مەکەنە سەر ئەوانەی سەفەری "بيت الله الحرام"یان بە مەرامگرتووە لە ناموسڵمانەکان لە کاتێکدا ئەوان داوای فەزڵ و رازیبوونی خودا دەکەن بە کارەکەیان.

٦.گەر لە ئیحرام بوونەوە بۆتان موباحە راو بکەن، چونکە کارەکە دوای ئەو قەدەغەبوونە دەگەڕێتەوە سەر دۆخەکەی یەکەمجاری لە واجبوون و نەدب و موباحبوون.

٧.رقتان لە قەومێك بە هۆیەکی پێشینە واتان لێ نەکات دەستدرێژی بکەنە سەریان، ئەمەش وەك ئەو ئایەتە وایە دەفەرموێت:﴿وَلاَ يَجْرِمَنَّكُمْ شَنَآنُ قَوْمٍ عَلَى أَلاَّ تَعْدِلُوا اعْدِلُوا هُوَ أَقْرَبُ لِلتَّقْوَى وَاتَّقُوا اللَّهَ إِنَّ اللَّهَ خَبِيرٌ بِمَا تَعْمَلُونَ﴾[1] خودا–سبحانه وتعالى– مەدحی ئەوانە دەکات بە چاکە رووبەڕووی خراپە دەبنەوە و هەروەها ئەوانەی رقی خۆیان دەخۆنەوە و لە هەڵەی بەرانبەر دەبوورێن، دەفەرموێت:﴿الَّذِينَ يُنْفِقُونَ فِي السَّرَّاءِ وَالضَّرَّاءِ وَالْكَاظِمِينَ الْغَيْظَ وَالْعَافِينَ عَنْ

---

[1] سورة المائدة/٨.

النَّـاسِ وَاللَّـهُ يُحِـبُّ الْمُحْسِـنِينَ﴾[1] بـەلام لـە هـەمان کاتـدا فـەرمانی کـردووە بـە بەرچدانەوەی کاری دوژمنکاری لە باری بەرگری رەوادا، دەفـەرموێت:﴿فَمَـنْ اعْتَـدَى عَلَيْكُمْ فَاعْتَدُوا عَلَيْهِ بِمِثْلِ مَا اعْتَدَى عَلَيْكُمْ﴾.

٨.هاوکاری بکەن لەسەر چاکە و تەقوا بە ئەنجامدانی ئەوەی فەرمانتان پێکراوە و وازهێنان لەوەی نەهیتان لێکراوە.

٩.هاوکـاری مەکـەن لەسـەر خراپـە و کـاری دوژمنکارانـە، بـە وازهێنـان لـەوەی فەرمانتان پێکراوە و ئەنجامدانی ئەوەی نەهیتان لێکراوە.

١٠ .تەقواتان هەبێت و بترسن لە سزای خودا، سزای توندی لەلایـە بـۆ ئەوانـەی دروشمەکانی حەلاڵ دەکەن، لەو دروشمانە دەستگرتنەوە لە دەسـتدرێژیکردنە سـەر کەسانی تر گەر دەستدرێژکاری ئەنجام نـەدا، خـۆ قەدەغـەکردن لـە زیانگەیانـدن بـە کەسـانی تـر، گـەر زیـانی پێگەیشـت ئـەوا مـافی قەرەبووکردنـەوەی بـۆ هەیـە بـەبێ تۆڵەسەندنەوە، چونکە زیان بە زیان لاناچێت(ناسڕێتەوە)، بەڵکو بە قەرەبووکردنەوە دەبێـت بـەپێی فـەرموودەی پێغەمبـەر(ﷺ) ((لا ضـرر ولا ضـرار-نـە زیـان و نـە زیانگەیاندن))[2] واتە دروست نییە زیـان بـە کەسـانی تـر بگەیـەنیت هـەر بـەو جـۆرە دروست نییە بە زیان رووبەڕووی زیان ببنەوە، یەکسـانە لای بەرانبـەر موسـڵمان بێـت یان ناموسڵمان، بۆ مرۆڤ مافی بەرگری رەوا و بەرپەرچدانەوەی دەستدرێژکاری هەیـە، یەکسانە دەستدرێژکارەکە موسڵمان بێت یان ناموسڵمان[3].

---

[1] سورة آل عمران/١٣٤.

[2] رواه مالك وأحمد وابن ماجة.

[3] سەرخەرانی نەسخ نەبوونەوە: الرازي ١١/١٣٠ والآلوسي ٦/٥٥.

-ئایەتی (٥):﴿الْيَوْمَ أُحِلَّ لَكُمُ الطَّيِّبَاتُ وَطَعَامُ الَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ حِلٌّ لَكُمْ وَطَعَامُكُمْ حِلٌّ لَهُمْ﴾[1] الآية.

"النحاس"[2] دەڵێت: سێ قسەی لەسەرە: هەیانە دەڵێن بۆ ئێمە حەڵاڵە با ناوی جگە لە خوداشیان لەسەر هێنا بێت، بۆیە نەسخکەرەوەی ئەم ئایەتەیە:﴿وَلاَ تَأْكُلُوا مِمَّا لَمْ يُذْكَرِ اسْمُ اللَّهِ عَلَيْهِ﴾[3] هەیانە دەڵێت ئایەتی(٥)ی سورەتی "المائدە" هەڵوارتنە لەم ئایەتە[4]، کەسانێکیش دەڵێن: نە نەسخکراوە و نە هەڵواردنە.

"ابن الجوزي"[5] دەڵێت: ئەهلی تەفسیر لەم ئایەتەدا جیاوازی کەوتۆتە نێوانیانەوە بۆ سێ قسە:

یەکەمیان: ئەوەیە داوا دەکات سەربڕاوی ئەهلی کیتاب بەرەهایی موباحکراوە، هەرچەند دەشزانین ناوی جگە لە خودای لەسەر هێنراوە، واتە یەکێکی تریان لەگەڵ خودادا کردووە بە هاوەڵ، بەڵام پێیان وایە نەسخکەری ئەم ئایەتەیە:﴿وَلاَ تَأْكُلُوا مِمَّا لَمْ يُذْكَرِ اسْمُ اللَّهِ عَلَيْهِ﴾.

دووەم: یەکەمجار[6] موباح بووە پاشان بەم ئایەتە نەسخکراوەتەوە:﴿وَلاَ تَأْكُلُوا مِمَّا لَمْ يُذْكَرِ اسْمُ اللَّهِ عَلَيْهِ﴾.

قسەی سێیەم: سەربڕاوی ئەهلی کیتاب بۆیە حەڵاڵکراوە چونکە لە بنەڕەتدا ناوی خودای لەسەر هێنراوە، بۆیە هەر کات زانرا ناوی جگە لە خودای لەسەر هێنراوە ناخورێت، "ابن الجوزي" دەڵێت ئەمە لەلای من دروستە.

---

[1] سورة المائدة/٥.
[2] المرجع السابق ص١١٧.
[3] سورة الانعام/١٢١.
[4] اي الآية ١٢١ من سورة الانعام.
[5] نواسخ القرآن ص١٤٢.
[6] ئایەتی ئاماژەکەر بە موباح کردن لە کوێیە تا بەم ئایەتە بسڕێتەوە؟

دروست ئەوەیە بانگەشەی نەسخ پووچەڵە بەم بەڵگانە:

١.هەموو ئەوەی وتراوە ئیجتیهادی تاکەکەسییە بەڵگەیەك لە قورئان یان سوننەت یان لە ئیجماع لەسەر دروستییەکەی راست نابێتەوە، ئیجتیهاد تەنها گومان دەبەخشێت، ئەوەش بە یەقین جێگیر بووە تەنها بە یەقین دەسڕێتەوە.

٢.جیاوازی لە مەرجی ناوهێنانی خودا و بە مەرجنەگرتنی ئەو ناوهێنانە لە فیقهی ئیسلامیدا هاتووە و تایبەت نییە بە ئەهلی کیتاب[1].

٣.نەبوونی زانست بە دواکەوتنی ئایەتی نەسخکەر لە نەسخکراو لە دابەزینـدا بە بەڵگەی ئەوەی جارێك نەسخکراو دەکەن بە نەسخکەری نەسخکەرێکی تر، جارێکیش پێچەوانەی ئەوە دەڵێن، بۆیە بابەتەکە بۆ گومان و ئیجتیهاد دەگەڕێتەوە، قورئانیش بینا لەسەر ئەوە ناسڕێتەوە، چونکە ئەوەی بە یەقین جێگیر دەبێت بە یەقین دەسڕێتەوە.

٤.هەر کەس دەڵێت نەسخکراوەتەوە تێکەڵی لا دروست بووە لە نێوان نەسخ و تایبەتکردندا یان لە نێوان نەسخ و سنووردارکردنی رەهادا وەك چۆن رۆشنە لەوەی باسمان کرد[1].

---

[1] ابن رشد في کتابه بداية المجتهد ونهاية المقتصد ٣٦٣/١ دەڵێت: لە حوکمی ناونانی بۆ سێ قسە دابەش بوون: وتراوە بەرەهایی فەرزە، ئەوە بریتییە لە قسەی ئەهلی زاهیر، وتراوە فەرزە گەر لەبیری بێت و فەرزەکە بەردەبێتەوە گەر لەبیری چوو ئەمەش قسەی مالیك و ئەبی حەنیفەیە، وتراویشە سوننەتێکی موئەکەدەیە ئەوەش قسەی شافیعی و هاوەڵانی ئەوە، لە "ابن عباس ﷺ وابي هريرة ﷺ " ریوایەتکراوە، هۆی جیاوازییەکەیان: بەرهەڵستی رووالەتی قورئانە لەوەدا لەگەڵ سوونەتی پێغەمبەر(ﷺ)، قورئان ئەم ئایەتەیە: (وَلاَ تَأْكُلُوا مِمَّا لَمْ يُذْكَرْ اسْمُ اللَّهِ عَلَيْهِ وَإِنَّهُ لَفِسْقٌ) سوننەتیش بریتییە لەوەی مالیك لە "هشام"ەوە لە باوکییەوە ریوایەتی کردووە، دەڵێت: پرسیار لە پێغەمبەر(ﷺ) کرا و وترا: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) خەڵکی بادیە گۆشتمان بۆ دەهێنن نازانین ناوی خودایان لەسەر هێناوە یان نە، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ناوی خودای لەسەر بهێنن و پاشان بیخۆن، مالیك پێیوایە ئایەتەکە نەسخی ئەم فەرموودەی کردووە.

-ئایەتی(١٣):﴿فَبِمَا[٢] نَقْضِهِمْ مِيثَاقَهُمْ لَعَنَّاهُمْ[٣] وَجَعَلْنَا قُلُوبَهُمْ قَاسِيَةً[٤] يُحَرِّفُونَ الْكَلِمَ[٥] عَنْ مَوَاضِعِهِ[٦] وَنَسُوا حَظًّا[٧] مِمَّا ذُكِّرُوا بِهِ وَلاَ تَزَالُ[٨] تَطَّلِعُ عَلَى خَائِنَةٍ[٩] مِنْهُمْ إِلاَّ قَلِيلاً مِنْهُمْ[١٠] فَاعْفُ عَنْهُمْ وَاصْفَحْ[١١] إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُحْسِنِينَ ﴾[١٢]

"ابن سلامە"[١٣] دەڵێت عەفو نەسخکراوەتەوە بەم ئایەتە:﴿قَاتِلُوا الَّذِينَ لاَ يُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَلاَ بِالْيَوْمِ الآخِرِ﴾[١٤] الآیة، "ابن حزم الاندلسی"[١٥] هەمان قسە دووبارە دەکاتەوە.

"ابن الجوزي"[١٦] دەڵێت: (زانایان لەسەر ئەمە جیاوازییان لە نێواندایە ئایا نەسخکراوەتەوە یان موحکەمە، بۆ دوو قسە:

---

[١] انصار عدم النسخ الرازي: ١١/١٤٦ والآلوسي: ٦/٦٥.
[٢] "ما" زائدە بە پەیمانشکێنییان.
[٣] واتە لە رەحمەتی خۆمان دوورمان خستنەوە.
[٤] نەرم نابن بۆ قبووڵ کردنی باوەڕ، ئەم "جعل"ە بەهۆی ئەوانەوە بووە و خودا بە زوڵم بەسەر ئەواندا نەیسەپاندووە.
[٥] ئەوەی لە تەوراتدایە.
[٦] ئەو شوێنەی خودا تیایدا دایناوە، واتە ئاڵوگۆڕی دەکەن.
[٧] واتە بەش، مانای "نسوا" واتە وازیان لێهێنا.
[٨] گوتارەکە بۆ سەروەرمان "محمد"ە(ﷺ).
[٩] اي خيانة منهم بنقض العهود والمواثيق.
[١٠] ئەو کەمە ئەوانە بوون کە موسڵمان بوون.
[١١] چونکە ئەوە لە ئەخلاقی بەرزی ئیسلامە و پێویستە موسڵمان پێیەوە پابەند بێت، چونکە لێبودرد و لێخۆشبوون لە دیارترین جیاکەرەوەکانی ئیسلامە.
[١٢] سورة المائدة/١٣.
[١٣] الناسخ والمنسوخ ص١١٧.
[١٤] سورة التوبة/٢٩.
[١٥] الناسخ والمنسوخ ص٣٥-٣٦.
[١٦] نواسخ القرآن ص١٤٤.

یەکـەمیان: ئایەتەکـە نەسـخکراوەتەوە، زۆربـەیان ئـەم قسـەیان کـردووە، بـۆ نەسخکەرەوەکەی دابەشبوون بەسەر سێ قسەدا:

١.ئایەتی شمشێر

٢.ئایەتی﴿قَاتِلُوا الَّذِينَ لاَ يُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ﴾ الایە.

٣.ئایەتی:﴿وَإِمَّا تَخَافَنَّ مِنْ قَوْمٍ[1] خِيَانَـةً[2] فَانْبِـذْ إِلَـيْهِمْ[3] عَلَـى سَوَاءٍ[4] إِنَّ اللَّـهَ لاَ يُحِبُّ الْخَائِنِينَ﴾[5].

قسەی دووەم: ئایەتەکە موحکەمە.

دروست ئەوەیە ئایەتەکە موحکەمە بەم بەڵگانە:

١.ئایـەتی شمشـێر تایبەتـە بـە حاڵـەتی دەسـتدرێژکاری و بـەرگری شـەرعی و هەڵوەشانەوەی پەیمان، بۆیە دەستدرێژکاری پێویست ناکات.

٢.﴿قَـاتِلُوا الَّـذِينَ لاَ يُؤْمِنُـونَ بِاللَّهِ﴾الآیـة، واتـە گـەر دژ بـە ئێـوە جـەنگان و دەستدرێژییان کردە سەرتان ئەمەش مەرجی داواکراوە بۆ جـەنگی ڕەوا وەك قورئـان باسی کردووە لە زۆرێك لە ئایەتەکانیدا، پێشتر هەندێکیمان باس کرد.

٣.ئایەتی "الأنفال" لەگەڵ لێخۆشـبوون و لێبـوردن بەرهەڵسـتی ناکـات لـە بـاری ئاشتیدا، بەڵکو ڕێسایەکی گشتی لەخۆ دەگرێت کە هـەموو دەوڵـەتانی دونیـا بـەپێی داواکارییەکەی ئەوە کاردەکەن، ئەوەش یەکێك لە دوو لایەنەکەی پەیمانبەسـتن گـەر پێیەوە پابەند نەبوو و پابەندبوونە سەرهەڵدراوەکانی ئـەو پەیمانبەسـتنەی جێبـەجێ

---

[1] پەیمانیان لەگەڵ بەستی.

[2] خیانەت لە پەیمانێکدا بە نیشانەیەك ئاماژەی پێ بکات.

[3] واتە پەیمانەکەیان بدەوە بەڕوودا و هەڵیبوەشێنەرەوە، چونکە گـەر یـەکێك لـە دوو لایەنەکە پابەند نەبێت بە هاوپەیمانێتییەکەوە ئەویتریان مافی خۆیەتی پێیەوە پابەند نەبێت.

[4] "حال"واتە تۆ و ئەوان لە پێزانینی هەڵوەشاندنەوەی پەیامانەکـە یەکسـان بـن، واتـە ئاگاداریان بکەرەوە لێی تا تۆمەتبارت نەك بە ناپاکی و پەیمانشکێنی.

[5] سورة الانفال/٥٨.

نــەکرد ئــەوا بــۆ لایەکــەی تــر دروســتە هەڵیبوەشــێنێتەوە و هەڵوەشــانەوەکەش ڕابگەیەنێت.

بۆیــە بابــەتی دوو ئایەتەکــە جیــاوازە و بەرهەڵســتکاری بــوونی نییــە و لەوێشــەوە نەسخ بوونی نییە[1].

-ئایەتی(٣٣):﴿إِنَّمَا جَزَاءُ الَّذِينَ يُحَارِبُونَ اللَّـهَ وَرَسُـولَهُ وَيَسْعَوْنَ فـِي الأَرْضِ فَسَادًا أَنْ يُقَتَّلُوا أَوْ يُصَلَّبُوا أَوْ تُقَطَّعَ أَيْدِيهِمْ وَأَرْجُلُهُـمْ مِـنْ خِـلاَفٍ أَوْ يُنفَـوْا مِـنْ الأَرْضِ ذَلِكَ لَهُمْ خِزْيٌ فِي الدُّنيَا وَلَهُمْ فِي الآخِرَةِ عَذَابٌ عَظِيمٌ﴾[2]

"ابن سلامه"[3] دەڵێت: خودا بە هەڵواردن نەسخی کردۆتەوە ئەوەش بریتییــە لــە ئایــەتی: ﴿إِلاَّ الَّـذِينَ تَـابُوا مِـنْ قَبْـلِ أَنْ تَقْـدِرُوا عَلَـيْهِمْ فَـاعْلَمُوا أَنَّ اللَّـهَ غَفُـورٌ رَحِيمٌ﴾[4]

"ابــن حــزم الاندلســي"[5] دەڵێــت: (بــەو هەڵواردنــەی بــە دوایــدا هــاتووە نەسخکراوەتەوە، ئەوەش بریتییە لە:﴿إِلاَّ الَّذِينَ تَابُوا﴾الآية.

قسەکەیان دروستە گەر مەبەستیان بە نەسخ ماناکەی بێت لای پێشینی چاکان کە مانایەکی گشتگیرە بۆ نەسخ وەك باسمــان کــرد، بــەڵام گــەر مەبەســت پێــی مانــا ئوسوڵییەکەی بێت کە بریتییــە لــە سڕینەوە و هەڵوەشاندنەوە ئــەوا هەڵەیــە، "ابــن الجوزي"[6] دەڵێت: ئەم ئایەتە لای فەقیهەکان موحکەمە، جیاوازیان لە نێوانداية ئایا ئــەو ســزایە بــەو ڕێکخســتنەیە لــە ئایەتەکــەدا هــاتووە یــان هەڵبــژاردەی تێــدا هەیــە، مەزهەبی ئیمام ئەحمەد و دەستەیەك لەسەر ئەوەن بەو ڕێکخستنەیە لــە ئایەتەکــەدا

---

[1] سەرخەرانی نەسخ نەبوونەوە: الرازي: ١٨٧/١١ والقرطبي: ١١٦/٦.

[2] سورة المائدة/٣٣. هەروەها لە سەرخەرانی نەسخ نەبوونەوە: الرازي: ٢١٤/١١.

[3] المرجع السابق ص١١٧.

[4] سورة المائدة/٣٤.

[5] المرجع السابق ص٣٦.

[6] المرجع السابق ص١٤٦.

هاتووه، ئەوانە(چەتە و رێگر) گەر بکوژن و ماڵ و سامان ببەن یان بکوژن و ماڵ و سامان نەبەن دەکوژرێن و لەدار دەدرێن، گەر ماڵ و سامان ببەن و نەکوژن دەست و لاقیان چەپ و راست دەبڕرێت، گەر ماڵ و سامان نەبەن نەفی دەکرێن، مالیك دەفەرموێت: ئیمام سەرپشکە لە جێبەجێ کردنی "حدود"دا، هەر "حدود"ێك لەو حدودانە بیەوێت پیادەی بکات، یەکسانە بکوژن یان نەکوژن، ماڵ و سامان ببەن، یان نەیبەن، هەندێ لە تەفسیرکەرانی قورئان–لەوانەی وردەکارییان نییە– پێیانوایە ئەم ئایەتە نەسخکراوەتەوە بەو هەڵواردنەی بەدوایدا دێت، لە چەندین شوێن ناوردی ئەم قسەیەمان رۆشن کردۆتەوە[1].

دروست ئەوەیە "الرازي"[2]دەڵێت: (بکوژرێن گەر کوشتنیان ئەنجامدابوو، لەدار بدرێن گەر هەستابوون بە کوشتن و بردنی ماڵ و سامان، یان دەست و لاقیان چەپ و راست ببڕرێت گەر تەنها ماڵ و سامانیان بردبوو، چونکە هێز بەکاردەهێنن لە بردنی ماڵ و ساماندا، بۆیە پێی دەوترێت دزی گەورە، یان لە زەوی نەفی بکرێن گەر ترسیان بۆ رێگە دروست دەکرد، پێوانەی ئاشکرا بەڵگەیە لەسەر دروستیی ئەوەی ئێمە باسمان کرد، چونکە کوشتنی بەئەنقەستی دوژمنکارانە کوشتن پێویست دەکات و ئەو کوشتنەش بۆ رێگر توند دەبێتەوە و کوشتنەکە لێبوردن نایگرێتەوە، بردنی ماڵ و سامان بڕینی دەستی پێوە پەیوەست دەبێت بۆ کەسانی تر جگە لە رێگر، لەسەر رێگر ئەوە توند دەبێتەوە بە بڕینی دەست و لاقی.

گەر کوشتن و بردنی ماڵیان لە خۆیاندا کۆکردەوە ئەوا کوشتن و لەداردانیان بۆ کۆدەبێتەوە، چونکە مانەوەی بە لەداردراوی لەسەر رێگە دەبێتە هۆیەك بۆ ئاشکراکردنی ئەو سزایە، ئەوەش دەبێتە هۆی دەمکوتکردنی کەسانی تر تاکو نەتوانن هەنگاو بۆ ئەو جۆرە یاخیبوونە هەڵبگرن، بەڵام گەر کارەکەی تەنها ترساندن

---

[1] نواسخ القرآن لابن الجوزي ص١٤٦.
[2] التفسير الكبير: ٢٢٢/١١.

بوو ئەوا شەرع سزایەکی سوکی بۆ داناوە کە بریتییە لە نەفیکردن لە زەویدا[1]

لە ئیجتیهادە هەڵەکان ئەوەیە هەندێ لە فەقیهان بۆی دەچن لە سەرپشککردنی ئیمام لە پیادەکردنی ئەم سزایانەدا بەبێ رەچاوکردنی رێکخستنەکەی، چونکە پێویستە سزا یەکسان بێت بە قەبارەی تاوانەکە، پاشان ئەم سزایە لە سزا حەدیەکانە و نە دەچێتە ژێر دەسەلاتی ئیمامەوە، نە دەچێتە ژێر دەسەلاتی قازیەوە، شایانی باسە ئەم سزایە تەنها یەك جار لە ئیسلامدا جێبەجێ کراوە ئەوەش بەسەر دەستەیەکی ناموسڵماندا کە تاوانەکانیان گەیشتبووە رادەی وەحشیگەری.

—ئایەتی(٤٢): ﴿فَإِنْ جَاءُوكَ فَاحْكُمْ بَيْنَهُمْ أَوْ أَعْرِضْ عَنْهُمْ﴾[2]

"ابن حزم الاندلسی"[3] دەڵێت: نەسخکراوەتەوە و نەسخکەرەکەشی بریتییە لە:﴿وَأَنْ احْكُمْ بَيْنَهُمْ بِمَا أَنزَلَ اللَّهُ وَلاَ تَتَّبِعْ أَهْوَاءَهُمْ﴾ [4].

سەرخەرانی نەسخی ئەم ئایەتە بریتین لە "السیوطي"[5] و"السدی" و"عکرمە" و"قتادە"[6].

بانگەشەی نەسخی باسکراو پووچە، چونکە تێکەڵییە لە نێوان نەسخ و رۆشنکردنەوەدا، ئایەتی دووەم تەواوکەری ئایەتی یەکەمە، پێغەمبەر(ﷺ) سەرپشك کراوە لە نێوان حوکم لە نێوان ئەهلی کیتابدا دەریکات یان پشتیان تێبکات، پاشان بۆی رۆشن کردەوە گەر حوکمدانی لە نێوانیان هەڵبژارد حوکم بەوە بکات خودا دایبەزاندووە.

---

[1] التفسیر الکبیر: ٢٢٢/١١.

[2] سورة المائدة/٤٢. من انصار عدم النسخ: الرازي: ٢٣٥/١١.

[3] الناسخ والمنسوخ ص٣٦.

[4] سورة المائدة/٤٩.

[5] الاتقان في علوم القرآن: ٢٣/٢.

[6] ابن الجوزي ص١٤٧.

بینا لەسەر ئەمە ئیمام(خاوەن ئەمر) و نوێنەرانی لە قازیان سەرپشکن، کاتێك دادبینی لەلایەن ئەهلی کیتابەوە بۆ بەرزکرایەوە گەر بیانەوێت دەتوانن لە نێوانیاندا حوکم بکەن یان گەر بیانەوێت پشتیان تێبکەن، بەڵام گەر حوکم کردنیان هەڵبژارد پێویستە حوکمەکە بە شەریعەتی ئیسلام بێت نەك بە شەریعەتی ئەوان.

کۆتایی ئایەتی(٤٢) بەڵگەیە لەسەر ئەوە: ﴿وَإِنْ حَكَمْتَ فَاحْكُمْ بَيْنَهُمْ بِالْقِسْطِ إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُقْسِطِينَ﴾.

-ئایەتی(٩٩):﴿مَا عَلَى الرَّسُولِ إِلاَّ الْبَلاَغُ﴾[١]

"ابن حزم الاندلسي"[٢] دەڵێت: ئایەتی شمشێر نەسخی کردۆتەوە.

"ابن الجوزی" دەڵێت: ئەهلی تەفسیر جیاوازیان لە نێواندایە لەسەر دوو قسە:

یەکەمیان: ئایەتەکە موحکەمە و ئاماژەیە بەوەی لەسەر پێغەمبەر(ﷺ) پێڕاگەیاندن پێویستە نەك هیدایەتدانیان لەسەری واجب بێت.

دووەم-ئایەتەکە کورتبوونەوە لەسەر پێڕاگەیاندن لەئامێز دەگرێت بەبێ فەرمانکردن بە جەنگان پاشان بە ئایەتی شمشێر نەسخکراوەتەوە، بۆچوونی یەکەمیان دروستترە[٣].

پێشتر باسمان کرد ئیسلام بیروباوەڕ و کردارە، بیر و باوەڕ بە شمشێر بەسەر مرۆڤدا ناسەپێت، چونکە ئیمان لەترسی شمشێر دەبێتە هۆی سەرهەڵدانی کۆمەڵگەیەکی دووڕوو، دەرەوەی جیادەبێت لە ناوەوەی، ئەوەش لە دوژمن ترسناکترە، بۆیە بانگەواز بە حیکمەت و ئامۆژگاری چاك و باش دەبێت، و ئایەتی شمشێر بۆ پەرچدانەوەی دەستدرێژییە بۆ سەر بەرژەوەندییە زەرورەکان لە ئایین و ژیان و نامووس و ماڵ و سامان[٤].

---

[١] سورة المائدة/٩٩.

[٢] المرجع السابق ص٣٦.

[٣] نواسخ القرآن/ص١٤٩.

[٤] سەرخەرانی نەسخ نەبوونەوە: الرازي ١٢/١٣٠.

-ئایەتی(١٠٥):﴿يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا عَلَيْكُمْ أَنفُسَكُمْ لاَ يَضُرُّكُمْ مَنْ ضَلَّ إِذَا اهْتَدَيْتُمْ﴾[١]

"ابن حزم الاندلسي"دەڵێت: کۆتایی ئایەتەکە سەرەتاکەی سڕیوەتەوە، نەسخکەرەکەی بریتییە لەم بەشەی ئایەتەکە:﴿إِذَا اهْتَدَيْتُمْ﴾ "الهدى"لێرەدا بریتییە لە فەرمان بە چاکە و ڕێگری لە خراپە، لە کتێبەکەی خودادا ئایەتێك نییە نەسخکەر و نەسخکراوی تێدا کۆببووبێتەوە جگە لەم ئایەتە[٢]

"ابن الجوزي" دەڵێت: بۆ زانایان دوو قسە هەیە:

یەکەم: ئایەتەکە نەسخکراوەتەوە، چونکە دەستگرتنەوەی تێدایە لە جەنگان دژ بە گومڕایان، بۆیە نەسخکراوەتەوە و لە نەسخکەرەوەکەشدا دوو قسەیان هەیە:

١.ئایەتی شمشێر

٢.کۆتاییەکەی سەرەتاکەی نەسخ کردۆتەوە و نەسخکەرەوەکەش بریتییە لە:﴿إِذَا اهْتَدَيْتُمْ﴾.

قسەی دووەم: ئایەتەکە موحکەمە، چونکە ماناکەی وەك "الزجاج" دەڵێت ئەمرە، خودا ئەمری خودی خۆتانی لەسەر پێویست کردوون و بە گوناهی کەسانی تر ئێوە ناگرێت، ئەم ئایەتە وازهێنان لە فەرمان بە چاکە پێویست ناکات، چونکە گەر باوەڕدار واز لەو کارە بهێنێت لەگەڵ ئەوەی توانای هەبێت ئەوە دەبێتە کەسێکی گومڕا و لەسەر هیدایەت نابێت، "ابن الجوزي" بەڵگەی هێناوەتەوە لەسەر ئەوەی ئایەتەکە موحکەمە لە چەند ڕوویەکەوە:

أ.ئایەتی: ﴿عَلَيْكُمْ أَنفُسَكُمْ﴾ داوا دەکات مرۆڤ بە بەرژەوەندییەکانی خۆیەوە سەرقاڵ بێت، هەروەها هەواڵی ئەوەی تێدایە بە گومڕایی کەسانی تر سزا نادرێت.

---

[١] سورة المائدة/١٠٥.

[٢] المرجع السابق ص٣٦.

ب.ئایەتەکە ئاماژە دەکات بە پێویستبوونی فەرمان بە چاکە و ڕێگری لە خراپە، چونکە﴿عَلَيْكُمْ أَنفُسَكُمْ﴾ فەرمانە بە چاککردنی و هەستان بەوەی لەسەریەتی، واجبوونی فەرمان بە چاکە و ڕێگری لە خراپە جێگیربووە، ئەوەش کە ئاماژەی پێ دەکات بریتییە لە:﴿إِذَا اهْتَدَيْتُمْ﴾ چونکە مرۆڤ نابێت بە هیدایەتدراو گەر فەرمانی شەرعی جێبەجێ نەکرد.

دروست ئەوەیە ئایەتەکە نەسخ نەکراوەتەوە لەبەر نەبوونی دژیەکی لە نێوان نەسخکەر و نەسخکراودا، ئایەتە نەسخکراوەکە–بەپێی بۆچوونەکەی ئەوان– ئاماژە ناکات بە بانگەواز نەکردن بۆ ئیسلام بە حیکمەت و ئامۆژگاری چاك و باش، هەر بەو جۆرە ئاماژە ناکات بە پەنانەبردن بۆ نەجەنگان هەرکات ڕووبەڕووی دەستدرێژکاری بوویەوە لە موسڵمان یان ناموسڵمانەوە، ئەمە گەر نەسخکەری بانگەشەبۆکراو بە ئایەتی شمشێر بێت، بەڵام گەر نەسخکەر کۆتایی ئایەتەکە بێت ئەوا تێکەڵییە لە نێوان نەسخ و تایبەتکردنی گشتی بە مەرجێك یان سنووردارکردنی ڕەها بەو مەرجەوە[1].

– الآيه (١٠٦) ﴿يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا شَهَادَةُ بَيْنِكُمْ إِذَا حَضَرَ أَحَدَكُمُ الْمَوْتُ حِينَ الْوَصِيَّةِ اثْنَانِ ذَوَا عَدْلٍ مِنْكُمْ أَوْ آخَرَانِ مِنْ غَيْرِكُمْ[2] إِنْ أَنْتُمْ ضَرَبْتُمْ[3] فِي الأَرْضِ فَأَصَابَتْكُمْ مُصِيبَةُ الْمَوْتِ﴾[4].

"النحاس" دەڵێت: لەسەر ئەم ئایەتە هاوەڵان و شوێنکەوتوان و فەقیهان پێنج قسەیان هەیە:

١.دروستی شایەتی ئەهلی کیتاب لەسەر وەسێت لە سەفەردا، ئەوەش قسەی "ابن عباس" و "عبدالله بن قيس"ە.

---

[1] لە سەرجەوانی نەسخ نەبوونەوە: الرازي ١٢/١١٦.

[2] لەسەر ئایینی ئێوە نەبێت، وتراویشە لە هۆزی ئێوە نەبێت.

[3] سەفەرتان کرد.

[4] سورة المائدة/١٠٦.

٢.كاتی خۆی دروست بوو دواتر نەسخکرایەوە، بۆیە شایەتی کافر لە هەموو بارەکاندا دروست نییە.

٣.هەموو ئایەتەکە بۆ موسڵمانانە واتە شایەتییەکە لە شایەتانی هۆزەکەی خۆت بێت یان لە کەسانی تر لە موسڵمانان.

٤.مەبەست بە "الشهادة" مانا زمانەوانییەکەی بریتییە لە ئامادەبوون.

٥."الشهادة" بە مانای سوێند دێت[1]

"ابن حزم الأندلسي"[2]: خودا شایەتی ئەهلی زیمەی لەسەر وەسێت لە سەفەردا بە دروست داناوە، پاشان ئەوە نەسخکراوەتەوە بەم ئایەتە: ﴿وَأَشْهِدُوا ذَوَى عَدْلٍ مِنْكُمْ﴾[3]

"ابن الجوزي" دەڵێت: دوو قسە هەیە:

یەکەم: ئایەتەکە موحکەمە، ئەوەش قسەی "ابن عباس و ابن المسيب و ابن جبير و ابن سيرين و قتادە و الشعبى و الثورى و أحمد بن حنبل"ە.

دووەم: ئایەتەکە نەسخکراوەتەوە بە ئایەتی: ﴿وَأَشْهِدُوا ذَوَى عَدْلٍ مِنْكُمْ﴾ ئەمەش قسەی "زيد بن أسلم"ە و "أبو حنيفة و مالك و الشافعي"ش مەیلیان بەلایدا هەیە، و دەڵێن: ئەهلی کوفر دادپەروەر نین.

پاشان "ابن الجوزي" پارسەنگی قسەی یەکەمی داوە، و دەڵێت: یەکەمیان دروستترە، چونکە ئەمە بابەتی زەرورەتە، بۆیە دروستە، وەك چۆن لە هەندێ شوێندا شایەتی ئافرەت دروستە و پیاویانی لەگەڵ نییە، وەك حەیز و زەیسانی و سەرەتای کەوتنە ناو حەیزی یەکەمجارەوە[4]

---

[1] الناسخ والمنسوخ لابي جعفر النحاس ص١٣١.

[2] الناسخ والمنسوخ ص٣٦.

[3] سورة الطلاق/٢.

[4] نواسخ القرآن ص١٥٤ والاستهلال.

دروست بریتییە لە نەسخ نەبوونەوە بەهۆی نەبوونی بەرهەڵستکاری لە نێوان دوو ئایەتەکەدا، چونکە یەکەمیان پەیوەستە بە پرسە داراییەکانەوە، بۆیە شایەتی دادپەروەر و فاسق و ناموسڵمانی تێدا دروستە، دووەمیان پەیوەستە بە شەرەف و میرات و نامووس و رەچەڵەکەوە لەڕووی مانەوەی هاوسەرگیری یان یان جیابوونەوە لە نێوان ژن و مێردەکەدا، بۆیە خودا-سبحانه وتعالى- دەفەرموێت: ﴿فَإِذَا بَلَغْنَ[1] أَجَلَهُنَّ[2] فَأَمْسِكُوهُنَّ[3] بِمَعْرُوفٍ أَوْ فَارِقُوهُنَّ بِمَعْرُوفٍ﴾ شافیعییەکان بەڵگە بەم ئایەتە دەهێننەوە لەسەر پەسەندی ئامادەبوونی دوو شاهیدی دادپەروەر لە کاتی گەڕانەوەی ژنە تەڵاقدراوەکە بە تەڵاقێکی رجعی[4].

وەك چۆن ئیمامییەکان بەڵگە بەم ئایەتە دەهێننەوە لەسەر ئەوەی شایەتی پایەیەکە لە پایەکانی تەڵاق، بۆیە دەڵێن: پایەکانی تەڵاق چوارن، مێرد و ژن و شێوازی دارشتن و شایەت[5].

بۆیە بابەتی دوو ئایەتەکە جیاوازن، لە مەرجەکانی نەسخیش دژیەکییە، لە مەرجەکانی دژیەکیش یەکێتی بابەتە، بۆیە گەر مەرجەکە دواکەوت، مەرجگیراو دەستەبەر نابێت.

پاشان ئەسڵ لە شایەتیدا ئەوەیە دادپەروەر بێت، چونکە شایەتییەکەی بە بەڵگە دادەنرێت و بەپێی ئەو بەڵگەیە حوکم دەردەکرێت، بەڵام پێچەوانەی ئەوە دروستە لەباری هەڵواردەییدا، بەزۆری بۆ هەموو ئەسڵێك هەڵواردنێك یان زیاتر لە هەڵواردنێك بوونی هەیە.

---

(1) نزیکببنەوە.

(2) واتە ماوەی عیدەکەیان نزیکبوویێتەوە لە کۆتاهاتن.

(3) بیانگێڕنەوە بۆ ژێر دەسەڵاتی هاوسەرداری خۆتان.

(4) الباجوري على الغزي ٢/١٥٢ تیایدا هاتووە: (سوننەتە شایەتی لەسەر بگیرێت تاکو لە جیاوازییەکەی ئەوانەی بە واجبی دەزانن قوتاری ببێت، بە واجب نەگیراوە لەبەرئەوەی لە حوکمی بەردەوامبوونی نیکاحدایە.

(5) الروضة البهية شرح اللمعة الدمشقية: ٢/١٤٧.

# نەسخی بانگەشەبۆکراو لە سورەتی "الانعام"دا

"ابن حزم الاندلسي"[1] دەڵێت: ئەم سورەتە چواردە ئایەتی نەسخکراو لەخۆ دەگرێت.

ابن سلامة[2] دەڵێت: نۆ ئایەتی لە مەکە دابەزیوە و یازدە ئایەتی نەسخکراوی تێدایە[3]:

﴿قُلْ إِنِّي أَخَافُ إِنْ عَصَيْتُ رَبِّي عَذَابَ يَوْمٍ عَظِيمٍ﴾ (١٥)

﴿وَكَذَّبَ بِهِ قَوْمُكَ وَهُوَ الْحَقُّ قُلْ لَسْتُ عَلَيْكُمْ بِوَكِيلٍ﴾ (٦٦)

﴿وَإِذَا رَأَيْتَ الَّذِينَ يَخُوضُونَ فِي آيَاتِنَا فَأَعْرِضْ عَنْهُمْ حَتَّى يَخُوضُوا فِي حَدِيثٍ غَيْرِهِ وَإِمَّا يُنسِيَنَّكَ الشَّيْطَانُ فَلاَ تَقْعُدْ بَعْدَ الذِّكْرَى مَعَ الْقَوْمِ الظَّالِمِينَ﴾ (٦٨)

﴿وَذَرِ الَّذِينَ اتَّخَذُوا دِينَهُمْ لَعِبًا وَلَهْوًا وَغَرَّتْهُمُ الْحَيَاةُ الدُّنْيَا﴾ (٧٠)

﴿قُلْ اللَّهُ ثُمَّ ذَرْهُمْ فِي خَوْضِهِمْ يَلْعَبُونَ﴾ (٩١)

﴿فَمَنْ أَبْصَرَ فَلِنَفْسِهِ وَمَنْ عَمِيَ فَعَلَيْهَا وَمَا أَنَا عَلَيْكُمْ بِحَفِيظٍ﴾ (١٠٤)

---

[1] الناسخ والمنسوخ ص ٣٧

[2] الناسخ والمنسوخ ص١١٩

[3] من انصار عدم النسخ الرازي١٢/١١٦ والقرطبي٦/٣٥٠.

﴿وَأَعْرِضْ عَنْ الْمُشْرِكِينَ ﴾ (١٠٦)

﴿وَمَا جَعَلْنَاكَ عَلَيْهِمْ حَفِيظًا وَمَا أَنْتَ عَلَيْهِمْ بِوَكِيلٍ﴾ (١٠٧)

﴿وَلاَ تَسُبُّوا الَّذِينَ يَدْعُونَ مِنْ دُونِ اللَّهِ فَيَسُبُّوا اللَّهَ عَدْوًا بِغَيْرِ عِلْمٍ﴾ (١٠٨)

﴿فَذَرْهُمْ وَمَا يَفْتَرُونَ﴾ (١١٢)

﴿وَلاَ تَأْكُلُوا مِمَّا لَمْ يُذْكَرْ اسْمُ اللَّهِ عَلَيْهِ﴾ (١٢١)

﴿قُلْ يَاقَوْمِ اعْمَلُوا عَلَى مَكَانَتِكُمْ إِنِّي عَامِلٌ فَسَوْفَ تَعْلَمُونَ مَنْ تَكُونُ لَهُ عَاقِبَةُ الدَّارِ إِنَّهُ لاَ يُفْلِحُ الظَّالِمُونَ﴾ (١٣٥)

﴿وَكَذَلِكَ زَيَّنَ لِكَثِيرٍ مِنْ الْمُشْرِكِينَ قَتْلَ أَوْلاَدِهِمْ شُرَكَاؤُهُمْ لِيُرْدُوهُمْ وَلِيَلْبِسُوا عَلَيْهِمْ دِينَهُمْ وَلَوْ شَاءَ اللَّهُ مَا فَعَلُوهُ فَذَرْهُمْ وَمَا يَفْتَرُونَ﴾ (١٣٧)

﴿قُلْ انتَظِرُوا إِنَّا مُنتَظِرُونَ﴾ (١٥٨)

﴿إِنَّ الَّذِينَ فَرَّقُوا دِينَهُمْ وَكَانُوا شِيَعًا لَسْتَ مِنْهُمْ فِي شَيْءٍ إِنَّمَا أَمْرُهُمْ إِلَى اللَّهِ ثُمَّ يُنَبِّئُهُمْ بِمَا كَانُوا يَفْعَلُونَ﴾ (١٥٩)

ئایەتی(١٥):﴿قُلْ إِنِّي أَخَافُ إِنْ عَصَيْتُ رَبِّي عَذَابَ يَوْمٍ عَظِيمٍ﴾[1]

ابن سلامه[2] دەڵێت بەم ئایەتە نەسخکراوەتەوە:﴿لِيَغْفِرَ لَكَ اللَّهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِكَ وَمَا تَأَخَّرَ وَيُتِمَّ نِعْمَتَهُ عَلَيْكَ وَيَهْدِيَكَ صِرَاطًا مُسْتَقِيمًا﴾ [3] ابن حزم الاندلسی[4]دەڵێت: ئایەتی:﴿قُلْ إِنِّي أَخَافُ إِنْ عَصَيْتُ﴾ الآیە، نەسخکراوەتەوە و نەسخکەرەوەکەشی بریتییە لە:﴿لِيَغْفِرَ لَكَ اللَّهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِكَ وَمَا تَأَخَّرَ﴾

بانگەشەی نەسخ بە چەندین بەڵگە پووچ و بێبنەمایە، لەوانە:

١-نەبوونی هیچ بەرهەڵستکارییەك لە نێوان دوو ئایەتەکەدا، چونکە بەڵێنی خودای باسکراو مانای نەترسان ناگەیەنێت لە سزا لە باری گریمانەی یاخیبووندا.

٢-هەتا مرۆڤ مەعریفەی بە خودا زۆرتر بێت ترسی لە خودا زیاتر دەبێت، پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت: ((من لە هەموو زاناترم بە خودا و لە هەمووتان زیاتر لێی دەترسم))[5]

٣-ئەو ئایەتەی پێیانوایە نەسخکراوەتەوە تایبەت نییە بە پێغەمبەر(ﷺ) وەك لە ئایەتێکی تردا: ﴿لَئِنْ أَشْرَكْتَ لَيَحْبَطَنَّ عَمَلُكَ وَلَتَكُونَنَّ مِنَ الْخَاسِرِينَ﴾[6]، پێغەمبەر(ﷺ) وێنای هاوەڵدانانی لێ ناکرێت، بەڵکو گوتارەکە روو بە ئوممەتەکەیەتی، هەر بەو جۆرە ئایەتی: ﴿قُلْ إِنِّي أَخَافُ إِنْ عَصَيْتُ رَبِّي عَذَابَ يَوْمٍ عَظِيمٍ﴾، ئەم حوکمە گشتییە و هەموو مرۆڤێك دەگرێتەوە.

٤-پیتی(إن) بۆ کارێك بەکاردەهێنرێت(وەك مرۆڤ) لە روودانی دڵنیا نەبین، واتە گەر وادابنێین یاخیبوون بوونی هەبێت بوونی ترس لە سزای خودا پێویست دەکات.

---

[1] سورة الانعام/١٥.
[2] الناسخ والمنسوخ ص١١٩.
[3] سورة الفتح/٢.
[4] المرجع السابق ص٣٧.
[5] رواه البخاري والنسائي.
[6] سورة الزمر/٦٥.

"الرازي"[1] دەڵێت: ئایەتەکە بەڵگەی ئەوە نییە لە نەفسی خۆی ترساوە، بەڵکو بەڵگەیە لەسەر ئەوەی گەر کوفر و یاخیبوونی لێ بوەشێتەوە ئەوا دەترسێت، ئەم برە ئاماژە ناکات بە سەرهەڵدانی ترس، نموونەکەی وتمان گەر ژمارە پێنج جووت بێت ئەوا بە یەکسانی بۆ دوو بەشی یەکسان دابەش دەبێت، ئەمەش ئاماژە نییە بۆ ئەوەی ژمارەی پێنج جووت بێت، هەروەها ئاماژە نییە بۆ ئەوەی بۆ دوو بەشی تەواو لە ژمارەدا دابەش ببێت.

٥-ئایەتە ئاماژەبۆکراوەکە کە پێیانوایە نەسخکراوەتەوە هەواڵە، نە فەرمانە و نە نەهی، هەواڵیش ناچێتە ژێر نەسخەوە، ئەگەر نە، سەردەکێشێت بۆ بەدرۆزانینی هەواڵ، پێویستەکە پووچە هەر بەو جۆرە پێویستکراوەکە[2].

-ئایەتی (٦٦):﴿وَكَذَّبَ بِهِ قَوْمُكَ وَهُوَ الْحَقُّ قُلْ لَسْتُ عَلَيْكُمْ بِوَكِيلٍ﴾[3] "ابن سلامه"[4] دەڵێت: ئایەتی﴿وَكَذَّبَ بِهِ قَوْمُكَ وَهُوَ الْحَقُّ﴾ ئەم بەشە موحکەمە و نەسخکراو بریتییە لە:﴿قُلْ لَسْتُ عَلَيْكُمْ بِوَكِيلٍ﴾ نەسخکراو تیایدا بە ئایەتی شمشێر نەسخکراوەتەوە.

"ابن الجوزي" دەڵێت ئایەتی﴿قُلْ لَسْتُ عَلَيْكُمْ بِوَكِيلٍ﴾ ئەهلی تەفسیر دوو قسەیان هەیە لەسەری:

یەکەم-داوای کورتهەڵهێنان دەکات تەنها لە ترساندن و ئاگادارکردنەوەیاندا، پاشان بە ئایەتی شمشێر نەسخکراوەتەوە، ئەم دەقە لە ریوایەتەکەی "الضحاك"ە لە "ابن عباس"ەوەیە-خوایان لێ رازی بێت-

---

[1] التفسير الكبير ومفاتيح الغيب ١٧٩/١٢.

[2] لە سەرخەرانی نەسخ نەبوونەوەی: الرازي ١٧٠/١٢

[3] سورة الانعام/٦٦

[4] الناسخ والمنسوخ في القرآن الكريم ص١١٩

دووەم-ماناکەی "لست حفيظا عليكم-من چاودێر نیم بە سەرتانەوە"، بەڵکو تەنها بە ڕواڵەت و ئاشکراتان مامەڵە دەکەم لە دانپیادانان و کارکردن نەك نهێنییەکانتان، لەسەر ئەمە ئایەتەکە موحکەمە و هەر ئەمەش دروستە و پێداگری دەکات ئایەتەکە هەواڵە، هەواڵیش نەسخ نابێتەوە، ئەمە هەڵبژاردنی دەستەیەکە لەوانە "أبو جعفر النحاس"[1].

"النحاس" دەڵێت: ئایەتی﴿قُلْ لَسْتُ عَلَيْكُمْ بِوَكِيلٍ﴾ لە "الضحاك" لە "ابن عباس"ەوە لەسەر ئایەتی:﴿لَسْتُ عَلَيْكُمْ بِوَكِيلٍ﴾ دەفەرموێت: ئەمە ئایەتی شمشێر نەسخی کردۆتەوە﴿فَاقْتُلُوا الْمُشْرِكِينَ حَيْثُ وَجَدْتُمُوهُمْ﴾[2] "ابو جعفر"دەڵێت: (مەبەستی خۆیەتی) ئەمە هەواڵە و دروست نییە نەسخ بووبێتەوە، مانای(وكيل) پارێزەر و چاودێرە، پێغەمبەر(ﷺ) لەسەر ئەوان چاودێر نییە، بەڵکو تەنها لەسەریەتی بیانترسێنێت و ئاگاداریان بکاتەوە و سزای ئەوان لەسەر خودایە [3].

دروست نەسخ نەبوونەوەیەتی بە کۆمەڵێك بەڵگە لەوانە: [4]

١- ئەوەی "النحاس" و "ابن الجوزي"باسی دەکەن لە وتنی نەسخ نەبوونەوەی ئایەتەکە لە بەڵگە ئاماژەبۆکراوەکان.

٢-ئەمە وەك ئەو شێوازەی تر وایە کە دەفەرموێت:﴿إِنَّكَ لاَ تَهْدِي مَنْ أَحْبَبْتَ وَلَكِنَّ اللَّهَ يَهْدِي مَنْ يَشَاءُ وَهُوَ أَعْلَمُ بِالْمُهْتَدِينَ﴾[5].

٣-ئەرکی پێغەمبەر(ﷺ) بریتییە لە بەخشینی خەمخۆری بە پێڕاگەیاندن و ئاراستەکردن و بانگەواز بە حیکمەت و ئامۆژگاری چاك و پاك، ئەرکی ئەو دەستەبەرکردنی ئامانجەکە نییە کە بریتییە لە هیدایەتی بەردەوام تا مردن، چونکە

---

[1] نواسخ القرآن لابن الجوزي ص١٤٥

[2] سورة التوبة/٥

[3] الناسخ والمنسوخ في القرآن الكريم لابي جعفر النحاس ص١٣٦-١٣٧.

[4] لە سەرچاوەکانی نەسخ نەبوونەوەی: الرازي ٢٤/١٣ والالوسي١٨١/٧ والقرطبي١١١/٧.

[5] سورة القصص/٥٦

ئەو ئامانجە ناکەوێتە ژێر ویستی پێغەمبەرانەوە، ئەم مانایە ئەو مەبەستەیە لەم بەشەی ئایەتەکە دەفەرموێت: ﴿لَسْتُ عَلَيْكُمْ بِوَكِيلٍ﴾.

٤-نەبوونی بەرهەڵستکاری لە نێوان دوو ئایەتی نەسخکەر و نەسخکراودا، وەك لە برگەکانی پێشتر رۆشن بوویەوە.

٥-ئەو گشتاندنە وەرگیراوە لە ئایەتی: ﴿لَسْتُ عَلَيْكُمْ بِوَكِيلٍ﴾ تایبەتکراوە بە ئایەتی شمشێر، بۆیە وتنی نەسخ تێکەڵییە لە نێوان تایبەتکردن و نەسخدا.

٦-ئەوەی گوازراوەتەوە لە "ابن عباس"ەوە لە وتنی نەسخ مەبەست پێی مانا گشتییە گشتگیرەکەیەتی بۆ تایبەتکردن و سنووردارکردن و شتانی تریش نەك مانا ئوسولییەکەی کە سڕینەوە دەگەیەنێت.

-ئایەتی(٦٨):﴿وَإِذَا رَأَيْتَ[1] الَّذِينَ يَخُوضُونَ[2] فِي آيَاتِنَا[3] فَأَعْرِضْ عَنْهُمْ[4] حَتَّى يَخُوضُوا فِي حَدِيثٍ غَيْرِهِ وَإِمَّا يُنسِيَنَّكَ الشَّيْطَانُ[5] فَلاَ تَقْعُدْ بَعْدَ الذِّكْرَى[6] مَعَ الْقَوْمِ الظَّالِمِ﴾.[7]

"الطبرسي"[8]-لە کەسانی ترەوە دەیگوێزێتەوە و - دەڵێت[9]: ئەوە لە سەرەتای ئیسلامەوە بوو، تایبەت بوو بە پێغەمبەر(ﷺ) روخسەت بە باوەڕداران

---

[1] بینینی چاو.
[2] "الخوض" لە بنەڕەتدا چوونە ناو ئاوە وەرگیراوە بۆ چوونە ناو قسە و رۆچوون تیایدا.
[3] أي آيات القرآن في الاستهزاء بها
[4] دامەنیشە لەگەڵیان و بەجێیان بهێڵە.
[5] لەگەڵیان دانیشتی کاتێك نەهیکردنەکەت لە دانیشتن لەگەڵیان لەبیرچوو.
[6] دوای ئەوەی نەهییەکەت بیر دەکەوێتەوە.
[7] سورة الانعام/٦٨
[8] مجمع البيان في تفسير القرآن٤/٣١٧
[9] وەك: سعيد بن جبير

درابوو لەگەڵیان دابنیشن و تێکەڵیان ببن، پاشان کە ئیسلام هێز و عیززەتی پەیدا کرد و موسڵمانان زۆر بوون نەهیان لێکرا لەگەڵیان دابنیشن و ئەم ئایەتە بەم ئایەتەی تر نەسخکرایەوە: ﴿وَقَدْ نَزَّلَ عَلَيْكُمْ فِي الْكِتَابِ أَنْ إِذَا سَمِعْتُمْ آيَاتِ اللَّهِ يُكْفَرُ بِهَا وَيُسْتَهْزَأُ بِهَا فَلاَ تَقْعُدُوا مَعَهُمْ حَتَّى يَخُوضُوا فِي حَدِيثٍ غَيْرِهِ إِنَّكُمْ إِذًا مِثْلُهُمْ﴾ [1] الآية.

"ابن سلامه"[2] دەڵێت: ﴿وَإِذَا رَأَيْتَ الَّذِينَ يَخُوضُونَ فِي آيَاتِنَا فَأَعْرِضْ عَنْهُمْ﴾[3] هەتا ئایەتی: ﴿وَمَا عَلَى الَّذِينَ يَتَّقُونَ مِنْ حِسَابِهِمْ مِنْ شَيْءٍ وَلَكِنْ ذِكْرَى لَعَلَّهُمْ يَتَّقُونَ﴾[4] نەسخکراوەتەوە بە ئایەتی: ﴿فَلاَ تَقْعُدُوا مَعَهُمْ حَتَّى يَخُوضُوا فِي حَدِيثٍ غَيْرِهِ﴾[5] واتە دوو ئایەتەکەی(٦٨-٦٩)ی سورەتی "الأنعام" نەسخکراونەتەوە بە ئایەتی(١٤٠)ی سورەتی "النساء"

هەمان قسە "ابن حزم الاندلسي"[6] دووبارەی کردۆتەوە.

"ابن الجوزي"[7] دەڵێت: ئایەتی ﴿وَإِذَا رَأَيْتَ الَّذِينَ يَخُوضُونَ فِي آيَاتِنَا فَأَعْرِضْ عَنْهُمْ﴾ مەبەست لەمە رۆچوونە-رۆچوون لە بەدرۆزانیندا- وەك ئەوە وایە پشتهەڵکردنی باسکراو لێی نەسخکرابێتەوە بە ئایەتی شمشێر.

بانگەشەی نەسخ پووچە بەم بەڵگانە:

١-نەبوونی هیچ بەرهەڵستییەك لە نێوان نەسخكەر و نەسخکراودا، بەڵکو ناوەرۆك لە دوو ئایەتەکەدا یەك ناوەرۆکە، بە جۆرێك نەهی ئاراستەکراو بۆ پێغەمبەر(ﷺ) لە ئایەتی(٦٨)ی سورەتی "الأنعام" ئاراستەی پێغەمبەر(ﷺ) و ئوممەتەکەی کراوە،

---

[1] سورة النساء/١٤٠
[2] الناسخ والمنسوخ ص١١٩-١٢٠
[3] سورة الانعام/٦٨
[4] سورة الانعام/٦٩
[5] سورة النساء/١٤٠
[6] الناسخ والمنسوخ في القرآن الكريم ص٣٦
[7] نواسخ القرآن/ص١٥٤

هەروەك چۆن ئەوە شێوازی قورئانە و خودا تەنها پێغەمبەرەکەی(ﷺ) بەم نەهییە تایبەت ناکات تا بە ئایەتی(١٤٠) بیسرێتەوە، لە هەردوو ئایەتەکەدا نەهی ئاراستەکراو بۆ پێغەمبەر(ﷺ) و هەموو ئوممەتەکەیەتی، نموونەی ئەمە لە قورئاندا زۆرە، وەك لە ئایەتی:﴿لَئِنْ أَشْرَكْتَ لَيَحْبَطَنَّ عَمَلُكَ وَلَتَكُونَنَّ مِنَ الْخَاسِرِينَ﴾[1] ﴿يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ إِذَا طَلَّقْتُمُ النِّسَاءَ فَطَلِّقُوهُنَّ لِعِدَّتِهِنَّ﴾ ئەمانە و چەندین ئایەتی تر کە قسە لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) دەکەن و مەبەست پێیان ئوممەتەکەیەتی.

٢-لە قورئاندا ئەمرێك نەهاتووە فەرمان بە دانیشتن بکات لەگەڵ ئەوانەی نەهیکراوە لە دانیشتن لەگەڵیان تا ئەم ئەمرە بە نەهی هاتوو لە ئایەتی(١٤٠)ی سورەتی "النساء" نەسخ کرابێتەوە.

ئایەتی:﴿وَمَا عَلَى الَّذِينَ يَتَّقُونَ مِنْ حِسَابِهِمْ مِنْ شَيْءٍ﴾ هەواڵ و بەڵێنە هەریەك لەو دوانەش ناچنە ژێر نەسخکردنەوە[2][3].

-ئایەتی (٧٠):﴿وَذَرِ الَّذِينَ اتَّخَذُوا دِينَهُمْ لَعِبًا وَلَهْوًا وَغَرَّتْهُمُ الْحَيَاةُ الدُّنْيَا﴾[4]

"النحاس"[5] دەڵێت: لە "قتادة"وە ئایەتەکە نەسخکراوەتەوە بەم ئایەتە:﴿فَاقْتُلُوا الْمُشْرِكِينَ حَيْثُ وَجَدْتُمُوهُمْ﴾[6] پاشان دەڵێ: ئەمە هەواڵ نییە و ئەگەری نەسخی بۆ هەیە، بەڵام رۆشن تیایدا ئەوەیە نەسخ نەکراوەتەوە و لەسەر

---

[1] سورة الزمر/٦٥.

[2] ابن الجوزی ص١٥٤ دەڵێت: دروست ئەوەیە ئایەتەکە موحکەمە چونکە هەواڵە: رۆشنمان کردەوە شتێك لە گوناه و خراپەی ئەوان لەسەر ئێوە نییە، بەڵکو ترساندنتان لەسەرە.

[3] لە سەرخەرانی نەسخ نەبوونەوە: الرازي ٢٤/١٣ والكياالهراسي في احكام القرآن ١٢٤/٢.

[4] سورة الانعام/٧٠

[5] الناسخ والمنسوخ ص١٣٧

[6] سورة التوبة/٥

مانای هەڕەشەیە بۆ کەسێك ئەو کارەی کردبێت، واتە تۆ لێبیگەڕێ خودا داواکاریەتی و سزای دەدات.

"ابن سلامە"[1] دەڵێت: ئەم ئایەتە نەسخی کردۆتەوە:﴿قَاتِلُوا الَّذِينَ لاَ يُؤْمِنُـونَ بِاللَّهِ وَلاَ بِالْيَوْمِ الآخِرِ﴾[2]

"ابن حزم الاندلسي"[3] هەمان قسەی "ابن سلامة"ی باسکردووە بەبێ ئەوەی یەکێك لەو دوانە رووی نەسخەکە باس بکەن، هەروەها بەبێ بەدواداچوون بۆ هەر جۆرە بەرهەڵستکارییەك لە نێوان دوو ئایەتەکەدا وەك ئەوەی نەسخی قورئان ئارەزوو و ئیجتیهادی تاکەکەسی بێت.

"ابن الجوزي"[4] دەڵێت: (ئەهلی تەفسیر دوو قسەیان هەیە:

یەکەم: داوای لێبوردن دەکات بۆیان و پشتهەڵکردن لێیان، پاشان بە ئایەتی شمشێر نەسخکرایەوە، ئەمەش هەڵوێستی "قتادة و السدي"ە.

دووەم: وەك هەڕەشەی لێهاتووە، هەروەك ئایەتی:﴿ذَرْنِـي وَمَـنْ خَلَقْـتُ وَحِيدًا﴾[5] لەسەر ئەمە موحکەمە، ئەمەش هەڵوێستی"مجاهد"ە و هەر ئەمەش دروستە)

دروست نەسخ نەبوونەوەیە، چونکە هەر ئایەتێك بانگەشە دەکەن نەسخکرابێتەوە بە ئایەتی شمشێر پێی تایبەتکراوە، ئایەتی شمشێر بۆ رەوشێکی هەڵواردەیی بوو، بۆ باری دەستدرێژکاری و بەرپەرچدانەوەی بوو، ئیسلام بە شمشێر بەسەر خەڵکیدا ناسەپێت، چونکە ئیمان بیروباوەڕێکی جێگیر و پڕاوپڕە بە واقیع، ئەوەش بە

---

[1] المرجع السابق ص١٢٠
[2] سورة التوبة/٢٩
[3] ص٣١
[4] المرجع السابق ص١٥٥
[5] سورة المدثر/١١

قەناعەتی تاکەکەسی پەیوەست بە ناخەوە بەدەستدێت، هەروەها بە بەلگەی نـەقلی و ئەقلی لەگەڵ هیدایەتی خودایی.

سەرباری ئەوە لـە دەروازەی وردنەبوونـەوەی تێگەیشتنی ژیـری مرۆڤـە بوترێت چەند ئایەتێك بەدوای یەكدا نەسخ بوونەتـەوە کـە ئەمانـەن: (٦٦) و (٦٨) و (٦٩) و (٧٠) نموونەی ئەم هەڵە گەورانە نادرێتە پاڵ مرۆڤی ئاسایی ئیتر چۆن دەدرێتـە پـاڵ خودای مەزن و بەتوانا و شكۆدار؟!!

ئەم بۆچوونانە كۆمەڵێك ئیجتیهادن پاڵپشتێكیان لە قورئان و سوننەت و ئیجماعی زانایانی مەزن بۆ نییە[1].

-ئایەتی(٩١): ﴿قُلْ اللَّهُ ثُمَّ ذَرْهُمْ فِي خَوْضِهِمْ يَلْعَبُونَ﴾[2]

"ابـن سـلامة"[3] دەڵێـت: وەك هـەموو جارێـك خـودا فـەرمان دەكـات بـە پشتلێكردنیان پاشان بە ئایەتی شمشێر نەسخكرایەوە، ئەمـەش دووبارەكردنـەوەی قسەكەی "ابن حزم الاندلسي"ە[4].

"ابن الجوزي"[5] دەڵێت: (دوو قسە هەیە:

یەكەم-فەرمانی پێكراوە بـە پشـتهەڵكردن لێیـان و پاشـان بـە ئایـەتی شمشـێر نەسخكراوەتەوە.

دووەم-ئەوە بریتییە لە هەڕەشە، لەسەر ئەمە موحكەمە و هەر ئەمەش دروستە)

دروست ئەوەیە بانگەشەی نەسخ پووچ و بێبنەمایـە، چـونكە تێكەڵییـە لـە نێـوان نەسخ و تایبەتكردندا وەك چەندین جار باسمان كرد[6].

---

[1] لە سەرخەرانی نەسخ نەبوونەوە: الرازي ٢٧/١٣ والالوسي ١٨٤/٧

[2] سورة الانعام/٩١.

[3] ص١٢٠

[4] ص٣٧

[5] ص١٥٥

[6] لە سەرخەرانی نەسخ نەبوونەوە: الرازي١٣/٧٩

-ئایەتی(١٠٤):﴿فَمَنْ أَبْصَرَ فَلِنَفْسِهِ وَمَنْ عَمِيَ فَعَلَيْهَا وَمَا أَنَا عَلَيْكُمْ بِحَفِيظٍ﴾[١]

"ابن سلامة"[٢] دەڵێت: بە ئایەتی شمشێر نەسخکراوەتەوە "ابن حزم الاندلسي"[٣] هەمان قسەی دووبارە کردۆتەوە.

"ابن الجوزي"دەڵێت: "ابن عباس" دەڵێت "نەسخکراوەتەوە بە ئایەتی شمشێر" بەڵام موحکەمە.

دروست ئەوەیە نەسخ و تایبەتکردنی لا تێکەڵ بووە، "ابن عباس" مەبەستی بە نەسخ تایبەتکردن بووە، چونکە ئەو مانایە لە سەردەمی ئەواندا مەبەست بووە، نەسخ بە مانای لابردن و سڕینەوە زاراوەیەکە ئوسولییە پاشینەکان دایانهێناوە[٤].

-ئایەتی(١٠٦):﴿وَأَعْرِضْ عَنْ الْمُشْرِكِينَ﴾[٥]

"ابن سلامة"دەڵێت: نەسخکراوەتەوە بە ئایەتی شمشێر، "ابن حزم"[٦]: بە ئایەتی شمشێر نەسخکراوەتەوە، "ابن الجوزي"[٧] دووبارەی دەکاتەوە بەبێ پارسەنگدانی بۆچوونێك لەو بۆچوونانەی باسی کردووە.

---

[١] سورة الانعام/١٠٤

[٢] ص١٢١.

[٣] المصتطى ورقة (٦).

[٤] لە سەرخەرانی نەسخ نەبوونەوە: الرازی ١٣/١٢٤ زانای پایەبەرز "الرازی" دوای ئەوەی بۆچوونەکانی ئەوانەی مەیلیان بەلای نەسخدایە دەخاتە روو دەڵێت: ئەو موفەسیرانە زۆر ئارەزوومەندی نەسخ بوون بەبێ پێویستییەك بوونی هەبێت، راستی ئەوەیە زانایانی "أصول الفقه" بڕیاریان لێداوە کە ئەسڵ نەبوونی نەسخ، بۆیە هەوڵدان بۆ کەمکردنەوەی تا ئەوپەڕی توانا واجب دەبێت.

[٥] سورة الانعام/١٠٦.

[٦] ص١٣٧.

[٧] نواسخ القرآن.

دروست ئەوەیە ئایەتی یەکەم تایبەتە بە رەوشی ئاساییەوە، چونکە کاری پێغەمبەر(ﷺ) بانگەوازە بۆ لای خودا-عز وجل- بە حیکمەت و ئامۆژگاری چاك و باش، لە ئایەتە نەسخکراوەکەدا-بەپێی بۆچوونی ئەوان- بەڕەهایی فەرمان بوونی نییە بۆ وازهێنان لە جەنگان، بەڵکو بەکارهێنانی شمشێر و هێز فەرزە لەسەر موسڵمانان هەرکات ڕووبەڕووی دەستدرێژی دوژمنکارانە بوونەوە.

جگە لەو رێگەیە بە رێگەیەکی تر بە شمشێر ئایین فەرز نابێت، ئەگەر نە سەرهەڵدانی کۆمەڵگەیەکی دووڕوو پێویست دەبوو، دووڕووش لە دوژمن ترسناکترە[1].

ئایەتەکانی: (١٠٧، ١٠٨، ١١٢):

﴿وَمَا جَعَلْنَاكَ عَلَيْهِمْ حَفِيظًا وَمَا أَنْتَ عَلَيْهِمْ بِوَكِيلٍ﴾[2]

﴿وَلَا تَسُبُّوا الَّذِينَ يَدْعُونَ مِنْ دُونِ اللَّهِ فَيَسُبُّوا اللَّهَ عَدْوًا بِغَيْرِ عِلْمٍ﴾[3]

﴿فَذَرْهُمْ وَمَا يَفْتَرُونَ﴾[4]

دەڵێن: ئەم سێ ئایەتە بە ئایەتی شمشێر نەسخکراونەتەوە.

بانگەشەی نەسخ پووچ و بێبنەمایە، فەرزکردنی ئایین بە شمشێر زۆرلێکردنییەتی لەسەر ئایین، زۆرلێکردنیش لەسەر ئایین قبووڵ نەکراوە بە ئایەتی:﴿وَلَوْ شَاءَ رَبُّكَ لَآمَنَ مَنْ فِي الْأَرْضِ كُلُّهُمْ جَمِيعًا أَفَأَنْتَ تُكْرِهُ النَّاسَ حَتَّى يَكُونُوا مُؤْمِنِينَ﴾[5] پاشان ئیمان قەناعەتێکدا لە دڵدا و شمشێر دەسەڵاتی بەسەردا نییە، لەسەر هەموو چاکسازێك پێویستە هەوڵی چاککردنی ئاکاری ئەوانە بدات ئاکاریان شێواوە،

---

[1] لە سەرخەرانی نەسخ نەبوونەوە: الرازی ١٣٧/١٣.

[2] سورة الانعام/١٠٧.

[3] سورة الانعام/١٠٨.

[4] سورة الانعام/١١٢.

[5] سورة یونس/٩٩.

ڕێنموونیان بکەن و ڕێگە نیشانی هەموو ئەوانە بدەن ڕێگەیان لێ بزر بووە، گەر سەرئەنجامەکە نەهاتە دی ئەوا پێویستە لەسەری وازی لێ بهێنێت بۆ رەوشێکی تر، بەڵکو ڕۆژێك بەئاگابێتەوە، دروست نییە شمشێری لێ رابکێشیت و پێی بڵێت ببە بە موسڵمان ئەگەر نە ئەتکوژم، ئەم هەڵسوکەوتە لە یاسای مرۆییدا رسواکەر و شورەییە ئیتر چۆن لە یاسای خوداییدا دروستە؟!

-ئایەتی(١٢١):﴿وَلاَ تَأْكُلُوا مِمَّا لَمْ يُذْكَرْ اسْمُ اللَّهِ عَلَيْهِ﴾[١]

"ابن سلامە" دەڵێت: نەسخکراوەتەوە بە ئایەتی:﴿الْيَوْمَ أُحِلَّ لَكُمْ الطَّيِّبَاتُ وَطَعَامُ الَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ حِلٌّ لَكُمْ وَطَعَامُكُمْ حِلٌّ لَهُمْ﴾[٢] "خواردن" لێرەدا بریتییە لە "الذبائح"[٣] ئەمەش دووبارەکردنەوەی قسەکەی "ابن حزم الاندلسی"ە بە هەمان گوزارە بەبێ ئەوەی هەردووکیان یان یەکێکیان رووی بەرهەڵستییەکە -کە ناتوانرێت هەڵبگیرێت بە نەسخ نەبێت- ڕۆشن بکەنەوە، بۆ رەدکردنەوەی ئەم بانگەشە ناوردانە ئەوەی "ابن الجوزی" گواستویەتەوە دەخەمە روو: (لە دەستەیەکەوە ریوایەت کراوە لەوانە "الحسن و عکرمە" وتویانە: نەسخکراوەتەوە بە ئایەتی:﴿وَطَعَامُ الَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ حِلٌّ لَكُمْ﴾ ئەمەش هەڵەیە گەر مەبەستیان بە نەسخ راستەقینەی نەسخ بێت، ئەمە نەسخ نییە، گەر مەبەستیشیان بە نەسخ تایبەتکردن و پێیان وابێت بە ئایەتەکەی "المائدە" تایبەت کراوە(خواردنی ئەهلی کیتاب) ئەوەش دروست نییە، چونکە ئەهلی کیتاب ناوی خودا لەسەر سەربڕاو دەهێنن بۆیە کارەکەیان هەڵدەدرێتە سەر ئەوە، گەر دڵنیابووین کە ناوی خودا واز لێ دەهێنن گونجاوە بەهۆی لەبیرچوونەوە بێت، لەبیرچوون ڕێگری لە حەڵاڵ ناکات، گەر

---

[١] سورة الانعام/١٢١

[٢] سورة المائدة/٥

[٣] الناسخ والمنسوخ ص١٢٢

وازهێنانیـان بـەهۆی لەبیرچـوونەوە نـەبوو و خـواردنی دروسـت نـەبوو ئـەو کـات لـە بنەڕەتدا روویەك بۆ نەسخ نامێنێتەوە.

هەرکەسیش لە ئەهلی تەفسیر دەڵێت مەبەست پێی ناونـەهێنانی خودایـە بەسـەر زاردا ئەوە گشتییەکی تایبەت کردووە، وتنی گشتاندن دروسـتترە، لەسـەر بۆچـوونی "الشـافعي" ئـەم ئایەتـە موحکەمـە، چـونکە یـان مەبەسـت پێـی لـەلای ئـەو مردارەوەبووە یان نەهییەکە بۆ کەراهەتە[1].[2]

ئایەتەکانی:(١٣٥، ١٣٧، ١٥٨، ١٥٩):

﴿قُلْ يَاقَوْمِ اعْمَلُوا عَلَى مَكَانَتِكُمْ[3] إِنِّي عَامِلٌ[4] فَسَوْفَ تَعْلَمُونَ مَنْ تَكُونُ لَهُ عَاقِبَةُ الدَّارِ[5] إِنَّهُ لاَ يُفْلِحُ الظَّالِمُونَ﴾[6]

﴿وَكَذَلِكَ[7] زَيَّنَ لِكَثِيرٍ مِنْ الْمُشْرِكِينَ قَتْلَ أَوْلاَدِهِمْ شُرَكَاؤُهُمْ لِيُرْدُوهُمْ[8] وَلِيَلْبِسُوا[9] عَلَيْهِمْ دِينَهُمْ وَلَوْ شَاءَ اللَّهُ مَا فَعَلُوهُ[10] فَذَرْهُمْ وَمَا يَفْتَرُونَ﴾[1]

---

[1] نواسخ القرآن لابن الجوزي ص١٥٧

[2] لە سەرخەرانی نەسخ نەبوونەوە: الرازی ١٢١/١٣

[3] لـە بـاری خۆتانـدا، ئەمـە فەرمانێکـە هەڕەشـە و دەمکـوتکردنی لەگـەڵ، وەك لـە فەرموودەکەی پێغەمبەردا(ﷺ): (چیتان دەوێ بیکەن)

[4] لەسەر باری خۆم.

[5] سەرئەنجامی باش لە دواڕۆژدا یان ئێمەین یان ئێوەن.

[6] سورە الانعام/١٣٥

[7] واتە وەك چۆن ئەوەی باسکرا بۆیان جوانکرا.

[8] واتە تیاتان دەبات.

[9] واتە لێیان تێکەڵ بێت.

[10] واتە گەر خودا ئەوەی نەویستبایە ئەنجامیان نەدەدا چونکە خودا دروستکەری خێـر و شەڕە، بەڵام هەڵبژاردەی بۆ مرۆڤ بەجێهێڵاوە تـاکو دەست بـۆ هۆکارەکـانی خێـر ببات و شایستە بێت بە پاداشت، هەر بەو جۆرە هەڵبژاردەی شەڕی بـۆ بـەجێهێڵاوە تـاکو شایسـتە بێـت بـە سـزا، گـەر ئـەوە لـەلای خـوداوە بەسـەر ئەوانـدا بسـەپایە شایستەی هیچ کام لەو دوانە نەدەبوون.

﴿قُلْ انتَظِرُوا إِنَّا مُنتَظِرُونَ﴾[2]

﴿إِنَّ الَّذِينَ فَرَّقُوا دِينَهُمْ وَكَانُوا شِيَعًا[3] لَسْتَ مِنْهُمْ فِي شَيْءٍ إِنَّمَا أَمْرُهُمْ إِلَى اللَّهِ ثُمَّ يُنَبِّئُهُمْ بِمَا كَانُوا يَفْعَلُونَ﴾[4]

دەڵێن: ئەم ئایەتانە بە ئایەتی شمشێر سڕاونەتەوە[5].

ئەم بۆچوونە ناوردە بە چەندین هۆ لەوانە:

١-نەبوونی بەرهەڵستی لە نێوان ئەو ئایەتە باسکراوانە و ئایەتی شمشێردا، چونکە حوکمی هەریەك لەوانە بۆ رەوشێکی تایبەت هاتووە و لە مەرجەکانی بەرهەڵستی یەکێتی رەوشە(یەکێتی بابەت).

٢-گەر بۆ گفتوگۆ خۆمان رادەستی بوونی بەرهەڵستی بکەین ئەوا بە تایبەتکردن هەڵدەگیرێت، بۆیە وتنی نەسخ تێکەڵییەکە لە نێوان تایبەتکردن و نەسخدا.

٣-ئەو چوار ئایەتە ئایەتی هەڕەشەن، ئایەتی هەڕەشەش ناچێتە ژێر نەسخەوە.

٤-قەرزکردنی ئایین بەسەر مرۆڤدا بە ئایەتی شمشێر و هێزی چەك بریتییە لە زۆرلێکردن لەسەر ئایین، زۆرلێکردنیش رەفزکراوە بەم ئایەتە کە تیایدا خودا-سبحانە- سەرزنشتی پێغەمبەرەکەی(ﷺ) خۆی دەکات لە گوزارەیەکی پرسیاری رەخنەئامێزدا(الإستفهام الإنكاري): ﴿وَلَوْ شَاءَ رَبُّكَ لَآمَنَ مَنْ فِي الْأَرْضِ كُلُّهُمْ جَمِيعًا أَفَأَنْتَ تُكْرِهُ النَّاسَ حَتَّى يَكُونُوا مُؤْمِنِينَ﴾[6].

---

[1] سورة الانعام/١٣٧

[2] سورة الانعام/١٥٨

[3] دەستە دەستە.

[4] سورة الانعام/١٥٩

[5] ينظر الناسخ والمنسوخ للنحاس ص١٤٦ . الناسخ والمنسوخ لابن سلامة ص١٢٢. الناسخ والمنسوخ لابن حزم الأندلسي ص٣٨. نواسخ القرآن لابن الجوزي ص١٥٧.

[6] لە سەرخەرانی نەسخ نەبوونەوە: الرازي١٣/٢٠٥ ١٤/٦ والطبري٨/٧٩.

# نەسخی بانگەشەبۆکراو لە سورەتی "الاعراف"

"أبو جعفر النحاس"[1]: لە "يموت بن المدرع"ەوە لە "أبـو حـاتم"ەوە لـە "أبـو عبيد يونس بن حبيب"ەوە لە "أبي عمرو بن علاء"ەوە لـە "مجاهـد"ەوە لـە "ابـن عباس"ەوە وتی: سورەتی "الأعراف" لـە مەکـە دابـەزیوە بۆیـە سـورەتی مەکییـە، "أبـو جعفـر" دەڵێت(مەبەسـتی خۆیـەتی): تیایـدا ئایـەتێکمان نـەبینیوە بچێتـە نـاو "الناسخ والمنسوخ"ەوە جگە لە یەك ئایـەت کـە جیـاوازی لەسـەرە، ئـەویش: ﴿خُذْ الْعَفْوَ﴾ ئەوەش بەشێکە لە ئایەتی (١٩٩)﴿خُذْ الْعَفْوَ وَأْمُرْ بِالْعُرْفِ وَأَعْرِضْ عَنْ الْجَاهِلِينَ﴾[2]

زانایان تیایدا پێنج قسەیان هەیە:

هەیانـە دەڵێـت نەسـخکراوەتەوە بـە زەکـاتی فـەرزکراو[3]، هەیانـە دەڵێـت نەسخکراوەتەوە بە فەرمان کرد بە توندبوون بەرانبەر بێباوەڕان، هەیانە دەڵێت﴿خُذْ الْعَفْوَ﴾ واتە زەکاتی فەرزکراو، هەیانە دەڵێت "العفو" شتێکە لە ماڵ جگە لە زەکات

---

[1] الناسخ والمنسوخ في القرآن الكريم ص١٤٧

[2] سورة الاعراف

[3] لەسەر ئەو بنچینەی مەبەست بە "العفو" بـریتی بێـت لـە صـەدەقەی فـەرزکراو یـان زەکات لەسەر پێویستی کە پێویستە لەسەر هەژاران خەرج بکرێت.

، ئەوەش قسەی "قاسم و سالم"ە، دەڵێن بریتییە لە ماڵی زیادە، قسەی پێنجەم قسەی "عبدالله و عروة ابن الزبیر" وەك بەسەر "أحمد بن شعیب"دا خوێنرایەوە لە "هارون ابن إسحاق"ەوە دەڵێت: لە "عبدة"ەوە لە "هشام بن عروة"ەوە لە "باوكییەوە" لە "ابن الزبیر"ەوە دەڵێت: خودا ﴿خُذْ الْعَفْوَ﴾ دابەزاند لەسەر ئەخلاقی خەڵكی ئەمە لەپێشترە لە هەر شتێكی تر لەسەر ئایەتەكە وترابێت بەهۆی دروستی سەنەدەكەیەوە، ﴿خُذْ الْعَفْوَ﴾ واتە ئاسان لە ئەخلاقی خەڵكی و توند مەبە لەسەریان و توندوتیژی بەكارمەهێنە لەگەڵیان، ئەخلاقی پێغەمبەریش(ﷺ) بەو جۆرە بوو، "ابن السلامە"[1] دەڵێت: سورەتەكە دوو ئایەتی نەسخكراو لەخۆ دەگرێت، یەكەمیان: ﴿وَأُمْلِي لَهُمْ إِنَّ كَيْدِي مَتِينٌ﴾[2]، جێگەی نەسخ لێرەدا واتە وازیان لێ بهێنە و باقی ئایەتەكە موحكەمە ئەوەی تیایدا نەسخكراوەتەوە بە ئایەتی شمشێر بووە[3].

-ئایەتی: دووەم﴿خُذْ الْعَفْوَ﴾ [4] ئەمە نەسخكراوەتەوە بە ئایەتی زەكات، مانای زیادە لە ماڵیان دەگەیەنێت، ئەم ئایەتە لە سەیروسەمەرەكانی نەسخە، چونكە سەرەتاكەی نەسخكراوە و كۆتاییەكەی نەسخكراوە و ناوەڕاستەكەی موحكەمە، كۆتاییەكەی ئەم بەشەیە﴿وَأَعْرِضْ عَنْ الْجَاهِلِينَ﴾-پشت لە نەفامان هەڵبكە، بە ئایەتی شمشێر نەسخكراوەتەوە، ناوەڕاستەكەشی ئەم بەشەیە:﴿وَأْمُرْ بِالْعُرْفِ﴾ ئەم بەشە موحكەمە)).

خودی ئەم قسەیە دووبارەكردنەوەی قسەكەی"ابن حزم الأندلسي"ە[5] بەبێ قسەكردن لەسەری و ڕۆشنكردنەوەی ڕووی نەسخەكە.

---

[1] الناسخ والمنسوخ ص١٢٣.

[2] سورة الاعراف/١٨٣

[3] سەرخەرانی نەسخ نەبوونەوە: الالوسي٩/١٤٦ والقرطبي٣٤٧/٧

[4] سورة الاعراف/١٩٨ تتمة الاية {خُذْ الْعَفْوَ وَأْمُرْ بِالْعُرْفِ وَأَعْرِضْ عَنْ الْجَاهِلِينَ}

[5] الناسخ والمنسوخ ص٣٨.

"ابن الجوزي"[1] لە تەفسیری ئەم بەشەدا:﴿خُذْ الْعَفْوَ﴾ دەڵێت: سێ قسە هەیە:

١.ئەخلاقی خەڵکی "ابن عمر" و "ابن الزبیر" وادەڵێن[2]

٢.مەبەست پێی ماڵ و سامانە، پاشان سەرخەرانی ئەم ئاراستەیە جیاوازی کەوتۆتە نێوانیانەوە، "مجاهد" دەڵێت، لە ریوایەتێکدا "الضحاك"یش: مەبەست بە "العفو" ماڵی زیادەیە، هەشیانە دەڵێت: صەدەقە واجب بوو بە زەکات نەسخکرایەوە.

٣.مەبەست پێی ئاسانکارییە لەگەڵ هاوەڵدانەران، لێبووردن لێیان، شوێنکەوتووانی ئەم بۆچوونە بۆ دوو را جیاوازی کەوتۆتە نێوانیانەوە: هەیانە دەڵێت:﴿وَأَعْرِضْ عَنْ الْمُشْرِكِينَ﴾ بە ئایەتی شمشێر نەسخکراوەتەوە، هەشیانە دەڵێت: ئەوە گشتییە بۆ کەسانێك باری پارێزگاری نەفس نازانن بە رووکردنە نەزانییەکانی ئەوانە، لەگەڵ پێویستبوونی وەستان بەرانبەریان، لەسەر ئەم بۆچوونە ئایەتەکە موحکەمە، هەر ئەمەش دروستە))[3]

رای دروست:

دروست ئەوەیە هەردوو ئایەتەکە نەسخ نەکراونەتەوە بەم بەڵگانە:

١.لێوەشاوە لە ئەهلی تەفسیر لەسەر ئەوەن لێبووردن و پشتهەڵکردن(العفو والإعراض) لە نەفامان و ئاسانبوون لەگەڵ ناموسڵمانەکاندا لەو ئەخلاقە مەزنانە بوو پێغەمبەر(ﷺ) خۆی پێ رازاندبووەوە، مەبەست لە دوو ئایەتەکە وەرگرتنی لای ئەخلاقییە نەك دارایی، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) ریوایەت کراوە: ((جبریل-علیه السلام- هاتووە بۆ لای و فەرموویەتی: ئەی محەمەد، من لەلای خوداوە بە ئەخلاقی بەرز و مەزنەوە هاتووم بۆ لای تۆ، فەرمووی: ئەوە چییە ئەی جبریل؟ فەرمووی:

---

[1] نواسخ القرآن ص١٦٢.

[2] فتح الباري شرح صحيح البخاري ٣٧٥/٩.

[3] نواسخ القرآن ص١٦٣

خودای تەعالا دەفەرموێت: ئەو کەسەی لێت دادەبڕێت تۆ سەردانی بکە، ئەو کەسەی بێبەشت دەکات تۆ پێی ببەخشە، ئەو کەسەی ستەمت لێ دەکات تۆ لێی ببوورە))
"الطبري" لە تەفسیرەکەیدا[1] ئەم فەرموودەیەی وەك شایەت باسکردووە، هەر بەو جۆرە "الطبرسي" لە تەفسیرەکەیدا[2] ئەوەی نامۆیە ئەوەیە "ابن سلامة" لە کتێبەکەیدا[3] گواستوویەتەوە بەبێ ئەوەی رەچاوی بکات لە وتنی نەسخی بانگەبۆکراودا.

لە "عبيدالله بن الزبير"ەوە ریوایەتکراوە وتوویەتی: (فەرمانی کردووە ئەخلاقی لێبووردن لە خەڵکی بگرێتەبەر) "النحاس" ئاماژەی پێکردووە و وەك بەڵگە هێناویەتەوە لەسەر ئەوەی مەبەست "العفو" بریتییە لە ئەخلاق[4]، و ئایەتەکە موحکەمە..

٢.ئیسلام بەو ئەخلاقە بەرز و شکۆدارە نەك بە شمشێر لە جیهاندا بڵاوەی کرد، پێغەمبەر(ﷺ) پێشەنگێکی چاك و پاك بوو بۆ ئەو کارە، بۆیە پێویستە لەسەر هەموو سەرکردەیەك شوێنی ئەو پێشەوا مەزنە بکەوێت، خودا–سبحانه وتعالى– سیفەتی پێشەوای دیاریکردووە و روو بە پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت: ﴿فَبِمَا[5] رَحْمَةٍ مِنْ اللَّهِ لِنْتَ[6] لَهُمْ[7] وَلَوْ كُنْتَ فَظًّا[8] غَلِيظَ الْقَلْبِ[9] لانْفَضُّوا[1] مِنْ حَوْلِكَ فَاعْفُ[2] عَنْهُمْ

---

[1] جامع البيان٩/١٥٥.
[2] مجمع البيان في تفسير القرآن ٤/٥١.
[3] الناسخ والمنسوخ ص١٢٤.
[4] بەڵگە لەسەر ئەوە کۆکردنەوەیەتی لەگەڵ ئەمر بە چاکە و پشتهەڵکردن لە نەفامان، چونکە ئەوانە لە سیفەتی ئەو کەسەیە خۆی بە ئەخلاقی بەرز و جوان برازێنێتەوە.
[5] ما زائدة.
[6] گوتارەکە روو بە پێغەمبەرە(ﷺ) ئەوەش گشتییە بۆ هەموو سەرکردەکان لە جیهاندا.
[7] ئەخلاقت لەگەڵیان نەرم و نیان بووە کاتێك ئەوان سەرپێچییان لێکردوویت.
[8] مامەڵە خراپ.
[9] وشك و توندوتیژ لەگەڵیان.

وَاسْتَغْفِرْ لَهُمْ[٣] وَشَاوِرْهُمْ فِي الأَمْرِ[٤] فَإِذَا عَزَمْتَ[٥] فَتَوَكَّلْ عَلَى اللَّهِ إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُتَوَكِّلِينَ﴾[٦]

تا کەی بە بیر و هۆشێکی دواکەوتووانەوە بژین کە وامان لێ دەکات بێبەش بین لە رۆحی شەریعەتی ئیسلام کە لە لە قورئاندا هاتووە، و لە کاروانی شارستانی هاوچەرخی پێشکەوتوو لە مەیدانی تەکنەلۆژیا دوابکەوین، ئەوەی رۆشنە تێگەیشتن لەهەریەك لە ئایین و ژیان پێکەوە لە گرنگترین هۆکارەکانی دەستەبەرکردنی بەختەوەری مرۆڤایەتییە لە دونیا و دوارۆژدا، وزەی مادی بەتەنها گەر وزەی رۆحی لەگەڵ کۆنەبێتەوە بەس نییە بۆ بەختەوەری مرۆڤ.

---

[١] واتە بڵاوەیان دەکرد.

[٢] لەوەی ئەنجامی دەدەن چاوپۆشییان لێ بکە.

[٣] واتە داوای لێخۆشبوون بۆ گوناهەکانیان بکە تا لێیان خۆشبم.

[٤] بۆچوونەکانیان دەربهێنە و لێیانی وەربگرە هەرکەس لە مەیدانی پسپۆری خۆیدا، ئەمەش بەڵگەی ئەوەیە رای تاك لایەنە لە سەرکردەی دەوڵەتانەوە بۆ دروستکردنی بریار تایبەتە بە هەموو گەل، گەورەترین هەڵە تاك لایەنییە و پێویستە لێی دوور بکەونەوە.

[٥] واتە رۆیشتن لەسەر ئەوەی دەتەوێت دوای راوێژکردن.

[٦] ال عمران/١٥٩.

# نەسخی بانگەشەبۆکراو لە سورەتی "الانفال"دا

﴿يَسْأَلُونَكَ عَنْ الأَنْفَالِ قُلْ الأَنْفَالُ لِلَّهِ وَالرَّسُولِ فَاتَّقُوا اللَّهَ وَأَصْلِحُوا ذَاتَ بَيْنِكُمْ وَأَطِيعُوا اللَّهَ وَرَسُولَهُ إِنْ كُنتُمْ مُؤْمِنِينَ﴾ (١)

﴿يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا لَقِيتُمْ الَّذِينَ كَفَرُوا زَحْفًا فَلاَ تُوَلُّوهُمْ الأَدْبَارَ﴾ (١٥)

﴿وَمَنْ يُوَلِّهِمْ يَوْمَئِذٍ دُبُرَهُ إِلاَّ مُتَحَرِّفًا لِقِتَالٍ أَوْ مُتَحَيِّزًا إِلَى فِئَةٍ فَقَدْ بَاءَ بِغَضَبٍ مِنْ اللَّهِ وَمَأْوَاهُ جَهَنَّمُ وَبِئْسَ الْمَصِيرُ﴾ (١٦)

﴿وَمَا كَانَ اللَّهُ لِيُعَذِّبَهُمْ وَأَنْتَ فِيهِمْ وَمَا كَانَ اللَّهُ مُعَذِّبَهُمْ وَهُمْ يَسْتَغْفِرُونَ﴾ (٣٣)

﴿يَاأَيُّهَا النَّبِيُّ حَرِّضْ الْمُؤْمِنِينَ عَلَى الْقِتَالِ إِنْ يَكُنْ مِنْكُمْ عِشْرُونَ صَابِرُونَ يَغْلِبُوا مِائَتَيْنِ وَإِنْ يَكُنْ مِنْكُمْ مِائَةٌ يَغْلِبُوا أَلْفًا مِنْ الَّذِينَ كَفَرُوا بِأَنَّهُمْ قَوْمٌ لاَ يَفْقَهُونَ﴾ (٦٥)

ئایەتی(١)﴿يَسْأَلُونَكَ عَنْ الأنْفَالِ قُلْ الأنْفَالُ لِلَّه وَالرَّسُولِ فَاتَّقُوا اللَّهَ وَأَصْلِحُوا ذَاتَ بَيْنِكُمْ وَأَطِيعُوا اللَّهَ وَرَسُولَهُ إِنْ كُنتُمْ مُؤْمِنِينَ﴾[1][2]

کێ پرسیارکەر و کێ پرسیارلێکراوە و مانای "النفل" چییە و کامە حوکمەکەیەتی؟

پرسیارکەران ئەوانەن پەیوەنییان بە غەنیمەتەوە هەیە لە هاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ) و خوا لەوانیش رازی بێت، پرسیارلێکراو بریتییە لە پێغەمبەر(ﷺ) "النفل" و "النافلة" مانای زیادەی هەیە لە ئەسڵەکە، لێرەدا مەبەست پێی غەنیمەتە، بە "النفل" ناوبراوە چونکە زیادەیە لەسەر هەستان بە تێکۆشان(جیهاد) و پارێزگاری لە ئایین و بانگەواز بۆ لای خودا—جل جلالە[3].

هەندێك پێیانوایە ئەم ئایەتە نەسخکراوەتەوە بە ئایەتی:﴿وَاعْلَمُوا أَنَّمَا غَنِمْتُمْ مِنْ شَيْءٍ فَأَنَّ لِلَّه خُمُسَهُ[4] وَلِلرَّسُولِ وَلِذِي الْقُرْبَى وَالْيَتَامَى[5] وَالْمَسَاكِينِ[6] وَابْنِ السَّبِيلِ[7] إِنْ كُنتُمْ آمَنْتُمْ بِاللَّهِ وَمَا أَنزَلْنَا عَلَى عَبْدِنَا يَوْمَ الْفُرْقَانِ[8] يَوْمَ الْتَقَى الْجَمْعَانِ[9] وَاللَّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ﴾.[10]

---

[1] سورة الانفال/١.

[2] لە سەرخەرانی نەسخ نەبوونەوە: الطبري ٩/١١٩ الالوسي٩/١٦٣ الرازي ١٥/١١٦.

[3] الرازي التفسير الكبير ١٥/١١٧ وما بعدها. المحرر الوجيز لابن عطية الاندلسي ٦/٢٠١.

[4] تیایدا فەرمان دەکات بەوەی بیەوێت.

[5] منداڵی موسڵمانان کە باوکیان شەهید بووە و هەژارن.

[6] خاوەن پێویستی لە موسڵمانان.

[7] دابڕاو لە سەفەرەکەی لە موسڵمانان.

[8] رۆژی بەدر جیاکەرەوەی حەق لە باتڵ.

[9] واتە کۆبوونەوەی موسڵمانان و بێباوەڕان لە کاتی جەنگدا.

[10] سورة الانفال/٤١.

"النحاس"[1] دەڵێت: زانایان لەسەر ئەم ئایەتە چەندین قسەیان هەیە، زۆربەیان لەسەر ئەوەن نەسخکراوەتەوە بە ئایەتی:﴿وَاعْلَمُوا أَنَّمَا غَنِمْتُمْ مِنْ شَيْءٍ فَأَنَّ لِلَّهِ خُمُسَهُ وَلِلرَّسُولِ﴾الآية

پاشان دەڵێت: لە "مجاهد" و "عكرمة"ەوە وتویانە: کاتی خۆی "الأنفال" بۆ خودا و پێغەمبەر بوو، پاشان بەم ئایەتە نەسخکرایەوە﴿وَاعْلَمُوا أَنَّمَا غَنِمْتُم﴾ الآية.

پاشان دەگاتە گواستنەوەی ئەو قسانە بەبێ پارسەنگدانی لایەك بەسەر لایەکی تردا.

"ابن سلامه"[2] دەڵێت: سورەتی "الأنفال" شەش ئایەتی نەسخکراوی تێدایە، لە ئایەتی یەکەمەوە﴿يَسْأَلُونَكَ عَنْ الأَنْفَالِ﴾الآية، نەسخکرایەوە بە ئایەتی:﴿وَاعْلَمُوا أَنَّمَا غَنِمْتُمْ مِنْ شَيْءٍ فَأَنَّ لِلَّهِ خُمُسَهُ وَلِلرَّسُولِ﴾، "ابن حزم الاندلسی"[3] پێش "ابن سلامه" کەوتووە لەوەی وتوویەتی.

بانگەشەی نەسخ پووچ و بێ بنەمایە بە زۆرێك لە بەڵگە، لە گرنگترینیان:

١.نەبوونی هیچ جۆرە بەرهەڵستییەك لە نێوان دوو ئایەتەکەدا، نەسخ لقی بەرهەڵستکارییە، چونکە بۆ هەڵگرتنی دێت.

"الطبرسي"[4] دەڵێت: هەندێکیان دەڵێن ئایەتەکە نەسخکراوەتەوە بە ئایەتی غەنیمەت﴿وَاعْلَمُوا أَنَّمَا غَنِمْتُمْ﴾ الآية. هەندێکی تریان دەڵێن نەسخ نەکراوەتەوە ئەمەش دروستەکەیانە، چونکە نەسخ ئاتاجە بە بەڵگە، دژیەکی لە نێوان ئەم ئایەتە و ئایەتی پێنجیەك(غەنیمەت)دا نییە.

بەڵگەیەکی دروستی جێگیر نابینرێتەوە پشتیوانی بانگەشەی سەرخەرانی نەسخ بکات لە وتنی نەسخبوونەوەی ئایەتی یەکەمی سورەتی "الأنفال" بە ئایەتی (٤١)ی

---

[1] الناسخ والمنسوخ ص١٤٩

[2] المرجع السابق ص١٢٥

[3] المرجع السابق ص٣٩

[4] مجمع البيان ٥١٧/٤

هەمان سورەت، "الطبري"[1] دەڵێت: ((جیاوازیان لە نێواندا هەیە ئایا ئایەتەکە نەسخکراوە یان نەسخ نەکراوەتەوە؟ هەندێکیان دەڵێن نەسخکراوەتەوە و نەسخکەرەکەشی ئەم ئایەتەیە:﴿وَاعْلَمُوا أَنَّمَا غَنِمْتُمْ مِنْ شَيْءٍ فَأَنَّ لِلَّهِ خُمُسَهُ وَلِلرَّسُولِ﴾الآیة ، ئەوەش قسەی "مجاهد و عكرمة"یە(ئەو دوانە پێیانوایە) غەنیمەت لەو ڕۆژانەدا بۆ پێغەمبەر(ﷺ) بوو، بۆیە بە پێنج یەك نەسخکرایەوە، هەندێکی تر دەڵێن موحکەمە و نەسخ نەکراوەتەوە، مانای ئەوەش﴿قُلْ الأَنْفَالُ لِلَّهِ﴾ گومانی تێدا نییە بۆ خودایە لەگەڵ دوارِۆژ و دونیا و ئەوەی تێیدایە، بۆ پێغەمبەر لە جێگەی خۆی دایدەنێت کە خودا فەرمانی پێکردووە تیایدا دایبنێت(واتە موڵکێکی تایبەت نەبووە بە ئەو(ﷺ) وەك بانگەکەرانی نەسخ بانگەشەی بۆ دەکەن).
پاشان "الطبري" بەردەوام دەبێت و دەڵێت: لە ئایەتەکەدا بەڵگەیەك بوونی نییە ئاماژە بێت لەسەر ئەوەی حوکمەکەی نەسخکراوەتەوە لەبەر هەڵگرتنی ئەوەی باسمان کرد لە مانای وەسفکراو، دروست نییە حوکم بدرێت بە نەسخکردنەوەی بە حوکمێك کە قورئان دایبەزاندووە مەگەر بە بەڵگەیەك پێویست بکات خۆتی رادەست بکەیت، لە چەندین شوێنی کتێبەکەمان بەڵگەمان هێناوە کە نەسخکراو حوکمەکەی بەتاڵ دەبێتەوە بەهۆی حوکمێکی پێچەوانە بە ئەو، لە هەموو ماناکانی نەرێی دەکات یان هەواڵێك دێت بەڵگە پێویست دەکات یەکێکیان نەسخکەر بێت بۆ ئەوی تریان.
"ابن حزم الظاهري" دەڵێت: (بانگەشەی نەسخی رستەیەك بە بەڵگەیەکی یەقینبەخش دەبێت، چونکە کەلامی خودا بۆ ئەوە هاتووە فەرمانەکانی جێبەجێ بکرێت و بە کارکردن پێی گوێڕایەڵی بین نەك وازی لێ بهێنین، نەسخ وازهێنان پێویست دەکات، دروست نییە بۆ هیچ کەسێك شتێك خودا فەرمانی پێکردووە بڵێت: ئەمە من پابەند ناکات بە گوێڕایەڵی کردنییەوە مەگەر بە دەقێکی تر لەلای خوداوە یان لای پێغەمبەرەوە(ﷺ) بەوەی نەسخکراوەتەوە، وتنی ئەمە دروست نییە) [2].

---

[1] جامع البيان في تفسير القرآن ١١٨/٩
[2] المحلى: ٣٤٦/٨.

٣–وتنی نەسخ لە ئایەتی یەکەمدا بە ئایەتی(٤١) تێکەڵییەکە لە نێوان نەسخ و درێژەپێداندا، چونکە ئایەتی دووەم درێژەپێدەری ئایەتی یەکەمە.

"الزمخشري"دەڵێت[1] ﴿قُلْ الأنْفَالُ لِلَّهِ وَالرَّسُولِ﴾ ماناکەی حوکمی "الأنفال" تایبەتە بە خودا و پێغەمبەر(ﷺ) خودا فەرمان بە دابەش کردنی دەکات بەپێی حیکمەتی خۆی و پێغەمبەریش(ﷺ) تیایدا نوێنەرایەتی فەرمانی خودا دەکات، فەرمانەکە هیچ کەسی پێرانەسپێرراوە. "ابن عطیة الأندلسي"[2] دەڵێت: "مجاهد وعکرمة" دەڵێن بە ئایەتی:﴿وَاعْلَمُوا﴾ الآیة نەسخکراوەتەوە، "ابن زید" دەڵێت: لە ئایەتەکەدا نەسخ روونەداوە، بەڵکو هەواڵیداوە غەنیمەت بۆ خودایە، مولکی ئەوە و رۆزی ئەوە، هەروەها بۆ پێغەمبەرە(ﷺ) لەو رووەوە کە حوکمی خودای تێدا بەیان دەکات.

"الصاوي"[3] دەڵێت: ئایەتی:﴿لِلَّهِ وَالرَّسُولِ﴾ وتراوە ئەوە مولکی خودایە و وەك مولك داویەتی بە پێغەمبەرەکەی(واتە مولکداری تایبەت) بۆ ئەوەی چۆنی بوێت هەڵسوکەوتی تێدا بکات، لەسەر ئەمە ئایەتی﴿وَاعْلَمُوا أَنَّمَا غَنِمْتُمْ﴾ الآیة نەسخکەرەوەیەتی.

وتراوە ئەوەی لە ئایەتی (٤١)دا هاتووە رۆشنکردنەوەی ئەوەیە لێرەدایە و درێژەپێدەریەتی، ئایەتەکەش موحکەمە کەوابوو مانای " لله والرسول " لەرووی دابەشکردنییەوەیە بەسەر موجاهیداندا.

"ابن الجوزي"[4] دەڵێت: جێگەی سەرسوڕمانە هەندێك دەڵێن نەسخکراوەتەوە، بەگشتی ئەوەی لە ئامێزی دەگرێت ئەوەیە ئەنفال بۆ خودا و پێغەمبەرە(ﷺ)

---

[1] الکشاف ١٤١/٢

[2] المحرر الموجز: ٢٠٥/٦.

[3] حاشیة الصاوي علی الجلالین: ١١٦/٢.

[4] نواسخ القرآن/ص١٦٥

ماناکەی ئەوەیە ئەو دوانە حوکمی تێدا دەکەن، هەر بەو جۆرە حوکمیان تێدا کرد بەوەی ئایەتی پێنجیەك لە ئامێزی دەگرێت.

"الکیاالهراسي"[1] دەڵێت: مەبەستی ئەوە نییە مولکی پێغەمبەرە(ﷺ) بەڵکو مەبەستی ئەوەیە بۆ بەرژەوەندی گشتی بەکاردەهێنرێت.

—هەردوو ئایەتی(١٥، ١٦):

﴿يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا لَقِيتُمْ الَّذِينَ كَفَرُوا زَحْفًا فَلاَ تُوَلُّوهُمْ الأَدْبَارَ﴾[2]

﴿وَمَنْ يُوَلِّهِمْ يَوْمَئِذٍ[3] دُبُرَهُ إِلاَّ مُتَحَرِّفًا[4] لِقِتَالٍ أَوْ مُتَحَيِّزًا[5] إِلَى فِئَةٍ فَقَدْ بَاءَ[6] بِغَضَبٍ مِنْ اللَّهِ وَمَأْوَاهُ جَهَنَّمُ وَبِئْسَ الْمَصِيرُ﴾[7]

"النحاس"[8] دەڵێت: زانایان لەسەر ئایەتی(١٦)[9] سێ قسەیان هەیە:

هەیانە دەڵێت: نەسخکراوەتەوە، لەوانە:"عگاو بن ابی رباح"ە، دەڵێت: دوو ئایەت نەسخیان کردۆتەوە ئەو دوانەش ئایەتی:(٦٥، ٦٦) هەمان سورەتن﴿يَاأَيُّهَا النَّبِيُّ حَرِّضْ الْمُؤْمِنِينَ عَلَى الْقِتَالِ إِنْ يَكُنْ مِنْكُمْ عِشْرُونَ صَابِرُونَ يَغْلِبُوا مِائَتَيْنِ وَإِنْ

---

[1] احکام القرآن ١٥٣/٣

[2] واتە بە کۆمەڵن وەك ئەوەی بەهۆی زۆریانەوە شەپۆل بدەن، لەو بارەدا پشتیان لێ مەکەن، سورە الانفال/١٥.

[3] رۆژی رووبەڕووبوونەوەیان.

[4] لاربوونەوە بۆ جەنگان وەك ئەوەی راکردنیان بۆ نیشان بدەی و مەبەستت هێرشکردنە سەریان بێت.

[5] خۆی بداتە پاڵ دەستەیەکی تر لە موسڵمانان پەنایان پێ بگرێت.

[6] واتة طةرِايةوة

[7] سورة الانفال/١٦.

[8] الناسخ والمنسوخ ص١٥٢.

[9] سەرخەرانی نەسخ نەبوونەوە: الطبري ١٣٥/٩ الرازي ١٣٧/١٥ الالوسي ١٨١/٩ ابن العربي ٨٣٣/٢.

يَكُنْ مِنْكُمْ مِائَةٌ يَغْلِبُوا أَلْفًا مِنَ الَّذِينَ كَفَرُوا بِأَنَّهُمْ قَوْمٌ لاَ يَفْقَهُونَ﴾[1] ﴿الآنَ خَفَّفَ اللَّهُ عَنكُمْ وَعَلِمَ أَنَّ فِيكُمْ ضَعْفًا فَإِنْ يَكُنْ مِنْكُمْ مِائَةٌ صَابِرَةٌ يَغْلِبُوا مِائَتَيْنِ وَإِنْ يَكُنْ مِنْكُمْ أَلْفٌ يَغْلِبُوا أَلْفَيْنِ بِإِذْنِ اللَّهِ وَاللَّهُ مَعَ الصَّابِرِينَ﴾[2] بۆ سوككردن لەسەریان و دەستكردنەوەیان بۆ پشتهەلكردن لەوانەی ژمارەیان زۆرترە نەسخكرایەوە.

قسەی دووەم ئایەتەكە تایبەتكراوە، واتە تایبەتە بە ئەهلی بەدر، هەلهاتن حەرامكراو بوو لەسەر ئەوانەی لە جەنگی بەدری مەزندا بەشداریان كرد.

ج–قسەی سێیەم حوكمەكەی ماوەتەوە تا رۆژی دوایی ئەمەش قسەی "ابن عباس"ە.

پاشان"النحاس" پارسەنگی ئەم قسەی سێیەمە دەدات، و دەلێت: ئەمە نزیكترین قسەیەكە لەسەری وترابێت، دروست نییە نەسخكرابێتەوە، چونكە هەوالّ و هەرەشەیە، هەرەشە نەسخ نابێتەوە وەك چۆن بەلێن نەسخ نابێتەوە[3].

"النحاس" باسی نەسخی ئایەتی[4] (١٥)ی نەكردووە و پارسەنگی نەسخ نەبوونەوەی ئایەتی(١٦)ی داوە، هەروەها باسی نەسخی ئەو دوو ئایەتە لە كتێبی "الناسخ والمنسوخ"ی هەریەك لە "ابن سلامة"[5] و "ابن حزم الاندلسي"دا[6] نەهاتووە، هەروەها "ابن الجوزي" پێیوایە جیاوازی لە نەسخبوون و نەسخ نەبوونی ئەو دوو ئایەتەدا(١٥ و ١٦) بوونی هەیە، كاتێك دەلێت[7] ئایەتی دووەم[1]﴿يَا أَيُّهَا

---

[1] سورة الانفال: ٦٥.

[2] سورة الانفال/٦٦.

[3] المرجع السابق ص١٥٣.

[4] وا دەردەكەوێ ئەوانەی بۆچوونیان لەسەر نەسخە دوو ئایەتی (١٥ و ١٦) بە نەسخكراو دادەنێن بە دوو ئایەتی(٦٥ و ٦٦)س هەمان سورەت.

[5] ص١٢٥.

[6] ص٣٩.

[7] نواسخ القرآن ص١٦٥.

﴿الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا لَقِيتُمْ الَّذِينَ كَفَرُوا زَحْفًا فَلاَ تُوَلُّوهُمْ الأَدْبَارَ، وَمَنْ يُوَلِّهِمْ يَوْمَئِذٍ دُبُرَهُ إِلاَّ مُتَحَرِّفًا لِقِتَالٍ أَوْ مُتَحَيِّزًا﴾الآية، هەردوو ئایەتەکەی کۆکردۆتەوە، لەگەڵ ئەوەش جیاوازی لە نەسخیان بەردەوامە بۆ هەردوو ئایەتەکە، چونکە یەك بابەت چارەسەر دەکەن، وەك چۆن نەسخکەر –بەپێی بۆچوونی ئەوان– بریتییە لە دوو ئایەتەکە پێکەوە(٦٥ و ٦٦)، دوای ئەوەی "ابن الجوزي" جیاوازییەکان دەخاتە روو دەڵێت: وتم: گوزارەی ئایەتەکە گشتییە هەرچەند لەسەر دەستەیەکی تایبەت و دیاریکراو دابەزیوە[٢].

پاشان بەردەوام دەبێت لە قسە و دەڵێت: لە "ابن عباس"ەوە ریوایەت کراوە ئەوانە گشتین، پاشان بۆ ئەوانە دوو قسە هەیە:

یەکەمیان: نەسخکراونەتەوە بە ئایەتی:﴿فَإِنْ يَكُنْ مِنْكُمْ مِائَةٌ صَابِرَةٌ يَغْلِبُوا مِائَتَيْنِ﴾الآية، بۆ ئیمانداران نییە لە باری دوو بەرانبەری ئەوان بەرانبەر بەمان هەڵبێن.

کەسانی تر دەڵێن موحکەمن هەر ئەمەش دروستە، چونکە موحکەمە لە نەهیکردن لە هەڵهاتن، بۆ نەهییەکە هەڵدەدرێتە سەر بارێك گەر ژمارەیان زۆرتر بوو لە ژمارەی موسڵمانان، "ابن جرير"یش هەمان بۆچوونی هەیە.

رای دروست:

١.نەبوونی هیچ جۆرە بەرهەڵستکارییەك لە نێوان نەسخکەر و نەسخکراودا، نەسخ لقی بەرهەڵستکارییە، گەر تەنها بۆ گفتوگۆ وامان دانا بەرهەڵستکاری بوونی هەیە بە تایبەتکردن هەڵدەگیرێت، بۆیە دوو ئایەتی(١٥ و ١٦) ئاماژە بە درروستنەبوونی هەڵهاتن دەکەن لە کاتی بەشداربوون لە جەنگدا کە بریتییە لە بەرگری رەوا لە ئاین و ژیان و ناموس و ماڵ و سامان، بەڵام ئەم گشتاندنە تایبەتکراوە بە توانین و

---

[١] أي في سورة الانفال.

[٢] واتە ئەهلی بەدر و کەسانی تر جگە لەوان دەگرێتەوە، بە پێچەوانەی ئەوانەی پێیان وایە حوکمەکە تایبەتە بە ئەهلی بەدرەوە چونکە دەربارەی ئەوان دابەزیوە.

ئامادەیی بۆ بەردەوامبوون لەسەر خۆراگری وەك وەستانێك دژ بە دوژمن، بـەڵام گـەر کـاره لـه توانـا بـەدەربوو ئـەوا هـەڵهاتنی بـۆ هەیـە بـۆ قوتـارکردنی ژیـانی دوای دڵنیابوونەوە لە ترسناکی دوژمن ئەمەش ئەوەیە ئایەتی(١٦) ئاماژەی پیٚ دەکات کـە بریتییه لـه: ﴿الآنَ خَفَّـفَ اللّـهُ عَـنكُمْ﴾ الآيـة، سـوککردن بەڵگـەی ئەوەیـە کەسـی جەنگاوەر بەپێی توانای خۆی داوای لیٚ دەکرێت، یاسای ئیسلام لە هـەموو داوایەکدا بە هەمان شێوەیە: ﴿لاَ يُكَلِّفُ اللّهُ نَفْسًا إِلاَّ وُسْعَهَا﴾.

٢.ئایەتی(٦٥) بە ئایەتی(٦٦) نەسخکراوەتەوە –بەپێی بۆچوونی ئەوان– چـونکە نەسخکراو دەبێتە نەسخکەر بۆ ئایەتێکی تر ئەمە تـەنها لـە فەرهـەنگی سـەرخەرانی نەسخدا دەبینرێتەوە.

٣.گەورە تەفسیرکەرانی قورئان لە جیهانی ئیسلام ئاماژەیان بە نەسـخی ئـەو دوو ئایەتە نەکردووە، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر پووچەڵی بانگەشەی نەسخ تایبەت بـە دوو ئایەتی(١٥ و ١٦)، بەڵکو هەندێکیان بە ئاشکرا رەدی ئەوانەیان داوەتەوە بانگەشـەی نەسخ بوونەوەی دوو ئایەتەکە دەکەن لەوانە " الطبري[1]" کە دەڵێت: ئێمە وتمـان[2] موحکەمە و نەسخ نەکراوەتەوە لەبەر ئەوەی لە چەندین جێگەی تری ئەم کتێبەماندا رۆشنمان کردۆتەوە دروست نییە حوکم بدەیت بە نەسـخبوونەوەی حـوکمی ئایـەتێك گەر رووی تری هەبێت جگە لە نەسخبوونەوە، مەگەر بە بەڵگەیەکی یەکلاکەرەوە کـە خۆڕادەستکردن پێویست بکات ئـەوەش لـە خەبەرێکـەوە بیـانوو ببڕێـت یـان بـوونی بەڵگەیەکی ئەقڵی، هیچ جۆرە بەڵگەیەك لەم دوو جۆرە مانایە بوونی نییە ئاماژە بکات بە نەسخبوونەوەی حوکمی ئایەتی: ﴿وَمَنْ يُوَلِّهِمْ يَوْمَئِذٍ دُبُرَهُ إِلاَّ مُتَحَرِّفًا لِقِتَـالٍ أَوْ مُتَحَيِّزًا إِلَى فِئَةٍ﴾.

---

[1] جامع البيان في تفسير القرآن ١٣٥/٩

[2] جێناوەکـە دەگەڕێتـەوە بـۆ هـەردوو ئایەتەکـە، چـونکە هـەموان بـە یـەك ئایـەتیان داناوە، چونکە بابەتەکە یەك بابەتە.

٤.ڕێسـای گشـتی هـاتوو لـه دوو ئایەتەکـەدا(١٥ و ١٦) بـه تـەواوی لـه هـەموو جەنگـەکانی جیهـانی ئیسـلام و نائیسـلامییدا پیـادەکراوە، شکسـتخواردن(دۆڕان) سزاکەی بریتییە لە کوشتن لە یاسای سەربازیدا، بەڵام بۆ پیلانـی جـەنگ دەتوانیـت بکشێیتەوە بـۆ ئـەوەی دوژمـن بێتـە پێشـەوە و پاشـان هەڵبگەڕێتـەوە سـەری و بـە دەستبەسەرداگرتنێکی تەواو دەستیان بەسەردا بگرن، بۆیـە ئـەو ڕێسـا هاتووانـە لـە چـوار ئایەتەکـەدا(١٥ و ١٦ و ٦٥ و ٦٦) ڕێسـاگەلێکن کۆدەنگیـان لەسـەر هەیـە لـە یاسای سەربازی هەموو جیهاندا.

–ئایەتی (٣٣):﴿وَمَا كَانَ اللَّهُ لِيُعَذِّبَهُمْ وَأَنْتَ فِيهِمْ[1] وَمَا كَانَ اللَّهُ مُعَذِّبَهُمْ[2] وَهُمْ يَسْتَغْفِرُونَ[3]﴾

هەندێ پێیانوایە ئەم ئایەتە نەسخکراوەتەوە بەو ئایەتەی بەدوایدا دێت کە بریتییە لەم ئایەتە:﴿وَمَا لَهُمْ أَلاَّ يُعَذِّبَهُمُ اللَّهُ[1] وَهُمْ يَصُدُّونَ عَنِ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ وَمَا كَانُوا أَوْلِيَاءَهُ إِنْ أَوْلِيَاؤُهُ[2] إِلاَّ الْمُتَّقُونَ وَلَكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لاَ يَعْلَمُونَ﴾[3].

---

[1] واتە خودا بە سزای ریشکەندکردن (قڕکردن) ئەهلی مەکە سزا نـادات لـە کاتێکدا تـۆ لەناو ئەواندای ئەمەش بەهۆی فەزڵ و حورکەتی تۆوە ئەی محمـد(ﷺ) چـونکە خـودا وەك ڕەحمەت بە هەموو جیهانان تۆی ڕەوانە کردووە تەنها لەو بارەدا سزا دەدرێـن کە کارێك ئەنجام بـدەن شایسـتە بـن بـە گرتنـەوەی نیعمەتـەکانی خـودا لـەوان وەك ڕێگری لە چوونە ناو "المسجد الحرام" وەك لە ئایەتەکەی دوای ئەو ئایەتە هاتووە.

[2] واتە خودا سزای ئەوان نادات لە کاتێکدا دەستەیەك لە باوەڕداران هێشتا لەناو ئەواندا ماونەتـەوە دوای دەرچـوونی تـۆ لـە مەکـە، چـونکە کاتێـك پێغەمبـەر(ﷺ) لـە مەکـە دەرچوو دەستەیەك لە باوەڕداران لەناو مەکە مانەوە و بـەهۆی عوزرێکـەوە کۆچیان نـەکرد بـۆ مەدینـە، ئـەوان دەیانویسـت کـۆچ بکـەن، بۆیـە خـودا سـزای لەسـەر هاوەڵدانەری مەکە هـەڵگرت وەك ڕێزێـك بـۆ داوای لێخۆشـبوونیان، کاتێـك ئـەوان لـە مەکـە دەرچـوون خـودا مۆڵـەتی فـەتحی مەکـەی دا. ینظـر مجمـع البیـان للطبرسـي ٥٣٩/٤.

[3] سورة الانفال/٣٣.

"النحاس" دەڵێت: (لەسەر ئەم ئایەتە پێنج قسە هەیە:

"الحسن" دەڵێت: ئەم بەشەی ئایەتەکە ﴿وَمَا كَانَ اللَّهُ مُعَذِّبَهُمْ وَهُمْ يَسْتَغْفِرُونَ﴾ نەسخکراوەتەوە بە ﴿وَمَا لَهُمْ أَلاَّ يُعَذِّبَهُمْ اللَّهُ﴾

پاشان بەردەوام دەبێت و دەڵێت: "أبو جعفر" (مەبەستی خۆیەتی) دەڵێت: نەسخ لێرەدا موحاڵە چونکە هەواڵە و خودا هەواڵی لەبارەوە داوە، هیچ کەسێك شك نابەین[4] ئەمەی لێوە ریوایەت کرببێت جگە لە "الحسن"، زانایانی تر لەسەر ئەوەن موحکەمە، "ابن سلامة"[5] دەڵێت: پاشان لە دوای ئەوە ئایەتی نەسخکەر بۆی دابەزی کە بریتییە لە: ﴿وَمَا لَهُمْ أَلاَّ يُعَذِّبَهُمْ اللَّهُ﴾ ئەمەش دووبارە کردنەوەی ئەوەیە "ابن حزم الاندلسي"[6] وتویەتی: لەوەی ئایەتەکە نەسخکراوەیە و نەسخکەرەوەکەشی بریتییە لە﴿وَمَا لَهُمْ أَلاَّ يُعَذِّبَهُمْ اللَّهُ﴾. هیچ کام لەوانە هۆی نەسخەکەی رۆشن نەکردۆتەوە.

"ابن الجوزي" دەڵێت: لە "عكرمه"ەوە لە "ابن عباس"ەوە ﷺ ﴿وَمَا كَانَ اللَّهُ لِيُعَذِّبَهُمْ﴾الآية، ئەو ئایەتەی بەدوایدا هاتووە نەسخی کردۆتەوە﴿وَمَا لَهُمْ أَلاَّ يُعَذِّبَهُمْ اللَّهُ﴾الآية، هەمان شت لە "الحسن" و "عكرمه"ەوە ریوایەتکراوە، ئەم قسەیە دروست نییە، چونکە نەسخ ناچێتە ناو هەواڵەوە، ئەم ئایەتە ئەوە رۆشن دەکاتەوە بوونی پێغەمبەر(ﷺ) لەناویاندا رێگری کردووە لە دابەزینی سزا، و ئەو ئایەتەی بەدوایدا دێت شایستەبوونی ئەوان بەو سزایە رۆشن دەکاتەوە، بەهۆی رێگەگرتن لە

---

[1] واتە بۆ دەبێ خودا سزایان نەدات و چ شتێك هەیە وا بکات سزاکەیان واز لێ بهێنرێت لە کاتێکدا رێ لە "المسجد الحرام" دەگرن، واتە رێگری دەکەن لە دۆستانی ئەو شوێنە.

[2] واتە هاوەڵدانەران سەرپەرشتیارانی "المسجد الحرام" بوون.

[3] سورة الانفال/٣٤.

[4] سەرخەرانی نەسخ نەبوونەوە الطبري ١٥٦/٩ الالوسي٩/٢٠٠ الرازي ١٥٨/١٥.

[5] الناسخ والمنسوخ ص١٢٥.

[6] الناسخ والمنسوخ ص٣٩

رێگەی خودا، لەگەڵ ئەوەش بوونی پێغەمبەر(ﷺ) لەناویاندا رێگری کردووە لە پەلەکردنی ئەو سزایە بۆ سەریان یان پەلەکردنی هەموو سزاکە، هەندێ لە موجتەهیدانی نەسخ کارەکەیان جێگەی سەرسوڕمانە[1].

رای دروست:

دروست ئەوەیە ئایەتی(٣٣) نەسخ نەکراوەتەوە بەم هۆیانە:

١.نەبوونی هیچ جۆرە بەرهەڵستکارییەك لە نێوان نەسخکراو و نەسخکەردا، چونکە یەکەمیان رەهایە و ئەنجامدانی هەموو جۆرە تاوانێکی نوێ و تاوانێکی پێشتری هەواڵدانەران لەخۆ دەگرێت، دووەمیان سنووردارکراوە بە ئەنجام نەدانی تاوانی نوێ ﴿وَهُمْ يَصُدُّونَ عَنْ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ﴾ ئەم رستەیە رستەیەکی هۆئامێزە بۆ دابەزاندنی سزا بەسەریاندا.

پوختەی قسان:

خودا لە ئایەتی یەکەمدا هەواڵیداوە لەسەر تاوانە پێشووەکانیان سزایان نادات بەهۆی بوونی پێغەمبەر(ﷺ) لە نێوانیاندا و داوای لێخۆشبوونی باوەڕداران بۆ ئەوان، ئایەتی دووەم ئاماژە بەوە دەکات راگرتنی سزای پێشوو کە شایستەیین بەمەرجگیراوە تاوانی نوێ ئەنجام نەدەن.

ئەم بیرە بەرز و بڵندە لە قورئانی پیرۆزدا لە ئەمڕۆدا وەك رێسایەکی گشتی لە یاسای سزاکانی جیهاندا پیادە دەکرێت، لەوانە یاسای سزا عێراقییەکان لە مادەی(١٤٤-١٤٧) ، مادەی (١٤٥) دەڵێت: ((لە کاتی فەرمان بە راگیرانی جێبەجێ کردن بۆ دادگا هەیە حوکم لەسەردراو پابەند بکات بەوەی بەڵێنی باشی ئاکار بدات لە ماوەی راگیرانی جێبەجێکردنی سزاکەدا)) لە کەسی تاوانبارەوە -کە سزاکەی راگیراوە لە ماوەی ئەزموونکردنیدا- تاوانێك وەشاوە بە هەمان سزای پێشوو سزا دەدرێت کە راگیرابوو سەرباری سزایەکی تر بۆ تاوانە نوێیەکەی.

---

[1] نواسخ القرآن ص١٦٦

بینا لەسەر ئەوە قورئان دانی بە راگرتنی جێبەجێ کردنی سزادا ناوە بەر لە یاسا دانراوەکان بە زیاتر لە هەزار ساڵ.

٢.ئەوەی لە "ابن عباس"ەوە گوازراوەتەوە لە وتنی نەسخ لەو ئایەتە باسکراوەدا گەر ریوایەتەکە دروست بێت ئەوا مەبەستی بە نەسخ مانا گشتییەکەی بووە لەلای پێشینی چاکان کە تایبەتکردنی گشتی و سنووردارکردنی رەها لەخۆ دەگرێت وەك چۆن پێشتر باسمان کرد.

٣.هەر کەس قسەی لەسەر نەسخ کردووە لەو ئایەتەدا تێکەڵییەکی لا دروست بووە لە نێوان نەسخ و سنووردارکردنی رەها یان تایبەتکردنی گشتی.

-ئایەتی(٦٥):﴿ يَاأَيُّهَا النَّبِيُّ حَرِّضْ الْمُؤْمِنِينَ عَلَى الْقِتَالِ[1] إِنْ يَكُنْ مِنْكُمْ عِشْرُونَ صَابِرُونَ يَغْلِبُوا مِائَتَيْنِ وَإِنْ يَكُنْ مِنْكُمْ مِائَةٌ يَغْلِبُوا أَلْفًا مِنْ الَّذِينَ كَفَرُوا بِأَنَّهُمْ قَوْمٌ لاَ يَفْقَهُونَ﴾ [2][3]

"النحاس"[4] دەڵێت: لە ریوایەتێکدا لە : "ابن ابی نجیح وعیمان"ەوە لە "عگاو"ەوە لە "ابن عباس"ەوە وتویەتی نەسخکەرەکەی بریتییە لە ﴿الآنَ خَفَّفَ اللَّهُ عَنكُمْ وَعَلِمَ أَنَّ فِيكُمْ ضَعْفًا فَإِنْ يَكُنْ مِنْكُمْ مِائَةٌ صَابِرَةٌ يَغْلِبُوا مِائَتَيْنِ وَإِنْ يَكُنْ مِنْكُمْ أَلْفٌ يَغْلِبُوا أَلْفَيْنِ بِإِذْنِ اللَّهِ وَاللَّهُ مَعَ الصَّابِرِينَ﴾[5] لە "جابر بن حازم"ەوە لە "الزبیر بن حریث"ەوە لە "ابن عباس"ەوە فەرمووی: فەرز بوو لەسەر موسڵمانان یەك پیاویان لەگەڵ دە پیاوی هاوەڵدانەراندا بجەنگێت، ئەمەش بارگرانی بوو لەسەریان، لەبەرئەوە خودا ئاسانکردن(سوککردن)ی دابەزاند، بۆیە بۆ

---

[1] واتە لەباری دەستدرێژی بۆ سەر ئیسلام و موسڵمانان، وەك لە ئایەتی: {فَمَنْ اعْتَدَى عَلَيْكُمْ فَاعْتَدُوا عَلَيْهِ بِمِثْلِ مَا اعْتَدَى عَلَيْكُمْ}.

[2] سورة الانفال/٦٥

[3] سەرخەرانی نەسخ نەبوونەوە: الالوسي١٠/٣١ الرازي١٥/١٢٩

[4] الناسخ والمنسوخ ص١٥٥.

[5] سورة الانفال/٦٦

هـەر پیاوێـك هـەبوو لەگـەڵ دوانـدا بجـەنگێت، کارەکـەیان لەسـەر ئاسـان بـوو و بـە ئەندازەی ئەوەی ئارامگرتنیان کەمی کرد.

پاشـان بـەردەوام دەبێـت لـە وتـن و دەڵێـت: "أبـو جعفـر" دەڵێت(مەبەسـتی خۆیـەتی): ئەمـە لێکدانەوەیـەکی ڕۆشـنی باشـە تـاکو ئـەوە سـوککردن بێـت نـەك نەسخکردن، چونکە ماناکەی هەڵگرتنی حـوکمی نەسـخکراوە، بـەڵام حـوکمی یەکـەم هەڵنەگیراوە، چونکە نەوتراوە پیاوێك بۆی نییە بەرانبەر بە دە پیاو بجەنگێت، بـەڵکو گەر توانای هەبوو هەڵبژاردنی بۆ هەیە، هاوشێوەی ئەمە شکاندنی ڕۆژوو لە سەفەردا، ناوترێت نەسخی ڕۆژووە، بەڵکو بریتییە لـە سـوککردن وەك ڕوخسـەتێك، ڕۆژووگـرتن بـۆی لەپێشـترە[1] لـەوەی باسـکرا دەگەیـنـە ئـەو سـەرئەنجامەی"ابن عبـاس" لـە ریوایەتەکەی یەکەمدا مەبەستی بە نەسخ تایبەتکردن و سنووردارکردن و شـتانی تـر بـووە، "ابـن سـلامة"[2] دەڵێـت ئایـەتی:﴿يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ حَرِّضْ الْمُؤْمِنِينَ عَلَى الْقِتَالِ﴾ موحکەمە و نەسـخکراو تیایدا﴿إِنْ يَكُنْ مِنْكُمْ عِشْرُونَ صَابِرُونَ يَغْلِبُوا مِائَتَيْنِ﴾ تا کۆتایی ئایەتەکە، لەسەر پیاوێك فەرزکرابوو دژ بە دە کـەس بجـەنگێت، هەر کەس لەخوار ئەوەوە هەڵبهاتبایە پشتی لە دوژمن کردبـوو، خـودا دەسـتەوسـانی ئەوانی لەوەدا زانی بۆیە ئایەتەکەی دوای ئەوەی دابەزاند بۆیە بوو بە نەسخکەر بـۆی، ئەوەش ئەم ئایەتەیە:﴿الآنَ خَفَّفَ اللَّهُ عَنْكُمْ وَعَلِمَ أَنَّ فِيكُمْ ضَعْفًا﴾ سـوککردن هەمیشە بەهۆی بارگرانییەوەیە، بۆیـە بـوو بـە فـەرز لەسـەر پیاوێـك دژ بـە دوو پیـاو بجەنگێت، گەر بۆ زیـاتر لـەوە هەڵبهاتبایـە پشـتی لـە دوژمـن نـەکردبوو بـە بەڵگـەی ئاشکرای ئایەتەکە.

---

[1] النحاس ص١٥٦

[2] الناسخ والمنسوخ ص١٢٦

"ابن حزم الاندلسی"[1] دەڵێت: ئایەتی﴿إِنْ يَكُنْ مِنْكُمْ عِشْرُونَ صَابِرُونَ يَغْلِبُوا مِائَتَيْنِ﴾ الآية، نەسخکراوەتەوە و نەسخکەرەوەکەشی بریتییە لە: ﴿الآنَ خَفَّفَ اللَّهُ عَنكُمْ﴾الآية.

"ابن الجوزي"[2] دەڵێت: ئەهلی تەفسیر دەڵێن: گوزارەی ئەم کەلامە هەواڵە و ماناکەی ئەمرە، مەبەستەکە: جەنگ دژ بە دووسەد بکەن، ئەمە لە سەرەتاوە فەرز بوو، پاشان نەسخکرایەوە بە ئایەتی:﴿الآنَ خَفَّفَ اللَّهُ عَنكُمْ﴾الآية، بۆیە فەرزە لەسەر یەك پیاوی باوەڕدار بەرانبەر دوو پیاو دامەزراو و خۆڕاگر بێت، گەر لەوە زیار بوون هەڵهاتنی بۆ رەوایە.

"البارزی"[3] ئایەتە نەسخکراوەکانی سورەتی "الأنفال" حەوت ئایەتن، یەکێکیان:﴿إِنْ يَكُنْ مِنْكُمْ عِشْرُونَ صَابِرُونَ يَغْلِبُوا مِائَتَيْنِ﴾ نەسخکەرەوەکەی بریتییە لە:﴿الآنَ خَفَّفَ اللَّهُ عَنكُمْ﴾.

رای دروست:

بانگەشەی نەسخبوونەوەی ئایەتی(٦٥)ی سورەتی "الأنفال" بێبنەمایە بەم بەڵگانە:

١.تێکەڵییە لە نێوان نەسخ و روخسەتدا[4] ئەوەی راشکاوانە ئاماژەی پێ دەکات ئەمەیە:﴿الآنَ خَفَّفَ اللَّهُ عَنكُمْ﴾ ئاسانکردن(سوککردن) بریتییە لە روخسەت.

---

[1] الناسخ والمنسوخ ص٣٩

[2] نواسخ القرآن ص١٦٨

[3] هبة بن عبد الرحيم بن ابراهيم المعروف بشرف الدين ابن البارزي نسبة الى باب بارز احدى محلات بغداد ق –٧٣٨هـ ناسخ القرآن العزيز ومنسوخه: ص١٦٥ تحقيق الدكتور حاتم صالح الضامن.

[4] الشيخ محمد الخضري (اصول الفقه ص٢٥٤) دەڵێت: هیچ کەس نەیوتووە روخسەت عەزیمەت نەسخ دەکاتەوە، چونکە ئایەتی تەیەموم ئایەتی دەستنوێژی نەسخ نەکردۆتەوە.

"ابن السبكي"[(١)] دەڵێت: ((حوكمی شەرعی[(٢)] بگۆڕێت[(٣)] لە گرانەوە بۆ ئاسان[(٤)] بە پاساوێك لەگەڵ راستبوونەوەی هۆیەكە بۆ حوكمە ئەسڵییەكە[(٥)] پێی دەوترێت روخسەت)) واتە حوكمە بۆ لا ئاسانە گۆڕاوەكە پێی دەوترێت روخسەت ئەوەش لەرووی زمانەوانییەوە مانای ئاسانكاری دەگەیەنێت.

٢.وتنی نەسخ لەو ئایەتە باسكراوەدا نەزانی بۆ خودا پێویست دەكات(پەنا دەگرین بۆ خودا) بەوەی لە كاتی دابەزینی ئایەتەكەدا نەیزانیوە لە باوەڕداراندا لاوازی هەیە و ناتوانن بە داوایەكەی یەكەم هەڵبستن، كاتێك ئەوەی ئەزموون كرد لاوازییەكەی ئەوان و نەتوانینی داوایەكەی زانی بۆیە نەسخی كردەوە و لە جێگەی ئەوە ئاسانتری دابەزاند، پێویستەكە پووچەڵە بە كۆدەنگی زانایان و ژیرمەندان هەر بەو جۆرە پێویستكراوەكەش.

٣.نەهی بۆ پیادەكردنی ئایەتە نەسخكراوەكەی یەكەم–بەپێی بۆچوونی ئەوان– نەهاتووە بۆیە دروستە جەنگاوەر بەرانبەر بە دە كەس بوەستێتەوە وەك لە ئایەتەكەدا هاتووە، لە كاتێكدا نەسخكەر و نەسخكراو لە رەوایی كاركردن بە حوكمی هەردووكیان كۆنابنەوە.

دكتۆر "مصطفى زيد"[(٦)] بە هەڵەدا چووە[(١)]كاتێك دەڵێت: ((لێرەدا بە پشتیوانی خودا ئەوە رۆشن دەكەینەوە چۆن ئایەتەكەی سورەتی "الأنفال" كە بەم بەشە

---

[(١)] جمع الجوامع بشرح المحلي مع حاشية البناني ١١٩/١.

[(٢)] واتە وەرگیراو لە شەرع.

[(٣)] لەرووی پەیوەست بوونییەوە(چونكە حوكمی خودا دێرینە و گۆڕانی بەسەردا نایەت) لە گرانی و بارگرانی لەسەر داوالێكراو.

[(٤)] گۆڕانەكە لە حەرامبوونەوە بۆ كردار یان وازهێنان بۆ حەڵاڵ بوونی.

[(٥)] لێ ئاسانكراو بە بوونی عوزرێك.

[(٦)] في كتابه النسخ غي القرآن الكريم ودراسة تشريعية تأريخية الطبعة الاولى/١٩٦٣ دار الفكر العربي٢/٨٢٢.

دەست پێدەكات: ﴿الآنَ خَفَّفَ اللَّهُ عَنكُمْ﴾ ئەوەی پێش خۆی نەسخ دەكاتەوە، ئەهلی تەئویل و جمهوری ئەهلی تەفسیر كۆدەنگییان هەیە لەسەر ئەوەی دوو ئایەتەكە نەسخكراو و نەسخكەرن و قسە لە خۆڕاگری و دامەزراوی دەكەن تا كۆتایی))

وا دەردەكەوێت مامۆستای بەڕێز"مصطفى زيد" زۆر بەهێز بووە لە كاریگەربوون بە چاولێكەری و لاواز بووە لە ڕێساكانی ئوسولّی فیقهدا، ئەو پاساوی خۆی هەیە چونكە كەسانی تر لەم هەڵە ڕۆشنەدا پێشی كەوتوون.

چەندین ئایەتی تر لە سورەتی "الأنفال"دا بوونی هەیە پێیانوایە نەسخكراونەتەوە بە ئایەتی شمشێر، لە كاتێكدا ئایەتی شمشێر تایبەتكەری ئەو ئایەتانە، بانگەشەی نەسخی ئەوانەم پشتگوێخست چونكە پێشتر لە چەندین شوێندا ڕۆشنم كردۆتەوە هەر ئایەتێك پێیانوایە نەسخكراوەتەوە بە ئایەتی شمشێر ئەو ئایەتە بە ئایەتی شمشێر تایبەتكراوەتەوە.

---

[1] في كتابه النسخ في القرآن الكريم ودراسة تشريعية تأريخية الطبعة الاولى/١٩٦٣ دار الفكر العربي٢/٨٢٢.

# نەسخی بانگەشەبۆکراو لە سورەتی "التوبة"دا

"ابن سلامه"[1] دەڵێت: لە مەدینە دابەزیوە و دوایین سورەتێکە دابەزی بێت، یازدە ئایەتی نەسخکراوی تێدایە:

﴿بَرَاءَةٌ مِنْ اللَّهِ وَرَسُولِهِ إِلَى الَّذِينَ عَاهَدْتُمْ مِنْ الْمُشْرِكِينَ، فَسِيحُوا فِي الأَرْضِ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ وَاعْلَمُوا أَنَّكُمْ غَيْرُ مُعْجِزِي اللَّهِ وَأَنَّ اللَّهَ مُخْزِي الْكَافِرِينَ﴾ (١-٢)

﴿وَالَّذِينَ يَكْنِزُونَ الذَّهَبَ وَالْفِضَّةَ وَلاَ يُنفِقُونَهَا فِي سَبِيلِ اللَّهِ فَبَشِّرْهُمْ بِعَذَابٍ أَلِيمٍ﴾ (٣٤)

﴿إِلاَّ تَنفِرُوا يُعَذِّبْكُمْ عَذَابًا أَلِيمًا وَيَسْتَبْدِلْ قَوْمًا غَيْرَكُمْ وَلاَ تَضُرُّوهُ شَيْئًا وَاللَّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ﴾ (٣٩)

﴿عَفَا اللَّهُ عَنْكَ لِمَ أَذِنتَ لَهُمْ حَتَّى يَتَبَيَّنَ لَكَ الَّذِينَ صَدَقُوا وَتَعْلَمَ الْكَاذِبِينَ﴾ (٤٣)

﴿إِنَّمَا يَسْتَأْذِنُكَ الَّذِينَ لاَ يُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ وَارْتَابَتْ قُلُوبُهُمْ فَهُمْ فِي رَيْبِهِمْ يَتَرَدَّدُونَ﴾ (٤٥)

---

[1] المرجع السابق ص١٢٧

-ئایەتی یەکەم:﴿ بَرَاءَةٌ مِنْ اللَّهِ وَرَسُولِهِ إِلَى الَّذِينَ عَاهَدْتُمْ مِنْ الْمُشْرِكِينَ﴾[1] تا ئایەتی ﴿فَسِيحُوا[2] فِي الأَرْضِ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ وَاعْلَمُوا أَنَّكُمْ غَيْرُ مُعْجِزِي اللَّهِ[3] وَأَنَّ اللَّهَ مُخْزِي الْكَافِرِينَ﴾ پاشان نەسخکرایەوە بەم ئایەتە: (فَاقْتُلُوا الْمُشْرِكِينَ حَيْثُ وَجَدْتُمُوهُمْ). [4]

پاشان "ابن سلامة" دەڵێت[5] : ئەم ئایەتە نەسخکەرە سەد و بیست و چوار ئایەتی لە قورئاندا نەسخ کردۆتەوە، پاشان کۆتایی ئایەتەکە سەرەتاکەی نەسخ کردۆتەوە، نەسخکەرەکە ئەم بەشەی ئایەتەکەیە:﴿فَإِنْ تَابُوا وَأَقَامُوا الصَّلاَةَ وَآتَوْا الزَّكَاةَ فَخَلُّوا سَبِيلَهُمْ﴾

ئەم ئاراستەیەی "ابن سلامة" زۆرێك لە ئایەتەکانی قورئانی پەکخستووە بەبێ ئەوەی هۆیەك بۆ ئەو کارەی باس بکات تەنانەت لە یەك ئایەتدا، هەر کەس کەمترین شارەزایی لە رێساکانی زانستی نەحو و زانستی ئوسوڵی فیقهدا هەبێت مەرج بۆ سنووردارکردنی حوکمێك ناکات بە نەسخکەری حوکمە بەمەرجگیراوەکە بۆ سنووردارکردن.

ئەم قسەیە دووبارە کردنەوەی ئەوەیە "ابن حزم الأندلسي"[6] وتوویەتی، هەردووکیان بەجۆرێك زیادەڕەوییان لە نەسخدا کردووە پێچەوانەی ئەدەبە لەگەڵ

---

[1] سورة التوبة/١

[2] واتە بە ئەمن و ئەمانەوە برۆن ئەی هاوەڵدانەران.

[3] لە سزای خودا دەرناچن.

[4] سورة التوبة/٥

[5] المرجع السابق ص١٢٨

[6] الناسخ والمنسوخ شاياني باسة "ابن حزم الأندلسي" ئيَش "ابن سلامة" کەوتووە، چونکە "ابن حزم" ساڵی ٣٢٠ هـ کۆچی دوایی کردووە، لە کاتێکدا "ابن سلامة"(٤١٠ ه) کۆچی دوایی کردووە، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی "ابن سلامة" قسەکانی و

خودادا، تەنانەت هەڵوەردراویان کردووە بە نەسخکەری لێهەڵوەردراو، و تایبەت بۆ گشتی و سنووردار بۆ رەها، و بەم جۆرە، وەك لە زیادەڕەوییەکانی نەسخیاندا دەردەکەوێت مەبەستیان بە نەسخ ئەو مانایە نەبووە لای ئوسولییەکان کە بریتییە لە سڕینەوەی حوکمی پێشوو بە بەڵگەی دوای ئەو، بەڵکو مەبەستیان ئەوە بووە کە لە "ابن عباس"ەوە گوازراوەتەوە لە وتنی نەسخ بە مانا گشتییە گشتگیرەکەی بۆ هەموو ئەوەی پێشتر باسمان لە بارەوە کردووە.

بانگەشەی نەسخ بەم بەڵگانە پووچ و بێبنەمایە:

١.نەبوونی هیچ جۆرە بەرهەڵستکارییەك لە نێوان نەسخکراو و نەسخکەردا، نەسخ لقی بەرهەڵستکارییە و بۆ هەڵگرتنی بەرهەڵستکاری دێت لەدوای ئەوەی ناتوانرێت کۆکردنەوە لە نێوانیاندا بکرێت یان پارسەنگی یەکێکیان لە کارکردن پێی بەسەر ئەویتریاندا بدرێت، رووی ئەمەش: مانای ﴿بَرَاءَةٌ مِنْ اللَّهِ﴾ واتە ئەمە بەریبوونی خودایە﴿وَرَسُولِهِ﴾ دابڕان لە پەیمان و هەڵگرتنی ئەمان و دەرچوون لێی﴿إِلَى الَّذِينَ عَاهَدتُّمْ مِنْ الْمُشْرِكِينَ﴾ لەگەڵ یەهود دوای ئەوەی ناپاکیان لێوەشایەوە و پابەندبوونی خۆیان هەڵوەشاندەوە، ئەو پەیمان و پابەندبوونەی لە نێوان ئەوان و پێغەمبەردا(ﷺ) حوکمی دەکرد[1]

ئایەتی نەسخکەر بریتییە لە ئایەتی پێنجەمی سورەتی "التوبة" کە پێی دەوترێت ئایەتی شمشێر بۆ پەرچدانەوەی دەستدرێژکاری هاتووە، لە هاوەڵدانەرانەوە بێت یان لە ئەهلی کیتابەوە.

---

بانگەشەکانیی نەسخی قورئانی لە "ابن حزم الأندلسي"ەوە وەرگرتووە، "النحاس" و "أبو مسلم الأصفهاني" هاوچەرخی "ابن حزم الأندلسي" بوون، "النحاس" ساڵی (٣٣٨هـ) کۆچی دوایی کردووە و "أبو مسلم" ساڵی(٣٢٢هـ) کۆچی دوایی کردووە.

[1] الطبري مجمع البيان ٥/٢-٣. الرازي التفسير الكبير ١١٥/١٥ وما بعدها.

بۆیە ئایەتی: ﴿فَاقْتُلُوا الْمُشْرِكِينَ حَيْثُ وَجَدْتُمُوهُمْ﴾ واتـە لـە بـاری شـکاندنی پەیمانەکانیان و دەستدرێژی کردنیان بۆ سەر ئیسلام و موسڵمانان، بەرهەڵستکاری لە کوێی ئەم دوو ئایەتەدا بوونی هەیە تا بە نەسخبوون هەڵبگیرێت؟

٢.ئایـەتی:﴿فَـإِنْ تَـابُوا وَأَقَـامُوا الصَّـلَاةَ وَآتَـوُا الزَّكَـاةَ فَخَلُّـوا سَـبِيلَهُمْ﴾ تایبەتکردنـە بـۆ گشـتاندنی ژنـەوراو لـە سـەرەتای ئایەتەکـەوە، گـەر بـەم مانایـە مەبەستیان نەسخکردنەوەی سەرەتای ئایەتەکـە بێـت بـە کۆتـایی ئایەتەکـە ئـەوا بەرهەڵستی بۆ قسەکانیان نییە، گەر مەبەستیان بە نەسخ مانـا ئوسـوڵییەکەی بێـت لای پاشین ئەوا لە دەروازەی تێکەڵکردنی نەسخ و تایبەتکردنە.

"ابن الجوزي"[1] دەڵێـت: ((هەنـدێك لەوانـەی تێگەیشـتنیان نییـە لەنەقڵکـەرانی تەفسیر پێیانوایە ئەم ئایەتە(ئایەتی شمشێر) سەد و بیست و چوار ئایەتی لە قورئان نەسخ کردۆتەوە و پاشان کۆتاییەکەی سەرەتاکەی نەسخ کردۆتـەوە، ئـەوەش ئـەم بەشەی ئایەتەکەیە:﴿فَإِنْ تَابُوا وَأَقَامُوا الصَّلَاةَ وَآتَوُا الزَّكَاةَ فَخَلُّوا سَبِيلَهُمْ﴾ ئەمە لە نـەبوونی وردی تێگەیشـتنەوەیە، چـونکە ماناکـەی بـەم جۆرەیـە: بیـانکوژن و بـە دیلیان بگرن جگە لەو کاتەی لە هاوەڵدانان تەوبـە دەکـەن و دان بـە نوێـژدا دەنـێن و زەکات دەدەن، لەو بارەدا رێگەیان پێ مەگرن و جەنگیان لەگەڵ مەکەن)).

٣.ئایـەتی یەکـەم لـە سـورەتی "الـبراءة" بـە نەسـخکەریان دانـاوە وەك پێشـتر باسمان کرد، چۆن نەسخکەر دەبێت بە نەسـخکراو؟ ئایـا ئەمـە لـە دەروازەی کـەمی ئەدەب نییە لەگەڵ خودا و قورئان؟[2]

---

[1] نواسخ القرآن ص١٧٣.

[2] لە سەرخەرانی نەسخ نەبوونەوە: الالوسي ٤٢/١٠. الرازي ٢١٧/١٥.

–ئایەتی(٣٤):﴿وَالَّذِينَ يَكْنِزُونَ الذَّهَبَ وَالْفِضَّةَ وَلاَ يُنفِقُونَهَا فِي سَبِيلِ اللَّهِ فَبَشِّرْهُمْ بِعَذَابٍ أَلِيمٍ﴾

هەندێك پێیانوایە[1] نەسخكراوەتەوە بە ئایەتی زەكاتی واجب.

ئەم بۆچوونە پووچ و بینەمایە بەم بەڵگانە:

١.نەبوونی هیچ جۆرە بەرهەڵستكارییەك لە نێوان دوو ئایەتەكەدا، نەسخیش لقی بەرهەڵستكارییە، دەستبەسەرداگرتنی زێڕ و زیو و گەنجینەكردنیان حەرامە، چونكە وادەكات پارە هەڵگیراوەكە بەرهەم نەهێنرێت لە پێناوی خودادا واتە لەپێناو بەرژەوەندی گشتی و پەرەپێدانی كۆمەڵایەتی و ئابووریدا.

٢.ئەم ئایەتە رێسایەكی گشتییە بەسەر هەموو جۆرە سكەیەكی كاغەزی و كانزاییدا پیادە دەكرێت لە جیهانی داراییدا ئاڵوگۆڕی پێ دەكرێت، چونكە ئایەتەكە گشتییە بە گشتاندنێكی ئەقڵییانە[2] وەك ئەوەی فەرمووبێتی هەموو ئەوانەی پارەیەكی كانزایی یان كاغەزی ئاڵوگۆڕپێكراو لە جیهاندا هەڵدەگرن لە هەر كات و شوێنێك و﴿وَلاَ يُنفِقُونَهَا فِي سَبِيلِ اللَّهِ﴾ واتە لەپێناوی بەرژەوەندی گشتی و پەرەپێدانی كۆمەڵایەتی و ئابووریدا بەرهەمی ناهێنن مژدەیان پێبدە بە سزایەكی چۆقەهەڵسێن لە دڵ، پێشتر هەڵەی ئەو بۆچوونەمان راست كردەوە كە ئایەتی فەرمانكەر بە خەرجكردن نەسخ دەكەنەوە بە ئایەتی زەكاتی فەرزكراو[3].

---

[1] ابن حزم ص٤٠ ابن سلامة ص١٢٩ ابن الجوزي ص١٧٥ ابن البارزي ناسخ القرآن العزيز ومنسوخة تحقيق د. حاتم صالح الضامن ص١٩١ .

[2] وتمان گشتاندنە، چونكە گشتی حوكم لە هۆیەكەوە حاڵی دەبین، هۆی حەرامبوونی گەنجینەكردنی زێڕ و زیو ئەوەیە گەنجینەكردن وا دەكات گەنجینەكراوەكە بەرهەم نەهێنرێت لە خەرجكردن و بەرهەمهێنان و ئاڵوگۆڕدا، ئەمەش وا دەكات پەرەپێدانی كۆمەڵایەتی و ئابووری سەرهەڵنەدات، هەموو ئەوەی لە زێڕ و زیودا واجب یان حەرامكراوە لە هەموو پارەیەكدا كە لە مامەڵە و ئاڵوگۆڕدا جێگەی زێڕ و زیو دەگرنەوە بەهەمان شێوەیە.

[3] سەرخەرانی نەسخ نەبوونەوە: الرازي ٤١/١٦

-ئایـەتی(٣٩):﴿ إِلاَّ[1] تَنفِرُوا يُعَذِّبْكُمْ عَذَابًا أَلِيمًا وَيَسْتَبْدِلْ قَوْمًا[2] غَيْرَكُمْ وَلاَ تَضُرُّوهُ[3] شَيْئًا وَاللَّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ﴾

"ابن حزم الاندلسی"[4] دەڵێت نەسخکراوەتەوە بە ئایەتی:﴿وَمَا كَانَ الْمُؤْمِنُونَ لِيَنفِرُوا كَافَّةً فَلَوْلاَ نَفَرَ مِنْ كُلِّ فِرْقَةٍ مِنْهُمْ طَائِفَةٌ لِيَتَفَقَّهُوا فِي الدِّينِ وَلِيُنذِرُوا قَوْمَهُمْ إِذَا رَجَعُوا إِلَيْهِمْ لَعَلَّهُمْ يَحْذَرُونَ﴾[5]

"النحاس"[6] دەڵێت: خودا-عز وجل- دەفەرموێت:﴿إِلاَّ تَنفِرُوا يُعَذِّبْكُمْ عَذَابًا أَلِيمًا﴾الآية، "عليل بن احمد" بۆی باسکردین لە "عاصم بن سليمان" لە "جويبر" لە "الضحاك" لە "ابن عباس" فەرمووی ئەم ئایەتە نەسخی کردۆتەوە:﴿وَمَا كَانَ الْمُؤْمِنُونَ لِيَنفِرُوا كَافَّةً﴾ الآیە، هەر بەو جۆرە "الحسن وعکرمە" هەمان شت دەڵێن، کەسانی تریش دەڵێن ئەو دوو ئایەتە موحکەمن، چونکە ئەم بەشەی ئایەتەکە:﴿إِلاَّ تَنفِرُوا يُعَذِّبْكُمْ عَذَابًا أَلِيمًا﴾ ماناکەی ئەوەیە گەر پێویستیان پێتان بوو.

رای دروست:

دروست نەسخ نەبوونەوەیە و وتنی نەسخی ئایەتەکە پووچ و بێبنەمایە بەم بەڵگانە:

١. نەبوونی هیچ جۆرە بەرهەڵستکارییەك لە نێوان دوو ئایەتەکەدا، نەسخیش لقی بەرهەڵستکارییە.

---

[1] ئەسڵەکەی "ان لا" واتە گەر دەرنەچن بۆ ئەو جەنگانەی کە پێغەمبەر(ﷺ) ئێوەی بۆ بانگ دەکات، دابنیشن و نەچن بە دەم بانگەکەیەوە خودا سزایەکی بەئێشتان دەدات لە دونیا و دواڕۆژدا.

[2] واتە ئێوە بە قەومێکی ئاڵوگۆڕ دەکات و فەرمانەکانی خودا جێبەجێ دەەن.

[3] واتە بەو کەمتەرخەمی و خۆگرتنەوە لە جیهادە زیان بە خودا ناگەیەنن.

[4] ص٤٠

[5] سورة التوبة ١٢٢

[6] المرجع السابق ص١٦٧

٢. وتنی نەسخ تێکەڵییەکە لە نێوان نەسخ و ماناکانی تردا لە روخسەت یان تایبەتکردن یان درێژەپێدان، ئەوەش لەبەرئەوەی ئایەتەکەی یەکەم بە گشتاندنی و رەهاکردنی و عەزیمەتەوە لێی حاڵی دەبین لەسەر هەموو موسڵمانێك کە دەتوانێت چەك هەڵبگرێت پێویستە بەشداری جیهاد بکات. ئایەتەکەی دووەم رۆشنی دەکاتەوە مەبەستەکە ئەوە نییە، بەڵکو لەسەر موسڵمانی باڵغی ئاقڵ پێویستە هەندێکیان بەشداری جیهاد بکەن لە کاتی پێویستیدا، هەندێکی تریان خەریك دەبن بە فێربوونی کاروباری دونیایانەوە تاکو ئەرکەکانی تر رابپەڕێنن، چونکە ئەرکەکانی مرۆڤ لە جیهاددا کورتنابێتەوە بە لە کاتی پێویستیش بێت، بۆیە ئایەتی یەکەم عەزیمەت و گشتی و پوختەیە، ئایەتی دووەم روخسەت و درێژەپێدان و تایبەتکردنە، وتنی نەسخی ئەو ئایەتە تێکەڵکردنی نەسخە لەگەڵ ئەو سێ مانای تردا.

٣. ئەوەی لە "ابن عباس"ەوە گوازراوەتەوە لە وتنی نەسخ -گەر راست بێت- ئەوا هەڵدەدرێتە سەر نەسخ بە مانای گشتی لەلای پێشین کە تایبەتکردن و سنووردارکردن و درێژەپێدان و شتانی تر لەخۆ دەگرێت.

٤. ئایەتی یەکەم هەرەشە بۆیە ناچێتە ژێر نەسخەوە[1].

-ئایەتی(٤٣):﴿عَفَا اللَّهُ عَنْكَ لِمَ أَذِنتَ لَهُمْ[2] حَتَّى يَتَبَيَّنَ لَكَ الَّذِينَ صَدَقُوا[3] وَتَعْلَمَ

[1] لە سەرخەرانی نەبوونی نەسخ: الرازی ٦١/١٦.

[2] "لە دواکەوتن لێت" قتادە وعمرو بن میمون دەڵێن: دوو شت پێغەمبەر(ﷺ) ئەنجامیدا فەرمانی پێنەکرابوو: مۆڵەتدان بە دووڕووان و فیدیە وەرگرتن لە دیلەکانی بەدر، بۆیە خودا سەرزەنشتی کرد.

[3] واتە تا بۆت دەربکەوێت کێ لەوانە لە دواکەوتنەکەی عوزری هەیە و کێش عوزری نییە، ئەوکاتە مۆڵەتدانەکەت بۆ ئەوانەی مۆڵەتتتدان لەسەر زانست بوایە، ئیبن عباس دەڵێت: ئەوەش لەبەر ئەوەی پێغەمبەر(ﷺ) لەو رۆژەدا دووڕووانی نەدەناسی. ینظر الطبري ٣٣/٥

الْكَاذِبِينَ ﴾[1]

هەندێك پێیانوایە[2] نەسخكراوەتەوە بە ئایەتی:﴿فَإِذَا اسْتَأْذَنُوكَ لِبَعْضِ شَأْنِهِمْ فَأْذَنْ لِمَنْ شِئْتَ مِنْهُمْ وَاسْتَغْفِرْ لَهُمْ اللَّهَ إِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَحِيمٌ﴾[3].

بەڵكو هەندێك زیاد لەوە پێیان لێ راكێشاوە، بۆیە وتوویانە ئەو ئایەتە ئامارەبۆكراوە(٤٣) لەگەڵ دوو ئایەتی دوای ئەو ئایەتی(٦٢)ی سورەتی "النور" نەسخی كردوونەتەوە، دوو ئایەتەكەی دوای ئەو ئایەتە ئەم دوانەن:﴿لاَ يَسْتَأْذِنُكَ الَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ أَنْ يُجَاهِدُوا بِأَمْوَالِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ وَاللَّهُ عَلِيمٌ بِالْمُتَّقِينَ﴾[4].

هەروەها ئایەتی:﴿إِنَّمَا يَسْتَأْذِنُكَ الَّذِينَ لاَ يُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ وَارْتَابَتْ قُلُوبُهُمْ فَهُمْ فِي رَيْبِهِمْ يَتَرَدَّدُونَ ﴾[5]

"النحاس" دەڵێت: "علی بن أحمد" بۆی باسكردین لە "محمد بن هشام"ەوە لە "عاصم بن سليمان"ەوە لە "جويبر"ەوە لە "الضحاك"ەوە لە "ابن عباس"ەوە ﴿عَفَا اللَّهُ عَنْكَ﴾ الآية ﴿لاَ يَسْتَأْذِنُكَ الَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِاللَّه﴾ الآية ﴿إِنَّمَا يَسْتَأْذِنُكَ الَّذِينَ لاَ يُؤْمِنُونَ﴾ الآية، هەتا (يترددون) واتە تا كۆتایی ئایەتی(٤٥) ئەم سێ ئایەتە سڕاونەتەوە بەم ئایەتە:﴿فَإِذَا اسْتَأْذَنُوكَ لِبَعْضِ شَأْنِهِمْ فَأْذَنْ لِمَنْ شِئْتَ مِنْهُمْ﴾. "الحسن وعكرمە"دەڵێن: ﴿لاَ يَسْتَأْذِنُكَ الَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ﴾ ئایەتەكەی سورەتی "النور" نەسخی كردۆتەوە:﴿فَإِذَا اسْتَأْذَنُوكَ﴾ الآيە، پاشان بەردەوام دەبێت و دەڵێت هەندێ لە زانایان دەڵێن ئەو سێ ئایەتە موحكەمن[6].

---

[1] سورة التوبة/٤٣

[2] منهم ابن حزم ص٤٠ وحسن وعكرمة والنحاس ص١٦٨ ابن الجوزي ص١٧٦

[3] سورة النور/٦٢

[4] سورة التوبة/٤٤

[5] سورة التوبة/٤٥

[6] المزيد من التفصيل راجع الناسخ والمنسوخ لابي جعفر النحاس ص١٦٨ وما بعدها.

**رای دروست:**

دروست ئەوەیە وتنی نەسخی ئایەتەکانی(٤٣ و ٤٤ و ٤٥)ی سورەتی "التوبە" بە ئایەتی (٦٢)ی سورەتی "النور" بۆچوونێکی پووچ و بێبنەمایە، و شان لەسەر پاڵپشتێکی شەرعی لە شەریعەتی ئیسلام (لە قورئان و فەرموودەی سەحیح و ئیجماع) دانادات، بەم هۆیانە:

١.نەبوونی هیچ جۆرە بەرهەڵستکارییەك لە نێوان نەسخکەر و نەسخکراوی بانگەشەبۆکراوی باسکراودا، وەك ڕۆشنە لەلای کەسانێك کەمترین شارەزاییان لە ڕێساکانی زمانی عەرەبی و ئوسولّی فیقه هەبێت، ئایەتی(٤٣) لەسەر ئەوەی تایبەتە بە دووڕووانەوە هاتووە، ئەوانەی داوای مۆڵەتیان لە پێغەمبەر(ﷺ) کرد و ئەویش مۆڵەتیدان لەسەر ئەو بنچینەی ئەوان خاوەنی عوزرن، چونکە ئەو لەو کاتەدا ڕاستەقینەی ئەوان و نییەتی تێکدەرانەی ئەوانی نەدەزانی[1]

ئایەتی(٦٢)ی سورەتی "النور" تایبەتە بە باوەڕداران و مۆڵەتپێدانیان بۆ عوزرە شەرعییەکانیان نەك بەهۆی دووڕووییانەوە، بەرهەڵستکاری لە کوێدایە تا بە نەسخ هەڵبگیرێت؟

ئایەتی (٤٤) تایبەت بە باوەڕداران هاتووە، ئەوانەی مۆڵەتیان لە پێغەمبەر(ﷺ) داوا دەکرد بۆ دانیشتن لە جیهادکردن لەگەڵی بەهۆی عوزرە ڕەواکانیانەوە وەك نەخۆشی و پیری و هاوشێوەکانیان، ئەوان باوەڕیان بە خودا و بە ڕۆژی دوایی هەبوو، ئەوەش هاندەری پاڵنەر بوو بۆ بەشداری کردن لە هەموو جیهادێکدا بۆ بەرپەرچدانەوەی دەستدرێژکاری دوژمن گەر ڕێگرێك بوونی نەبوایە ڕێگەی ئەوەیان لێ بگرێت.

مۆڵەتپێدان بەهۆی عوزرێکەوە لەم ئایەتەدا هەمان ئەو مۆڵەتپێدانەیە لە ئایەتی(٦٢)ی سورەتی "النور"دا، بەرهەڵستکاری لە کوێدایە تا بە نەسخ هەڵبگیرێت؟

---

[1] سەرخەرانی نەسخ نەبوونەوە: الالوسي ١٠/١٠٩ الرازي ١٦/٧٦.

ئایـەتی(٤٥)ی سـورەتی "التوبـة" بـۆ ئـەوە هـاتووە پێمـان بفـەرموێت مۆڵـەت وەرگـرتن بـەبێ عـوزرێکی شـەرعی ئاشـکرای جـێگیر بەڵگـەی دووڕوویـی کەسـی مۆڵەتوەرگرە، چونکە تەنها ئەوانە بەبێ عوزری ڕەوا مۆڵەت وەردەگرن کـە باوەڕیـان بە خودا و بە ڕۆژی دوایی نییە، هەروەها ئـەو کەسـانەی دڵیـان هاتـە لـەرزە و شـك و گومان دایگرتنەوە، ئەوانە لە شك و گومانیاندا دڵەڕاوکێیانە و دەڕۆن و دەگەڕێنەوە[1]، بەرهەڵستی ئـەم حوکمـە لەگـەڵ حـوکمی ئایەتەکـەی (٦٢)ی سـورەتی "النـور" لـە کوێدایە تا بە نەسخ هەڵبگیرێت؟

٢.گەر وادابنێین بەرهەڵستکاری بوونی هەبێت لە نێوان ئایـەتی (٦٢)ی سـورەتی "النور" و ئایەتەکانی (٤٣ و ٤٤ و ٤٥)ی سورەتی "التوبة"دا ئەوا بە تایبەتکردن یان سنووردارکردن یان درێژەپێدان وەك باسمان کرد هەڵدەگیرێت.

٣.گـەر ئەوانـەی قسـە لـە نەسـخی ئـەو ئایەتانـە دەکـەن مەبەسـتیان پێـی مانـا گشتییەکەی نـەبێت لای پێشـینی چاکان کـە سـنووردارکردنی ڕەهـا و تایبـەتکردنی گشـتی و درێژەپێـدانی پوختـە و روخسـەت لـە عەزیمـەت و هاوشـێوەکانی ئەمانـە لەخۆدەگرێت ئەوا وتنی نەسخی سێ ئایەت بەدوای یەکدا –کە خودا ڕەوانەی کردووە بۆ ئەوەی ببێت بە بەشێك لە دەستووره نەمرەکەی بۆ خێزانـی مرۆڤایـەتی– دەبێتـە پێچەوانەی ئەدەب لەگەڵ خودا–سبحانه وتعالى–

---

[1] ينظر الطبري ٣٤/٥ والرازي ٧٨/١٦ وما بعدها.

# نەسخی بانگەشەبۆکراو لە سورەتی "یونس"دا

"ابن حزم الأندلسي"[1] پێیوایە دوو ئایەتی نەسخکراو لە سورەتی "یونس"دا هەیە.

﴿إِنِّي أَخَافُ إِنْ عَصَيْتُ رَبِّي عَذَابَ يَوْمٍ عَظِيمٍ﴾ (١٥)

﴿قُلْ فَانْتَظِرُوا إِنِّي مَعَكُمْ مِنَ الْمُنْتَظِرِينَ﴾ (١٠٢)

-یەکەمیان ئەم ئایەتەیە: ﴿إِنِّي أَخَافُ إِنْ عَصَيْتُ رَبِّي عَذَابَ يَوْمٍ عَظِيمٍ﴾[2][3]، بەم ئایەتە نەسخکراوەتەوە:﴿لِيَغْفِرَ لَكَ اللَّهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِكَ وَمَا تَأَخَّرَ﴾[4].

ئەم بۆچوونە پووچە، چونکە ئایەتی(١٥) سورەتی "یونس" هەمان ئایەتی(١٥)ی سورەتی "الأنعام"ە و هیچ جیاوازییەك لە نێوانیاندا نییە جگە لەوەی ئایەتەکەی

---

(١) الناسخ والمنسوخ ص٤١ وتبعه ابن سلامة ص١٣١.

(٢) سورة يونس/١٥.

(٣) سەرخەرانی نەسخ نەبوونەوە: الرازی ١٧/٥٥.

(٤) سورة الفتح/٢.

دووەم بە "قل" دەستپێدەکات، چۆن یەك ئایەت دوو جار دابەزیبێت دوو جار نەسخ دەکرێتەوە، ئەم یاریکردنە چییە و ئەمە چ جۆرە مامەڵەیەکە لەگەڵ خودا و قورئاندا؟

لە سورەتی "الأنعام"دا ئەوەندەی پێویست بێت ئەم بۆچوونەمان بەرپەرچ دایەوە بۆیە پاساو نییە بۆ کات کوشتن لە ئیجتیهادگەلێکدا جێگەی باوەڕ نین.

-ئایەتی(١٠٢):﴿قُلْ فَانْتَظِرُوا إِنِّي مَعَكُمْ مِنْ الْمُنْتَظِرِينَ ﴾[١]

ئەمە بەشێکە لە ئایەتی:﴿فَهَلْ يَنْتَظِرُونَ إِلاَّ مِثْلَ أَيَّامِ الَّذِينَ خَلَوْا مِنْ قَبْلِهِمْ قُلْ فَانْتَظِرُوا إِنِّي مَعَكُمْ مِنْ الْمُنْتَظِرِينَ﴾، هەندێك پێیانوایە[٢] ئەم ئایەتە بە ئایەتی شمشێر نەسخکراوەتەوە.

ئەم بانگەشە رەد دەکرێتەوە بە نەبوونی بەرهەڵستکاری، چونکە ئایەتی شمشێر تایبەتە بە باری بەرگری شەرعییەوە دژ بە دەستدرێژکاری بۆ سەر ئیسلام و موسڵمانان.

گەر وا دابنێین بەرهەڵستکاری بوونی هەیە، ئەوا لە دەروازەی بەرهەڵستکاری گشتییە و وتنی نەسخ تێکەڵکردنێکە لە نێوان نەسخ و تایبەتکردندا.

چەندین ئایەتی تر لە سورەتی "یونس"دا بوونیان هەیە هەندێك پێیانوایە[٣] بە ئایەتی شمشێر نەسخبوونەتەوە، لە کاتێکدا ئەو ئایەتانە گشتین و بە ئایەتی شمشێر تایبەتکراون، و وتنی نەسخ تیایاندا تێکەڵکردنە لە نێوان نەسخ و تایبەتکردندا، گەر مەبەست بە نەسخ مانا گشتییەکەی نەبێت لای پێشین.

---

(١) لە سەرخەرانی نەبوونی نەسخ: الالوسي ١١/١٩٠ الرازي ١٧/١٦٥.

(٢) منهم ابن حزم الاندلسي ص٤١ وابن سلامة ص١٣١.

(٣) ينظر ابن حزم: ص٤١، والنحاس: ص١٧٦، وابن سلامة: ص١٣١، وابن الجوزي: ص١٧٩ وما بعدها.

# نەسخی بانگەشەبۆكراو لە سورەتی "هود"دا

﴿مَنْ كَانَ يُرِيدُ الْحَيَاةَ الدُّنْيَا وَزِينَتَهَا نُوَفِّ إِلَيْهِمْ أَعْمَالَهُمْ فِيهَا وَهُمْ فِيهَا لاَ يُبْخَسُونَ﴾ (١٥)

﴿وَقُلْ لِلَّذِينَ لاَ يُؤْمِنُونَ اعْمَلُوا عَلَى مَكَانَتِكُمْ إِنَّا عَامِلُونَ، وَانتَظِرُوا إِنَّا مُنتَظِرُونَ﴾ (١٢١)

—ئایەتی (١٥):﴿مَنْ كَانَ يُرِيدُ الْحَيَاةَ الدُّنْيَا وَزِينَتَهَا[١] نُوَفِّ إِلَيْهِمْ أَعْمَالَهُمْ فِيهَا[٢] وَهُمْ فِيهَا لاَ يُبْخَسُونَ ﴾.[٣]

هەندێك پێیانوایە[٤] نەسخكراوەتەوە بەم ئایەتە:﴿مَنْ كَانَ يُرِيدُ الْعَاجِلَةَ عَجَّلْنَا لَهُ فِيهَا مَا نَشَاءُ لِمَنْ نُرِيدُ ﴾ [١] الآية.

---

[١] واتە جوانی و رازاوەیی دونیا و نەویستنی دواڕۆژ.

[٢] واتــە بەتـەواوی پاداشـتی كردارەكانیـان دەدەینـەوە لـە دونیـادا و شـتێكی لـێ كـەم ناكەین.

[٣] سورة هود/١٥.

[٤] ابن حزم: ص٤١، والنحاس: ص١٧٧، وابن سلامة: ص٣٣، وابن البارزي: ص١٩٢.

ئەم بۆچوونە پووچ و بێبنەمایە بەم بەڵگانە:

١.بانگەشەی نەسخ تێکەڵکردنە لە نێوان نەسخ و سنووردارکردنی رەهادا، چونکە ئایەتی یەکە رەهایە و دووەمیان حوکمەکەی پەیوەست کردووە بە ویستی خوداوە بۆ ئەو شتانەی دەیەوێت و ئەو ویستانەی ویستیان دەکات.

٢.هەردوو ئایەتەکە هەواڵن، هەواڵیش ناچێتە ژێر باری نەسخەوە[٢].

ئەوەی لە ئایەتی(١٥)ی سورەتی "هود"دا هاتووە هەمان ئەو مانایە لە ئایەتی (١٤٥)[٣]ی سورەتی "آل عمران"دا هاتووە کە پێیانوابوو نەسخکراوەتەوە بە هەمان ئایەتی(١٨)ی سورەتی "الإسراء"، لە شوێنی خۆی رەدی ئەم بۆچوونە پووچەمان دایەوە، بەڵام لێرەدا لە سەرخەرانی نەسخ دەپرسین چۆن یەك حوکم دوو جار لە دوو سورەتدا دادەبەزێت پاشان دوو جار دەسڕێتەوە، ئەم گشتە زیادەڕەوییە چییە لە نەسخدا و ئەم شێوازی مامەڵەکردنە کردنە چییە لەگەڵ خودا و قورئاندا؟[٤].

–ئایەتی(١٢١):﴿وَقُلْ لِلَّذِينَ لاَ يُؤْمِنُونَ اعْمَلُوا عَلَى مَكَانَتِكُمْ إِنَّا عَامِلُونَ، وَانتَظِرُوا إِنَّا مُنتَظِرُونَ﴾[٥]

هەندێك پێیانوایە:[٦] ئەم دوو ئایەتە بە ئایەتی شمشێر نەسخکراوەتەوە.

---

[١] سورة الاسراء/١٨.

[٢] ابن الجوزي نواسخ القرآن ص١٨٢ تيايدا هاتووە(ئەم قسەیە دروست نییە چونکە دوو ئایەتەکە هەواڵن)

[٣] وهو قوله تعالى {ومن يرد ثواب الدنيا نؤته منها ومن يرد ثواب الاخرة نؤته منها وسنجزي الشاكرين} سورة آل عمران/١٤٥.

[٤] لە سەرخەرانی نەسخ نەبوونەوە: الرازي: ١٨٩/١٧، الآلوسي: ٢٤/١٢.

[٥] سورة هود/١٢١، ١٢٢.

[٦] ابن حزم: ص٤٠، ابن سلامة: ١٣٣، ابن الجوزي: ١٨٢، ابن البارزي: ص١٩٢.

ئەم بۆچوونە پووچ و بێبنەمایە بەم بەڵگانە:

١.ئەم دوو ئایەتە نەسخکراوە–بەپێی بۆچوونی ئەوان– هەڕەشەن، هەڕەشەش ناچێتە ژێر باری نەسخەوە.

٢.حوکمی هاتوو لە دوو ئایەتە نەسخکراوەکەی سورەتی "هود" هەمان حوکمی هاتووە لە ئایەتی(١٠٢)ی سورەتی "یونس" ئەوەش ئەمەیە:﴿قُلْ فَانْتَظِرُوا إِنِّي مَعَكُمْ مِنَ الْمُنْتَظِرِينَ﴾ ئەوان دەڵێن ئەم ئایەتە[1] بە ئایەتی شمشێر نەسخکراوەتەوە[2]

دووبارە دەڵێم چۆن یەك حوکم لە دوو سورەتی بەدوای یەکتردا هاتوو دووبارە دەبێتەوە و لە خاوەن شەرعێکی توانادار بەسەر هەمووشتێکدا دادەبەزێت و پاشان دوو جار بە ئایەتی شمشێر نەسخ دەبنەوە؟

٣.گەر پێمان وابێت بەرهەڵستکاری بوونی هەیە ئەوە لە دەروازەی بەرهەڵستی گشتی و تایبەتییە، بۆیە یەکەم بە دووەم تایبەت دەکرێت ئەوکات بەرهەڵستکارییەکە هەڵدەگیرێت و پێویست بە نەسخ ناکات.

٤.لە دوو ئایەتەکەدا هەڕەشە و ترساندن هەیە و ناچێتە ژێر باری نەسخەوە.

---

[1] أي في سورة هود.

[2] لە سورە "یونس"دا بەرپەرچدانەوەی ئەم بانگەشەیەم پشتگوێ خست بەوەندە وەستام بڵێم: هەر ئایەتێك ئەوان پێیان وایە نەسخکراوەتەوە بە ئایەتی شمشێر ئەوە تایبەتکەرە بۆی، بانگەشەکە تێکەڵییەکە لە نێوان نەسخ و تایبەتکردندا.

# نەسخی بانگەشەبۆکراو لە سورەتی "یوسف"دا

ئەمـە سـورەتێکە لـە سـورەتەکانی قورئـان و یەکـەمین سـورەتێکە لـە زمـانی بانگکەرانی نەسخ رزگاری بووبێت، دەڵێن: نە نەسخکەر و نە نەسخکراوی تێدا نییە.

# نەسخی بانگەشەبۆکراو لە سورەتی "الرعد"دا

﴿وَإِنَّ رَبَّكَ لَذُو مَغْفِرَةٍ لِلنَّاسِ عَلَى ظُلْمِهِمْ﴾ (٦)
﴿فَإِنَّمَا عَلَيْكَ الْبَلاَغُ وَعَلَيْنَا الْحِسَابُ﴾ (٤٠)

-ئايەتى(٦):﴿وَإِنَّ رَبَّكَ لَذُو مَغْفِرَةٍ لِلنَّاسِ عَلَى ظُلْمِهِمْ﴾[1]

هەندێك پێیانوایە[2] ئەم بەشەی ئایەتەكە نەسخكراوەتەوە بەم ئایەتە:﴿إِنَّ اللَّهَ لاَ يَغْفِرُ أَنْ يُشْرَكَ بِهِ﴾[3] ئەم بۆچوونە پووچ و بێبنەمایە چونكە تێكەڵكردنە لە نێوان نەسخ و تایبەتكردندا، وشەی "الناس" "ال-الإستغراق"ی چووەتە سەر و هاوەڵدانەر و كەسانی تریش دەگرێتەوە، لەبەرئەوە بە ئایەتی هاوەڵدانان تایبەتكراوە، بۆیە لە گشتاندنی ستەمكاران كرانە دەرەوە كە ستەمەكەیان لە

(١) سورة الرعد/٦.

(٢) وەك ابن حزم الاندلسي: ص٤٢، وابن سلامة: ص١٣٥.

(٣) سورة النساء/٤٨.

هاوەڵداناندا بەرجەستە بووە، پاشان نەبوونی لێخۆشبوون لە ئایەتەکەی دووەمدا تایبەتە بەوانەی وەك هاوەڵدانەر مردوون.

"ابن الجوزي"[1] دەڵێت: هەندێ لە ئەهلی تەفسیر وەهمی ئەوەیان بۆ دروست بووە ئەم ئایەتە نەسخکراوەتەوە، چونکە مەبەست بە ستەم لێرەدا بریتییە لە "هاوەڵدانان"، ئەم وەهمکردنە تێکچووە، چونکە "ستەم" گشتییە و لێکدانەوەی بە "هاوەڵدانان" پێویستی بە بەڵگەیە، بەڵگەش بوونی نییە.

-ئایەتی(٤٠):﴿فَإِنَّمَا عَلَيْكَ الْبَلاَغُ وَعَلَيْنَا الْحِسَابُ﴾[2]

"ابن حزم الاندلسي"[3] دەڵێت: بە ئایەتی شمشێر نەسخکراوەتەوە، "ابن سلامة"[4] هەمان قسە دووبارە دەکاتەوە بەبێ ئەوەی رووی نەسخکردنەکە رۆشن بکاتەوە. "قتادة[5] والبارزي"[6] هەمان قسە دەکەن.

بانگەشەی نەسخ پووچ و بێبنەمایە بەجۆرێك ئاتاج بە بەڵگە ناکات، هەر مرۆڤێك کەمترین شارەزایی بە شەریعەتی ئیسلام و شەریعەتە خواییەکانی پێشوو هەبێت دەزانێت کاری پێغەمبەران بریتی بووە لە پێڕاگەیاندن، دادگاییکردن لەسەر خودایە و ئەوان دەسەڵاتی گەیاندنیان بە ئامانج نەبووە و دەسەڵاتی موحاسەبەیان نەبووە.

ئایەتی شمشێریش تایبەتە بە حاڵەتی بەرگری شەرعی و بەرهەڵستی ناکات لەگەڵ کاری پێغەمبەران لە پێڕاگەیاندن، بەڵام موحاسەبەی بەندەکان تەنها خودایە لە دونیا و دوارۆژدا، ئیتر بەرهەڵستکاری و دژیەکی لە کوێی دوو ئایەتەکەدایە؟

---

(١) نواسخ القرآن: ص١٨٣.

(٢) سورة الرعد/٤٠.

(٣) الناسخ والمنسوخ في القرآن: ص٤٢.

(٤) الناسخ والمنسوخ

(٥) ابن الجوزي نواسخ القرآن: ص١٨٣.

(٦) ناسخ القرآن العزيز ومنسوخه لابن البارزي (عبد الله بن عبد الرحيم) المتوفى ٧٣٨ هـ: ص١٩٢.

## نەسخی بانگەشەبۆکراو لە سورەتی "الحجر"

پێیانوایە[1] ئـەم پێـنج ئایەتـە[2] (٢، ٨٦، ٨٨، ٨٩، ٩٤) بـە ئایـەتی شمشـێر نەسخکراوەتەوە. بۆچوونەکەیان پووچ و بێبنەمایە، لەبـەر نـەبوونی بەرهەڵسـتکاری، گەر وادابنێین بەرهەڵستکاری بوونی هەبێت، ئەوا بە تایبەتکردنی ئەو پێنج ئایەتە بـە ئایەتی شمشێر هەڵدەگیرێت.

---

[1] لە سەرخەرانی نەسخی ئەم بانگەشەیە: ابن حزم: ص٤٢، وابن سـلامة: ص١٣٧، ابـن الجوزي: ص١٨٤-١٨٥، وابن البارزي: ص١٩٣.

[2] لە سەرخەرانی نەسخ نەبوونەوە: الرازي: ٢٠٦/١٩، الآلوسي: ٧٧/١٤.

# نەسخی بانگەشەبۆکراو لە سورەتی "النحل"دا

– ئایەتی(٦٧):﴿وَمِنْ ثَمَرَاتِ النَّخِيلِ وَالأَعْنَابِ تَتَّخِذُونَ مِنْهُ سَكَرًا وَرِزْقًا حَسَنًا﴾[١] پێیانوایە[٢] نەسخکراوەتەوە بە ئایەتی:﴿إِنَّمَا الْخَمْرُ وَالْمَيْسِرُ وَالأَنصَابُ وَالأَزْلاَمُ رِجْسٌ مِنْ عَمَلِ الشَّيْطَانِ﴾[٣]

پێشتر بەرپەرچی ئەم بۆچوونەمان داوەتەوە و ڕۆشنمان کردەوە ئەوە تێکەڵییەکە لە نێوان نەسخ و پلە بە پلەییدا(التدرج)[٤] شایانی باسە لە دەروازەی "الطباق"ە لە زانستی رەوانێژیدا، کاتێك ڕۆزی باش و چاك(الرزق الحسن)ی لەگەڵ ڕۆزی خراپ و ناباش(الرزق القبيح)دا کۆکردۆتەوە[٥].

هەروەها پێیانوایە[٦] ئەو پێنج ئایەتە(٨٢ و١٠٦ و١٢٥ و١٢٨)ی سورەتەکە بە ئایەتی شمشێر نەسخکراوەتەوە. بۆچوونەکە پووچ و بێبنەمایە لەبەر نەبوونی بەرهەڵستکاری، گەر وادابنێین بوونی هەبێت ئەوا بە تایبەتکردن هەڵدەگیرێت، بۆیە وتنی نەسخ تێکەڵییە لە نێوان نەسخ و تایبەتکردندا.

---

[١] سورة النحل/٦٧.

[٢] لە سەرخەرانی ئەم بۆچوونە: ابن حزم: ٤٣، ابن سلامة: ١٣٨، وقال النحاس: ص١٨٠، والقول في انها منسوخة يروى عن سعيد بن جبير ومجاهد والشعبي وابراهيم ويرد هذا بانهم ارادوا بالنسخ معناه العام الشامل للتدرج وغيره.

[٣] سورة المائدة/٩٠.

[٤] سەرخەرانی نەسخ نەبوونەوە: الرازي: ٦٨/٢٠، والآلوسي: ١٨٠/١٤.

[٥] سەرخەرانی نەسخ نەبوونەوە: الرازي: ١٤١/٢٠، والآلوسي: ٢٥٦/١٤.

[٦] المراجع السابقة.

# نەسخی بانگەشەبۆکراو لە سورەتی "الإسراء"دا

﴿وَقَضَى رَبُّكَ أَلاَّ تَعْبُدُوا إِلاَّ إِيَّاهُ وَبِالْوَالِدَيْنِ إِحْسَانًا إِمَّا يَبْلُغَنَّ عِنْدَكَ الْكِبَرَ أَحَدُهُمَا أَوْ كِلاَهُمَا فَلاَ تَقُلْ لَهُمَا أُف وَلاَ تَنْهَرْهُمَا وَقُلْ لَهُمَا قَوْلاً كَرِيمًا وَاخْفِضْ لَهُمَا جَنَاحَ الذُّلِّ مِنْ الرَّحْمَةِ وَقُلْ رَبِّ ارْحَمْهُمَا كَمَا رَبَّيَانِي صَغِيرًا﴾ (٢٣-٢٤)

﴿رَبُّكُمْ أَعْلَمُ بِمَا فِي نُفُوسِكُمْ إِنْ تَكُونُوا صَالِحِينَ فَإِنَّهُ كَانَ لِلْأَوَّابِينَ غَفُورًا﴾ (٢٥)

﴿رَبُّكُمْ أَعْلَمُ بِكُمْ إِنْ يَشَأْ يَرْحَمْكُمْ أَوْ إِنْ يَشَأْ يُعَذِّبْكُمْ وَمَا أَرْسَلْنَاكَ عَلَيْهِمْ وَكِيلاً﴾ (٥٤)

﴿قُلْ ادْعُوا اللَّهَ أَوْ ادْعُوا الرَّحْمَانَ أَيًّا مَا تَدْعُوا فَلَهُ الأَسْمَاءُ الْحُسْنَى وَلاَ تَجْهَرْ بِصَلاَتِكَ وَلاَ تُخَافِتْ بِهَا وَابْتَغِ بَيْنَ ذَلِكَ سَبِيلاً﴾ (١١٠)

-دوو ئایەتی(٢٣-٢٤)[1] ﴿وَقَضَى[2] رَبُّكَ أَلاَّ تَعْبُدُوا إِلاَّ إِيَّاهُ[3] وَبِالْوَالِدَيْنِ إِحْسَانًا[4] إِمَّا يَبْلُغَنَّ عِنْدَكَ الْكِبَرَ[5] أَحَدُهُمَا أَوْ كِلاَهُمَا فَلاَ تَقُلْ لَهُمَا أُفٍّ[6] وَلاَ تَنْهَرْهُمَا[7] وَقُلْ لَهُمَا قَوْلاً كَرِيمًا[8] وَاخْفِضْ لَهُمَا جَنَاحَ الذُّلِّ[9] مِنَ الرَّحْمَةِ وَقُلْ رَبِّ ارْحَمْهُمَا[10] كَمَا رَبَّيَانِي صَغِيرًا﴾[11]

"ابن حزم الاندلسي" دەڵێت: هەندێ لە حوکمی دوو ئایەتەکە نەسخکراوەتەوە و هەندێکیشی لەسەر ئاشکرای خۆی ماوەتەوە، حوکمەکە لە حوکمی ئەهلی

[1] لە سەرخەرانی نەسخ نەبوونەوە: الرازي: ٢٠/١٨٤، والآلوسي: ١٥/٥٣.

[2] واتە خودا فەرمانی پێکردووی بە فەرمانێکی یەکلاکەرەوەی پابەندکەر بەجۆرێك بکەری فەرمانپێکراوەکە پاداشت پێ وەردەگرێت و وازلێهێنەریشی سزا دەدرێت.

[3] واتە بیپەرستن و کەسێکی تر مەپەرستن.

[4] واتە بڕیاری چاکەی داوە لەگەڵ دایك و باوك، یان وەسێتی کردووە چاکە لەگەڵ دایك و باوك بکەن، هەردوو یەك مانان.

[5] گەر لەلات مانەوە و ژیان ئەی کوڕ و ئەی کچ و پیربوون یان یەکێکیان ژیاو پیر بوو تا گەیشتە تەمەنێك وەك منداڵێك ئاتاج بوو بە یەکێك کۆمەکی بکات و یارمەتی بدات.

[6] ئەوەش بریتییە لە کەمترین خراپە، مەبەست ئەوەیە بە کەم و زۆر ئازاریان مەدە، وشەی "ئۆف" ئاماژە بە بێزاری و وەڕسی دەکات.

[7] واتە وەڕس و بێزاریان مەکە بە شێوازی خراپ و هاوارکردن.

[8] واتە بە قسەی نەرم و نیان و باش و جوان قسەیان لەگەڵ بکە، دوور لە قسەی ناباش و ڕەق و بێتام.

[9] واتە لە تەوازوع و شۆڕبوونەوە بۆیان زیادەڕەوی بکە بە کردار و بە گوفتار، ئەوەش وەك چاکە و بەزەیی لەگەڵیان، مەبەست بە "الذل" واتە نەرمی و تەوازوع بەبێ زەلیلی و ڕسوایی، لەوەوە هاتووە کە باڵندە باڵی شۆڕدەکاتەوە کاتێك بێچووەکانی دەخاتە ژێر باڵی، خودا دەفەرموێت تۆش باوك و دایکت بەو شێوەیە بخە ژێر باڵەکانت وەك چۆن ئەوان بە منداڵی تۆیان دەخستە ژێر باڵی بەزەییان.

[10] واتە داوای لێخۆشبوون و بەزەییان بۆ بکە لە ژیانیاندا و لەدوای مردنیان وەك پاداشتێك بۆ پەروەردەی ئەوان. ینظر الگبرسی: ٦/٤٠٩.

[11] سورة الاسراء/٢٣، ٢٤.

یەکتاپەرستیدا موحکەمە و لە حوکمی ئەهلی هاوەڵدانانـدا نەسـخکراوەتەوە بـە ئایەتی:﴿مَا كَانَ لِلنَّبِيِّ وَالَّذِينَ آمَنُوا أَنْ يَسْتَغْفِرُوا لِلْمُشْرِكِينَ﴾.

"النحاس"[1] دەڵێت لەم ئایەتەدا سێ قسە هەیە، هەیانە دەڵێت:﴿وَقُلْ رَبِّ ارْحَمْهُمَا كَمَا رَبَّيَانِي صَغِيرًا﴾ نەسخکراوەتەوە، چونکە ئەمە پوختەیە، و دروست نییە بۆ کەسێك دایك و باوکی هاوەڵدانەر بن داوای بەزەییان لە خودا بۆ بکات، هەیانە دەڵێت: دروستە ئەمە کاتێك دایك و باوك زیندووبن، بەڵام گەر مردبن دروست نییە، هەیانە دەڵێت دروست نییە داوای بەزەیی لە خودا بۆ هیچ بێباوەڕێك بکرێت و داوای لێخۆشبوونیان لە خودا بۆ بکرێت زیندوو بێت یان مردوو، ئایەتەکە موحکەمە و بێباوەڕی لێ هەڵوارده کراوە.

"قتادة"[2] دەڵێت نەسخکراوەتەوە.

"ابن سلامە"[3] هەمان قسەی "ابن حزم الاندلسی" دووبارە دەکاتەوە.

"ابن الجوزي"[4] ئەوە لە دەروازەی تایبەتکردنە نەك نەسخ.

"ابن البارزي"[5] بۆچوونی نەسخی هەیە.

وتنی نەسخی ئەو ئایەتە هەڵەیە گەر مەبەست پێی مانای گشتی نەسخ نەبێت، بەم بەڵگانە:

١.نەبوونی بەرهەڵستی لە نێوان نەسخکەر و نەسخکراودا وەك چۆن کۆتایی ئایەتی نەسخکەر(١٣)ی سوورەتی "التوبة" ئاماژەی پێدەکات، خودا-سبحانە- دەفەرموێت: (مَا كَانَ لِلنَّبِيِّ وَالَّذِينَ آمَنُواْ أَن يَسْتَغْفِرُواْ لِلْمُشْرِكِينَ وَلَوْ كَانُواْ أُوْلِي قُرْبَى مِن بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُمْ أَصْحَابُ الْجَحِيمِ)

---

[1] الناسخ والمنسوخ: ص١٨٠.

[2] الناسخ والمنسوخ المورد: ٤٩٦.

[3] ص١٤٠.

[4] نواسخ القرآن: ص١٩١ تیایدا هاتوو: (دەڵێم: ئەمە نەسخ نییە لەلای فەقیهان، بەڵکو گشتییە و تایبەتکراوە، هاوشێوەی ئەوەی من دەیڵێم "ابن جرير الطبري" وتویانە)

[5] ناسخ القرآن العزيز ومنسوخه تحقيق الدكتور حاتم صالح الضامن: ص١٩٥.

٢.ئەوەی ڕۆشنە ئەوەیە بۆ هیچ کەس دەرناکەوێت فلان کەس ئەهلی ئاگرە مەگەر لە دوای مردنی لەسەر هاوەڵدانان و گومڕایی، بۆیە نەهی لە داوای لێخۆشبوون ڕەها نییە، بەڵکو سنووردارە بەو کۆتوبەندەی لە کۆتایی ئایەتەکەدا هاتووە، بۆیە بەرهەڵستی بوونی نییە لە نێوان دوو ئایەتەکە و ئەوەی پێیانوایە نەسخی دوو ئایەتەکەی کردۆتەوە.

٣.فەرمانە هاتووەکانی ناو دوو ئایەتەکە(٢٣ ، ٢٤) تایبەت بە مامەڵەی منداڵەکان لەگەڵ باوانیان هەر هەموو تایبەتە بە باری لەژیاندابوون، بۆیە دوعاکردن بۆیان بە هیدایەتدانیان پێویستە، نەك تەنها لەسەر منداڵەکان بەڵکو لەسەر هەموو مرۆڤێك پێویستە بە گوفتار و کردار داوای لێخۆشبوون و هیدایەت بۆ ئەوانە بکات پێیوایە لەسەر گومڕایین لە ژیانیاندا.

٤.گەر وادابنێین بەرهەڵستی بوونی هەیە ئەوا بە تایبەتکردنی گشتی هەڵدەگیرێت، چونکە ئایەتە نەسخکەرەکە تایبەتە بە باری بێهیوابوون لە سوودی دوعاکردن، وەك دوعاکردن بۆ ئەوانەی لەسەر گومڕایی مردوون بۆ دایك و باوك و کەسانی تریش، ئایەتەکە: ﴿وَقُلْ رَبِّ ارْحَمْهُمَا كَمَا رَبَّيَانِي صَغِيرًا﴾ گشتییە و پێش مردن و دوای مردن دەگرێتەوە، هەڵبەت پێش بێهیوابوون و دوای بێهیوابوون، بۆیە بە ئایەتی(١١٣) تایبەتکرا.

"ابن حزم الاندلسی"[١] دەڵێت: ئایەتی دووەم لە ئایەتە نەسخکراوەکانی سورەتی "الإسراء"یە:﴿رَّبُّكُمْ أَعْلَمُ بِكُمْ..﴾ تا ﴿وَمَا أَرْسَلْنَاكَ عَلَيْهِمْ وَكِيلاً﴾ دوو ئایەتی:(٢٥، ٥٤) بە ئایەتی شمشێر نەسخکراونەتەوە[٢].

---

[١] ص٤٤.

[٢] وفي طبعة دار الكتب بيروت (لە "٢٥"ەوە تا "٥٤"ی سورەتی "الإسراء" نەسخ کراونەتەوە بە ئایەتی شمشێر، ئەمەش هەڵەیەکی گەورەیە جا یان لە چاپەوە یان لە گوازەرەوەکەیەوە، دروست ئەوەیە ئایەتی(٢٥ و ٥٤) نەسخکرابنەوە بە ئایەتی شمشێر.

-ئایەتی (٢٥):﴿رَبُّكُمْ أَعْلَمُ بِمَا فِي نُفُوسِكُمْ إِنْ تَكُونُوا صَالِحِينَ فَإِنَّهُ كَانَ لِلْأَوَّابِينَ غَفُورًا﴾[1]

ئایەتی(٥٤):﴿رَبُّكُمْ أَعْلَمُ بِكُمْ إِنْ يَشَأْ يَرْحَمْكُمْ أَوْ إِنْ يَشَأْ يُعَذِّبْكُمْ وَمَا أَرْسَلْنَاكَ عَلَيْهِمْ وَكِيلًا﴾[2]

"ابن سلامه"[3] وابن البارزی"[4] لەسەر ئایەتی دووەم هاوڕان.

"ابن الجوزی"[5] دەڵێت: ئایەتی:﴿وَمَا أَرْسَلْنَاكَ عَلَيْهِمْ وَكِيلًا﴾ ئەهلی تەفسیر بۆ مانای "الوکیل" سێ قسەیان هەیە[6]:

یەکەم: مانای کەفیلی هەیە، "ابن عباس" ئەمەی وتووە.

دووەم:"حافظا و رقیبا-پارێزەر و چاودێر"، "الفراء" ئەمەی وتووە.

سێیەم: کەفیلی هیدایەتیان و توانا بۆ چاککردنی دڵ و دەروونیان، "ابن الأنباري" باسی کردووە.

لەسەر ئەمە ئایەتەکە موحکەمە هەندێکیشیان پێیانوایە نەسخکراوەتەوە بە ئایەتی شمشێر، بەڵام دروست نییە، پێشتر لە هاوشێوەکانی ئەمە قسەمان کرد[7] "ابو جعفر النحاس"[8] باسی نەسخی ئەم ئایەتەی نەکردووە.

دروست نەسخ نەبوونەوەی ئایەتەکەیە لەبەر نەبوونی بەرهەڵستی، گەر وادابنێین بەرهەڵستی هەبێت ئەوا ئایەتی شمشێر تایبەتکەرە بۆی نەك نەسخکەرەوە، وەك چەندین جار لەو ئایەتانەدا پێیانوایە نەسخکراونەتەوە بە ئایەتی شمشێر باسمان کردووە.

---

[1] سورة الاسراء/٢٥.
[2] سورة الاسراء/٥٤.
[3] ص١٤١.
[4] ص ١٩٥.
[5] ص ١٩١.
[6] سەرخەرانی نەسخ نەبوونەوە: الرازي: ١٨٦/٢٠، الآلوسي: ٥٦/١٥.
[7] نواسخ القرآن: ص ١٩١.
[8] ص ١٨١.

–ئایەتی(١١٠):﴿قُلْ ادْعُوا اللَّهَ أَوْ ادْعُوا الرَّحْمَانَ أَيًّا مَا تَدْعُوا فَلَهُ الأَسْمَاءُ الْحُسْنَى وَلاَ تَجْهَرْ بِصَلاَتِكَ وَلاَ تُخَافِتْ بِهَا وَابْتَغِ بَيْنَ ذَلِكَ سَبِيلاً﴾[1][2]

"ابن حزم الاندلسی"[3] دەڵێت: نەسخکراوەتەوە بەم ئایەتەی لە سورەتی "الأعراف"دایە:﴿وَاذْكُرْ رَبَّكَ فِي نَفْسِكَ[4] تَضَرُّعًا[5] وَخِيفَةً[6] وَدُونَ الْجَهْرِ[7] مِنْ الْقَوْلِ بِالْغُدُوِّ وَالآصَالِ[8] وَلاَ تَكُنْ مِنْ الْغَافِلِينَ﴾[9].

کەسانی تر لە بانگەکرانی نەسخ شوێنی "الاندلسي" کەوتوون[10].

دروست ئەوەیە نەسخ نەبووەتەوە بەهۆی نەبوونی بەرهەڵستکارییەوە، یەکسانە مەبەست بە "الصلاة" مانا شەرعییەکەی بێت، یان مانا زمانەوانییەکەی(دوعا).

هەردوو ئایەتەکە(نەسخکەر و نەسخکراو) فەرمان بە میانەڕەویی دەکەن لە بەرزکردنەوەی دەنگدا، بۆیە هیچ بەرهەڵستکارییەك بوونی نییە تا بە نەسخ هەڵبگیرێت، هەریەکەیان ئەوەی بە مەبەستگیراوە لەویتریاندا شرۆڤە دەکات.

---

[1] سورة الاسراء/١١٠، نەسخی بانگەشەبۆکراو هاتووە بەسەر ئایەتی: {وَلاَ تَجْهَرْ بِصَلاَتِكَ وَلاَ تُخَافِتْ بِهَا وَابْتَغِ بَيْنَ ذَلِكَ سَبِيلاً} لە تەفسیرەکەیدا چوار قسە هەیە وەك "الطبري": ٤٤٦/٦ گواستوویەتەوە، دانی پیادا بنێ و خوێندنەوەیەکی مامناوەند بخوێنە و دەنگ بەرز مەکەرەوە وا بکات کەسانی نزیك بە تۆ لە نوێژکەران سەرقاڵ بکەیت، ئەوەندەش نزمی مەکەرەوە بەجۆرێك خۆت دەنگی خۆت نەبیستی، رێگەیەك لە نێوان دەنگ بەرزکردنەوە و بێدەنگبووندا بگرە بەر.

[2] سەرخەرانی نەسخ نەبوونەوە: الرازي: ٧١/٢١، الألوسي: ١٩٥/١٥.

[3] الناسخ والمنسوخ.

[4] واتە بەهێنی

[5] واتە بە گەردنکەچییەوە.

[6] واتە وەك ترسان لێی.

[7] واتە لەسەرو شاردنەوە و لەخوار بەرزکردنەوەی دەنگ، وەك میانەگیری نێوانیان.

[8] واتە سەرەتای رۆژ و کۆتاییەکەی.

[9] سورة الاعراف/٢٠٥.

[10] ابن سلامة: ١٤١، ابن البارزي: ١٩٥، والضحاك ينظر ابن الجوزي: ص١٩٢.

# نەسخی بانگەشەبۆکراو لە سورەتی "الکهف"دا

-ئایەتی(٢٩):﴿وَقُلْ الْحَقُّ مِنْ رَبِّكُمْ فَمَنْ شَاءَ فَلْيُؤْمِنْ وَمَنْ شَاءَ فَلْيَكْفُرْ إِنَّا أَعْتَدْنَا لِلظَّالِمِينَ نَارًا أَحَاطَ بِهِمْ سُرَادِقُهَا﴾[١]

بانگکەرانی نەسخ[٢] پێیانوایە ئەو ئایەتە نەسخکراوەتەوە بەم ئایەتە:﴿وَمَا تَشَاءُونَ إِلاَّ أَنْ يَشَاءَ اللَّهُ رَبُّ الْعَالَمِينَ﴾[٣].

**بانگەشەی نەسخ بێبنەمایە بەم بەڵگانە:**

**١.نەبوونی بەرهەڵستکاری لە نێوان دوو ئایەتەکەدا، چونکە یەکەمیان ئاماژە بەوە دەدات مرۆڤ خاوەنی هەڵبژاردنە لە دەستبردن بۆ هۆکارەکانی گومڕایی و هۆکارەکانی**

---

[١] سورة الکهف/٢٩، "سرادقها"واتە ئەوەی دەورەی دەدات "السرادق" دیوارێکە لە ئاگر کە ئابلۆقەیان دەدات، مەبەست لە ئایەتەکە ئەوەیە بەڵگە دەرکەوتووە و حەق رۆشن بووەتەوە لەلایەن خوداوە و تەمومژ و لێڵییەکان رەواونەتەوە {فمن شاء فليؤمن ومن شاء فليكفر} ئەمە هەڕەشە و ترساندنە لەلایەن خوداوە، بۆیە بەدوایدا فەرمووی: {انا اعتدنا للظالمين نارا}.

[٢] ابن حزم الاندلسي: ٤٤، ابن سلامة: ١٤١، ابن البارزي: ١٩٥.

[٣] سورة التكوير/٢٩.

هیدایـەت، و دروسـتبوونی سـەرئەنجام لـەلای خـوداوە وەك چـۆن ئەمـە مەزهـەبی ئەشعەرییەکانە، ئایەتی دووەم ئاماژە بەوە دەدات گەر ویستی مرۆڤ بەرهەڵستی کـرد لەگـەڵ ویسـتی خـودا ئـەوا دووەمیـان دژ بـە دەسـتەبەربوونی سـەرئەنجامەکە دەوەستێتەوە، چونکە توانا و دەسـەڵاتی خـودا لـە هـەموو شـتێکدا لەسەرو توانـا و دەسەڵاتی مرۆڤەوەیە، هەروەها لەبەر ئەوەی سەرئەنجامی هۆکارەکان دروسـتکراوی خودان، و هۆیەکان لە مرۆڤـەوەن، دەسـتبردن بـۆ هۆیـەکان مانـای دەسـتەبەربوونی سەرئەنجام ناگەیەنێت گەر خودا ئـەو کـارەی نـەوێت، ئەمـە ئەوەیـە کـە هـەر کـەس کەمترین ئاستی زانستی هەبێت بە کاروبارەکانی ئایین رەدی ناکاتەوە.

٢.ئایـەتی یەکـەم هەڕەشـە و ترسـاندنە، لـە مەرجـەکانی نەسـخیش قابیلییـەتی حوکمەکەیە بۆ سڕانەوە، هەڕەشە ئەوە قبووڵ ناکات، ئـەگینا بـەڵێن شـکێنی لـەلای خوداوە-سبحانە وتعـالی- پێویست دەبوو، پێویست پووچ و بێبنەمایە هەر بەو جۆرە پێویستکراو[1].

---

[1] لە سەرخەرانی نەسخ نەوونەوە: الکیاالهراسي: ٢/٢٧٠.

# نەسخی بانگەشەبۆکراو لە سورەتی "مریم"دا

﴿وَأَنـذِرْهُمْ يَـوْمَ الْحَسْـرَةِ إِذْ قُضِـيَ الأَمْـرُ وَهُـمْ فِـي غَفْلَـةٍ وَهُـمْ لاَ يُؤْمِنُونَ﴾ (٣٩)

﴿فَخَلَفَ مِنْ بَعْدِهِمْ خَلْفٌ أَضَاعُوا الصَّلاَةَ وَاتَّبَعُوا الشَّهَوَاتِ فَسَـوْفَ يَلْقَوْنَ غَيًّا﴾ (٥٩)

﴿وَإِنْ مِنْكُمْ إِلاَّ وَارِدُهَا﴾ (٧١)

﴿قُلْ مَنْ كَانَ فِي الضَّلاَلَةِ فَلْيَمْـدُدْ لَـهُ الرَّحْمَـانُ مَـدًّا حَتَّـى إِذَا رَأَوْا مَايُوعَدُونَ إِمَّا الْعَذَابَ وَإِمَّـا السَّـاعَةَ فَسَـيَعْلَمُونَ مَـنْ هُـوَ شَـرٌّ مَكَانًـا وَأَضْعَفُ جُندًا﴾ (٧٥)

﴿فَلاَ تَعْجَلْ عَلَيْهِمْ إِنَّمَا نَعُدُّ لَهُمْ عَدًّا﴾ (٨٤)

**- ئایەتی(٣٩):﴿وَأَنذِرْهُمْ يَوْمَ الْحَسْرَةِ إِذْ قُضِـيَ الأَمْـرُ وَهُـمْ فِـي غَفْلَـةٍ وَهُـمْ لاَ يُؤْمِنُونَ﴾[١]**

**بەوەی"ابن الجـوزي"[٢] دەیڵێـت لـە بەرچەرچـدانەوەی ئـەو بۆچـوونە پووچـەدا دەوەستم کە دەڵێت:(هەندێ لە بێئاگایـانی ئـەهلی تەفسـیر پێیانوایـە "الإنـذار" لـە ئایەتەکـەدا بـە ئایـەتی شمشـێر سـڕاوەتەوە، ئەمـە یاریکردنـە لەلایـەن ئەوانـەوە بـە**

[١] سورة مريم: ٣٩.

[٢] نواسخ القرآن: ص١٩٣.

قورئان، له کوێدا دژیەکی له نێوان هەڕەشه و ترساندنیان به قورئان لەگەڵ کوشتنیان بوونی هەیە؟!) واته گەر پێویستی کرد بکوژرێن.

-ئایەتی(٥٩):﴿فَخَلَفَ مِنْ بَعْدِهِمْ خَلْفٌ أَضَاعُوا الصَّلَاةَ وَاتَّبَعُوا الشَّهَوَاتِ فَسَوْفَ يَلْقَوْنَ غَيًّا﴾[١]

پێیانوایه[٢] ئەم ئایەته نەسخکراوەتەوه بەو هەڵاوردن(الإستثناء)ه هاتووەی له ئایەتی(٦٠)ی دوای ئەو ئایەتەدا هاتووه، ئەوەش:﴿إِلاَّ مَنْ تَابَ وَآمَنَ وَعَمِلَ صَالِحًا فَأُوْلَئِكَ يَدْخُلُونَ الْجَنَّةَ وَلاَ يُظْلَمُونَ شَيْئًا﴾[٣]

بانگەشەی نەسخ پووچ و بێبنەمایه بەو هۆیەی چەندین جار باسمان کردووه، ئەوەش ئەوەیه هەڵاوردن نەسخ نییه.

"ابن الجوزي"[٤]: (هەندێ نەزان پێیانوایه ئایەتەکه بەو هەڵاوردنەی بەدوایدا هاتووه نەسخکراوەتەوه، ڕۆشنمان کردەوه هەڵاوردن نەسخ نییه).

ئایەتی(٧١) ﴿وَإِنْ مِنْكُمْ إِلاَّ وَارِدُهَا﴾[٥]

واته چوونه ناو دۆزەخ، بانگکەرانی نەسخ پێیانوایه[٦] نەسخکراوەتەوه بەو ئایەتەی بەدوایدا هاتووه ڕاستەوخۆ، ئەوەش ئەم ئایەتەیه:﴿ثُمَّ نُنَجِّي الَّذِينَ اتَّقَواْ وَنَذَرُ الظَّالِمِينَ فِيهَا جِثِيًّا﴾[٧].

بەوەندەی "ابن الجوزي" ڕەدی داواتەوه دەربارەی بانگەشەی نەسخی بێبنەما

---

[١] سورة مريم/٥٩.
[٢] المراجع السابقة.
[٣] سورة مريم/٦٠.
[٤] نواسخ القرآن: ص١٩٣.
[٥] سورة مريم/٧١.
[٦] المراجع السابقة.
[٧] سورة مريم/٧٢.

دەوەستین کە دەڵێت:

(ئەو نەزانە پێیوایە ئایەتەکە نەسخکراوەتەوە بە ئایەتی:﴿ثُمَّ نُنَجِّي الَّذِينَ اتَّقَواْ﴾ ئەمە لە خراپترین بوێرییە -بە نەزانانە- دەربارەی کەلامی خودا لە کتێبەکەیدا.

ئایا لە نێوان دوو ئایەتەکەدا دژیەکی بوونی هەیە، یەکەمیان ئەوە جێگیر دەکات کە هەموو کەسێك دەچێتە ناویەوە، دووەمیش ئەوە جێگیر دەکات ئەوانەی ئەهلی تەقوان رزگاریان دەکات، پاشان ئەو دوو ئایەتە هەواڵن، هەواڵیش نەسخ ناکرێتەوە)[1].

-ئایەتی:(٧٥):﴿قُلْ مَنْ كَانَ فِي الضَّلاَلَةِ فَلْيَمْدُدْ[2] لَهُ الرَّحْمَانُ مَدًّا حَتَّى إِذَا رَأَوْاْ مَايُوعَدُونَ إِمَّا الْعَذَابَ[3] وَإِمَّا السَّاعَةَ[4] فَسَيَعْلَمُونَ مَنْ هُوَ شَرٌّ مَكَانًا وَأَضْعَفُ جُندًا﴾[5]

پێیانوایە[6] ئایەتەکە نەسخکراوەتەوە بە ئایەتی شمشێر.

"ابن الجوزي" دەڵێت: (ئەو کەسە نەزانە بانگەشەی ئەوە دەکات[7] ئایەتەکە نەسخکراوەتەوە بە ئایەتی شمشێر، ئەمەش پووچ و بێبنەمایە، "الزجاج" دەڵێت ئەم ئایەتە گوزارەکەی فەرمانە و ماناکەی هەواڵە، ماناکەشی ئەوەیە خودا لە تۆڵەی گومراییەکەیدا لە دۆزەخدا بەجێیدەهێڵێت، لەسەر ئەمە هیچ روویەك بۆ نەسخ بوونی نییە)[8].

---

[1] نواسخ القرآن لابن الجوزي: ص١٩٣.

[2] ئەمرەکە بە مانای هەواڵ دێت، واتە "الرحمن" لە دونیادا پەتی بۆ شل دەدات و پێیدەدات.

[3] سزای دونیایی.

[4] سزای دواڕۆژ.

[5] سورە مریم/٧٥.

[6] المراجع السابقە.

[7] ئاماژە بەوانەی دەڵێن ئایەتەکانی پێشووی ئەم سورەتە نەسخکراوەتەوە.

[8] فواتح القرآن لابن الجوزي: ص١٩٤.

گەر وا دابنێین بەرهەڵستی بوونی هەیە ئەوا بە تایبەتکردن هەڵدەگیرێت، بۆیە هیچ داواکارییەك بۆ نەسخ نییە.

—ئایەتی:(٨٤) ﴿فَلاَ تَعْجَلْ عَلَيْهِمْ[١] إِنَّمَا نَعُدُّ لَهُمْ[٢] عَدًّا﴾[٣]

بانگکەرانی نەسخ دەڵێن[٤] سەرەتای ئایەتەکە بە ئایەتی شمشێر نەسخکراوەتەوە.

"ابن الجوزي" لە بەرپەرچدانەوەی ئەم بانگەشەیەدا دەڵێت: (هەندێ لە ئەهلی تەفسیر پێیانوایە نەسخکراوەتەوە بە ئایەتی شمشێر، ئەمەش دروست نییە گەر ماناکە ئەوە بێت پەلە مەکە لە داوای سزادانیان کە لە دوارۆژدایە، ئەوا ماناکەی ئەوە دەگەیەنێت: تەمەنیان زوو کۆتایی پێ دێت، کەوابوو رووی نەسخ بوونی نییە، خۆ گەر ماناکەی ئەوە بێت پەلە مەکە لە داوای جەنگان لەگەڵیان ئەوا ئەم سورەتە لە مەکە دابەزیوە و لەو قۆناغەدا فەرمان بە جەنگان نەکراوە، نەهیکردنەکەی بە پەلەنەکردن لە جەنگان دژ بەوانە لە شوێنی خۆیدا روودەدات، پاشان لەدوای کۆچ فەرمانی پێکرا بە جەنگان لەگەڵیان ئەمە نەرێی داوای جەنگان لە مەکە ناکات، ئیتر چۆن نەسخ رووی لێ دەکات، پاکێتی بۆ ئەو خودایەی بوونی خەڵکانێکی بە جۆرێك ئەندازەگیری کردووە دەچنە ناو ئەو تەئویلە دوور و بێبنەمانەوە لە قورئان، بانگەشەی نەسخی شتێك دەکەن کە نەسخ نەکراوەتەوە، هەموو ئەمانەش لە نەبوونی وردەکارییە لە تێگەیشتن، پەنا دەگرین بە خودا لەوە)[٥].

---

[١] بە داوای سزا.

[٢] رۆژان و شەوان تا کاتی سزایان.

[٣] سورة مريم/٨٤.

[٤] المراجع السابقة.

[٥] نواسخ القرآن لابن الجوزي: ص١٩٤.

# نەسخی بانگەشەبۆکراو لە سورەتی "الانبیاء"

"ابن حزم الاندلسی"[1] دەڵێت: دوو ئایەتی تێدا نەسخکراوەتەوە:(٩٨، ٩٩) بە ئایەتی:﴿إِنَّ الَّذِينَ سَبَقَتْ لَهُمْ مِنَّا الْحُسْنَى﴾[2] الایە.

"ابن سلامة"[3] دەڵێت: سێ ئایەتی نەسخکراوی پەیوەست بەیەك لەخۆ دەگرێت، ئەمانەش سێ ئایەتی پەیوەست بەیەك نەسخی کردوونەتەوە، نەسخکراوەکان ئەمانەن:(٩٨، ٩٩، ١٠٠) نەسخکەرەکانیش ئەمانەن:(١٠١، ١٠٢، ١٠٣).

"ابن البارزي"[4] هاوڕایە لەگەڵ "ابن سلامة" لەوەی بۆیچووە[5] لە بانگەشەی نەسخی سێ ئایەتی بەدوای یەکتردا هاتوو.

﴿إِنَّكُمْ وَمَا تَعْبُدُونَ مِنْ دُونِ اللَّهِ حَصَبُ جَهَنَّمَ أَنْتُمْ لَهَا وَارِدُونَ﴾ (٩٨)

﴿لَوْ كَانَ هَؤُلَاءِ آلِهَةً مَا وَرَدُوهَا وَكُلٌّ فِيهَا خَالِدُونَ﴾ (٩٩)

﴿لَهُمْ فِيهَا زَفِيرٌ وَهُمْ فِيهَا لَا يَسْمَعُونَ﴾ (١٠٠)

---

(١) الناسخ والمنسوخ: ص٤٥.

(٢) سورة الانبیاء/١٠١.

(٣) الناسخ والمنسوخ: ص١٤٥.

(٤) المرجع السابق: ص١٩٧ ولم یرد بحث النسخ في سورة الانبیاء في نواسخ القرآن لابن الجوزي: ص١٩٥– ١٩٦. "النحاس"ئایەتێکی تر باس دەکات جگە لەم ئایەتانە، لەم نزیکانە ڕۆشنکردنەوەی ئەوە دێت.

(٥) لە سەرخەرانی نەسخ نەبوونەوە: الرازي:٢/ما بعد ص٢٢٠ والآلوسي: ١٧/ما بعد ص٩٠.

ئایەتی(٩٨) ﴿إِنَّكُمْ وَمَا تَعْبُدُونَ[1] مِنْ دُونِ اللَّهِ حَصَبُ[2] جَهَنَّمَ أَنْتُمْ لَهَا وَارِدُونَ[3]﴾

ئایەتی(٩٩) ﴿لَوْ كَانَ هَؤُلَاءِ[4] آلِهَةً[5] مَا وَرَدُوهَا وَكُلٌّ[6] فِيهَا خَالِدُونَ﴾

ئایەتی(١٠٠) ﴿لَهُمْ فِيهَا زَفِيرٌ وَهُمْ فِيهَا لَا يَسْمَعُونَ﴾

ئەم ئایەتانە نەسخکراونەتەوە بەپێی بۆچوونی ئەوان.

ئایاتە نەسخکراوەکانیش ئەم سێ ئایەتەیە:

ئایەتی(١٠١) ﴿إِنَّ الَّذِينَ سَبَقَتْ لَهُمْ مِنَّا الْحُسْنَى[7] أُولَئِكَ عَنْهَا مُبْعَدُونَ﴾.

ئایەتی(١٠٢) ﴿لَا يَسْمَعُونَ حَسِيسَهَا[8] وَهُمْ فِي مَا اشْتَهَتْ أَنْفُسُهُمْ[9] خَالِدُونَ﴾.

ئایەتی(١٠٣) ﴿لَا يَحْزُنُهُمُ الْفَزَعُ الْأَكْبَرُ وَتَتَلَقَّاهُمُ[10] الْمَلَائِكَةُ هَذَا يَوْمُكُمُ الَّذِي كُنْتُمْ تُوعَدُونَ﴾[11].

---

[1] لە بتەکان

[2] سووتەمەنی دۆزەخ.

[3] دەچنە ناو دۆزەخەوە.

[4] بت و وەسەن.

[5] وەك بانگەشەی بۆ دەکەن.

[6] لە بەندە و پەرستراو.

[7] پلە و پایە.

[8] دەنگی ئاگر و دۆزەخ.

[9] لە خۆشی و نیعمەت.

[10] فریشتەکان پێشوازیان لێدەکەن.

[11] لە دونیادا.

بانگەشەی نەسخ لەو سێ ئایەتە باسکراوەدا پووچ و بێبنەمایە بە چەندین هۆ، لەوانە:

١ .نەسخبوونەوەی سێ ئایەتی بەدوای یەکتردا هاتوو بە سێ ئایەتی بەدوای یەکتردا تەنها لە فەرهەنگی بێئاگایان لە قورئان و پلە و پایەی قورئان و سەرچاوەی قورئاندا بوونی هەیە.

٢.ئەم جۆرە کارانە ژێری تەندروست رەدیان دەکاتەوە لە پرۆژە یاسای دانراودا ئیتر چۆن دەبێت شتێك بدرێتە پاڵ خودا کە بۆ مرۆڤ ناتەواوییە؟

٣.نەبوونی هیچ جۆرە بەرهەڵستکاری و دژیەکییەك لە نێوان نەسخکەرەوەکان و نەسخکراوەکاندا، بەهۆی جیاوازی بابەت و ناوەرۆکەوە لە دوو کۆمەڵە ئایەتەکەدا، لە نەسخکراوەکاندا بابەت بریتییە لە ئەهلی هاوەڵدانان و بەندەی بتەکان و ناوەرۆکیش بریتییە لە سزا، بابەت لە کۆمەڵەی نەسخکەرەکاندا بریتییە لە باوەڕدارانی تەقواداری خودا پەرست ناوەرۆکەکەش بریتییە لە پاداشت.

٤.هەر ئایەتێك لە ئایەتە نەسخکراوەکان هەواڵ و هەڕەشەیە، ئەو دوانەش ناچنە ژێر نەسخەوە.

"ابو جعفر النحاس"[1] کە لە بانگەکەرانی نەسخە و یەکێکە لەوانەی زیادەڕەوی لە نەسخدا کردووە دەڵێت:"یموت" بۆی باسکردین لە "ابن عباس"ەوە: سورەتی "الکهف و مریم و طه و الأنبیاء" لە مەکە دابەزیون، لەم سورەتانەدا ئایەتێکمان نەبینیوە بیخەینە ناو بابەتی کتێبەکەمانەوە[2] جگە لە یەك ئایەت، خودا دەفەرموێت: ﴿وَدَاوُدَ وَسُلَيْمَانَ إِذْ يَحْكُمَانِ فِي الْحَرْثِ إِذْ نَفَشَتْ[3] فِيهِ غَنَمُ الْقَوْمِ وَكُنَّا

---

[1] الناسخ والمنسوخ في القرآن: ص١٨٤.

[2] اي كتاب الناسخ والمنسوخ.

[3] "انفش بفتح الفاء وسكونها" وشتر و مەڕ و ماڵات بە شەو بڵاوە بکەن و بەبێ شوان بلەوەڕێن.

لِحُكْمِهِمْ شَاهِدِينَ، فَفَهَّمْنَاهَا سُلَيْمَانَ وَكُلاً آتَيْنَا حُكْمًا وَعِلْمًا وَسَخَّرْنَا مَعَ دَاوُدَ الْجِبَالَ يُسَبِّحْنَ وَالطَّيْرَ وَكُنَّا فَاعِلِينَ﴾[1].

هەندێك لە كوفییەكان دەڵێن ئەم حوكمە نەسخكراوەتەوە، چونكە ئاژەڵان گەر كشتوكاڵێكیان خوارد لە شەودا یان لە ڕۆژدا خاوەنەكەی هیچی ناچێتە سەر، ئەوان پێیانوایە بە فەرموودەی پێغەمبەر(ﷺ) نەسخكراوەتەوە كە دەفەرموێت: ((ئاژەڵان دەستەبەر ناكرێن))[2].

داوود–علیە السلام– بڕیاریدا مەڕەكان بۆ خاوەن باخە ترێكە بن، چونكە بەهاكەیان لەیەكتر نزیك بوو، حوكمەكەی سولەیمان–علیە السلام– ئەوەبوو مەڕەكان بدرێت بە خاوەن باخەكە و سوود لە شیر و خوری و بەچكەكانیان ببینێت، باخەكەش بدرێت بە خاوەن مەڕەكان بۆ ئەوەی خزمەتی بكات تا وەك یەكەمجاری لێ دێتەوە، كاتێك وەك یەكەمجاری لێهاتەوە باخەكە رادەستی خاوەن باخەكە دەكاتەوە و ئەویش مەڕەكانی بۆ دەگێڕێتەوە.

بانگەشەی نەسخ پووچ و بێبنەمایە بە چەندین هۆ لەوانە:

١.ئەم دوو ئایەتە ناچنە ناو دەروازەی نەسخی قورئان بە قورئان، حوكمەكە لە شەریعەتی پێشوودایە، گەر بیشڵێین بووە بە بەشێك لە شەریعەتی ئێمە، قورئان بڕیاری لێداوە ئەوا بە فەرموودەی ئاحاد ناسخ نابێتەوە.

٢.دوو ئایەتەكە هەواڵن و هەواڵیش ناچێتە ژێر نەسخەوە.

---

[1] سورة الانبیاء/٧٨، ٧٩.

[2] رواه أحمد في مسنده:٢/٣١٩، وسنن الترمذي: ٣/٦٦١" بڕیاردراو لە شەریعەتی ئیسلامدا ئەوەیە كە "نە زیان و نە زیانگەیاندن" لە فیقهی ئیسلامیشدا خاوەن ئاژەڵ دەستەبەركەرە بۆ هەموو ئەوەی ئاژەڵەكانی تیای دەبەن گە لە دەستگرتن بەسەریاندا كەمتەرخەم بوو، بەڵام گەر هەوڵی چاودێری و ڕێگریدا لەوەی زیان بە خەڵكانی تر نەگەیەنن و سەرەڕای ئەوەش زیانیان لێوە پەیدا بوو ئەوا دەستەبەركردنی لەسەر نییە.

٣.لەوانەیە نەسخ لە نێوان حوکمەکەی سولەیمان و حوکمەکەی "داوود"دا-علیهما السلام- روویدا بێت لەسەر ئەو بنچینەی ئەوەی بۆ سەر سولەیمان دابەزیوە نەسخی ئەوەی کردۆتەوە بۆ سەر داوود دابەزیوە، لەلای ئەوانەی پێیانوایە پێغەمبەران بە ئیجتیهاد حوکم ناکەن[1].

٤.لە دیدی منەوە "النحاس" هەڵەی کردووە لە خستنە ناوی ئەم دوو ئایەتە بۆ ناو کتێبەکەی بەناوی "الناسخ والمنسوخ"ەوە، وەك چۆن ڕۆشنە چونکە، ناوی کتێبەکەی "الناسخ والمنسوخ في القرآن الكريم"ە.

[1] ينظر تفسير هذا الموضوع التفسير الكبير للرازي: ٢١/١٩٥-١٩٩، ومجمع البيان للطبرسي: ٧/٧٥.

# نەسخی بانگەشەبۆکراو لە سورەتی "الحج"دا

"ابن حزم الأندلسي"[1] دەڵێت: سورەتی "الحج" لە نهێنییە گەورەکانی قورئانە، چونکە ئایەتی مەکی و مەدەنی تێدایە، ئایەت لە سەفەردا و ئایەت لە باری نیشتەجێبووندا، ئایەت لە باری جەنگدا و ئایەت لە باری ئاشتیدا، ئایەت لە شەودا و ئایەت لە رۆژدا، ئایەتە مەکییەکان لە سەرەتای ئایەتی سییەوەن تا کۆتاییەکەی، مەدەنییەکان لە سەرەتای ئایەتی پازدەوە تا سەرەتای ئایەتی سی، باری شەو لە سەرەتای سورەتەکەوە تا سەرەتای ئایەتی پێنج، بەڕۆژ لە سەرەتای پێنجەوە بۆ سەرەتای دوازدە، باری نیشتەجێبوون لە دوازدەوە بۆ سەرەتای بیست، دانەپاڵی مەدینە نزیکبوونییەتی لە مەدینەوە، هەروەها نەسخکەر و نەسخکراوی تێدایە، لەوانە نەسخکرانەوەی دوو ئایەتی(٥٢ و ٥٦).

"ابن سلامة"[2]هەمان قسەی "ابن حزم" دووبارە دەکاتەوە و وەکو خۆی بەبێ دەستکاری گواستوویەتەوە، بەڵکو لە ئەوی دزیوە بەبێ ئەوەی ئاماژەی پێ بکات هەروەك نەریتی بەردەوامی خۆی لە هەموو ئەو شتانەی قسەی لەسەر دەکات، بەڵام دەڵێت سێ ئایەتی نەسخکراوی تێدایە، ئەو دوو ئایەتە ئاماژەبۆکراوە و ئایەتی(٦٨).

---

[1] الناسخ والمنسوخ ص٤٦.

[2] الناسخ والمنسوخ: ص١٤٧.

"ابن البارزي"[1] دەڵێت: نەسخکراوەکانی ناوی چوارن(٣٠ و ٤٩ و ٦٨ و ٧٨)
"النحاس"[2] دەڵێت نەسخکراوەکان(٢٨، ٣٩، و ٥١ و ٧٨)
"ابن الجوزي"[3]: دەڵێت: دوو ئایەتی نەسخکراوی تێدایە: (٦٨ و ٧٨).

﴿لِيَشْهَدُوا مَنَافِعَ لَهُمْ وَيَذْكُرُوا اسْمَ اللَّهِ فِي أَيَّامٍ مَعْلُومَاتٍ عَلَى مَا رَزَقَهُمْ مِنْ بَهِيمَةِ الأَنْعَامِ فَكُلُوا مِنْهَا وَأَطْعِمُوا الْبَائِسَ الْفَقِيرَ﴾ (٢٨)

﴿ذَلِكَ وَمَنْ يُعَظِّمْ حُرُمَاتِ اللَّهِ فَهُوَ خَيْرٌ لَهُ عِنْدَ رَبِّهِ وَأُحِلَّتْ لَكُمُ الأَنْعَامُ إِلاَّ مَا يُتْلَى عَلَيْكُمْ﴾ (٣٠)

﴿قُلْ يَاأَيُّهَا النَّاسُ إِنَّمَا أَنَا لَكُمْ نَذِيرٌ مُبِينٌ﴾ (٤٩)

﴿وَمَا أَرْسَلْنَا مِنْ قَبْلِكَ مِنْ رَسُولٍ وَلاَ نَبِيٍّ إِلاَّ إِذَا تَمَنَّى أَلْقَى الشَّيْطَانُ فِي أُمْنِيَّتِهِ فَيَنْسَخُ اللَّهُ مَا يُلْقِي الشَّيْطَانُ فَيَنْسَخُ اللَّهُ مَا يُلْقِي الشَّيْطَانُ ثُمَّ يُحْكِمُ اللَّهُ آيَاتِهِ وَاللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ﴾ (٥٢)

﴿الْمُلْكُ يَوْمَئِذٍ لِلَّهِ يَحْكُمُ بَيْنَهُمْ فَالَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ فِي جَنَّاتِ النَّعِيمِ﴾ (٥٦)

﴿وَإِنْ جَادَلُوكَ فَقُلْ اللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا تَعْمَلُونَ﴾ (٦٨)

﴿وَجَاهِدُوا فِي اللَّهِ حَقَّ جِهَادِهِ﴾ (٧٨)

---

[1] ناسخ القرآن العزيز ومنسوخه: ص١٩٧.
[2] الناسخ والمنسوخ: ص١٨٦ وما بعدها.
[3] نواسخ القرآن: ص١٩٦.

-ئایەتی(٢٨)﴿لِيَشْهَدُوا مَنَافِعَ[١] لَهُمْ وَيَذْكُرُوا اسْمَ اللَّهِ فِي أَيَّامٍ مَعْلُومَاتٍ[٢] عَلَى مَا رَزَقَهُمْ مِنْ بَهِيمَةِ[٣] الْأَنْعَامِ[٤] فَكُلُوا مِنْهَا[٥] وَأَطْعِمُوا الْبَائِسَ الْفَقِيرَ[٦]﴾

"ابو جعفر النحاس" لە وتنی نەسخبوونەوەی ئەم ئایەتەدا تەنها کەوتۆتەوە بەبێ ئەوەی ئایەتە نەسخکەرەکە باس بکات[٧] ئەمە یەکێك لە هەڵەکانییەتی لە وتنی نەسخی هەندێ ئایەتدا، ئایەتەکە موحکەمە هەتا ئاسمانەکان و زەوی بوونیان هەبێت، وەك ژێری تەندروست هەر لە سەرەتاوە بڕیار لەوە دەدات[٨].

-ئایەتی(٣٠)﴿ذَلِكَ وَمَنْ يُعَظِّمْ حُرُمَاتِ اللَّهِ فَهُوَ خَيْرٌ لَهُ عِنْدَ رَبِّهِ وَأُحِلَّتْ لَكُمُ الْأَنْعَامُ إِلَّا مَا يُتْلَى عَلَيْكُمْ﴾

واتە ئەوەی لە سورەتی "المائدة" بۆتان خوێنرایەوە لە مردارەوەبوو و خنکاو و لێدراو و هاوشێوەکانی ئەمانە.

ئەمەش هەڵەیەکی ڕۆشنە چونکە هەڵواردن(الإستثناء) تایبەتکردنە نەك نەسخ.

-ئایەتی(٤٩) ﴿قُلْ يَاأَيُّهَا النَّاسُ إِنَّمَا أَنَا لَكُمْ نَذِيرٌ مُبِينٌ﴾

پێیانوایە ئەم ئایەتە بە ئایەتی شمشێر نەسخکراوەتەوە.

---

[١] ئەوەش بریتییە لە بازرگانی لە دونیا و پاداشت لە دواڕۆژدا.

[٢] دە ڕۆژەکە.

[٣] لە "الابهام"ەوە هاتووە چونکە قسە ناکەن وەك مرۆڤ قسە دەکات.

[٤] "الانعام" بریتییە لە وشتر و مانگا و مەڕ و بزن.

[٥] ئەمرەکە بۆ "ندب" و موباحکردنە نەك واجب بوون.

[٦] ئەمرەکە بۆ واجبوونە، "البائس" ئەو کەسەیە ئەسەری هەژاری و نەداری لە برسێتی و بێپۆشاکی پێوە دیارە، یان ئەو کەسەی دەست لە خەڵکی پان دەکاتەوە.

[٧] ينظر الناسخ والمنسوخ: ص١٨٦ وما بعد.

[٨] سەرخەرانی نەسخ نەبوونەوە: الرازي: ٢٣/٢٩، الآلوسي: ١٧/١٤٥.

ئەمە بۆچوونێكی پووچە بەهۆی نەبوونی بەرهەڵستكارییەوە لە نێوان ئەوەی پێغەمبەر(ﷺ) ترسێنەر و مژدەدەر بێت لەگەڵ ئەوەی هێز لە باری بەرگری شەرعیدا بەكاریهێنێت، گەر وادابنێین بەرهەڵستی بوونی هەبێت ئەوا بە تایبەتكردنی گشتی ئایەتی یەكەم بە ئایەتی شمشێر هەڵدەگیرێت.

–ئایەتی(٥٢) ﴿وَمَا أَرْسَلْنَا مِنْ قَبْلِكَ مِنْ رَسُولٍ وَلاَ نَبِيٍّ إِلاَّ إِذَا تَمَنَّى أَلْقَى الشَّيْطَانُ فِي أُمْنِيَّتِهِ فَيَنْسَخُ اللَّهُ مَا يُلْقِي الشَّيْطَانُ فَيَنْسَخُ اللَّهُ مَا يُلْقِي الشَّيْطَانُ ثُمَّ يُحْكِمُ اللَّهُ آيَاتِهِ [1] وَاللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ﴾

"ابن حزم الاندلسی"[2]: دەڵێت ئایەتی(٥٢) نەسخكراوەتەوە بە ئایەتی(٦)ی سورەتی "الأعلی"﴿سَنُقْرِئُكَ فَلاَ تَنسَى﴾.

ابن سلامة[3] دەڵێت:(سورەتی "الحج" سێ ئایەتی نەسخكراوی تێدایە، ئایەتی یەكەم بریتییە لە:﴿وَمَا أَرْسَلْنَا مِنْ قَبْلِكَ مِنْ رَسُولٍ وَلاَ نَبِيٍّ﴾الآیة، ئەوەش لەبەرئەوەی پێغەمبەر(ﷺ) لە مەكە نوێژی بە هاوەڵانی كرد و سورەتی "النجم"ی تێدا خوێندووە تا خوێندنەوەكەی كۆتایی هاتووە بەم ئایەتە ﴿أَفَرَأَيْتُمُ اللاَّتَ وَالْعُزَّى، وَمَنَاةَ الثَّالِثَةَ الأُخْرَى، أَلَكُمُ الذَّكَرُ وَلَهُ الأُنْثَى﴾[4] ویستی بفەرموێ: ﴿تِلْكَ إِذًا قِسْمَةٌ ضِيزَى﴾[5] كەچی وتی(ﷺ): (تلك الغرانيق العلى وشفاعتهم ترتجى)، جبريل (ﷺ) هات و فەرمووی: بەم جۆرە دانەبەزیوە بۆ سەرت، بۆیە نەسخكرایەوە بە ئایەتی:﴿سَنُقْرِئُكَ فَلاَ تَنسَى﴾.

---

[1] لە سەرخەرانی نەسخ نەبوونەوە: الآلوسي: ١٧١/١٧، والرازي: ٤٧/٢٣.

[2] ص ٤٦.

[3] ص ١٤٧.

[4] الايات (١٩ و٢٠ و٢١).

[5] سورة النجم/٢٢.

بانگەشەی نەسخ پووچە و ئەو فەرموودە باسکراوە هەڵبەستراوە و دروست نییە، پووچبوونەوەی بانگەشەی نەسخیش بەهۆی نەبوونی بەرهەڵستکارییەوەیە لە نێوان دوو ئایەتەکەدا بە چەندین هۆ لەوانە:

١.بابەتی دوو ئایەتەکە جیاوازە وەك رۆشنە لەلای هەموو ژیرییەکی تەندروست.

٢.خودا فەرمانی بە نەسخ نەکردووە تا بە لەبیرنەچوون نەسخی کردبێتەوە.

٣.لەبیرچوون و لەبیرنەچوون لە غەریزەکانی مرۆڤن و لە حوکمە شەرعییەکان نین تا یەکێکیان بەوی تریان نەسخ ببێتەوە.

٤.ئەمە تێکەڵییە لە نێوان ئایەتی(١١٤)ی سورەتی "طه"﴿وَلاَ تَعْجَلْ بِالْقُرْآنِ مِنْ قَبْلِ أَنْ يُقْضَى إِلَيْكَ وَحْيُهُ وَقُلْ رَبِّ زِدْنِي عِلْمًا﴾ بانگەشەی نەسخی ئەم ئایەتە بە ئایەتی﴿سَنُقْرِئُكَ فَلاَ تَنسَى﴾ پووچ و بێبنەمایە، یەکەم خودا فەرمانی پێنەکردووە بە پەلەکردن و لەبیرچوون تا بە لەبیرنەچوون و پەلەنەکردن بیسڕێتەوە، چونکە هەریەك لە نەسخکەر و نەسخکراو لە غەریزەی مرۆڤە و لە حوکمە شەرعییەکان نین وەك باسمان کرد.

ئەوەی "ابن سلامە" دەیگوێزێتەوە لەوەی پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: (تلك الغرانق العلی وشفاعتهم ترتجی) ئەوە قسەیەکی هەڵبەستراوە و خزێنراوەتە ناو فەرموودەوە، سەرەڕای ئەوەی هەندێ لە ئەهلی تەفسیر دووبارەی دەکەنەوە بە شێوەی گواستنەوە و بەبێ هیچ پاڵپشتێك، لەوانە "الطبري"[1] و کەسانی تریش، بەڵام بە توندی بەرپەرچی ئەم قسە هەڵبەستراوەیان نەداوەتەوە، بەڵکو ڕێگەی تەئویلی دووریان گرتۆتە بەر بۆ ریوایەتێکی خزێنراو بۆ ناو فەرموودە، بەم ڕێگەیەش تیشکی سەوزیان بۆ دوژمنانی ئیسلام هەڵگرتووە لەوانە "سلمان رشدي" کە ئاماژە بەم قسە هەڵبەستراو و خزێنراوە بۆ ناو فەرموودە دەکات لە کتێبەکەیدا "آيات شيطانية"، زۆربەی ئەهلی تەفسیر هەموو ئەوەی وتراوە لە دروست و نادروست و

---

[1] ١٨٦/١٧ الطبرسي: ٩١/٧، والرازي: ٥٠/٢٣.

ماقوولّ و ناماقوولّ و ئەفسانە و حەقیقەت و شتگەلێکی هەڵبەستراو دەگوێزنـەوە بـۆ ناو تەفسیرەکانیان بەبێ ئەوەی قسەی لەسەر بکەن، بەڵام هەندێ لە ئەهلی تەفسیر ترسناکی ئەم ریوایەتـەیان بـۆ دەرکـەوتووە بۆیـە بـە بەڵگـەی زانسـتی بەرپـەرچیان داوەتـەوە لەوانـە "الكياالهراسـي"[1] کـە دەڵێـت: (باسـی ئـەوەیان کـردووە پێغەمبەر(ﷺ) ئەمـەی بـە دەمـدا هـاتووە" ان تلـك الغرانيـق العلـى " تێکچـوون و بێبنەمایی ئەو قسەیەمان ڕۆشـن کـردەوە و ڕووی ریوایـەتی دروسـتمان لـە ئوسـوڵدا خستە ڕوو) بەڵام ئەو کتێبـەم دەسـتنەکەوت تـاکو درێـژەی بەرپـەرچدانەوەکەی بـۆ خوێنەری بەڕێز بگوێزمەوە.

" القـرطبي[2]" ئـەو فەرموودانـەی ریوایـەتکراون دەربـارەی دابـەزین شـتێکی دروستیان تێدا نییـە، هـەروەها دەڵێـت: "أبـي لقـي" لـە ڕۆژهـەڵات کـە یەکێکـە لـە زانایانی مەزن و ئەهلی کەلام بۆی باسکردم: هەر کەس ئەو قسـەیە بکـات بـۆ شـان و شـکۆی پێغەمبـەر(ﷺ) دروسـت نییـە، چـونکە لـە گەیانـدنی وەحیـدا مەعسـوومە، "القاضـي عیـاض" لـە کتـێبی "الشـفا"دا[3] دەڵێـت-دوای ئـەوەی بەڵگـە لەسـەر ڕاستگۆیی پێغەمبەر(ﷺ) دەخاتە ڕوو-: ئوممەت کۆدەنگیـان هەیـە لەسـەر ئـەوەی پێغەمبـەر(ﷺ) لـە ڕێگـەی گەیانـدنی وەحـی مەعسـوومە لـە گەیانـدنی هـەواڵێك پێچەوانەی ئەوەی لەسەریەتی نە بە مەبەست و نە بەبێ مەبەست، نە بـە لەبیرچـوون و نە بە هەڵەکردن.

پاشان " القرطبي " دەڵێت: دوو قسەمان لەسەر تەمومژی ئەم فەرمووده هەیە:

یەکەمیان: ئەسڵەکەی لاوازە، ئەوەندە بەسە هـیچ کـەس لـە ئـەهلی فـەرموودەی دروسـت ریوایـەتی نـەکردووە و بـە سـەنەدێکی دروسـتی تەندروسـتی پەیوەسـتی

---

[1] أحكام القرآن: ٢٨٣/٤.

[2] الجامع لاحكام القرآن: ٨١/١٢.

[3] القرطبي المرجع السابق.

جێمتمانە ریوایەت نەكراوە، بەڵكو ئەهلی تەفسیر و ئەهلی مێژوو هۆگری ئەمە و هاوشێوەكانی ئەمە بوون.

ابو بكر الرازي[1] نەمانزانیوە ئەم فەرموودەیە بە سەنەدێكی پەیوەست كە شایەنی باسكردن بێت لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) ریوایەتكرابێت.

لەوانەی لەسەر "الناسخ والمنسوخ" لە سەدەی سێی كۆچیدا نووسیویانە "أبو جعفر النحاس"ە ئەم كەسە سەرەڕای ئەوەی لە زیادەڕەوانی نەسخە زۆر بەتوندی بەرپەرچی ئەم فەرموودەی داوەتەوە و دەڵێت[2]:"الزهري" لە "ابي بكر بن عبد الرحمن بن الحارث بن هشام"ەوە دەڵێت پێغەمبەر(ﷺ) سورەتی "النجم"ی دەخوێند، كاتێك گەیشتە:﴿أَفَرَأَيْتُمْ اللاَّتَ وَالْعُزَّى﴾ فەرمووی: (وان شفاعتهم لترتجى) لەمەدا هاوەڵدانەران گەیشتن بە پێغەمبەر(ﷺ) و سەلامیان لێكرد و دڵخۆشبوون بەوەی دابەزیبوو، بۆیە ئەم ئایەتەی دابەزی ﴿وَمَا أَرْسَلْنَا مِنْ قَبْلِكَ مِنْ رَسُولٍ وَلاَ نَبِيٍّ إِلاَّ إِذَا تَمَنَّى أَلْقَى الشيطان فِي أُمْنِيَّتِهِ﴾ الاية.

ئەم فەرموودە فەرموودەیەكی ترسناكە[3] و ئەم ئەمرە مەزنەی تێدایە، هەر بەو جۆرە فەرموودەكەی "قتادة"ئەمەی تێدایە(وانهن لهن الغرانيق العلى) گەر ئەمە راست بێت تەئویلی خۆی هەیە، ترسناكتر لەمە ئەوەیە "الواقدي" لە "كثير بن زيد عن المطلب بن عبدالله"ەوە ریوایەتی دەكات، دەڵێت: هەموو هاوەڵدانەران سوژدەیان برد جگە لە "الوليد بن المغيرة" ئەو خۆڵی لەسەر زەوی هەڵگرت و بەرزی كردەوە بۆ ناوچاوانی، دەوترێت ئەو كەسە "ابو اصيحة سعيد العاصي" بووە، تا "جبريل"–عليه السلام– دابەزی و پێغەمبەر(ﷺ) ئەمەی بەسەردا

---

[1] المرجع السابق: ٨١/١٧.

[2] الناسخ والمنسوخ في القرآن الكريم: ص١٩٠ وما بعدها.

[3] "فظع الامر": خراپییەكەی توند بوویەوە و لە رادەی خۆی بەدەرە بوو.

خوێندەوە، ئەویش فەرمووی: ئەمەم بۆ نەهێناوی، خودا ئەم ئایەتەی دابەزاند: ﴿لَقَدْ كِدْتَ تَرْكَنُ إِلَيْهِمْ شَيْئًا قَلِيلاً﴾[1] الاية.

ئەم فەرموودەیە "منكر منقطع–نەناسراوی پچڕاو"ە بە تایبەت لە ریوایەتەکەی "الواقدي"دا، ئایین و ژیری رێگری لەوە دەکەن[2].

–ئایەتی (٥٦) ﴿يَحْكُمُ بَيْنَهُمْ﴾ هەتا﴿الْمُلْكُ يَوْمَئِذٍ لِلَّهِ يَحْكُمُ بَيْنَهُمْ فَالَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ فِي جَنَّاتِ النَّعِيمِ﴾

"ابن حزم الاندلسي" و ئەوانەی لەگەڵ ئەون[3] پێیانوایە بە ئایەتی شمشێر نەسخکراوەتەوە.

ئەم بۆچوونە پووچە بەم بەڵگانە:

١.نەبوونی هیچ جۆرە بەرهەڵستکارییەك لە نێوان دوو ئایەتەکەدا.

٢.ئایەتەکە هەڕەشەیە هەڕەشەش ناچێتە ژێر نەسخکردنەوە.

٣.ئایەتەکە هەواڵە، هەواڵیش ناچێتە ژێر نەسخەوە.

–ئایەتی(٦٨) ﴿وَإِنْ جَادَلُوكَ فَقُلْ اللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا تَعْمَلُونَ﴾

"ابن سلامة"[4]: ئایەتی شمشێر نەسخی کردۆتەوە، ئەم بۆچوونە پووچە رەد دەکرێتەوە بەوەی لە بانگەشەی نەسخی ئایەتی (٥٦) باسمان کرد.

---

[1] سورة الإسراء/٧٤ .

[2] لمزيد من التفصيل راجع الناسخ والمنسوخ لابي جعفر النحاس: ص١٩٠–ص١٩١" لە سەرخەرانی نەسخ نەبوونەوە: الألوسي: ١٧٣/١٧، الرازي:: ٤٨/٢٣.

[3] ص٤٦.

[4] ص١٤٨.

-ئایەتی(٧٨) ﴿وَجَاهِدُوا فِي اللَّهِ حَقَّ جِهَادِهِ﴾[1]

"ابن سلامة"[2] وابن البارزي" دەڵێن: ئەم بەشەی ئایەتەکەی(٧٨)ی سورەتی "الحج" نەسخکراوەتەوە بە ئایەتی (١٦)ی سورەتی "التغابن"﴿فَاتَّقُوا اللَّهَ مَا اسْتَطَعْتُمْ﴾.

ئەم بۆچوونە پووچە رەد دەکرێتەوە بە چەندین بەڵگە لەوانە:

١.بەوەی رەدمان کردەوە لە بۆچوونی نەسخی﴿اتَّقُوا اللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِ﴾.

٢.وتنی نەسخ تێکەڵییە لە نێوان نەسخ و تایبەتکردندا، یان لە نێوان نەسخ و کۆتوبەندکردندا، بۆیە ئایەتەکەی یەکەم گشتییە و بە ئایەتی دووەم تایبەتکراوە، نموونەکانیشی وەک:﴿لاَ يُكَلِّفُ اللَّهُ نَفْسًا إِلاَّ وُسْعَهَا﴾، یان رەهایە و بەم ئایەتە کۆتوبەندکراوە.

هەر ئەمرێك لە خوداوە سنووردارکراوە بەوەی بچێتە ژێر توانا و دەسەڵاتی فەرمانپێکراوەکەوە، چونکە لە مەرجەکانی ئەمر ئەوەیە کەسی فەرمانپێکراو داوالێکراوی بالغی ژیری زانا بێت بەوەی داوای لێکراوە، هەروەها هەڵبژاردەی بۆ هەبێت و بتوانێت بەوە هەڵبستێت داوای لێکراوە.

"النحاس" دەڵێت: خودا-عز وجل- دەفەرموێت::﴿وَجَاهِدُوا فِي اللَّهِ حَقَّ جِهَادِهِ﴾ هەر کەس دەڵێت نەسخکراوەتەوە ئەوە دەڵێت ئایەتی:﴿اتَّقُوا اللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِ﴾ نەسخکراوەتەوە بە﴿فَاتَّقُوا اللَّهَ مَا اسْتَطَعْتُمْ﴾ ئەمە نەسخی تێدا نییە وەك لە سورەتی "آل عمران"دا رۆشنمان کردەوە.

---

[1] سەرخەرانی نەسخ نەبوونەوە: الرازي:: ٧٢/٢٣، والآلوسي: ٢٠٩/١٧.

[2] ص١٤٨.

# نەسخی بانگەشەبۆکراو لە سورەتی "المؤمنون"دا

"ابن حزم الاندلسي"[1] پێیوایە ئەم سوورەتە دوو ئایەتی نەسخکراوی تێدایە بە ئایەتی شمشێر، ئەو دوو ئایەتەش ئایەتی(٥٤ و ٩٦)ن.

"ابن سلامة"[2] بە عادەتەکەی خۆی هەمان قسەی دووبارە کردۆتەوە بەبێ قسە لەسەرکردن و بەڵگەهێنانەوە، لەو کارەیاندا "ابن البارزي"[3] شوێنیان کەوتووە و هەمان قسەی ئەوان دووبارە دەکاتەوە بەبێ قسە لەسەرکردن و بەڵگەهێنانەوە.

"ابن الجوزي"[4] دوو ئایەتەکە دەگوێزێتەوە لەگەڵ قسە لەسەرکردن و پارسەنگنەدان لە ئایەتی یەکەمدا و پارسەنگدانی نەسخ لە ئایەتی دووەمدا.

﴿فَذَرْهُمْ فِي غَمْرَتِهِمْ حَتَّى حِينٍ﴾ (٥٤)

﴿ادْفَعْ بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ السَّيِّئَةَ نَحْنُ أَعْلَمُ بِمَا يَصِفُونَ﴾ (٩٦)

---

(١) ص٤٦.

(٢) ص١٤٩.

(٣) ص١٩٧.

(٤) ص١٩٧.

بۆیە لە ئایەتی (٥٤) ﴿فَذَرْهُمْ فِي غَمْرَتِهِمْ حَتَّى حِينٍ﴾

دەڵێت: جیاوازیان لە نێواندا هەیە ئایا یەکەمجار ئەم ئایەتە نەسخکراوەتەوە، لە وەڵامدا دوو قسە هەیە:

یەکەم: نەسخکراوەتەوە بە ئایەتی شمشێر، چونکە داوا دەکات واز لە بێباوەڕ بهێنرێت لەوەی لەسەریەتی.

٢.ماناکەی هەڕەشەیە و هەڕەشەش ناچێتە ژێر نەسخکردنەوە.

هەروەها لە ئایەتی (٩٦)دا ﴿ادْفَعْ بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ السَّيِّئَةَ نَحْنُ أَعْلَمُ بِمَا يَصِفُونَ﴾

"ابن الجوزی" دەڵێت: بۆ ئەهلی تەفسیر دەربارەی ماناکەی چوار قسە هەیە:

یەکەم: خراپەی خراپەکار بە لێبوردن پاڵپێوە بنێ، "الحسن" ئەمە بۆچوونیەتی.

دووەم: خراپەکاری بە ئیسلام پاڵپێوە بنێ. "عطاء و الضحاك" ئەمە بۆچوونیانە.

سێیەم: شەڕ بە یەکتاپەرستی پاڵ پێوە بنێ، "ابن السائب" ئەمە دەڵێت.

چوارەم: مونکەر بە ئامۆژگاری پاڵ پێوە بنێ، "الماوردي" ئەمە دەڵێت.

هەندێك ئەهلی تەفسیر باسی ئەوەیان کردووە: ئەم ئایەتە نەسخکراوەتەوە، هەندێ لە زانایانی مەزنیش دەڵێن پێویستمان بە وتنی نەسخ نییە، چونکە هەڵکردن(مودارات) کارێکی پەسەندە گەر زیان بە ئاین نەگەیەنێت و سەرنەکێشێت بۆ پووچەڵبوونەوەی حەق و جێگیربوون باتڵ.

دروست نەسخ نەبوونەوەیەتی، چونکە رووبەڕووبوونەوەی خراپە بە چاکە لە بەها باڵاکان و ئەخلاقە بەرزەکانە قورئان لە چەندین ئایەتدا فەرمانی پێکردووە، خودا رووی گوتاری دەکاتە پێغەمبەرەکەی و دەفەرموێت: ﴿وَإِنَّكَ لَعَلَى خُلُقٍ عَظِيمٍ﴾ عائشە—خوا لێی رازی بێت— دەفەرموێت: (ئەخلاقی پێغەمبەر بریتی بوو لە قورئان)، بەڵام رووبەڕووبوونەوەی خراپە بە چاکە سنوورێکی هەیە، وەك "ابن الجوزي"

دەفەرموێت، هەندێ جار دەبێت پاداشتی خراپە بە خراپە بێت، خودا –سبحانه وتعالى– دەفەرموێت: ﴿فَمَنْ اعْتَدَى عَلَيْكُمْ فَاعْتَدُوا عَلَيْهِ بِمِثْلِ مَا اعْتَدَى عَلَيْكُمْ﴾ ئایەتە باسکراوەکە بە ئایەتی شمشێر تایبەتکراوە، گەر خراپەکاری گەیشتە رادەی دەستدرێژی بۆ سەر بەرژەوەندییەك لە بەرژەوەندییە زەروورەکان ئەوا پێویستە بەپێی ئایەتی شمشێر بەرگری لێ بکرێت.

"النحاس" هیچ نەسخێکی لەم سورەتەی قورئاندا باس نەکردووە، جگە لەوەی ئاماژەی کردووە بە نەسخی سوننەتێکی کرداری بە قورئان کاتێك دەڵێت[1]: "یموت" بە سەنەدی خۆی لە "ابن عباس"ەوە بۆمان باس دەکات دەڵێت: سورەتی "المؤمنون" لە مەکە دابەزیوە بۆیە سورەتێکی مەکییە، لە ریوایەتەکەی "المعتمر"دا لە "خالد"ەوە لە "محمد بن سعید"ەوە دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) لە نوێژدا تەماشای ئاسمانی دەکرد، خودا ئەم ئایەتەی دابەزاند﴿الَّذِينَ هُمْ فِي صَلَاتِهِمْ خَاشِعُونَ﴾[2]، بۆیە پێغەمبەر(ﷺ) رووی کردە ئەو شوێنەی سوژدەی تیادەبرد، لە ریوایەتێکدا موسڵمانان لە نوێژدا لایان دەکردەوە و دەیانروانی، بۆیە خودا ئەم ئایەتانەی دابەزاند﴿قَدْ أَفْلَحَ الْمُؤْمِنُونَ، الَّذِينَ هُمْ فِي صَلَاتِهِمْ خَاشِعُونَ﴾، روویان نوێژەکانیان کرد و تەماشای پێش خۆیان دەکرد و لایان پەسەند بوو هیچ کام لەوان چاوی لە شوێنی سوژدەبردنەکەی سەرنەکات.

"النحاس" بەردەوام دەبێت لە قسەکانی: زۆربەی زانایان لەسەر ئەوەن "خشوع" لە نوێژدا ئەوەیە تەماشای شوێنی سوژدەکەت بکەیت گەر بە پێوە بوو، هەیانە دەڵێت جگە لە "مەکە" چونکە لەو شوێنە باشترە تەماشای ماڵی خودا بکەیت.

---

[1] ص١٩٢.

[2] سورة المؤمنون/٢.

# نەسخی بانگەشەبۆکراو لە سورەتی "النور"دا

"ابن حزم"[1] و ابن سلامة"[2] پێیانوایە حەوت ئایەتی نەسخکراو لەم سورەتەدا هەیە، "ابـن الجـوزي"[3] ئایەتـەکانی خسـتووەتە روو و لـە زۆربەیانـدا بەرپەرچـی ئەوانەی داوەتەوە بانگەشەی نەسخبوونەوەیان دەکەن.

"ابن البارزي"[4] پێیوایە نەسخکراو تیایدا هەشت ئایەتە، "النحـاس"[5] پێیوایـە چوار ئایەتی نەسخکراوی تێدایە.

ئەو بۆچوونە پووچانە دەخەینەڕوو و بەرپەرچیان دەدەینەوە:

﴿الزَّانِي لاَ يَـنكِحُ إلاَ زَانِيَـةً أَوْ مُشْـرِكَةً وَالزَّانِيَـةُ لاَ يَنكِحُهَـا إِلاَّ زَانٍ أَوْ مُشْرِكٌ وَحُرِّمَ ذَلِكَ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ﴾ (٣)

﴿وَالَّذِينَ يَرْمُونَ الْمُحْصَنَاتِ ثُـمَّ لَـمْ يَـأْتُوا بِأَرْبَعَـةِ شُـهَدَاءَ فَاجْلِـدُوهُمْ ثَمَانِينَ جَلْدَةً وَلاَ تَقْبَلُوا لَهُمْ شَهَادَةً أَبَدًا وَأُوْلَئِكَ هُمُ الْفَاسِقُونَ﴾ (٤)

---

[1] ص٤٧.

[2] ص١٤٩-١٥٠.

[3] ص١٩٨-٢٠١.

[4] ص١٩٨.

[5] ص١٩٢-١٩٩.

﴿وَالَّذِينَ يَرْمُونَ أَزْوَاجَهُمْ وَلَمْ يَكُنْ لَهُمْ شُهَدَاءُ إِلاَّ أَنفُسُهُمْ فَشَهَادَةُ أَحَدِهِمْ أَرْبَعُ شَهَادَاتٍ بِاللَّهِ إِنَّهُ لَمِنَ الصَّادِقِينَ﴾ (٦)

﴿يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لاَ تَدْخُلُوا بُيُوتًا غَيْرَ بُيُوتِكُمْ حَتَّى تَسْتَأْنِسُوا وَتُسَلِّمُوا عَلَى أَهْلِهَا ذَلِكُمْ خَيْرٌ لَكُمْ لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ، فَإِنْ لَمْ تَجِدُوا فِيهَا أَحَدًا فَلاَ تَدْخُلُوهَا حَتَّى يُؤْذَنَ لَكُمْ وَإِنْ قِيلَ لَكُمْ ارْجِعُوا فَارْجِعُوا هُوَ أَزْكَى لَكُمْ وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ عَلِيمٌ﴾ (٢٧-٢٨)

﴿وَقُلْ لِلْمُؤْمِنَاتِ يَغْضُضْنَ مِنْ أَبْصَارِهِنَّ وَيَحْفَظْنَ فُرُوجَهُنَّ وَلاَ يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلاَّ مَا ظَهَرَ مِنْهَا وَلْيَضْرِبْنَ بِخُمُرِهِنَّ عَلَى جُيُوبِهِنَّ وَلاَ يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلاَّ لِبُعُولَتِهِنَّ أَوْ آبَائِهِنَّ أَوْ آبَاءِ بُعُولَتِهِنَّ﴾ (٣١)

﴿قُلْ أَطِيعُوا اللَّهَ وَأَطِيعُوا الرَّسُولَ فَإِنْ تَوَلَّوا فَإِنَّمَا عَلَيْهِ مَا حُمِّلَ وَعَلَيْكُمْ مَا حُمِّلْتُمْ وَإِنْ تُطِيعُوهُ تَهْتَدُوا وَمَا عَلَى الرَّسُولِ إِلاَّ الْبَلاَغُ الْمُبِينُ﴾ (٥٤)

﴿يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لِيَسْتَأْذِنْكُمْ الَّذِينَ مَلَكَتْ أَيْمَانُكُمْ وَالَّذِينَ لَمْ يَبْلُغُوا الْحُلُمَ مِنْكُمْ ثَلاَثَ مَرَّاتٍ مِنْ قَبْلِ صَلاَةِ الْفَجْرِ وَحِينَ تَضَعُونَ ثِيَابَكُمْ مِنْ الظَّهِيرَةِ وَمِنْ بَعْدِ صَلاَةِ الْعِشَاءِ ثَلاَثُ عَوْرَاتٍ لَكُمْ لَيْسَ عَلَيْكُمْ وَلاَ عَلَيْهِمْ جُنَاحٌ بَعْدَهُنَّ طَوَّافُونَ عَلَيْكُمْ بَعْضُكُمْ عَلَى بَعْضٍ كَذَلِكَ يُبَيِّنُ اللَّهُ لَكُمْ الآيَاتِ وَاللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ﴾ (٥٨)

–ئایەتی(٣) ﴿الزَّانِي لاَ يَنكِحُ إلاَ زَانِيَةً أَوْ مُشْرِكَةً وَالزَّانِيَةُ لاَ يَنكِحُهَا إِلاَّ زَانٍ أَوْ مُشْرِكٌ وَحُرِّمَ ذَلِكَ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ﴾[1]

ئەهلی تەفسیر لەمەڕ تەفسیری ئـەم ئایەتـە جیاوازیـان لـە نێواندایـە[2]، زیـاتر لـە شەش قسەی لەیەکتر جیاوازی دژیەیـەکیان دەربـارەی تەفسـیرەکەی و نەسـخکراوە یان موحکەم گواستۆتەوە، ئەم جیاوازییە ئیجتیهادییە گومانئامێزانە هەر هەموو بەسە وەك بەڵگەیەکی یەکلاکەرەوە لەسەر نەبوونی نەسخ، چونکە هەر ئایـەتێکی قورئـانی خوێندنەوە و حوکمەکەی بە تەواتور جێگیر بووبێـت و بووبێـت بـە یـەقین، ئـەوا ئـەو یەقینە تەنها بە یەقین دەسڕێتەوە.

بانگکەرانی ئـەم ئایەتـە جیاوازییـان هەیـە دەربـارەی نەسـخکەرەکەی، هەیانـە[3] دەڵێت ئایەتی (٣٢)ی هەمان سورەت نەسخی کردۆتەوە:﴿وَأَنكِحُوا الأَيَامَى مِنْكُمْ وَالصَّالِحِينَ مِنْ عِبَادِكُمْ وَإِمَائِكُمْ إِنْ يَكُونُوا فُقَرَاءَ يُغْنِهِمْ اللَّهُ مِنْ فَضْلِهِ وَاللَّهُ وَاسِعٌ عَلِيمٌ﴾.

ئەم بانگەشەیە بە چەندین هۆ پووچ و بێبنەمایە، لەوانە:

١.نـەبوونی بەرهەڵسـتی لـە نێـوان دوو ئایەتەکـەدا، ئایـەتی(٣) هاوەڵـدانان و ئەنجامدانی کاری زینا لە ڕێگرەکانی هاوسەرگیری دروستن تایبەت بە باوەڕداران گـەر زیناکەری ژن یان پیاو تەوبە نەکات، یان هاوەڵدانەری ژن یان پیاو بـاوەڕ نـەهێنن بـە

---

[1] سورة النور/٣.

[2] للاطلاع على هذه التفاسير والاختلاف ينظر التفسير الكبير للرازي: ٢٣/١٥٠-١٥٢، مجمع البيان للطبرسي: ١٧/١٢٤، جامع البيان للطبري: ١٢/١٦٧ وما بعدها، الكشاف للزمخشري: ٣/٤٨، احكام القرآن للكياالهراسي: ٤/٢٩٥، حاشية الصاوي على تفسير الجلالين: ٣/١٢٨ وما بعدها.

[3] ابن حزم ٤٧، ابن سلامة ١٩١، ابن البارزي ١٩٨.

بەڵگەی هۆی دابەزینەکە[1] نەسخکەرەوەکە بۆ موباحکردنی هاوسەرگیری هاتووە بە هەر شتێك رێگرێکی هەمیشەیی تیادا نەبینرێتەوە وەك رەچەڵەك و شیردان و خزمایەتی ژنخوازی یان رێگرێکی کاتی وەك پەیوەستبوونی ماف کەسانی تر بە ژنەکەوە بەهۆی هاوسەرگیرییەوە یان بەهۆی عیدەوە و هاوەڵدانان یان رێگرێکی تر، "الأيامى"کۆی وشەی "أيم"ە، ئەوەش ئەو ئافرەتانەن مێردیان نییە بە کچێتی بێت یان بە بێوەژنی، هەر بەو جۆرە ئەو پیاوەی ژنی نەبێت.

بۆیە ئایەتی(٣٩) دەبێتە سنووردانەر بۆ ئایەتی(٣٤) یان تایبەتکەر بۆ گشتاندنەکەی.

هەیانە[2] پێیوایە نەسخکەرەکە بریتییە لە ئایەتی(٣)ی سورەتی "النساء"، ئەوەش ئایەتی: ﴿فَانكِحُوا مَا طَابَ لَكُمْ مِنَ النِّسَاءِ﴾الآية.

ئەم بانگەشەیە بەرپەرچ دەدرێتەوە بەم بەڵگانە:

١.مەبەست بە "ما طاب" ئەوەیە رێگرێك لە رێگرەکانی هاوسەرگیری تێدا نەبێت هەر بەو جۆرە رێگرەکانی هاوەڵدانان و راهاتن لەسەر تاوانی زینا.

٢.ئایەتەکە هەواڵ و رۆشنکردنەوەیە بۆ واقیعێکی زاڵی گشتی، پیاوی ئالوودە بە زینا هەڵبژاردنی لە هاوسەرگیریدا دەکەوێت بەسەر پەتیارەی زیناکەری وەکو خۆی، ئافرەتی ئالوودەبوو بە زیناش پیاوی زیناکەر یان هاوەڵدانەری بۆ یەکلادەبێتەوە[3]،

---

[1] پێش ئیسلام هەندێ ئافرەت ئەم تاوانە قێزەونەیان ئەنجام دەدا وەك پیشەیەك بۆ ژیان، ئەم دیاردەیە دوای هاتنی ئیسلام ماوەیەکی کەم بەردەوام بوو، لەو ماوەیەدا هەندێ پیاوی ئیمان لاواز لە کۆچکەران داوای مۆڵەتیان لە پێغەمبەر(ﷺ) دەکرد بۆ ئەوەی رێگەیان پێبدا هاوسەرگیرییان لەگەڵ بکەن ئەوەش بەهۆی هەژارییەوە، بۆیە ئایەتەکە دابەزی و ئەو جۆرە هاوسەرگیرییەی حەرام کرد و وەك رێسایەکی دەستووری نەمر مایەوە بۆ ئەوەی کار بە داواکارییەکەی بکرێت لە هەموو کات و شوێنێکدا.

[2] المراجع السابقة من التفاسير.

[3] ئەم ئایەتە ئاماژە بەوە دەکات: {الْخَبِيثَاتُ لِلْخَبِيثِينَ وَالْخَبِيثُونَ لِلْخَبِيثَاتِ} النور/٢٦.

ئەوەش لە باوەڕداران حەرامکراوە بە حەرامبوونێکی کاتی، بۆیە هاوسەرگیری نێوان زیناکەری ژن و پیاو دروستە لە دوای تەوبە هەر بەو جۆرە تایبەت بە هاوەڵدانەری ژن و پیاو لە دوای باوەڕهێنان[1].

-ئایەتی(٤)﴿ وَالَّذِينَ يَرْمُونَ الْمُحْصَنَاتِ ثُمَّ لَمْ يَأْتُوا بِأَرْبَعَةِ شُهَدَاءَ فَاجْلِدُوهُمْ ثَمَانِينَ جَلْدَةً وَلاَ تَقْبَلُوا لَهُمْ شَهَادَةً أَبَدًا وَأُولَئِكَ هُمُ الْفَاسِقُونَ﴾

پێیانوایە ئایەتەکە نەسخکراوەتەوە بەو هەڵواردن(الأسپناو)ی تیایدا هاتووە لە ئایەتەکەی دواتردا:﴿إِلاَّ الَّذِينَ تَابُوا مِنْ بَعْدِ ذَلِكَ وَأَصْلَحُوا فَإِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَحِيمٌ﴾[2].

ئەم بۆچوونە پووچ و بێبنەمایە، چونکە هەڵواردن نەسخ نییە بەڵکو بریتییە لە تایبەتکردن، ئایەتی (٤) سێ سزای تێدایە:

یەکەم: سزای جەستەیی(هەشتا دار)

دووەم: قبووڵنەبوونی شایەتیدان.

سێیەم: فیسق، سزای دووەم و سێیەم سزانی نەفسین، هەڵواردنەکە ناگەڕێتەوە بۆ سزای یەکەم، چونکە لە مافە هاوبەشەکانی نێوان خودا و بەندەی قەزفکراوە(تۆمەت بۆ هەڵبەستراو) و بە تەوبە و خۆچاککردن بەرنابێتەوە بە پێچەوانەی دووەم و سێیەمەوە لەلای جمهوری فەقیهان.

حەنەفییەکان دەڵێن: هەڵواردن بۆ زەرورەتە، زەرورەتەکانیش بە ئەندازەی خۆیان ئەندازەگیرییان بۆ دەکرێت، بۆیە تەنها دەگەڕێتەوە بۆ سزای کۆتایی و شایەتیدانی قەزفکراو بە تەوبە و نەفسی خۆ چاککردن قبووڵ ناکرێت، رای جمهور رای پارسەنگدراوە.

---

[1] لە سەرخەرانی نەسخ نەبوونەوە: الرازي: ١٥١/٢٣، والالوسي: ٨٤/١٨، والقرطبي: ١٦٨/١٢.

[2] سورة النور/٥.

-ئایەتی(٦) ﴿وَالَّذِينَ يَرْمُونَ أَزْوَاجَهُمْ وَلَمْ يَكُنْ لَهُمْ شُهَدَاءُ إِلاَّ أَنفُسُهُمْ فَشَهَادَةُ أَحَدِهِمْ أَرْبَعُ شَهَادَاتٍ بِاللَّهِ إِنَّهُ لَمِنَ الصَّادِقِينَ﴾[1]

"ابـن حـزم"[2] دەڵێـت نەسـخکراوەتەوە بـەو دوو ئایەتـەی بەدوایـدا دێـن، ئەوانـەش:﴿وَالْخَامِسَـةُ أَنَّ لَعْنَـةَ اللَّـهِ عَلَيْـهِ إِنْ كَـانَ مِـنْ الْكَـاذِبِينَ﴾[3] هـەروەها ﴿وَالْخَامِسَةَ أَنَّ غَضَبَ اللَّهِ عَلَيْهَا إِنْ كَانَ مِنْ الصَّادِقِينَ﴾[4].

(حەدەکە لەسەر ژنەکە و پیاوەکە لادەبات بە سوێند و مولاعەنە، گـەر یـەکێکیان ئینکاری کرد و ئەویتریان سوێندی خوارد حەدەکە بەردەبێتەوە لـە سـوێندخۆرەکە و حەد لەسەر نەرێکەرەکە راستدەبێتەوە، ئەمە ئەوەیە "ابن حزم الأندلسي" دەیڵێت لە کتێبەکەیدا "الناسخ والمنسوخ في القرآن الكريم".

ئەوەی رۆشنە ئەوەیە پووچـەڵکردنەوەی نموونـەی ئـەو قسـانە ئاتـاج بـە بەڵگـە ناکات، چونکە ئاشکرا و رۆشنە، ئـەم ئایەتـە تایبەتـە بـە حـوکمی تۆمـەتی پیـاو بـۆ ژنەکەی، ئایەتەکە تایبەتکەری ئایەتی چوارەمی گشـتی گشـتگیرە بـۆ تۆمـەتی ژن و مێـرد لـە یـەکتر و کەسـانی تـریش، ئـەوەش کـە لـە ئایـەتی(٧ و ٨ و ٩)دا هـاتووە تەواوکەری حوکمی قەزفی مێردە بۆ ژنەکەی، ئیتر چۆن تەواوکاری شـتێك دەبێـت بـە نەسخکەر بۆی؟

"ابن سلامە"[5] دەڵێت:(ئایەتی سێیەم لـە ئایەتـە نەسـخکراوەکانە لـە سـورەتی "النور"دا، ئەوەش:﴿وَالَّذِينَ يَرْمُونَ أَزْوَاجَهُمْ وَلَـمْ يَكُـنْ لَهُـمْ شُـهَدَاءُ إِلاَّ أَنفُسُـهُمْ﴾

---

(١) سورة النور/٦.

(٢) ص٤٨.

(٣) سورة النور/٧.

(٤) سورة النور/٩، الآية الثامنة قولـه تعالى {وَيَـدْرَأُ عَنْهَـا الْعَـذَابَ أَنْ تَشْـهَدَ أَرْبَـعَ شَـهَادَاتٍ بِاللَّهِ إِنَّهُ لَمِنَ الْكَاذِبِينَ}.

(٥) ص١٥١.

دەربارەی"عاصم بن عدی[1] الانصاری" دابەزی، وتی بە پێغەمبەری خودا(ﷺ): ئەی پێغەمبەری خودا پیاوێك دەچێتە ماڵەوە پیاوێك لەگەڵ ژنەکەیدا دەبینێ، گەر پەلە بکات لەسەری و بیکوژێت لەسەری دەکوژرێتەوە، گەر شایەتی لەسەر بدات داری حەدی لێ دەدرێت، دەبێ چی بکات ئەی پێغەمبەری خودا؟

چەند رۆژێکی کەمی برد پیاوێك لە خانەوادەی "عاصم" تووشی ئەو بەڵایە بوو، بۆیە "عاصم" بە پەلە هات بۆ لای پێغەمبەری خودا(ﷺ) و وتی: ئەی پێغەمبەری خودا پیاوێك لە خانەوادەکەم تووشی ئەو بەڵایە بووە و پیاوێکی لەگەڵ ژنەکەی بینیوە، ئەو کات ئەم ئایەتە دابەزی:﴿فَشَهَادَةُ أَحَدِهِمْ أَرْبَعُ شَهَادَاتٍ بِاللَّهِ إِنَّهُ لَمِنَ الصَّادِقِينَ﴾

بۆیە ئایەتی مولاعەنە دابەزی کە تایبەتە بە قەزفی ژنان لەلایەن پیاوەکانیانەوە، شێوازەکەی: پیاوەکە ئامادە دەبێت و شایەتی لەسەر ژنەکەی دەدات بە زینا لە دوای نوێژی عەسر لە ناو کۆمەڵێك خەڵکدا، یان دوای هەر نوێژێك لە نوێژەکان چوار سوێند بە خودا دەخوات کە لە قسەکەیدا راستگۆیە و لە پێنجەمیاندا دەڵێت نەفرەتی خودای لێ بێت گەر لە درۆزنان بێت، پاشان لەو شوێنەی لەسەر وەستا بوو دادەبەزێت و ژنەکەی دەچێتە شوێنەکەی ئەو، ئەویش چوار سوێند بە خودا دەخوات کە مێردەکەی درۆ دەکات لەوەی داویەتە پاڵی، لە پێنجەمدا دەڵێت غەزەبی خودا لەسەری بێت گەر مێردەکەی راست بکات لەو تۆمەتەی داویەتە پاڵی، گەر سکی پڕ بێت نادرێتە پاڵ پیاوەکەی بەڵکو ژنەکە دەبێتە باوك و دایك بۆ منداڵەکە، گەر یەکێکیان سوێندی خوارد و ئەویتریان نەیخوارد، ئەوا حەد بەسەر ئەوەیاندا(ئەوەی سوێندی نەخوارد) جێبەجێ دەکرێت، گەر هەردووکیان سوێندیان نەخوارد حەد

[1] "بن الجد البلوى العجلاني" هاوشێیماني ئەنصار بوو، طەورەي "العجلان" بوو، ثێغەمبەر داينابوو بە جێنشيني خۆي لە دەورووبەري مەدينە. الاعلام: ٤/١٣.

لەسەر هەردووکیان راستدەبێتەوە، حەد لە مەزهەبی ئەهلی حیجازدا رەجمە و لە مەزهەبی ئەهلی عێراقدا دارلێدانە)[1].

لە قسەکەی "ابن سلامة"دا دیاریکردنی ئایەتی نەسخکەری تێدا نییە، بەڵکو قسەکەی "ابن حزم" دووبارە دەکاتەوە لەگەڵ شتێك لە درێژەپێدان بە حوکمەکانی نەفرەتکردن.

لە قسەکەی " ابن البارزي[2]"وە -کە دوای "ابن حزم و ابن سلامة" دێت لە زیادەڕەوی لە نەسخدا- تێدەگەین ئایەتی قەزف بە ئایەتی نەفرەتکردن(اللعن) نەسخکراوەتەوە، ئەم قسەیە ماقووڵ و وەرگیراوە گەر مەبەست بە نەسخ مانا گشتییەکە بێت لای پێشینی چاکان کە بریتییە لە تایبەتکردن و ماناکانی تر، چونکە ئایەتی نەفرەتکردن گشتاندنی ئایەتی قەزفی تایبەتکردووە و لە سێ حوکمەکەی و سزا باسکراوەکەی دەربارەی قەزفی پیاوان بۆ ژنەکانیان بەدەریناوە، سزای ئەم قەزفە بریتییە لە جیاکردنەوەی ژن و پیاو لە یەکتری لەدوای رێکارە شێوەگرییەکان، چونکە گومان کەوتۆتە ناو ژیانی هاوسەرییانەوە و پەیوەندییەکە بە لەرزۆکی و خراپی دەمێنێتەوە و ئەوەش وا دەکات خێزانێکی دوور لە بەختەوەری سەرهەڵبدات.

ئەوەی نامۆیە ئەوەیە ئایەتی قەزف دوو جار نەسخکرابێتەوە بەپێی بۆچوونی ئەوان، جارێك بەو هەڵوارنەی تیایدا هاتووە و جارێکیش بە ئایەتی نەفرەتکردن، ئەم گاڵتەجاڕییە جێگەی تەئویل نییە مەگەر لێکدانەوەی بە مانا گشتییەکە لەلای پێشینی چاکان کە تایبەتکردن و ماناکانی تر دەگرێتەوە.

---

[1] الناسخ والمنسوخة - لابن سلامة هبة الله البغدادي: ص١٥٢.

[2] ناسخ القرآن العزيز ومنسوخه لابن البارزي (عبد الله بن عبد الرحيم): ص١٩٨.

ـ ئایـەتی(٢٧) ﴿يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لاَ تَدْخُلُوا بُيُوتًا غَيْرَ بُيُوتِكُمْ حَتَّى تَسْتَأْنِسُوا(١) وَتُسَلِّمُوا عَلَى أَهْلِهَا ذَلِكُمْ خَيْرٌ لَكُمْ لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ﴾ [٢]

﴿فَإِنْ لَمْ تَجِدُوا فِيهَا أَحَدًا فَلاَ تَدْخُلُوهَا حَتَّى يُؤْذَنَ لَكُمْ وَإِنْ قِيلَ لَكُمُ ارْجِعُوا فَارْجِعُوا هُوَ أَزْكَى لَكُمْ وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ عَلِيمٌ﴾ [٣]

پێیانوایه[٤] ئایەتی (٣) بە ئایەتی (٢٩) نەسخکراوەتەوە﴿لَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ أَنْ تَدْخُلُوا بُيُوتًا غَيْرَ مَسْكُونَةٍ فِيهَا مَتَاعٌ لَكُمْ وَاللَّهُ يَعْلَمُ مَا تُبْدُونَ وَمَا تَكْتُمُونَ﴾[٥].

ئەم[٦] بۆچوونە پووچ و بێبنەمایە، چونکە تێکەڵییە لە نێوان تایبەتکردنی گشتی و نەسخدا، ئایەتی (٢٩) دوو مەرجی تێدایە بۆ دروستی چوونە ژوورەوە بەبێ مۆڵەت و سەلام.

یەکەمیان: ئەوماڵانە کەسی تێدا نیشتەجێ نەبووبێت.

دووەم: بوونی شتێك مرۆڤ سوودی لێ ببینێت وەك چوونە ناو ئوتێل و خانەکانەوە لە لایەن ئەو گەشتیارانەی ژوورێکی تێدا دەگرن و شتومەکەکانی خۆیانی تێدەکەن، دەچنە دەرەوە و لە کاتی گەڕانەوەیان پێویست بە وەرگرتنی مۆڵەت ناکات لە خاوەن ئوتێلەکە یان لە خاوەن خانەکە، و هاوشێوەکانی ئەمانە، چونکە کلیلی ژوورەکەی لەگەڵ خۆی هەڵگرتووە، یان لەبەر ئەوەی کلیلەکە لە شوێنێکی تایبەت لە ژووری پێشوازی هەڵواسراوە، پاشان بابەتی دوو ئایەتەکە جیاوازن لە

---

[١] "تستأذنوا"، لە ئایەتەکەدا پێشکەوتن و دواکەوتن هەیە، چونکە سەلام پێش مۆڵەت وەرگرتنە.

[٢] سورة النور/٢٧.

[٣] سورة النور/٢٨.

[٤] ابن حزم الاندلسي: ص٤٨، ابن سلامة: ١٥٢، ابن البارزي: ١٥٨ وغيرهم.

[٥] سورة النور/٢٩.

[٦] لە سەرخەرانی نەسخ نەبوونەوە: الالوسي: ١٣٦/١٨، والرازي: ١٩٨/٢٣، والقرطبي: ٢١٩/١٢.

یەکەمیاندا ماڵێکە ئەو دوو مەرجە باسکراوەی تێدا نەهاتووە بە پێچەوانەی دووەمەوە.

هیچ پاساوێك بۆ ئەو نەسخە بێ بنەمایە بوونی نییە گەر مەبەست پێی مانا گشتییەکە نەبێت لەلای پێشین، ئەوەش لە "ابن عباس"ەوە گوازراوەتەوە لە وتنی نەسخ مەبەستی پێی مانا گشتییەکە بووە، ئەگینا شانوشکۆی "ابن عباس" بەرزترە لەوەی بکەوێتە ناو ئەو جۆرە هەڵانەوە.

"أبو جعفر النحاس"[1] دەڵێت: لەسەر ئایەتی(٢٧)ی سورەتی "النور" زانایان دوو قسەیان هەیە، هەیانە دەڵێت: نەسخکراوەتەوە بەو هەڵواردنەی لە ئایەتی(٢٩)دا هاتووە، هەشیانە دەڵێت: دوو ئایەتەکە موحکەمن، چونکە مەبەست بە "البیوت" لە ئایەتی یەکەمدا ئەوەیە خاوەنی هەبێت و خەڵکی تێدا نیشتەجێ بووبێت، لە ئایەتی (٢٩)دا مەبەست بە "البیوت" ئەوەیە خاوەنی ناسراوی نەبێت و کەسی تێدا نیشتەجێ نەبووبێت، قسەی یەکەم لە "ابن عباس و عکرمة"ەوە دەگێڕنەوە، قسەی دووەم ئەوەیە دوو ئایەتەکە موحکەمن کە قسەی زۆربەی ئەهلی تەئویلە.

"ابن الجوزي"[2] دەڵێ: ئایەتی (٢٧) دوو قسەی لەسەرە:

یەکەمیان نەسخکراوەتەوە و ئەم بەشەی لێ هەڵواردەکراوە ﴿لَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ﴾ الآية، ئەمە لە "الحسن وعكرمة والضحاك"ەوە ریوایەتکراوە، ئەمە نەسخ نییە بەڵکو بریتییە لە تایبەتکردن.

دووەم: دوو ئایەتەکە موحکەمن، مۆڵەتوەرگرتن لە یەکەمدا مەرجە گەر خانووەکە خاوەنی هەبوو(دیاربوو)، دووەمیان دەربارەی ئەو خانووانە هاتووە کەسیان تێدا نیشتەجێ نەبووە، بۆیە مۆڵەت بەبێ مۆڵەتدەر وێنا ناکرێت، گەر مۆڵەتوەرگرتن پووچکرایەوە ئەوا ماڵی چۆڵ ناچێتە ناو یەکەمەوە، ئەمەش راسترینە).

---

[1] الناسخ والمنسوخ في القرآن الكريم/ص١٩٥ وما بعدها.

[2] نواسخ القرآن: ص١٩٩.

دەڵێم: جیاوازییەکە گوزارەییە، چونکە ئەو کەسەی دەڵێت نەسخکراوەتەوە مەبەستی بە نەسخ تایبەتکردنە، ئایەتی (٢٧) گشتییە و خانووی نیشتەجێ بوو دەگرێتەوە، بۆیە گشتاندنی یەکەمی تایبەتکردەوە، ئەوەش لە " ابن عباس والضحاك وعكرمة " و کەسانی ترەوە گوازراوەتەوە لە وتنی نەسخ مەبەستیان پێی مانای گشتیی گشتگیرە بۆ تایبەتکردن، بەڵکو تەنها مەبەستیان پێی تایبەتکردن بووە.

—ئایەتی (٣١) ﴿ وَقُلْ لِلْمُؤْمِنَاتِ يَغْضُضْنَ مِنْ أَبْصَارِهِنَّ وَيَحْفَظْنَ فُرُوجَهُنَّ وَلاَ يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلاَّ مَا ظَهَرَ مِنْهَا[1] وَلْيَضْرِبْنَ بِخُمُرِهِنَّ عَلَى جُيُوبِهِنَّ[2] وَلاَ يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ[3] إِلاَّ لِبُعُولَتِهِنَّ أَوْ آبَائِهِنَّ أَوْ آبَاءِ بُعُولَتِهِنَّ﴾.[4]

بانگکەرانی نەسخ دەڵێن[5] ئەم ئایەتە نەسخکراوەتەوە بە ئایەتی(٦٠)ی هەمان سورەت کە بریتییە لە: ﴿وَالْقَوَاعِدُ[6] مِنْ النِّسَاءِ اللاَّتِي لاَ يَرْجُونَ نِكَاحًا فَلَيْسَ عَلَيْهِنَّ جُنَاحٌ أَنْ يَضَعْنَ ثِيَابَهُنَّ غَيْرَ مُتَبَرِّجَاتٍ بِزِينَةٍ وَأَنْ يَسْتَعْفِفْنَ خَيْرٌ لَهُنَّ وَاللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ﴾[7].

وتنی ئەم نەسخە پووچ و بێبنەمایە بەهۆی جیاوازی بابەتی دوو ئایەتەکەوە، چونکە یەکەمیان تایبەتە بەوانەی ترسی بوونە هۆی فیتنەیان هەیە، دووەمیان تایبەتە بە پیرەژنان کە ترسی بوون بە فیتنەیان نییە، بۆیە هیچ بەرهەڵستکارییەك لە

---

[1] ئەوەش بریتییە لە دەموچاو و دوو دەست، دروستە بۆ نامەحرەم دەریکەون گەر لە فیتنە نەدەترسا.

[2] سەر و گەردن و سنگ داپۆشرێت.

[3] واتە شاراوە کە بریتییە لە هەموو جەستە جگە لە دەموچاو و دوو دەست.

[4] سورة النور/٣١.

[5] ابن حزم:٤٨، ابن سلامة: ١٥٣، ابن البارزي: ١٩٨ وغيرهم.

[6] لە حەیز و منداڵبوون چووبنەوە بەهۆی پیرییەوە.

[7] سورة النور/٣١.

نێوان دوو ئایەتەكە بوونی نییە، گەر واشدابنێین بوونی هەیە ئەوا بە تایبەتكردنی یەكەم بەهۆی ئایەتی دووەمەوە هەڵدەگیرێت.

"ابن الجوزی"[1] دەڵێت: (لە "عكرمە"وە لە "ابن عباس"ەوە (ﷺ) ﴿وَقُلْ لِلْمُؤْمِنَاتِ يَغْضُضْنَ مِنْ أَبْصَارِهِنَّ﴾ هەتا ﴿لِيُعْلَمَ مَا يُخْفِينَ مِنْ زِينَتِهِنَّ﴾ نەسخكراوەتەوە و ئەمەی لێ هەڵواردە كراوە﴿وَالْقَوَاعِدُ مِنَ النِّسَاءِ اللاَّتِي لاَ يَرْجُونَ نِكَاحًا﴾ هەر بەو جۆرە "الضحاك" دەڵێت: ئەمە دروست نییە، چونكە ئایەتەكەی یەكەم بۆ ئەوانەیە بوونە هۆی فیتنەیان لێ دەخوێنرێتەوە، ئەم ئایەتەش بۆ پیرەژنانە، بۆیە نەسخ بوونی نییە).

-ئایەتی(٥٤) ﴿قُلْ أَطِيعُوا اللَّهَ وَأَطِيعُوا الرَّسُولَ فَإِنْ تَوَلَّوا فَإِنَّمَا عَلَيْهِ مَا حُمِّلَ وَعَلَيْكُمْ مَا حُمِّلْتُمْ وَإِنْ تُطِيعُوهُ تَهْتَدُوا وَمَا عَلَى الرَّسُولِ إِلاَّ الْبَلاَغُ الْمُبِينُ﴾[2]

بانگكەرانی نەسخ پێیانوایە[3] ئەم ئایەتە بە ئایەتی شمشێر نەسخكراوەتەوە، ئەمە بۆچوونێكی پووچە لەبەر نەبوونی بەرهەڵستكاری نێوان دوو ئایەتەكە، گەر وا دابنێین بەرهەڵستكاری بوونی هەیە یەكەم گشتییە و گشتاندنەكەی بە ئایەتی شمشێر تایبەتكراوە، وەك پێشتر لە هاوشێوەكانی ئەمەدا لەو ئایەتانەی پێیانوایە بە ئایەتی شمشێر نەسخكراوەتەوە باسمان كرد.

ابن الجوزي[4] دەڵێت(هەندێكیان پێیانوایە نەسخكراوەتەوە بە ئایەتی شمشێر ئەوەش راست نییە، چونكە فەرمان بە جەنگان دژ بەوانە نەرێی ئەوە ناكات هەریەك كۆڵی خۆی هەڵدەگرێت، هەركاتێكیش دژیەكی لە نێوان نەسخكەر و نەسخكراودا بوونی نەبوو نەسخ بوونی نییە)

---

[1] نواسخ القرآن: ص٢٠٠.

[2] سورة النور/٥٤.

[3] لەوانە: ابن حزم الاندلسي: ص٤٨، وابن سلامة: ص٥٣.

[4] نواسخ القرآن: ص٢٠٠.

-ئايەتی (٥٨) ﴿يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لِيَسْتَأْذِنْكُمُ الَّذِينَ مَلَكَتْ أَيْمَانُكُمْ[١] وَالَّذِينَ لَمْ يَبْلُغُوا الْحُلُمَ مِنْكُمْ [٢] ثَلَاثَ مَرَّاتٍ[٣] مِنْ قَبْلِ صَلَاةِ الْفَجْرِ[٤] وَحِينَ تَضَعُونَ ثِيَابَكُمْ[٥] مِنَ الظَّهِيرَةِ[٦] وَمِنْ بَعْدِ صَلَاةِ الْعِشَاءِ [٧] ثَلَاثُ عَوْرَاتٍ لَكُمْ[٨] لَيْسَ عَلَيْكُمْ وَلَا عَلَيْهِمْ جُنَاحٌ بَعْدَهُنَّ طَوَّافُونَ عَلَيْكُمْ بَعْضُكُمْ عَلَى بَعْضٍ كَذَلِكَ يُبَيِّنُ اللَّهُ لَكُمُ الْآيَاتِ وَاللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ﴾.

دوای ئەوەی خودا-سبحانە وتعالی- ئاداب و ئەحکام و مۆڵەتوەرگرتنی ڕۆشن کردەوە لە خەڵکانی تر جگە لە خانەوادەی خۆی، لێرەشدا حوکمەکانی سەردان و

---

[١] لە بەندە و کەنیزەك، ئەوەی ڕۆشنە ئەوەیە حوکمی تایبەت بەوانە کۆتایی پێهاتووە، چونکە ئیسلام ڕێگەی زۆری گرتەبەر بۆ کۆتاپێهێنان بە کۆیلەکردنی مرۆڤ، بۆ هەتاهەتایە کۆتایی پێهات، بۆیە حوکمەکە تایبەت بەوانە کۆتایی پێهاتووە بەهۆی کۆتاهاتنی جێگەکەی(مەرامەکەی).

[٢] لە ئازادان و عەورەتی ئافرەت دەزانن و جیای دەکەنەوە.

[٣] واتە لە سێ کاتدا.

[٤] چونکە کاتی هەستانە لە خەو نەك پۆشاکی خەبەربوون.

[٥] لە ئاگاییدا دەپۆشرێ و لە کاتی قەیلولەدا لەبەر دەکرێتەوە.

[٦] واتە لەپێناو نیوەڕۆدا کە کاتی هەڵکردنی گەرمای توندە.

[٧] چونکە کاتی خۆ ڕووتکردنەوەیە لە جلوبەرگ و خەوتن لە جێگە.

[٨] واتە کاتی سێ عەورەت، "الصاوی" لەسەر تەفسیری "الجلالین" و هۆی دابەزینی ئەم ئایەتە دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) مێردمنداڵێکی ئەنصاری کە ناوی "مدلج بن عمرو" بوو نارد بۆ لای عومەری کوڕی خەتاب بۆ ئەوەی بانگی بکات، ئەویش بانگی کرد و بینی خەوتبوو و دەرگاکەی داخست بوو، منداڵەکە تەقەی دا لە دەرگا و بانگی لێ کرد، چووە ژوورەوە و عومەری بەئاگا هێنا و شتێ لە عەورەتی دەرکەوت، بۆیە عومەر وتی: ئاوات دەخوازم خودا نەهی بکات لە ڕۆڵەکانمان و ئافرەتەکانمان و خزمەتکارەکانمان بێنە ژوورەوە بۆ لامان لەم کاتانەدا مەگەر بە مۆڵەت، پاشان ڕۆیشت بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) بینی ئەم ئایەتە دابەزی بوو، بۆیە وەك شوکرکردن چوو بە سوژدەدا.

مۆڵـەتوەرگرتن لـە خانـەوادەی خـۆ ڕۆشـن دەکاتـەوە، خزمـەتکاران و کـەنیزەکان و منداڵانی جیاکەرەوە کە نەچوونەتە تەمەنی باڵغبوون و پێگەیشتنەوە دەتـوانن بـەبێ مۆڵەتی پێشینە بێنە ژوورەوە جگە لە سێ کات، ئەو سێ کاتە بـە سروشـتی خۆیـان کاتی دەرخستنی عـەورەتن، لـەو سـێ کاتـەدا لەسـەر خزمـەتکاران پێویسـتە داوای مۆڵـەت بکـەن، ئـەو سـێ کاتـەش: پـێش نوێـژی بـەیانی کـە خـەڵکی لـە جلوبـەرگی نوستندان، هەروەها کاتی قەیلولە چونکە جل و بەرگەکانیان دادەنێن و جل و بـەرگی نوستن لەبەر دەکەن بە مەبەستی پشوودان و نوستن، هەروەها دوای نوێژی عیشا کە جل و بەرگ فڕێدەدەن و جل و بەرگی نوستن لەبەر دەکەن.

خودا-سبحانه وتعالى- ئەو سێ کاتەی بە "عورات" ناوبردووە، وەك ڕێگەپێـدانێك بۆ دەرکەوتنی عەورەت تیایاندا، ئەمـەش لـە ئـەدەبی قورئـانی مەزنـە کـە زۆرێـك لـە خەڵکی لە ژیانی خێزانی خۆیاندا پشتگوێی دەخەن.

بانگکەرانی نەسخ[1] پێیانوایە ئەم ئایەتە کە ئـەم هـەموو ئادابـە مەزنانـەی تێدایـە نەسخکراوەتەوە بەو ئایەتەی بەدوایدا دێت، دەفەرموێت: ﴿وَإِذَا بَلَغَ الأَطْفَـالُ مِـنْكُمْ الْحُلُمَ فَلْيَسْتَأْذِنُوا[2] كَمَا اسْتَأْذَنَ الَّذِينَ مِنْ قَـبْلِهِمْ[3] كَذَلِكَ يُبَـيِّنُ اللَّـهُ لَكُـمْ آيَاتِـهِ وَاللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ﴾[4].

ئەم بۆچوونە پووچە لەبـەر نـەبوونی دژیـەکی لـە نێـوان دوو ئایەتەکـەدا، ئایـەتی یەکەم حوکمەکانی مۆڵەتوەرگرتن تایبـەت بـە خزمـەتکاران و کـەنیزەکان و منـداڵانی جیاکـەرەوە کـە نەگەیشـتوونەتە تەمـەنی ڕوشـد و بـاڵغبوون دەگرێتـەوە، ئەوانـە لەسەریانە پابەندبن بە مۆڵەتوەرگرتنەوە تەنها لە سێ کاتدا بەبێ مۆڵەت لە کاتەکانی

---

[1] ابن حزم الاندلسي: ٤٨، ابن سلامة: ١٥٣، ابـن البـارزي: ١٩٨، وابـن المسـيب نواسـخ القرآن لابن الجوزي: ص٢٠١.
[2] واتە لە هەموو کاتەکاندا.
[3] لە ئازادان و گەورەکان.
[4] سورة النور/٥٩.

تردا، ئایەتی دووەم حوکمی مۆڵەت وەرگرتنی ڕۆشن کردۆتـەوە تایبـەت بـە گـەورانی ئازاد، ئەوان دەبێت لە هەموو کاتەکاندا مۆڵەت وەربگرن، بۆیە دوو ئایەتەکە لە بابەت و حوکم و کاتـدا لـە یـەکتر جیـاوازن، دەبـێ بەرهەڵسـتی لـە کوێـدا بێـت–عاشـقانی نەسخ– هەتا بە نەسخکردنەوە هەڵبگیرێت؟

"النحاس"[1]دەڵێت: لەم ئایەتەدا شەش قسە هەیە، قسەی شەشهەم ئەوەیـە کـە ئایەتەکە موحکەم و واجب و جێگیرە لەسەر پیاوان و ئافرەتان، ئەمە قسەی زۆریـەی ئەهلی زانستە.

"ابن الجوزی"[2] دەڵێت: لەسـەر ئـەم ئایەتـە جیاوازییـان لـە نێواندایـە، زۆریـەیان پێیانوایە ئایەتەکە موحکەمە[3].

---

[1] الناسخ والمنسوخ: ص١٩٨.

[2] نواسخ القرآن: ص٢٠٠.

[3] لە سـەرخەرانی نەسـخ نەبوونـەوە: الالوسي: ٢١٤/١٨، والـرازي: ٣٢/٢٤، والقـرطبي: ٣٠٢/١٢.

# نەسخی بانگەشەبۆکراو لە سورەتی "الفرقان"دا

"ابن حزم الاندلسي"[1] دەڵێت: ئەم سورەتە دوو ئایەتی نەسخکراوی تێدایە، "ابن سلامة"[2] دەڵێت: لەم سوورەتەدا دوو ئایەتی نەسخکراوی تێدایە بە یەکەوە لکاون، "ابن البارزي"[3]شوێنی ئەو دوانە کەوتووە، "النحاس"[4]دەڵێت: تەنها یەك ئایەتی تێدایە[5]، "ابن الجوزي"[6] بانگەشەی نەسخبوونەوەی ئایەتی گواستۆتەوە لەژێر ناونیشانی: دەروازەی باسی ئەو ئایەتانەی کە پێیانوایە لە سورەتی "الفرقان" نەسخکراونەتەوە.

﴿أَرَأَيْتَ مَنْ اتَّخَذَ إِلَهَهُ هَوَاهُ أَفَأَنْتَ تَكُونُ عَلَيْهِ وَكِيلاً﴾ (٤٣)

﴿وَعِبَادُ الرَّحْمَانِ الَّذِينَ يَمْشُونَ عَلَى الأَرْضِ هَوْنًا وَإِذَا خَاطَبَهُمْ الْجَاهِلُونَ قَالُوا سَلاَمًا﴾ (٦٣)

﴿وَالَّذِينَ لاَ يَدْعُونَ مَعَ اللَّهِ إِلَهًا آخَرَ وَلاَ يَقْتُلُونَ النَّفْسَ الَّتِي حَرَّمَ اللَّهُ إِلاَّ بِالْحَقِّ وَلاَ يَزْنُونَ وَمَنْ يَفْعَلْ ذَلِكَ يَلْقَ أَثَامًا﴾ (٦٨)

---

[1] الناسخ والمنسوخ: ص٤٨.
[2] الناسخ والمنسوخ: ص١٥٤.
[3] المرجع السابق: ص١٩٩.
[4] الناسخ والمنسوخ: ص٢٠٢.
[5] وهي الآية/٦٣.
[6] ص٢٠٢.

-ئایەتی(٤٣) ﴿أَرَأَيْتَ مَنْ اتَّخَذَ إِلَهَهُ هَوَاهُ أَفَأَنْتَ تَكُونُ عَلَيْهِ وَكِيلاً﴾[1]
پێیانوایە ئەم ئایەتە نەسخکراوەتەوە بە ئایەتی شمشێر.

ئەم بۆچوونە پووچە لەبەر نەبوونی هیچ جۆرە بەرهەڵستکارییەك لە نێوان دوو ئایەتەکەدا، تەنها ئەوەی "ابن الجوزي"[2] وتویەتی دەگوێزمەوە: ("الكلبي" پێیوایە بە ئایەتی شمشێر نەسخکراوەتەوە، ئەوەش دروست نییە، چونکە ماناکەی بریتییە لە "أفأنت تكون حفيظاً عليه-ئایا تۆ چاودێر و پارێزەری لەسەر ئەو" تا بیپارێزیت لە شوێنکەوتنی ئارەزووەکانی، بۆیە بۆ نەسخ رووبەك بوونی نییە).

-ئایەتی(٦٣) ﴿وَعِبَادُ الرَّحْمَانِ الَّذِينَ يَمْشُونَ عَلَى الأَرْضِ هَوناً[3] وَإِذَا خَاطَبَهُمْ الْجَاهِلُونَ[4] قَالُوا سَلاماً﴾[5]
پێیانوایە[6] نەسخکراوەتەوە بە ئایەتی شمشێر.

لە بەرپەرچدانەوەی وتنی نەسخی ئەم ئایەتە تەنها ئەوەی "ابن الجوزي"[7] وتویەتی دەگوێزمەوە: وتنی نەسخی ئەم ئایەتە بە ئایەتی شمشێر پووچ و بێبنەمایە،

---

[1] سورة الفرقان/٤٣.
[2] ص٢٠٢.
[3] واتە بە ئارامی و تەوازوعەوە.
[4] ببەوەی لایان ناپەسەندە.
[5] سورة الفرقان/٦٣، "قالوا سلاماً" واتە قسەیەك تیایدا لە گوناه و خراپە سەلامەت بن، چونکە لە ئەخلاقی موسڵمان لەبەر رۆشنایی قورئانی مەزندا ئەوەیە بە چاکە رووبەرووی خراپە ببێتەوە، گەر خراپە نەگەیشتە رادەی دەستدرێژی بۆ سەر بەرژەوەندییە زەرورەکان.
[6] ابن حزم: ٤٩، ابن البارزي: ١٩٩.
[7] ص٢٠٢.

چونکه ناوی "الجاهل" هاوەڵدانەر و کەسانی تریش دەگرێتەوە، گەر هاوەڵدانەرێك قسەیان لەگەڵ بکەن قسەی دروست و ڕەوا دەکەن لە بەرپەرچدانەوەیان، جوانی گفتوگۆ نەرێی جەنگان ناکات، بۆیە ڕوویەك بۆ نەسخ بوونی نییە[1]

-ئایەتی(٦٨) ﴿وَالَّذِينَ لاَ يَدْعُونَ مَعَ اللَّهِ إِلَهًا آخَرَ وَلاَ يَقْتُلُونَ النَّفْسَ الَّتِي حَرَّمَ اللَّهُ إِلاَّ بِالْحَقِّ وَلاَ يَزْنُونَ وَمَنْ يَفْعَلْ ذَلِكَ يَلْقَ أَثَامًا﴾[2]

"ابن حزم"[3] و ابن سلامة"[4] ئەوانەی شوێنی ئەو دوانە کەوتوون لەم بۆچوونەدا دەڵێن بە هەڵواردن(الإستثناء)ەکە نەسخکراوەتەوە کە لە ئایەتی (٧٠)دا هاتووە: ﴿إِلاَّ مَنْ تَابَ وَآمَنَ وَعَمِلَ صَالِحًا﴾الآية.

ئەم بۆچوونە پووچە، چونکە تێکەڵییە لە نێوان نەسخ و تایبەتکردندا بە هەڵواردنەکە.

"ابن الجوزی"[5] دەڵێت: ئەم ئایەتە﴿وَلاَ يَقْتُلُونَ النَّفْسَ الَّتِي حَرَّمَ اللَّهُ إِلاَّ بِالْحَقِّ﴾ هەتا ﴿إِلاَّ مَنْ تَابَ﴾ زانایان دوو قسەیان لەسەری هەیە:

یەکەم: نەسخکراوەتەوە، ئەوانە لەسەر نەسخکەرەوەکەی سێ قسەیان هەیە:

نەسخکەر بریتییە لەم ئایەتە:﴿وَمَنْ يَقْتُلْ مُؤْمِنًا مُتَعَمِّدًا فَجَزَاؤُهُ جَهَنَّمُ﴾ الآية.

"ابن عباس" (ﷺ) ئەمەی وتووە، زۆریەیان پێچەوانەی ئەوەن و پێیانوایە کوشتن مانەوەی هەتاهەتایی لە ناو ئاگردا پێویست ناکات.

نەسخکەر بریتییە لەم ئایەتە:﴿إِنَّ اللَّهَ لاَ يَغْفِرُ أَنْ يُشْرَكَ بِهِ﴾[6] الآية.

---

[1] لە سەرخەرانی نەسخ نەبوونەوە: الالوسي: ١٩/٤٤، والرازي: ٢٤/١٨٠، والقرطبي: ١٣/٧٠.

[2] سورة الفرقان/٦٨.

[3] ص٤٨.

[4] ص١٥٤.

[5] ص٢٠٢.

[6] سورة النساء/٤٨.

ئەمەش ڕاست نییە، چونکە هاوەڵدانەر خودا لێیخۆش نابێت گەر وەك هاوەڵدانەر بمرێت.

نەسخکەرەکەی بریتییە لەو هەڵواردنەی لە ئایەتی (٧٠)دا هاتووە، ئەمەش پووچ و بێبنەمایە چونکە هەڵواردن نەسخ نییە.

قسەی دووەم: ئایەتەکە موحکەمە و مانەوەی هەتاهەتایی کاتێکە هاوەڵدانان لەپاڵ کوشتن و زینادا بێت[1].

---

[1] نواسخ القرآن–ابن الجوزي: ٣٠٢.

# نەسخی بانگەشەبۆکراو لە سورەتی "الشعراء"

بانگەشەکەرانی نەسخ پێیانوایە[1] لەم سورەتەدا یەك ئایەت هەیە نەسخکراوەتەوە، ئەوەش: ئایەتی ﴿وَالشُّعَرَاءُ يَتَّبِعُهُمُ الْغَاوُونَ(٢) أَلَمْ تَرَى أَنَّهُمْ فِي كُلِّ وَادٍ(٣) يَهِيمُونَ(٤) وَأَنَّهُمْ يَقُولُونَ مَا لاَ يَفْعَلُونَ﴾[5]

دەڵێن ئایەتی(٢٢٤) بەو هەڵاوردنەی تێیدایە نەسخکراوەتەوە کە بریتییە لە: ﴿إِلاَّ الَّذِينَ[6] آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ وَذَكَرُوا اللَّهَ كَثِيرًا﴾ الآية.

ئەمەش بۆچوونێکی پووچە گەر مەبەستیان بە نەسخ تایبەتکردن نەبێت، چونکە هەڵاوردنەکە بۆ تایبەتکردنە، پاشان ئایەتەکە هەواڵە و هەواڵیش ناچێتە ژێر نەسخەوە[1].

---

(١) ابن حزم ٤٩ ابن سلامة ١٥٥ ابن البارزي ١٩٩ ورواه النعمان عن ابن عباس النحاس ص٢٠٣ ونسب القول الى عكرمة ابن الجوزي ص٢٠٥

(٢) سورة الشعراء/٢٢٤ "الغاوون" كۆی "الغاوي"ە بە مانای گومڕاو شوێنکەوتەی ئارەزوو.

(٣) لە دۆڵەکانی کەلام و هونەرەکانی.

(٤) واتە دەڕۆن و سنوور دەبەزێنن بە مەدح و و هێرشکردن.

(٥) سورة الشعراء/٢٢٥.

(٦) ئەوانە بریتی بوون لە شاعیرە موسڵمانەکان لەوانە: "حسّان (ابو الوليد) بن ثابت الخزرجي الانصاري" شاعر الرسول(ﷺ). و" كعب بن مالك" یەکێك لە شاعیرەکانی پێغەمبەر(ﷺ) بوو کە بەرگرییان لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) دەکرد(ت–٥٣هـ) خزانة الادب: ١/٢٠٠، وعبد الله بن رواحة الخزرجي الانصاري.

# نەسخی بانگەشەبۆکراو لە سورەتی "النمل"دا

بانگکەرانی نەسخ پێیانوایە لەم سورەتەدا تەنها یەك ئایەت نەسخکراوەتەوە[1]، ئەوەش: ﴿وَأَنْ أَتْلُوَ الْقُرْآنَ[2] فَمَنْ اهْتَدَى فَإِنَّمَا يَهْتَدِي لِنَفْسِهِ وَمَنْ ضَلَّ فَقُلْ إِنَّمَا أَنَا مِنْ الْمُنذِرِينَ﴾[3] هەروەها دەڵێن[4] ئەو ئایەتە بە ئایەتی شمشێر نەسخکراوەتەوە.

ئەم بۆچوونە پووچ و بێبنەمایە، چونکە تێکەڵکردنە لە نێوان تایبەتکردنی گشتی و نەسخدا، هەروەها لەبەر ئەوەی لەم ئایەتەدا هەڕەشە بوونی هەیە و هەڕەشەش ناچێتە ژێر نەسخەوە[5].

کاری پێغەمبەر(ﷺ) بریتییە لە ترساندن﴿تَبَارَكَ الَّذِي نَزَّلَ الْفُرْقَانَ عَلَى عَبْدِهِ لِيَكُونَ لِلْعَالَمِينَ نَذِيرًا﴾[6]. بەڵام کاری ئایەتی شمشێر بریتییە لە بەرگری لە بەرژەوەندییە پێویستەکان هەر کات رووبەرووی دەستدرێژی بوونەوە، ئیسلام ئایینی رشتنی خوێن نییە و بە شمشێر بەسەر کەسدا ناسەپێنرێت وەك چەندین جار باسمان کرد.

---

(١) لە سەرخەرانی نەسخ نەبوونەوە: الالوسي: ١٩/١٤٥، والرازي: ٢٤/١٧٥.

(٢) واتە فەرمانم پێکراوە قورئان بخوێنمەوە.

(٣) سورة النمل/٩٢.

(٤) لەوانە: ابن حزم ٤٩، ابن سلامة ١٩٦، ابن البارزي ١٩٩، وقتادة، نواسخ القرآن لابن الجوزي ٢٠٥.

(٥) "ابن الجوزي"/ المرجع السابق، دەڵێت: قسەمان لە رەگەزی ئەمە کرد و رۆشنمان کردەوە دروست ئەوەیە نەسخ نەبووەتەوە.

(٦) سورة الفرقان/١.

# نەسخی بانگەشەبۆکراو لە سورەتی "القصص"دا

بانگکەرانی نەسخ پێیانوایە[1] نەسخ لەم سورەتەدا بریتییە لە ئایەتی(٥٥) کە بە ئایەتی شمشێر نەسخکراوەتەوە، ئەوەش بریتییە لە: ﴿وَإِذَا سَمِعُوا اللَّغْوَ أَعْرَضُوا عَنْهُ وَقَالُوا لَنَا أَعْمَالُنَا وَلَكُمْ أَعْمَالُكُمْ سَلَامٌ عَلَيْكُمْ لَا نَبْتَغِي الْجَاهِلِينَ﴾

ئەوەی لەم ئایەتەدا هاتووە[2] لە ئادابی مامەڵەکردن لەگەڵ کەسانی تر موسڵمان و ناموسڵمان لە جوانترین و ناوازەترین ئادابەکانی قورئانی مەزنە، مرۆڤی فێرکردووە چۆن مامەڵە لەگەڵ خەڵکیدا بکات کاتی بەریەککەوتن لەگەڵیان.

بانگەشەی نەسخ پووچ و بێبنەمایە و شایستەی بەرپەرچدانەوە نییە بەهۆی ئاشکرابوونی پووچییەکەیەوە، تەنها بەوەندە دەوەستم "النحاس"[3] دەیڵێت: زانایان لەسەر ئەم ئایەتە چوار قسەیان هەیە، قسەی چوارەم ئەوەیە ئەم ئادابە ئادابێکی جوانە و گفتوگۆکردنە بە جوانی و بە باشی بۆیە نەسخی تێدا نییە.

قسەیەك دەخەمە سەر ئەو قسەیە و دەڵێم گەر بۆچوونی بانگکەرانی نەسخ وەربگرین ئەوا پێویست لەسەر موسڵمان بریتی دەبێت لە جەنگ و کوشتار بە درێژایی ژیان بەبێ پێدانی هیچ جۆرە گرنگییەك بە لایەنەکانی تری ژیان.

---

(١) ابن حزم ٤٥، ابن سلامة ١٥٦، ابن البارزي ٢٠٠.

(٢) لە سەرخەرانی نەسخ نەبوونەوە: الرازي: ٢٦٣/٢٤، والالوسي: ٩٥/٢٠، القرطبي: ٢٩٨/١٣.

(٣) الناسخ والمنسوخ: ص٢٠٣.

# نەسخی بانگەشەبۆکراو لە سورەتی "العنكبوت"دا

هەندێ پێیانوایە[1] لەم سورەتەدا تەنها یەك ئایەتی نەسخکراو هەیە ئەویش ئایەتی(٤٦) کە بە ئایەتی(٢٩)ی سورەتی "التوبة" نەسخکراوەتەوە، هەندێکی تر[2] ئایەتی (٥٠)شی دەخەنە سەر و دەڵێن بە ئایەتی شمشێر نەسخکراوەتەوە.

| | |
|---|---|
| ﴿وَلاَ تُجَادِلُوا أَهْلَ الْكِتَابِ إِلاَّ بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ إِلاَّ الَّذِينَ ظَلَمُوا مِنْهُمْ وَقُولُوا آمَنَّا بِالَّذِي أُنْزِلَ إِلَيْنَا وَأُنْزِلَ إِلَيْكُمْ وَإِلَهُنَا وَإِلَهُكُمْ وَاحِدٌ وَنَحْنُ لَهُ مُسْلِمُونَ﴾ | (٤٦) |
| ﴿وَقَالُوا لَوْلاَ أُنْزِلَ عَلَيْهِ آيَاتٌ مِنْ رَبِّهِ قُلْ إِنَّمَا الآيَاتُ عِنْدَ اللَّهِ وَإِنَّمَا أَنَا نَذِيرٌ مُبِينٌ﴾ | (٥٠) |

(١) ابن حزم: ٥٠، ابن سلامة: ١٥٧.

(٢) لەوانە: ابن المارزي: ص٢٠٠.

–ئایەتی(٤٦) ﴿وَلاَ تُجَادِلُوا أَهْلَ الْكِتَابِ إِلاَّ بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ إِلاَّ الَّذِينَ ظَلَمُوا مِنْهُمْ وَقُولُوا آمَنَّا بِالَّذِي أُنْزِلَ إِلَيْنَا وَأُنْزِلَ إِلَيْكُمْ وَإِلَهُنَا وَإِلَهُكُمْ وَاحِدٌ وَنَحْنُ لَهُ مُسْلِمُونَ﴾[1]

واتە تەنها بە ڕێگەی باش و جوان موجادەلە لەگەڵ ئەهلی کیتابدا بکەن[2] وەك ڕووبەڕووبوونەوەی زبری و ڕەقییان بە نەرمونیانی و کاری گێرەشێوێنییان بە ئامۆژگاری، مەگەر ئەوانەیان ستەم دەکەن بە زیادەڕەوی لە دەستدرێژکاری، پێیان بڵێن جیاوازی لە نێوان ئێمە و ئێوەدا بوونی نییە جگە لەوەی کە ئارەزووەکانتان و وەهمەکانتان بەسەر ئێوەیدا دەسەپێنن.

ئایەتی نەسخکەر بەپێی بۆچوونی ئەوان بریتییە لەم ئایەتە: ﴿قَاتِلُوا الَّذِينَ لاَ يُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَلاَ بِالْيَوْمِ الآخِرِ... وَلاَ يَدِينُونَ دِينَ الْحَقِّ﴾[3].

بانگەشەی نەسخ پووچ و بێبنەمایە لەبەر نەبوونی بەرهەڵستکاری لە نێوان دوو ئایەتەکەدا بەو هەڵاوردنەی تیایدا هاتووە لە ئایەتی(٤٦)دا کە ئەم بەشەیە: ﴿إِلاَّ الَّذِينَ ظَلَمُوا مِنْهُمْ﴾[4]، واتە بە هاوەڵدانان ستەمیان لە نەفسی خۆیان کرد و دواتر ستەمییان لە ئێوە کرد بە دەستدرێژی کردنە سەر بەرژەوەندییە زەرورییەکانتان لە ئایین و ژیان و ناموس و ماڵ و سامان، لەو بارەدا پێویستە بەرپەرچی ستەمەکەیان بدەنەوە لە ڕێگەی بەکارهێنانی هێزەوە لە دوای شکستخواردنی گفتوگۆ بە باشترین و چاکترین ڕێگە و شێواز، ئەمە هەمان حوکمی هاتووە لە ئایەتی (٢٩)دا، گەر بەرهەڵستکاری بوونی نەبێت نەسخ لە کوێدا دروستە؟

---

(١) سورة العنكبوت/٤٦.

(٢) وەك لە ئایەتی: {وَجَادِلْهُمْ بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ}.

(٣) سورة التوبة/٢٩.

(٤) سورة العنكبوت/٥٠.

–ئایەتی(٥٠):﴿وَقَالُوا لَوْلاَ أُنْزِلَ عَلَيْهِ آيَاتٌ مِنْ رَبِّهِ قُلْ إِنَّمَا الآيَاتُ عِنْدَ اللَّهِ وَإِنَّمَا أَنَا نَذِيرٌ مُبِينٌ﴾

پێیانوایە بە ئایەتی شمشێر نەسخکراوەتەوە[1].

ئـەم بۆچـوونە پـووچ و بێبنەمایـە لەبـەر نـەبوونی بەرهەڵسـتکاری لـە نێـوان دوو ئایەتەکەدا، چونکە ئایەتی: ﴿إِنَّمَا أَنَا نَذِيرٌ﴾ مانای رێگەنەدان بـە بـەکارهێنانی هێـز ناگەیەنێت لە باری بەرگری شەرعیدا، ئەرکی سەر شـانی پێغەمبـەر(ﷺ) بریتییـە لـە ترساندن، هەروەها کاری هەموو مرۆڤێك پێغەمبەر بێت یان کەسێکی ئاسایی بریتییـە لە بەرپەرچدانەوەی دوژمنکاری هەر کات رووبەرووی دەبێتەوە ئەوەش بە ئەنـدازەی بەرپەرچدانەوەی دوژمنکارییەکە بەپێی ئایەتی: (فمن اعتدى عليكم فاعتـدوا عليـه بمثل ما اعتدى عليكم ولا تعتدوا).

"ابن الجوزي"[2] دەڵێت: (ئایەتی:﴿إِنَّمَا أَنَا نَذِيرٌ مُبِينٌ﴾ هەندێك پێیانوایـە بـە ئایەتی شمشێر نەسخکراوەتەوە، ئـەو نەسـخە کاتێـك ئەگـەری هـەبوو لـەم ئایەتـەدا بوایە:﴿وَمَا أَنَا إِلاَّ نَذِيرٌ﴾ بەڵام لێرەدا نـەخێر، چـونکە ئـەم ئایەتـە ئـەوەی جێگیر کردووە کە پێغەمبـەر(ﷺ) ترسـێنەرە، حوکمەکانیشـی پاڵپشـتی ئـەوە دەکـەن کـە ئایەتەکە هەواڵە).

---

(١) ينظر ابن البارزي المرجع السابق: ص٢٠٠.

(٢) ص٢٠٧.

# نەسخی بانگەشەبۆکراو لە سورەتی "الروم"دا

هەندێك پێیانوایە[1] ئایەتی (٦٠)ی ئەم سورەتە بە ئایەتی شمشێر نەسخکراوەتەوە، خودا–سبحانه وتعالى–دەفەرموێت:﴿فَاصْبِرْ إِنَّ وَعْدَ اللَّهِ حَقٌّ وَلاَ يَسْتَخِفَّنَّكَ الَّذِينَ لاَ يُوقِنُونَ﴾[2]

بانگەشەی نەسخبوونەوەی ئەم ئایەتە پووچ و بێبنەمایە، چونکە فەرمان بە "ئارامگرتن" نەهی لە جەنگان پێویست ناکات لە کاتی داواکاری جەنگاندا بۆیە هیچ بەرهەڵستکارییەك بوونی نییە، لەوێشەوە نەسخ بوونی نییە.

"ابن الجوزي"[3] دەڵێت: ("السدي"پێیوایە ئەو ئایەتە بە ئایەتی شمشێر نەسخکراوەتەوە، ئەمە کاتێك راستە ئایەتەکە فەرمانی کردبێت بە ئارامگرتن لە جەنگان دژ بەوانە، بەڵام گەر ئەگەری ئەوە هەبێت فەرمانی کردووە بە ئارامگرتن لەسەر ئەو شتانەی فەرمانی پێکردووە و ئەو شتانەی نەهی لێکردووە ئەوا وێنای نەسخ بوونەوە ناکرێت).

---

(١) ابن حزم: ص٥٠، ابن سلامة: ص١٥٨، ابن البارزي: ص٢٠٠ وغيرهم.

(٢) سورة الروم/٦٠.

(٣) نواسخ القرآن: ص٢٠٧.

# نەسخی بانگەشەبۆکراو لە سورەتی "لقمان"دا

بانگکەرانی نەسخ پێیانوایە لەم سورەتەدا یەك ئایەت نەسخکراوەتەوە، ئەوەش ئایەتی: ﴿وَمَنْ كَفَرَ فَلاَ يَحْزُنْكَ كُفْرُهُ إِلَيْنَا مَرْجِعُهُمْ فَنُنَبِّئُهُمْ بِمَا عَمِلُوا إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ بِذَاتِ الصُّدُورِ﴾[1]

بەپێی بۆچوونی ئەوان ئایەتەکە بە ئایەتی شمشێر نەسخکراوەتەوە[2].

ئەم بۆچوونە پووچ و بێبنەمایە بەم هۆیانە:

١-نەبوونی بەرهەڵستی لە نێوان دوو ئایەتەکەدا، وەك چۆن لای هەموو خاوەن ژیرییەکی تەندروست رۆشنە، گەر وا دابنێین بەرهەڵستی بوونی هەیە ئەوا بە تایبەتکردن هەڵدەگیرێت، بۆیە هیچ پاساوێك بۆ نەسخبوونەوە بوونی نییە.

٢-لە ئایەتەکەدا هەڕەشە بوونی هەیە و هەڕەشەش ناچێتە ناو نەسخەوە.

٣-ئایەتەکە هەواڵە و هەواڵیش حوکمەکانی نەسخی بەسەردا گوزەر ناکات.

"ابن الجوزي"[3] دەڵێت: (ئایەتی: ﴿وَمَنْ كَفَرَ فَلاَ يَحْزُنْكَ كُفْرُهُ﴾، هەندێك لە ئەهلی تەفسیر پێیانوایە بە ئایەتی شمشێر نەسخکراوەتەوە، هەندێکیش دەڵێن ماناکەی بە ئایەتی شمشێر نەسخکراوەتەوە نەك گوزارەکەی، ئەم قسەیە هیچ بنەمایەکی نییە، چونکە ئایەتەکە دڵنەوایی پێغەمبەر(ﷺ) لەخۆ دەگرێت لە کاتی دڵتەنگیدا، ئەوەش نەرێی جەنگان ناکات).

---

(١) سورة لقمان/٢٣.

(٢) ابن حزم: ٥٠، ابن سلامة: ١٥٨، ابن البارزي: ٢٠٠.

(٣) نواسخ القرآن: ص٢٠٨.

# نەسخی بانگەشەبۆکراو لە سورەتی "السجدة"دا

هەندێك پێیانوایە[1] ئایەتی (٣٠)ی ئەم سورەتە کە دوایین ئایەتە ئەم بەشەی: ﴿فَأَعْرِضْ عَنْهُمْ وَانْتَظِرْ إِنَّهُمْ مُنْتَظِرُونَ﴾نەسخکراوەتەوە بە ئایەتی شمشێر

ئەمەش بۆچوونێکی پووچە بە چەندین هۆ، لەوانە:

١-نەبوونی هیچ جۆرە بەرهەڵستکارییەك لە نێوان ئەم ئایەتە و ئایەتی شمشێردا، چونکە مانای ئایەتەکە دەڵێت چاوەڕوانی کات و بەڵێنی من بە بۆ سەرخستنت بەسەر دوژمنەکانتدا، ئەوان چاوەڕوانی ڕووداوەکانی ڕۆژگارن بەسەر تۆدا بێت لە مردن و کوشتن، ئەوکات لە دەستت بحەوێنەوە، ئایا ئەم مانایە لە داهاتوودا جەنگان حەرام دەکات هەر کات پێویستیان پێی بوو تا ئەو حەرامکردنە بە واجبوونی جەنگان -لە

---

(١) ابن حزم الاندلسي: ص٥٠، ابن سلامة: ١٥٨، ابن البارزي: ص٢٠١ رواه الضحاك النسخ عن ابن عباس النحاس: ص٢٠٧، وابن الجوزي: ٢٠٨" وقال الصاوي: ٢٦٧/٣: "فاعرض عنهم" واتە وازیان لێ بهێنە و پشتیان تێبکە و پەلاماریان مەدە، ئەمەش پێش فەرمان کردن بوو بە جەنگ لەگەڵیان، بۆیە نەسخکراوەتەوە بە ئایەتی جیهاد، ئەگەری ئەوەش هەیە ئایەتەکە موحکەم بێت، بەردەوام دەبێت "فأعرض عنهم" عوزری ئەو کەسانەی لەوانە موسڵمان دەبێت وەربگرە و ئەوەی ئەو لەسەریەتی و لێی وەشاوەتەوە وازی لێ بهێنە.

کاتی پێویستدا– نەسخ بکرێتەوە؟ بەرهەڵستکاری لە کوێدایە تا بە نەسخ هەڵبگیرێت کە بریتییە لە سڕینەوەی وەحی بێشوو بەو وەحییەی بەدوایدا دێت؟

٢–چاوەڕوانی رەوشی تایبەت بەخۆی هەیە و جەنگانیش رەوشی تایبەت بەخۆی هەیە، لە مەرجەکانی بەرهەڵستکاری و دژیەکی بریتییە لە یەکێتی رەوش و کات.

٣–ئەوە بەڵێنە لە خوداوە، بەڵێن و هەڕەشە نەسخیان بەسەردا گوزەر ناکات.

# نەسخی بانگەشەبۆکراو لە سورەتی "سبأ"دا

بانگکەرانی نەسخ پێیانوایە[1] لەم سورەتەدا ئایەتی(٢٥) بە ئایەتی شمشێر سڕاوەتەوە، ئایەتەکە: ﴿قُلْ لاَ تُسْأَلُونَ عَمَّا أَجْرَمْنَا وَلاَ نُسْأَلُ عَمَّا تَعْمَلُونَ﴾

وتنی نەسخی ئەم ئایەتە بۆچوونێکی پووچ و بێبنەمایە بەجۆرێك پووچکردنەوەی ئاتاج بە هێنانی بەڵگە ناکات بەهۆی روونی و ئاشکرایی و بەڵگەنەویستییەوە، بەڵگەهێنانەوەش بۆ بەڵگەنەویست لە دەروازەی بێمانایییە، سەرەڕای ئەوەش بەوانە دەڵێم: ئەم ئایەتە رێسایەکی دەستووری کردارییە و هەموو دەستوورەکان و یاساکانی دەوڵەتانی جیهان وەریانگرتووە و کاریان پێکردووە، ئەم رێسایە لە دیاردەکانی مەزنی ئیسلامە کە دانی بە بەرپرسیار نەبوونی هەموو مرۆڤێکدا ناوە لەو کارە تاوانکاریانەی کەسانی تر ئەنجامی دەدەن گەر ئەو کەسە خاوەنی ژیری بێت، بەڵام گەر کەسەکە ناکام بوو و لەژێر وەسێتداریدا بوو یان لەژێر سەرپەرشتیاریدا بوو ئەوا وەسێتدارەکە یان سەرپەرشتیارەکە بەرپرسیارە لە زیانگەیاندن بە کەسانی تر لەلایەن کەسە ناکامەکەوە، گەر سەرپەرشتیار یان وەسێتدار لەو کارە رێگری لێ نەکات، چەندین ئایەتی تر بوونی هەیە هاوواتای ئەم ئایەتەیە، لەوانە: ﴿وَلاَ تَكْسِبُ

---

(١) ابن حزم الاندلسي: ٥١، ابن سلامة: ١٥٩.

كُلُّ نَفْسٍ إِلاَّ عَلَيْهَا وَلاَ تَـزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْـرَى﴾[1] هـەروەها ئایـەتی: ﴿وَمَـنْ ضَـلَّ فَإِنَّمَا يَضِلُّ عَلَيْهَا وَلاَ تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَى﴾[2].

"ابن الجوزي"[3] دەڵێت: هیچ ڕوویەك بۆ نەسخبوونەوەی نابینم، چـونکە گـرتنی هەر کەسێك بە کاری خۆی ڕێگری لە جەنگان ناکات.

---

(١) سورة الانعام/١٦٤.

(٢) سورة فاطر/١٨.

(٣) نواسخ القرآن: ٢١١.

# نەسخی بانگەشەبۆکراو لە سورەتی "الفاطر"دا

سەرخەرانی نەسخ پێیانوایە[1] لەم سورەتەدا: ئایەتی(٢٣)﴿إِنْ أَنْتَ إِلاَّ نَذِيرٌ﴾ بە ئایەتی شمشێر نەسخکراوەتەوە.

ئەوەی بەڵگەیە لەسەر پووچی ئەم بۆچوونە ئایەتی(٢٤)ە کە راستەوخۆ بەدوایدا دێت، ئەوەش:﴿إِنَّا أَرْسَلْنَاكَ بِالْحَقِّ بَشِيرًا وَنَذِيرًا وَإِنْ مِنْ أُمَّةٍ إِلاَّ خلاَ فِيهَا نَذِيرٌ﴾ بۆیە کار و ئەرکی پێغەمبەران–سەلامی خودایان لەسەر بێت– بریتییە لە گەیاندنی حەق و پەیامی خودایی و رۆشنکردنەوەی ئەوەی هەر کەس بە ئەندازەی گەردیلەیەك خێر ئەنجام بدات خودا دەیبینێت و هەر بەو جۆرە هەر کەس بە ئەندازەی گەردیلەیەك شەڕ ئەنجام بدات خودا دەیبینێت، ئەمەش بەرهەڵستی ناکات لەگەڵ ئایەتی شمشێر و بەکارهێنانی شمشێر دژ بە دەستدرێژکار هەر کات پێویست بوو.

"ابن الجوزي"[2] دەڵێت: هەندێ لە ئەهلی تەفسیر دەڵێن ماناکەی بە ئایەتی شمشێر نەسخکراوەتەوە، لە هاوشێوەکانی ئەمانە قسەمان کرد و رۆشنمانکردەوە ئەوە نەسخ نییە.

---

(١) لەپێش هەموویانەوە: ابن حزم: ٥١، ابن سلامة: ١٦٠، ابن البارزي: ٢٠١.

(٢) نواسخ القرآن: ص٢١٢.

# نەسخی بانگەشەبۆکراو لە سورەتی "الصافات"دا

عاشقانی نەسخ پێیانوایە[1] لەم سورەتەدا چوار ئایەتی نەسخکراو بوونی هەیە کە بە ئایەتی شمشێر نەسخکراونەتەوە، ئەو چوارەش ئایەتی:(١٧٤ و١٧٥ و١٧٨ و١٧٩):

ئایەتی(١٧٤) ﴿فَتَوَلَّ[2] عَنْهُمْ حَتَّى حِينٍ ﴾[3]
ئایەتی(١٧٥) ﴿وَأَبْصِرْهُمْ فَسَوْفَ يُبْصِرُونَ ﴾
ئایەتی(١٧٨) ﴿وَتَوَلَّ عَنْهُمْ حَتَّى حِينٍ﴾
ئایەتی(١٧٩) ﴿وَأَبْصِرْ فَسَوْفَ يُبْصِرُونَ﴾
پێیانوایە ئەم چوار ئایەتە هەریەکەیان بە ئایەتی شمشێر نەسخکراوەتەوە.

ئایەتی (١٧٤) لە ئایەتی(١٧٨)دا دووبارە بووەتەوە، هەروەها ئایەتی(١٧٥)یش لە ئایەتی (١٧٩)دا دووبارە بووەتەوە، وەك دڵنیاکردنەوەیەك بۆ هەڕەشەلێکردنیان

---

(١) لەوانە: ابن حزم: ٥٢، ابن سلامة: ١٦٠، ابن البارزي: ٢٠٢ مقاتل بن حيان نواسخ القرآن: ٢١٢ غيرهم من عشاق النسخ.
(٢) واتە پشت هەڵبکە لە بێباوەڕانی مەکە.
(٣) واتە تا کاتی هەستانیان بەوەی پێویست دەکات دژ بەوانە هێز بەکاربهێنی یان تا کاتی مردنیان و دادگایی کردنیان لەلای خوداوە(ﷻ).

بەوەی خودا لە داهاتوودا لە دونیا یان لە دواڕۆژدا دادگاییان دەکات، هەروەها بۆ دڵنەوایی پێغەمبەر(ﷺ)

بانگەشەی نەسخبوونەوەی ئەو چوار ئایەتە پووچە بە چەندین بەڵگە لەوانە:

١-نەبوونی هیچ جۆرە بەرهەڵستکارییەك لە نێوان ئەوەی لەم چوار ئایەتەدا هاتووە لە فەرمان کردن بە ئارامگرتنی پێغەمبەر(ﷺ) و هاوەڵانی، بەڵکو دوژمنەکانیان هیدایەت وەربگرن لەگەڵ ئەوەی لە ئایەتی شمشێردا هاتووە کە پێویستە جێبەجێ بکرێت هەرکات بەرژەوەندی گشتی -ئایینی و دونیایی- کەوتە بەر مەترسی هەڕەشەی دوژمنەوە، گەر بەرهەڵستکاری بوونی نەبێت ئیتر چ هۆکارێك هەیە بۆ خراپی مامەڵە لەگەڵ قورئاندا بەم ئەندازەیە و وتنی نەسخبوونەوەی چوار ئایەت بەدوای یەکتردا کە هەندێکی دڵنیایی بە هەندێکی تری دەدات لە مانا و حوکمدا.

٢-چۆن وێنا دەکرێت ئایەتێك دوو جار دووبارە بووبێتەوە بەهۆی گرنگی بابەتەکەوە پاشان هەردوو جارەکە نەسخ بکرێتەوە، ئەو دژیەکییە چییە کە تەنها لە فەرهەنگی بانگکەرنی نەسخدا بوونی هەیە؟.

٣-ئەو چوار ئایەتە بۆ هەڕەشە و ترساندنە، نەسخبوونەوەیان بەڵێنشکێنی بەڵێنی خودا پێویست دەکات، پێویستەکە پووچ و بێبنەمایە و هەر بەو جۆرەش پێویستکراوەکە.

# نەسخی بانگەشەبۆكراو لە سورەتی "القصص"دا

بانگكـەرانی نەسـخ پێیانوایـە[1] لـەم سـورەتەدا دوو ئایـەت بـە ئایـەتی شمشـێر نەسخكراوەتەوە، ئەو دوانەش:

ئایەتی(٧٠) ﴿إِنْ يُوحَى إِلَيَّ إِلاَّ أَنَّمَا أَنَا نَذِيرٌ مُبِينٌ﴾

ئایەتی(٨٨) ﴿وَلَتَعْلَمُنَّ نَبَأَهُ بَعْدَ حِينٍ﴾

وتنی نەسخی ئەو دوو ئایەتە پووچ و بێبنەمایە هەروەك بۆچـوونەكانی پێشـوویان بە چەندین هۆ لەوانە:

١- نەبوونی هیچ جۆرە بەرهەڵسـتكارییەك لـە نێـوان ئـەوەی لـەم چـوار ئایەتـەدا هاتووە لەگەڵ ئایەتی شمشێر، نەسخیش لقی بەرهەڵستكارییە.

٢- لە دوو ئایەتەكەدا هەڕەشە هەیە، هەڕەشەش نەسخی تێدا نییە.

"ابن الجـوزي"[2] دەڵێـت: (هەنـدێك كـەس كـە تێگەیشـتنیان نییـە دەڵـێن ئـەم ئایەتە[3] بە ئایەتی شمشێر نەسخ كراوەتەوە، ئەوەش قسەیەكی راست نییە، چونكە ئایەتەكە هەڕەشەیە و هیچ شتێكی تێدا نییە رێگری لە جەنگان بكات) واتە هەر كـات پێویستی داوای جەنگانی كرد.

---

(١) لەوانە: ابن حزم: ٥٢، ابن سلامة: ١١٦، "ابن البارزي" ئایەتی سێیەمی نەسخكراو بە ئایەتی شمشێری زیاد كردووە كە بریتییە لە ئایەتی: (١٧) {اصبر على مـا يقولـون} الاية.

(٢) نواسخ القرآن: ص١٤٢.

(٣) واتە ئایەتی: (٨٨).

# نەسخی بانگەشەبۆكراو لە سورەتی "الزمر"دا

"ابن حزم"[1] و سەرخەرانی ئەو لە زیادەڕەوانی نەسخ و خراپەكاران بەرانبەر مەزنی و شكۆمەندی خودا و مەزنی قورئان بە نەزانی یان زیادەڕەوی و كەمڕەوی لە بیروبۆچوونی نابەرپرسیارانەیاندا پێیانوایە سورەتی "الزمر" سورەتێكی مەكییە و هەموو ئایەتەكانی موحكەمن جگە لە حەوت ئایەت كە بە ئایەتی شمشێر[2] نەسخكراونەتەوە، ئەوانەش:

﴿إِنَّ اللَّهَ يَحْكُمُ بَيْنَهُمْ فِي مَا هُمْ فِيهِ يَخْتَلِفُونَ﴾ (٣)

﴿قُلْ إِنِّي أَخَافُ إِنْ عَصَيْتُ رَبِّي عَذَابَ يَوْمٍ عَظِيمٍ﴾ (١٣)

﴿فَاعْبُدُوا مَا شِئْتُمْ مِنْ دُونِهِ﴾ (١٥)

﴿وَمَنْ يُضْلِلْ اللَّهُ فَمَا لَهُ مِنْ هَادٍ﴾ (٣٦)

﴿قُلْ يَاقَوْمِ اعْمَلُوا عَلَى مَكَانَتِكُمْ إِنِّي عَامِلٌ فَسَوْفَ تَعْلَمُونَ﴾ (٣٩)

﴿فَمَنْ اهْتَدَى فَلِنَفْسِهِ وَمَنْ ضَلَّ فَإِنَّمَا يَضِلُّ عَلَيْهَا وَمَا أَنْتَ عَلَيْهِمْ بِوَكِيلٍ﴾ (٤١)

﴿عَالِمَ الْغَيْبِ وَالشَّهَادَةِ أَنْتَ تَحْكُمُ بَيْنَ عِبَادِكَ فِي مَا كَانُوا فِيهِ يَخْتَلِفُونَ﴾ (٤٦)

---

(١) ص٥٢ ابن سلامة ١٦٢، "ابن البارزي" نەسخكراوە تیایدا ضوار ئایەتە، لە كتێبی "النحاس" و "قتادة" و كەسانی تریشدا كە لەوان وردترن باسی سورەتی "الزمر" نەكراوە.

(٢) اي باستثناء الاية (١٣).

ئایەتی(٣) ﴿إِنَّ اللَّهَ يَحْكُمُ بَيْنَهُمْ فِي مَا هُمْ فِيهِ يَخْتَلِفُونَ﴾.
ئایەتی(١٣) ﴿قُلْ إِنِّي أَخَافُ إِنْ عَصَيْتُ رَبِّي عَذَابَ يَوْمٍ عَظِيمٍ﴾
ئەم ئایەتە نەسخکراوەتەوە بەم ئایەتە:﴿لِيَغْفِرَ لَكَ اللَّهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِكَ وَمَا تَأَخَّرَ﴾.

پێشتر بەرپەرچی ئەم بۆچوونەمان داوەتەوە لەسەر ئایەتی (١٥)ی سورەتی "الأنعام"﴿قُلْ إِنِّي أَخَافُ إِنْ عَصَيْتُ رَبِّي عَذَابَ يَوْمٍ عَظِيمٍ﴾ کە پێیانوایە بە ئایەتی دووەم لە سورەتی "الفتح"نەسخکراوەتەوە، لەوێ ئەوەندەی پێویست بێت بەرپەرچی ئەم بۆچوونە تێکچووەمان داوەتەوە، بۆیە لێرەدا پێویست بە دووبارەبوونەوە نییە، بەڵام تێبینییەك دەخەمە سەر ئەوەی پێشوو ئەوەش: چۆن یەك ئایەت دوو جار دووبارە دەبێتەوە بەهۆی گرنگییەکەیەوە لە هەردوو جارەکەشدا نەسخ دەبێتەوە؟ وەڵامەکەی بۆ هەر کەسێکی خاوەن ژیری تەندروست بەجێدەهێڵم.

ئایەتی(١٥) ﴿فَاعْبُدُوا مَا شِئْتُمْ مِنْ دُونِهِ﴾.
ئایەتی(٣٦) ﴿وَمَنْ يُضْلِلْ اللَّهُ فَمَا لَهُ مِنْ هَادٍ﴾.
ئایەتی(٣٩) ﴿قُلْ يَاقَوْمِ اعْمَلُوا عَلَى مَكَانَتِكُمْ إِنِّي عَامِلٌ فَسَوْفَ تَعْلَمُونَ﴾.
ئایەتی(٤١) ﴿فَمَنْ اهْتَدَى فَلِنَفْسِهِ وَمَنْ ضَلَّ فَإِنَّمَا يَضِلُّ عَلَيْهَا وما أنت عليهم بِوَكِيلٍ[1]﴾.

"ابن سلامە"[2] ئایەتی(٤٦)ی خستۆتە پاڵ ئەو ئایەتانە، کە دەفەرموێت: (عَالِمَ الْغَيْبِ وَالشَّهَادَةِ أَنْتَ تَحْكُمُ بَيْنَ عِبَادِكَ فِي مَا كَانُوا فِيهِ يَخْتَلِفُونَ)
پێیانوایە هەموو ئەم ئایەتانە جگە لە ئایەتی(١٣) بە ئایەتی شمشێر نەسخکراونەتەوە.

---

(١) "الوكيل" بريتيية لة دادطابيكةري كار و كردةوةي خير و شةري خةلَكي.
(٢) الناسخ والمنسوخ: ص١٦٣.

پووچــی ئــەم بۆچــوونە تێکچــووانە ڕۆشــن و بەڵگەنەویســتە، ســەلماندنی بەڵگەنەویستیش کارێکی بێمانایە و کوشتنی کات و تەمەنە، بەرهەڵستکاری لە کوێی ئـەم ئایەتانـە و ئایـەتی شمشـێردا بـوونی هەیـە تـا بـە نەسـخکردنەوە هـەڵبگیرێت، زیادەڕەوی گەیشتۆتە ئاستێك دەسەڵاتی خودا لەناو بەندەکانیدا بە ئایـەتی شمشـێر سڕاوتەوە، وای لێهاتووە هەر هەڕەشەیەك لە قورئاندا هاتبێت ئایەتی شمشێر بەدرۆی دەخاتەوە، خودا لە دوارۆژدا لێیان ببورێت، چونکە عوزری خۆیان بەدەستەوە بووە.

"ابـن الجـوزي"[1] لـە بەرپەرچـدانەوەی بانگەشـەی نەسـخی ئایـەتی (١٥)دا دەڵێت:(ئەمە فەرمان نییە، بەڵکو هەڕەشەیە و ئایەتێکی موحکەمە و وەك ئەم ئایەتە وایە:﴿اعْمَلُوا مَا شِئْتُمْ﴾ هەندێك کە تێگەیشتنیان نییـە پێیانوایـە ئـەوە بـە ئایـەتی شمشـێر نەسـخکراوەتەوە، بۆیـە ئـەو قسـەی کـردووە وا گومـانی بـردووە—مانـای ئایەتەکە— فەرمان بێت، ئەوەش گومانێکی تێکچوو و خەیاڵێکی بێ ئەرزشە).

هەر بەو جۆرە بەرپەرچی هەموو بۆچوونەکانی داوەتەوە، هەر کەس درێژەی ئـەم بابەتەی گەرەکە با بگەڕێتەوە بۆ کتێبی "نواسخ القرآن"/ ص(٢١٥–٢١٦).

---

(١) نواسخ القرآن: ص٢١٥.

# نەسخی بانگەشەبۆکراو لە سورەتی "غافر"دا

بانگکەرانی نەسخ پێیانوایە[1] لەم سورەتەدا دوو ئایەت هەیە بە ئایەتی شمشێر نەسخکراوەتەوە، ئەو دوانەش:

ئایەتی(٥٥) ﴿فَاصْبِرْ إِنَّ وَعْدَ اللَّهِ حَقٌّ﴾.

ئایەتی(٧٧) ﴿فَاصْبِرْ إِنَّ وَعْدَ اللَّهِ حَقٌّ فَإِمَّا نُرِيَنَّكَ بَعْضَ الَّذِي نَعِدُهُمْ أَوْ نَتَوَفَّيَنَّكَ فَإِلَيْنَا يُرْجَعُونَ﴾.

نەسخکراوی بانگەشەبۆکراو لە دوو ئایەتەکەدا بریتییە لە:﴿فَاصْبِرْ إِنَّ وَعْدَ اللَّهِ حَقٌّ﴾.

بانگەشەکە پووچ و بێبنەمایە بە چەندین بەڵگەی ڕۆشن، لەوانە:

١-ئەم گوتارە بەتەنها ئاراستەی پێغەمبەر(ﷺ) نەکراوە، بەڵکو گوتارێکی ئایەتە و خودا مەبەستی پێی هەموو تاکێکی خێزانی مرۆڤایەتییە بەوەی هەر کات ڕووبەڕووی گرفتێکی ئایینی یان دونیایی بوویەوە یەکەمجار لەسەریەتی خۆی بە ئارامگرتن بڕازێنێتەوە، ئەوەش لە مەزنترین سیفەتەکان و ڕەوشتە پەسەند و باشەکانە و پێویستە هەموو مرۆڤێك خۆی پێ جوان بکات.

زۆرێك لە گرفت و تەنگەژەی دژوار بە ئارامگرتن بەبێ ئازار و ڕشتنی خوێن و تیابردنی ماڵ و سامان چارەسەر بوون.

---

(١) المراجع السابقة.

٢-فەرمانکردن بە ئارامگرتن لە یەك ئایەتدا دووجار دووبارە بووەتەوە ئەمەش بۆ گرنگی ئارامگرتن دەگەڕێتەوە.

٣-چۆن خودا-سبحانه وتعالى- لە یەك سورەتدا دوو جار فەرمان بە شتێك دەكات و پاشان لە هەردوو جارەكەدا دەیسڕێتەوە، ئایا ئەمە نامۆ نییە تەنانەت گەر لە مرۆڤێكی ئاسایی بوەشێتەوە؟

٤-دوو ئایەتەكە لە میانەی هەڕەشەدا هاتوون، زۆرمەندان لە موسڵمانان كۆدەنگیان هەیە لەسەر ئەوەی ئایەتەكانی هەڕەشە و ترساندن و بەڵێن و هەواڵ نەسخ نایانگرێتەوە.

"ابن الجوزي"[1] دەڵێت: ﴿فَاصْبِرْ إِنَّ وَعْدَ اللَّهِ حَقٌّ﴾ ئەم ئایەتە لەم سورەتەدا لە دوو شوێندا هاتووە، باسی ئەوەیان كردووە نەسخكرابێتەوە بە ئایەتی شمشێر، لەسەر هاوشێوەكانی ئەمە بڕیارماندا نەسخ بوونی نییە)

٥-هیچ بەرهەڵستكارییەك بوونی نییە لە نێوان ئارامگرتن لە ئێستادا و بەكارهێنانی هێز لە داهاتوودا بەهۆی جیاوازی كات و بارەوە(رەوشەوە).

---

(١) نواسخ القرآن: ص٢١٦.

## نەسخی بانگەشەبۆکراو لە سورەتی "فصلت"دا

"ابن حزم"[1] دەڵێت: لەم سورەتەدا تەنها یەك ئایەت هەیە بە ئایەتی شمشێر نەسخکراوەتەوە.

ئایەتی(٣٤)﴿وَلاَ تَسْتَوِي الْحَسَنَةُ وَلاَ السَّيِّئَةُ ادْفَعْ بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ فَإِذَا الَّذِي بَيْنَكَ وَبَيْنَهُ عَدَاوَةٌ كَأَنَّهُ وَلِيٌّ حَمِيمٌ ﴾.

لەگەڵ ئەوەی مانا بەرز و بڵندەکانی ئەم ئایەتە رێگە بە نەسخبوونەوە و سڕانەوە نادەن، چونکە خودا بە مرۆڤ دەڵێت لە هەموو کات و شوێنێکدا گەر رووبەرووی خراپە بوویەوە بە چاکە پاڵی پێوە بنێ، چونکە ئەوە کاریگەرترین رێگەیە بۆ بەرپەرچدانەوە و سڕینەوەی خراپەکە، لەو رێگەیەوە ئەو دوژمنایەتییەی نێوان خۆت و ئەو دەگۆڕێت بە دۆستایەتی گیانی بەگیانی، ئەم حیکمەتە تەنها ئارامگران دەتوانن بەدەستی بهێنن و تەنها ئەوانەی خاوەنی بەشی مەزنن پێیان دەبەخشرێت گەر بواری ئەوە هەبوو خراپە بە چاکە پاڵ پێوە بنرێت، بەڵام گەر بواری ئەوە نەبوو ئەوا لەسەر مرۆڤ پێویستە رووبەرووی خراپە ببێتەوە بە خراپە، وەك بەکارهێنانی هێز بۆ چارەسەری کێشە و گرفتەکان و لابردنی هەڕەشەی راستەوەبوو.

ئایا ئەم مانا باڵانە لە ئیسلامدا دەسڕێنەوە، ئایا هیچ جۆرە بەرهەڵستکارییەك لە نێوان ئەمە و پەنابردن بۆ هێز لە کاتی پێویستدا بوونی هەیە؟ نەخێر و بەدڵنیاییەوە نەخێر.

---

(١) الناسخ والمنسوخ: ص٥٣.

# نەسخی بانگەشەبۆکراو لە سورەتی "الشوری"دا

هەنـدێك لـە بانگکـەرانی نەسـخ پێیانوایـە[1] لـەم سـورەتەدا هەشـت ئایـەتی نەسـخکراوی تێدایـە، هەشـیانە[2] دەڵێـت نەسـخکراو حـەوت ئایەتـە، کەسـانێکیش دەڵێن[3] شەش ئایەتی نەسخکراوی تێدایە.

"النحاس" پێنج ئایەتی باس کردووە کە ئەمانەن:(٥ و١٥ و٢٠ و٣٣ و٣٩) "ابن الجوزي"[4] نۆ ئایەتی خستووەتە روو، پاشان بەڵگەی ئەوانەی بەرپەرچداوەتەوە کە دەڵێن ئەو ئایەتانە نەسخکراونەتەوە.

---

(١) لەوانە: ابن حزم: ٥٣–٥٤.

(٢) وەك: ابن سلامة: ١٦٤–١٦٥.

(٣) وەك: ابن البارزي: ٢٠٣–٢٠٤.

(٤) نواسخ القرآن: ٢١٨–٢٢٢.

﴿تَكَادُ السَّمَاوَاتُ يَتَفَطَّرْنَ مِنْ فَوْقِهِنَّ وَالْمَلاَئِكَةُ يُسَبِّحُونَ بِحَمْدِ رَبِّهِمْ وَيَسْتَغْفِرُونَ لِمَنْ فِي الأَرْضِ أَلاَ إِنَّ اللَّهَ هُوَ الْغَفُورُ الرَّحِيمُ﴾ (٥)

﴿وَالَّذِينَ اتَّخَذُوا مِنْ دُونِهِ أَوْلِيَاءَ اللَّهُ حَفِيظٌ عَلَيْهِمْ وَمَا أَنْتَ عَلَيْهِمْ بِوَكِيلٍ﴾ (٦)

﴿فَلِذَلِكَ فَادْعُ وَاسْتَقِمْ كَمَا أُمِرْتَ وَلاَ تَتَّبِعْ أَهْوَاءَهُمْ وَقُلْ آمَنْتُ بِمَا أَنْزَلَ اللَّهُ مِنْ كِتَابٍ وَأُمِرْتُ لأَعْدِلَ بَيْنَكُمُ اللَّهُ رَبُّنَا وَرَبُّكُمْ لَنَا أَعْمَالُنَا وَلَكُمْ أَعْمَالُكُمْ لاَ حُجَّةَ بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمُ اللَّهُ يَجْمَعُ بَيْنَنَا وَإِلَيْهِ الْمَصِيرُ﴾ (١٥)

﴿مَنْ كَانَ يُرِيدُ حَرْثَ الآخِرَةِ نَزِدْ لَهُ فِي حَرْثِهِ وَمَنْ كَانَ يُرِيدُ حَرْثَ الدُّنْيَا نُؤْتِهِ مِنْهَا وَمَا لَهُ فِي الآخِرَةِ مِنْ نَصِيبٍ﴾ (٢٠)

﴿قُلْ لاَ أَسْأَلُكُمْ عَلَيْهِ أَجْرًا إِلاَّ الْمَوَدَّةَ فِي الْقُرْبَى﴾ (٢٣)

﴿وَالَّذِينَ إِذَا أَصَابَهُمُ الْبَغْيُ هُمْ يَنْتَصِرُونَ﴾ (٣٩)

﴿وَجَزَاءُ سَيِّئَةٍ سَيِّئَةٌ مِثْلُهَا﴾ (٤٠)

﴿وَلَمَنِ انْتَصَرَ بَعْدَ ظُلْمِهِ فَأُولَئِكَ مَا عَلَيْهِمْ مِنْ سَبِيلٍ﴾ (٤١)

لێره بەدواوه خستنەڕوو و پووچەڵکردنەوەی بۆچوونی ئەوانە دەخەینە روو کە دەڵێن نەسخ لە سورەتی "الشورى"دا بوونی هەیە:

ئایەتی(٥) ﴿تَكَادُ السَّمَاوَاتُ يَتَفَطَّرْنَ مِنْ فَوْقِهِنَّ وَالْمَلاَئِكَةُ يُسَبِّحُونَ بِحَمْدِ رَبِّهِمْ وَيَسْتَغْفِرُونَ لِمَنْ فِي الأَرْضِ أَلاَ إِنَّ اللَّهَ هُوَ الْغَفُورُ الرَّحِيمُ﴾

پێیانوایە ئەم ئایەتە بە ئایەتی (٧) لە سورەتی "غافر" سڕاوەتەوە کە بریتییە لە: ﴿الَّذِينَ يَحْمِلُونَ الْعَرْشَ وَمَنْ حَوْلَهُ يُسَبِّحُونَ بِحَمْدِ رَبِّهِمْ وَيُؤْمِنُونَ بِهِ وَيَسْتَغْفِرُونَ لِلَّذِينَ آمَنُوا﴾ الآية.

بەوەندە دەوەسـتم"ابن الجـوزى" لـە بەرپەرچدانەوەی ئەمانـەدا وتوويـەتی، کـە دەڵێـت:[1]: (ئايـەتی: ﴿وَيَسْتَغْفِرُونَ لِمَنْ فِـي الأَرْضِ﴾ دەسـتەيەك پێيانوايـە لەوانـە "منبه و السدى و مقاتل بن سليمان" نەسخكراوەتەوە بە ئايەتی:﴿وَيَسْتَغْفِرُونَ لِلَّذِينَ آمَنُوا﴾ ئەمەش قسەيەكی ناشيرينە، چونكە دوو ئايەتەكە هەواڵە و هـەواڵيش ناچێتە ژێر نەسخەوە[2] پاشان لە نێوان دوو ئايەتەكەدا دژيـەكی بـوونی نييـە، چـونكە داوای لێخۆشبوونيان بۆ باوەڕداران داوای لێخۆشبوونێكی تايبەتە و هيچ كەسێكی تێناچـێت مەگـەر رێگـەی راسـت و رەوانـی گرتبێتـە بـەر، بـۆ ئەوانـە داوای لێخۆشـبوون و و پەناپێدانيان لە ئاگر و كردنە ژوورەوەيان بۆ بەهەشت بوونی هەيە)

لە قسەكەی "ابن الجوزى"ەوە ئەوە پاڵفتە دەكرێـت: وتـنی نەسـخ تێكەڵييـە لـە نێوان نەسخ و تايبەتكردندا، ئەمە ئەگەر مەبەست بە نەسخ مانا گشتييەكەی نـەبێت، ئەگينا هيچ بەرهەڵستييەك لەسـەر قسـەكەيان نييـە بـە مانـای تايبـەتكردنی گشـتی، وشەی "مَن" لە ئايەتەكەی يەكەمدا "اسم الموصول"ە مانای گشتی دەگەيـەنێت لـە خـودی خۆيـدا و بـاوەڕداران و كەسـانی تـريش دەگرێتـەوە، لـە ئايـەتی دووەمـدا گشتييەكەی بە باوەڕداران تايبەتكردەوە.

–ئايەتی(٦): ﴿وَالَّذِينَ اتَّخَذُوا مِنْ دُونِهِ أَوْلِيَـاءَ اللَّـهُ حَفِيظٌ عَلَـيْهِمْ وَمَـا أَنْـتَ عَلَـيْهِمْ بِوَكِيلٍ﴾

پێيانوايە ئەم ئايەتە نەسخكراوەتەوە بە ئايەتی شمشێر.

دروست ئەوەيە نەسخ بوونی نييە بە هۆی نەبوونی بەرهەڵسـتكارييەوە لـە نێـوان نەسخكەر و نەسـخكراودا، چـونكە خـودا هـەواڵی مۆڵەتپێـدانی بێبـاوەڕانی داوە دوای ترساندنيان و دەفەرموێت: ﴿وَالَّذِينَ اتَّخَذُوا مِـنْ دُونِـهِ أَوْلِيَـاءَ﴾ ئـەو خواوەندانـەی

---

(١) نواسخ القرآن: ص٢١٨.

(٢) لە سەرخەرانی نەسخ نەبوونـەوە: الـرازي: ١٤٦/٢٧، والالوسـي: ١١/٢٥، والقـرطبي: ٥٠٤/١٦.

لەخوار خوداوە دەیانپەرستن، واتە بێباوەڕانی مەکە﴿اللَّهُ حَفِيظٌ عَلَيْهِمْ﴾ واتە کار و کردەوەکانیان لەسەر دەنوسێت و دەیانپارێزێت، هیچ شتێك لەو کار و کردەوانە لە خودا بزر نابێت﴿وَمَا أَنتَ عَلَيْهِم بِوَكِيلٍ﴾ واتە تۆ زاڵ نەکراویت بەسەر ئەوانەدا تاکو بەزۆر بیانهێنیتە ناو ئیمانەوە، بەڵکو وەك ترسێنەرێك بۆ سەریان رەوانەکراوی و بانگکەرێکی بۆ سەر رێگەی روشد و کەماڵ، بەڵام گەیشتن بە ئامانجەکە دەکەوێتە ژێر دەسەڵاتی خوداوە بەتەنها، بەرهەڵستکاری لە نێوان ئەم دوو ئایەتەدا لە کوێدایە تا بە نەسخ هەڵبگیرێت؟

"ابن الجوزي"[1] دەڵێت: (زۆرینەی ئەهلی تەفسیر پێیانوایە ئەم ئایەتە نەسخکراوەتەوە بە ئایەتی شمشێر، مەزهەبی خۆمان لە هاوشێوەکانی ئەوە خستەڕوو، مەبەستەکە ئەوەیە ئێمە تۆمان نەکردووە بە وەکیل بە کار و کردەوەکانیان بیانگریت، بۆیە ئەگەری نەسخی تێدا نییە)

پاشان ئایەتەکە هەواڵ و هەڕەشەیە و ئەو دوانەش نەسخ قبووڵ ناکەن.

-ئایەتی(١٥) ﴿فَلِذَلِكَ فَادْعُ وَاسْتَقِمْ كَمَا أُمِرْتَ وَلاَ تَتَّبِعْ أَهْوَاءَهُمْ وَقُلْ آمَنتُ بِمَا أَنزَلَ اللَّهُ مِن كِتَابٍ وَأُمِرْتُ لأَعْدِلَ بَيْنَكُمُ اللَّهُ رَبُّنَا وَرَبُّكُمْ لَنَا أَعْمَالُنَا وَلَكُمْ أَعْمَالُكُمْ لاَ حُجَّةَ بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمُ اللَّهُ يَجْمَعُ بَيْنَنَا وَإِلَيْهِ الْمَصِيرُ﴾.

ئەم ئایەتە پەیوەندی بە ئایەتەکانی پێشترەوە هەیە کە یەکێتی ئایینەکان رۆشن دەکەنەوە ﴿شَرَعَ لَكُم مِّنَ الدِّينِ مَا وَصَّى بِهِ نُوحًا وَالَّذِي أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ وَمَا وَصَّيْنَا بِهِ إِبْرَاهِيمَ وَمُوسَى وَعِيسَى أَنْ أَقِيمُوا الدِّينَ وَلاَ تَتَفَرَّقُوا فِيهِ كَبُرَ عَلَى الْمُشْرِكِينَ مَا تَدْعُوهُمْ إِلَيْهِ اللَّهُ يَجْتَبِي إِلَيْهِ مَن يَشَاءُ وَيَهْدِي إِلَيْهِ مَن يُنِيبُ﴾ تا کۆتایی، پاشان خودا- سبحانە- رووی گوتاری دەکاتە پێغەمبەر(ﷺ) و پێی دەفەرموێت: بانگ بۆ رێکەوتن و کۆبوونەوە لەسەر ئەم ئەسڵە هاوبەشە بکە لە نێوان هەموو ئایینەکاندا، و لەسەر

---

(١) نواسخ القرآن: ص٢١٩.

بانگەواز راست راوەستە وەك چۆن خودا فەرمانی پێکردووی، شوێنی ئارەزوو و وەهمەکانی ئەوان مەکەوە و بڵێ بەگشتی باوەڕم هەیە بە هەر کتێبێك خودا دایبەزاندووە و پەروەردگار فەرمانی پێکردووم دادپەروەری لە نێوانتان ئەنجام بدەم، لایەنگیریم بۆ دەستە و رەگەزێك نییە، خودا پەروەردگاری ئێمە و ئێوەیە، ئێمە پاداشت و سزای کار و کردەوەی خۆمان وەردەگرین و ئێوەش پاداشت و سزای کار و کردەوەی خۆتان وەردەگرن، لەدوای دەرکەوتنی حەق جێگەیەك بۆ دوژمنایەتی لە نێوانمان نامێنێتەوە جگە لە لە ملهوڕی و سەرپێچی، خودا ئێمە و ئێوەش کۆدەکاتەوە و گەڕانەوە بۆ لای ئەوە"[1][2].

پێیانوایە ئەو ئایەتە بە ئایەتی (٢٩)ی سورەتی "التوبە" نەسخکراوەتەوە کە بریتییە لە: ﴿قَاتِلُوا الَّذِينَ لاَ يُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَلاَ بِالْيَوْمِ الآخِرِ﴾الآية.

بەرهەڵستکاری نێوان ئەم دوو ئایەتە لە کوێدایە تا بە ئایەتی دووەم ئایەتی یەکەم نەسخبکرێتەوە و بەرهەڵستکارییەکە هەڵبگیرێت، ئایا ئایەتی یەکەم دوور و نزیك ئاماژەی حەرامکردنی جەنگانی تێدایە دژ بە دەستدرێژکاران هەر کات پێویستی داوای ئەو جەنگانەی بکات تا ئەو حەرامکردنە بەم واجببوونە بسڕێتەوە؟ وەڵامەکە: نەخێر پاشان نەخێر.

-ئایەتی(٢٠) ﴿ مَنْ كَانَ يُرِيدُ حَرْثَ الآخِرَةِ نَزِدْ لَهُ فِي حَرْثِهِ وَمَنْ كَانَ يُرِيدُ حَرْثَ الدُّنْيَا نُؤْتِهِ مِنْهَا وَمَا لَهُ فِي الآخِرَةِ مِنْ نَصِيبٍ ﴾.

پێیانوایە ئەم ئایەتە نەسخکراوەتەوە بە ئایەتی(١٨)ی سورەتی "الإسراء".

ئەم بۆچوونە پووچ و بێبنەمایە بە چەندین هۆ کە لە بەرپەرچدانەوەی بۆچوونی نەسخی ئایەتی(١٤٥)ی سورەتی "آل عمران"دا رۆشنمان کردەوە، بۆیە پێویست بە

(١) المصحف المفسر للاستاذ محمد فريد وجدي.

(٢) لە سەرخەرانی نەسخ نەبوونەوە: الرازي: ١٥٨/٢٧، والالوسي: ٢٥/٢٥ ص٦٤٠، والقرطبي: ١٣/١٦.

دووبارەكردنەوە ناكات.

پاشان چۆن حوكمێك لە دوو سورەتدا دووبارە دەبێتەوە و لە هەردووكیاندا دەسڕێتەوە، ئەمە چ سەرسوڕمان و نامۆییەكە[1].

-ئایەتی(٢٣) ﴿قُلْ لاَ أَسْأَلُكُمْ عَلَيْهِ أَجْرًا إِلاَّ الْمَوَدَّةَ فِي الْقُرْبَى﴾.

پێیانوایە بە ئایەتی (٤٧)ی سورەتی "سبأ" نەسخكراوەتەوە، كە بریتییە لە: ﴿قُلْ مَا سَأَلْتُكُمْ مِنْ أَجْرٍ فَهُوَ لَكُمْ إِنْ أَجْرِيَ إِلاَّ عَلَى اللَّهِ وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ شَهِيدٌ﴾.

ئەمە بۆچوونێكی پووچ و بێبنەمایە، چونكە مەبەست بە "أجر" لە ئایەتەكەی دووەمدا سیلەی خزمایەتییە، بۆیە ئایەتی یەكەم تایبەتكراوە بەو هەڵاواردنەی تێیدایە، ئایەتی دووەمیش پێداگرییە لەو هەڵاواردنەی ئایەتی یەكەم، بەرهەڵستكاری لە كوێی هەڵاواردنەكە و ئایەتی دووەمدایە تا بە نەسخ هەڵبگیرێت؟ واتە: بڵێ داوای شتێكتان لێ ناكەم لەسەر ئەو پێڕاگەیاندن و رێنموونی و ئامۆژگارییانەی ئاراستەتان دەكەم جگە لە خۆشەویستی خزمایەتیم لە ئێوەوە.

"ابن الجوزي"[2] دەڵێت: (لە "ابن عباس"ەوە(ﷺ) فەرمووی تیرەیەك لە قورەیش نەبوو پێغەمبەر(ﷺ) خزمایەتی لەگەڵ نەبووبێت، بۆیە ئەم ئایەت دابەزی: ﴿قُلْ لاَ أَسْأَلُكُمْ عَلَيْهِ أَجْرًا إِلاَّ الْمَوَدَّةَ فِي الْقُرْبَى﴾ واتە تەنها سیلەی خزمایەتی نێوان من و ئێوەم لەگەڵ بگەیەنن[3] ئەمەش دروستەكەیەتی و نەسخ بە هیچ جۆرێك روو لەو ئایەتە ناكات).

---

(١) لە سەرخەرانی نەسخ نەبوونەوە: الرازي: ١٦٢/٢٧، والالوسي: ٢٧/٢٥، والقرطبي: ١٩/١٦.

(٢) نواسخ القرآن: ص٢٢٠.

(٣) فتح الباري: ١٨٥/١٠.

ئایەتی(٣٩) ﴿وَالَّذِينَ إِذَا أَصَابَهُمْ الْبَغْيُ هُمْ يَنْتَصِرُونَ﴾
بانگکەرانی نەسخ پێیانوایە[1] بە ئایەتی شمشێر نەسخکراوەتەوە.

ئەمەش بۆچوونێکی پووچ و بێبنەمایە، چونکە لەسەر ئەوە بیناکراوە دەربارەی هاوەڵدانەران هاتووە، ئەوەش هەڵەیە، چونکە پەیوەندی هەیە بە ئایەتەکانی پێشتر لەخۆی، ئەوانەش ئەم ئایەتانەن: ﴿وَالَّذِينَ يَجْتَنِبُونَ كَبَائِرَ الإِثْمِ وَالْفَوَاحِشَ وَإِذَا مَا غَضِبُوا هُمْ يَغْفِرُونَ﴾[2] ﴿وَالَّذِينَ اسْتَجَابُوا لِرَبِّهِمْ وَأَقَامُوا الصَّلاَةَ وَأَمْرُهُمْ شُورَى بَيْنَهُمْ وَمِمَّا رَزَقْنَاهُمْ يُنْفِقُونَ﴾[3]، پاشان دەفەرموێت: ﴿وَالَّذِينَ إِذَا أَصَابَهُمْ الْبَغْيُ هُمْ يَنْتَصِرُونَ﴾[4].

پوختەی مانای ئەم سێ ئایەتە ئەمەیە: ئەوانەی لە ئەنجامدانی تاوان و گوناهی گەورە خۆیان بەدوور دەگرن و کاتێك تووڕەدەبن لێخۆشبوونیان هەیە و دەست ناوەشێنن، ئەوانەی وەڵامی خودایان دایەوە لەوەی خودا و پێغەمبەر(ﷺ) بانگیان بۆ دەکرد—ئەوانە بریتی بوون لە ئەنصار— و نوێژ ئەنجام دەدەن و لەسەر بنەمای شورا و راوێژپێکردن بڕیارەکانیان دروست دەکەن، بڕیارێك یەکلا ناکەنەوە تا بۆچوونی ئەوانیتر تیایدا وەرنەگرن، لەوەی وەك رۆزی پێمان بەخشیون خێر و چاکە لەگەڵ هەژاران دەکەن، ئەوانەی گەر ستەمێك روویان لێ بکات دەستەوسان دانانیشن بەڵکو ستەمەکە لەسەر خۆیان لادەدەن ئەوەش بە دەستپێشخەری و ئازایەتی ئەوان بۆیە سەرکەوتن بەدەست دەهێنن.

(١) لەوانە: ابن حزم: ص٥٤، وابن سلامة: ص١٦٥، وابن البارزي: ص٢٠٤.
(٢) سورة الشورى/٣٧.
(٣) سورة الشورى/٣٨.
(٤) سورة الشورى/٣٩.

–ئایەتی(٤٠) ﴿وَجَزَاءُ سَيِّئَةٍ سَيِّئَةٌ مِثْلُهَا﴾

بانگکەرانی نەسخ پێیانوایە[1] بەم بەشەی ئایەتەکە نەسخکراوەتەوە:﴿فَمَنْ عَفَا وَأَصْلَحَ فَأَجْرُهُ عَلَى اللَّهِ﴾ ئەمە تەواوکەری ئایەتی (٤٠)ە کە پێیانوایە بەشی دووەمی ئایەتەکە بەشی یەکەمی ئایەتەکەی سڕیوەتەوە، ئەمەش ئەوپەڕی هەڵەکارییە.

"ابن الجوزي"[2] دەڵێت: (هەندێك لەوانەی تێگەیشتنیان نییە پێیانوایە ئەم ئایەتە نەسخکراوەتەوە بە ﴿فَمَنْ عَفَا وَأَصْلَحَ فَأَجْرُهُ عَلَى اللَّهِ﴾[3] ئەمە قسەی کەسێك نییە لە "الناسخ والمنسوخ" تێگەیشتبێت، چونکە مانای ئایەتەکە: هەر کەس خراپە بەرانبەر خراپەکارێك ئەنجام دەدات با بە ئەندازەی خراپەکارییەکەی بێت، هەر کەسیش دەبورێت ئەوا باشتر و چاکترە).

خودا–سبحانە وتعالی– سزای خراپەکاری بە خراپە ناوبرد وەك رەچاوکردنێك بۆ لایەنی رەوانبێژی کە پێی دەوترێت (مشاکلة) ئەگینا سزای تاوانکار خراپە نییە، واتە سزای کاری خراپە سزایەکە لەگەڵ بڕ و قەبارەی تاوانەکەدا دەگونجێت، هەر کەسیش لێبووردنی بەکارهێنا لەگەڵ دوژمنەکەی و چاکەکاری ئەنجامدا ئەوا پاداشتەکەی لەسەر خودایە، ئەو–سبحانە– ستەمکارانی خۆشناوێت.

–ئایەتی(٤١) ﴿وَلَمَنِ انْتَصَرَ بَعْدَ ظُلْمِهِ فَأُولَئِكَ مَا عَلَيْهِمْ مِنْ سَبِيلٍ﴾

هەرکەس نەفسی خۆی سەرخست لە دوای ئەوەی ستەمی لێکرا ئەوانە رێگەیەك بۆ سەرەکۆنە و سەرزەنشت و دادگایی و سزادانیان بوونی نییە، بەڵکو لۆمەکردن و سزا لەسەر ئەوانەیە ستەم لە خەڵکی دەکەن و فەساد لەسەر زەوی بڵاو دەکەنەوە بە ناحەق، ئەوانە سزای بەئازاریان بۆ بڕاوەتەوە.

---

(١) لەپێش هەموویانەوە: ابن سلامة الناسخ والمنسوخ: ص١٦٦.

(٢) نواسخ القرآن: ص٢٢١.

(٣) سورة الشورى: ٤١.

بانگکەرانی نەسخ پێیانوایە[1] ئەم ئایەتە بە ئایەتی (٤٣)ی هەمان سورەت نەسخکراوەتەوە ﴿وَلَمَنْ صَبَرَ وَغَفَرَ إِنَّ ذَلِكَ لَمِنْ عَزْمِ الأُمُورِ﴾، واتە هەر کەس لەسەر ئازار ئارامی گرت و لە گوناهی ئەو کەسە خۆشبوو خراپەی لەگەڵ کرد و نەفسی خۆی سەرنەخست ئەوە لە کار و بارە پەسەند و خۆشەویستەکانە، چونکە پەندێکی عەرەبی دەڵێت: (خۆشەویستی لە دوای دوژمنایەتی شیرینترە لە شیرینی).

ئەم چاکانەی کە لە قورئانی مەزنەوە فێریان دەبین بریتییە لە لوتکەی ئەخلاق و ئەوپەڕی مرۆڤدۆستی بۆ مامەڵەی مرۆڤ لەگەڵ برا مرۆڤەکەی، بەڵام زۆرێك لە خەڵکی خراپەیان دەرحەق ناوبانگی ئیسلام و قورئان ئەنجامدا ئەمەش بەهۆی نەزانینیانەوە یان بەهۆی چاولێکەری بۆ کەسانی تر یاخود دەمارگیری کوێرانە.

"ابن الجوزی"[2]–رەحمەتی خودای لێ بێت– دەڵێت: (ئایەتی:﴿وَلَمَنْ انْتَصَرَ بَعْدَ ظُلْمِهِ فَأُولَئِكَ مَا عَلَيْهِمْ مِنْ سَبِيلٍ﴾ هەندێك لەوانەی تێگەیشتنیان نییە پێیانوایە نەسخکراوەتەوە بە ئایەتی:﴿وَلَمَنْ صَبَرَ وَغَفَرَ إِنَّ ذَلِكَ لَمِنْ عَزْمِ الأُمُورِ﴾ ئەمە قسەی کەسێك نییە لە "الناسخ والمنسوخ" تێگەیشتبێت، چونکە ئایەتەکەی یەکەم دروستی خۆسەرخستن جێگیر دەکات، ئەمەش دەفەرموێت ئارامگرتن باشتر و چاکترە)

---

(١) لەوانە: ابن حزم الاندلسي: ٥٥، وابن البارزي: ص٢٠٤.

(٢) نواسخ القرآن: ص٢٢١–٢٢٢.

# نەسخی بانگەشەبۆکراو لە سورەتی "الزخرف"دا

"ابن حزم الاندلسي" هەموو سورەتەکە مەکییە جگە لە دوو ئایەت(٨٣ و ٨٩) ئەو دوو ئایەتە بە ئایەتی شمشێر نەسخکراونەتەوە، لەمەدا "ابن سلامة"[١] شوێنی کەوتووە و ئەوەی "ابن حزم" وتوویەتی بەبێ گۆڕین و شیکردنەوە دووبارەی دەکاتەوە، "أبو جعفر النحاس"[٢] تەنها باس لە نەسخبوونەوەی ئایەتی (٨٩) دەکات، "ابن البارزي" ئایەتی (٤١)ی بۆ زیاد کردووە و پێیوایە ئەو سێ ئایەتە بە ئایەتی شمشێر نەسخکراونەتەوە[٣].

"ابن الجوزي"[٤] دوو ئایەتەکەی یەکەمی خستۆتە روو، بانگەشەی ئایەتی یەکەم(٨٣) رەد دەکاتەوە و لەسەر پارسەنگدای ئایەتی دووەمیان بێدەنگە.

"النحاس"[٥] نەسخی لە ئایەتی (٨٣)دا باس نەکردووە، نەسخی لە ئایەتی (٨٩)دا گواستۆتەوە بەبێ پارسەنگدان.

---

(١) ص١٦٧.

(٢) ص٢١٨.

(٣) ص٢٠٥ (فَإِمَّا نَذْهَبَنَّ بِكَ فَإِنَّا مِنْهُمْ مُنْتَقِمُونَ) سورة الزخرف/٤١ بانگەشەی نەسخ لەم ئایەتەدا بێبنەمایە لەبەر نەبوونی هیچ جۆرە بەرهەڵستکارییەك لە نێوان ئایەتەکە و ئایەتی شمشێردا، بۆیە بەرپەرچدانەوەی بانگەشەی نەسخیم پشتگوێخست.

(٤) نواسخ القرآن ص٢٢٢.

(٥) ص٢١٨.

﴿فذرهم يخوضوا ويلعبوا حتى يُلاقوا يومهم الذي يوعدون﴾ (٨٣)
﴿فَاصْفَحْ عَنْهُمْ وَقُلْ سَلاَمٌ فَسَوْفَ يَعْلَمُونَ﴾ (٨٩)

-ئايەتی(٨٣) ﴿فذرهم يخوضوا ويلعبوا حتى يُلاقوا يومهم الذي يوعدون﴾[1]

واتە لێیانگەڕێ لە پووچی و بێمانایی خۆیاندا با نوقم بن و لە دونیایاندا سەرقاڵی گاڵتە و گەپ بن تا رووبەڕووی رۆژی خۆیان دەبنەوە لە رۆژی دوایی کە بەڵێنیان پێدراوە، "الزمخشري"[2] دەڵێت: ئەمە بەڵگەیە ئەوەی دەیڵێن لە دەروازەی نەزانی و رۆچوونی بێمانا و یاریکردنە، هەروەها ئاگادارکردنەوەی پێغەمبەرە(ﷺ) لەوەی دڵیان مۆرکراوە و بە هیچ شێوەیەك بەر رەحمەت ناکەون.

بەڵگەکانی پووچی بۆچوونی نەسخبوونەوەی ئایەتی (٨٣) بە ئایەتی شمشێر:

١-نەبوونی بەرهەڵستکاری لە نێوان دوو ئایەتەکەدا، ئایەتی(٨٣) روونکردنەوەی رۆڵی پێغەمبەرە(ﷺ) لەدوای پێڕاگەیاندن و هەوڵی هیدایەت و رێنموونییان بۆ سەر رێگەی راست و رەوان و دروست، ئەم رۆڵە کۆتایی پێ دێت بە وازلێهێنانیان بۆ دەسەڵاتی خودایی و دادگاییکردنیان لە دواڕۆژدا گەر ئەوەی پێغەمبەر(ﷺ) پێیهەستاوە بەرهەمی نەبوو.

٢-ئایەتەکە جەنگانی حەرام نەکردووە گەر ئەوانە دەستدرێژییان کردە سەر موسڵمانان تا فەرمان بە جەنگان لە ئایەتی شمشێردا بێتە نەسخکەرەوەی ئەو حەرامکردنە.

٣-لە تەفسیرە باوەڕپێکراوەکاندا[3] قسەیەك لەسەر نەسخی ئەم ئایەتە نەکراوە.

---

(١) سورة الزخرف/٨٣.

(٢) الكشّاف:٣/٤٩٧.

(٣) ينظر التفسير الكبير للرازي:٢٧/٢٣٤ وما بعدها، القرطبي:١٦/١٢١، الكبرس:٩/٥٩، وما بعدها الكشاف:٣/٤٩٧، البيضاوي بلا رقم، الصاوي:٤/٥٨، ابن العربي:٣/١٦٧٧، وغيرها من التفاسير الاخرى المعتمدة.

٤-گەر وا دابنێین بەرهەڵستکاری بوونی هەیە لەگەڵ ئایەتی شمشێردا ئەوا گشتاندنی ئەم ئایەتە بە ئایاتی شمشێر تایبەت دەکرێت، چونکە ئایەتی شمشێر تایبەتە بە باری دەستدرێژیکاری و بەرپەرچدانەوەی ئەو دەستدرێژکارییە.

٥-وتنی نەسخ پێویست دەکات بوترێت ئەم ئایەتە حوکمێکی هێناوە تەنها تایبەتە بە سەردەمی هاتنی پەیامی خوداوە، پێویستەکە پووچ و بێبنەمایە، هەر بەو جۆرە پێویستکراوەکە.

٦-گەر ئەم ئایەتە و هاوشێوەکانی ئەم ئایەتە نەسخکرابنەوە بە ئایەتی شمشێر ئەمە بەڵگەی ئەوەیە بنچینە و بنەڕەت لە ئیسلامدا بریتییە لە جەنگ و رشتنی خوێن و ئاشتی هەڵواردەیە، ئەمەش پێچەوانەیە بە رۆحی شەریعەتی ئیسلام و ئەو ناوەرۆکەی قورئان لە ئامێزی دەگرێت، تەنها کەسی نەفام بە ئایین و دونیاکەی ئەم قسەیە دەکات.

٧-ئایەتەکە هەڕەشە و ترساندنە، هۆشمەندان و زانایان کۆدەنگیان هەیە لەسەر ئەوەی هەڕەشە نەسخی بەسەردا گوزەر ناکات.

٨-"ابن الجوزي"[١] بە توندی بانگەشەی نەسخی ئەم ئایەتەی رەد کردۆتەوە.

- الآیە (٨٩) ﴿فَاصْفَحْ عَنْهُمْ وَقُلْ سَلَامٌ فَسَوْفَ يَعْلَمُونَ﴾ [٢]

واتە پشتهەڵبکە لە بانگکردنیان و بێهیوا ببە لە ئیمانهێنانیان وماڵئاواییان لێ بکە و وازیان لێ بهێنە و پێیان بڵێ لە دەستتان سەلامەت دەبین و وازتان لێ دەهێنین و لە داهاتوودا دەزانن و دەبینن، ئەمەش هەڕەشەیە لە خوداوە بۆ ئەوان و دڵنەوایی پێغەمبەرەکەیەتی[٣].

---

(١) نواسخ القرآن ص٢٢٢.

(٢) سورة الزخرف:٨٩.

(٣) الكشاف للزمخشري:٣/٤٩٩.

"الرازی"[1] دەڵێت: "سیبویه" دەڵێت: ماناکەی وازلێهێنانە، هاوشێوەی ئەوە فەرموودەکەی ئیبراهیم–سەلامی خوای لەسەر بێت–﴿سَلاَمٌ عَلَيْكَ سَأَسْتَغْفِرُ لَكَ رَبِّي﴾[2] هەروەها ئایەتی: ﴿سَلاَمٌ عَلَيْكُمْ لاَ نَبْتَغِي الْجَاهِلِينَ﴾[3].

بەڵگەی پووچەڵبوونەوەی بانگەشەی نەسخی ئایەتی(٨٩) بە ئایەتی شمشێر:

بەڵگە بۆ پووچەڵبوونەوەی ئەم بانگەشە دەهێنرێتەوە بەو بەڵگانەی جێگیرمان کرد لەسەر پووچەڵکردنەوەی بانگەشەی نەسخی ئایەتی(٨٣) ئەم بەڵگانەی تریش دەخەینە سەریان:

١– ئەوەی لە "ابن عباس"ەوە گوازراوەتەوە لە وتنی نەسخی ئەم ئایەتە بە ئایەتی شمشێر تێکەڵکردنە لە نێوان نەسخ و تایبەتکردندا وەك چەندین جار باسمان کردووە لەو ئایەتانەی کە پاشین پێیانوایە بە ئایەتی شمشێر نەسخکراونەتەوە بە مانای تایبەتی نەسخ، بۆیە نەسخ لای "ابن عباس" ئەو نەسخە نییە لای ئوسولییەکان کە بریتییە لە سڕینەوەی حوکمێکی پێشوو بە بەڵگەیەکی شەرعی دواتر، ڕۆشنکردنەوەی ئەمە لە هاوشێوەکانیدا خراوەتە ڕوو.

٢– "الرازي"[4] وتنی نەسخ لەم ئایەتەدا ڕەد دەکاتەوە و دەڵێت: لای من پابەندبوونی نەسخ لەم ئایەتەدا تەمومژاوییە، چونکە ئەمرەکە تەنها یەك جار فەرمان دەگەیەنێت، گەر تەنها یەك جار هێنای ئاماژەی گوزارەکە بەردەبێتەوە، ئیتر تیایدا چ پێویستییەك بە پابەندبوونی نەسخەوە هەیە؟

٣– ئەهلی تەفسیری باوەڕپێکراو قسەیان لەسەر نەسخی ئەم ئایەتە نەکردووە[5].

---

(١) التفسير الكبير:٢٧/٢٣٥.

(٢) سورة مريم:٤٧.

(٣) سورة القصص:٥٥.

(٤) التفسير الكبير:٢٧/٢٣٦.

(٥) راجع المراجع المذكورة من التفاسير في الآية (٨٣).

# نەسخی بانگەشەبۆکراو لە سورەتی "الدخان"دا

"ابن حزم الاندلسي"[1] دەڵێت هەموو ئایەتەکانی موحکەمن جگە لە یەك ئایەت ئەوەش بریتییە لە:﴿فارتقب انهم مرتقبون﴾[2] بە ئایەتی شمشێر نەسخکراوەتەوە، "ابن سلامة" بە عادەتی خۆی هەمان قسەی دووبارە کردۆتەوە[3] بەبێ قسە لەسەرکردن و شیکردنەوە و بەڵگەهێنانەوە، هەر بەو جۆرە "ابن البارزي"[4].

"النحاس"[5] هیچی لەبارەوە نەوتووە، "الطبري"[6] دەڵێت: تۆ ئەی محەمەد، لە پەروەردگارتەوە چاوەڕوانی سەرکەوتن بە بەسەر هاوەڵدانەراندا، ئەوان لە ناوەوە چاوەڕوانی کەوتنی تۆ و زاڵبونن بەسەر تۆدا، بەوەی بەرەنگار دەبنەوە لەگەڵ ئەو حەقەی تۆ بۆت هێناون و لەسەری دەڕۆی، "البیضاوي والقرطبي[7] والطبرسي[8]

---

(١) ص٥٥.

(٢) سورة الدخان:٥٩.

(٣) الناسخ والمنسوخ:ص١٦٨.

(٤) ص٢٠٥.

(٥) الناسخ والمنسوخ:ص٢١٨-٢١٩.

(٦) جامع البيان في تفسير القرآن:٢٤/٨٣.

(٧) الجامع لاحكام القرآن:١٦/١٥٥.

(٨) مجمع البيان:٩/٧٠.

والزمخشـري"[1]نزيك بـەم مانايـە قسـەيان لەسـەر ئايەتەكـە كـردووە، بـەڵام "ابـن العربي"[2] قسەی لەسەر نەكردووە.

بەڵگەی پووچەڵبوونەوەی بانگەشەی نەسخی ئايـەتی(٥٩)ی سـورەتی "الـدخان" بە ئايەتی شمشێر:

١-نـەبوونی هـيچ جـۆرە بەرهەڵسـتييەك لـە نێـوان دوو ئايەتەكـەدا وەك چـۆن لێكدانەوەكـەيمان لـە چـەندين تەفسـيری بـاوەڕپێكراوەوە گواسـتەوە، نەسخيش لقی بەرهەڵستكارييە.

٢- لەم ئايەتەدا خودا-سبحانە وتعـالی- جـەنگانی لەسـەر موسـڵمانان حـەرام نەكردووە گەر رووبەرووی دەستدرێژكاری بوونەوە تا ئـەو حەرامبوونـە بـە واجبوونی جەنگان -بە ئايەتی شمشێر- نەسخ بكرێتەوە.

٣- گـەر وا دابنـێين بەرهەڵسـتكاری بـوونی هەيـە ئـەوا بـە تايبـەتكردن هەڵـدەگيرێت، چـونكە هـەر ئايـەتێك پێيانوايـە بـە ئايـەتی شمشـێر نەسخكراوەتەوە -گەر بانگەشەی بەرهەڵستكاری دروست بێت- ئـەوا بـە ئايەتی شمشێر تايبەتكراوە، چونكە ئايەتی شمشـێر تايبەتـە بـە حاڵـەتی دەستدرێژكاری بـەپێی ئـەوەی كـە دەفـەرموێت: ﴿فَمَنْ اعْتَدَى عَلَيْكُمْ فَاعْتَدُوا عَلَيْهِ بِمِثْلِ مَا اعْتَدَى عَلَيْكُمْ﴾.

٤-ئايەتەكە هەواڵە ژێرمەندان كۆدەنگيان هەيە لەسەر ئـەوەی هەواڵـەكانی خـودا نەسخيان بەسەردا نايەت، ئەگەر نە دانـەپاڵی درۆ بـۆ لای خـودا-سـبحانە وتعالی- پێويست دەبێت، ئەويش-عز وجل- لەو سيفەتە پاك و بێگەردە.

٥-بنەڕەت لە ئيسلامدا ئاشتييە بـە كـۆدەنگی ژێرمەنـدان، جـەنگ هەڵواردەيـە و ئايەتی شمشێر تايبەتە بەو بارە هەڵواردەييەوە.

---

(١) الكشاف:٣/٥٠٨.

(٢) احكام القرآن:٤/١٦٧٨.

٦- ئەهلی تەفسیری باوەڕپێکراو ئاماژەیان بە نەسخی ئەم ئایەتە نەکردووە، جگە لە "الصاوي"[(١)] کە یەکێکە لەوانەی زیادەڕەوی لە نەسخدا کردووە، چونکە قورئان بە ئیجتیهاد نەسخ نابێتەوە، ئەوەی بە یەقین جێگیر دەبێت بە یەقین دەسڕێتەوە.

٧- "ابن الجوزي" نەسخی ئەم ئایەتەی ڕەد کردۆتەوە و دەڵێت: (دەستەیەك لە ئەهلی تەفسیر پێیانوایە ئەم ئایەتە نەسخکراوەتەوە بە ئایەتی شمشێر ئێمە پێمانوایە ئەوە دروست نییە، چونکە دژایەتی لە نێوان دوو ئایەتەکە و چاوەڕوانی سزادا بوونی نییە جا یان لە کاتی کوشتندا یان مردن یان لە دوارۆژدا لەمەشدا نەسخکراو بوونی نییە)

---

(١) لەسەر "تفسیر الجلالین٤/٦٧" دەڵێت: (ئەمە فەرمان بە جیهاد دەنوێنێت، ئەوە نەسخکراوەتەوە، چونکە مانای "فارتقب" واتە مۆڵەت و ماوەیان پێ بدە بەبێ جەنگان لەگەڵیان تا خودا حوکم لە نێوان تۆ و ئەواندا دەردەکات) ئەمە بۆچوونێکی بێبنەمایە و شان لەسەر بەڵگەیەکی شەرعی و ئەقڵی لە بیرمەندانی خاوەن ژیری تەندروستەوە دانادات.

# نەسخی بانگەشەبۆکراو لە سورەتی "الجاثية"دا

بانگکەرانی نەسخ پێیانوایە نەسخ لەم سورەتەدا ئایەتی (١٤)یە، ئەوەش:

﴿قُل لِّلَّذِينَ آمَنُوا يَغْفِرُوا لِلَّذِينَ لا يَرْجُون أَيَّامَ اللَّهِ لِيَجْزِيَ قَوْماً بِما كَانُوا يَكْسِبُونَ﴾[1]

مانای ئایەتەکە: "قل" بۆ گوتاری تایبەتە و مەبەست پێی گشتییە، بۆیە پێغەمبەر(ﷺ) و کەسانی تریش دەگرێتەوە کە خاوەنی ئیمانن، ئەوان ئازار لەدەست کەسانی تر دەچێژن، ئێوە لە گوناهی گوناهکاران خۆشبن گەر نەگەیشتبووە رادەیەك بەکارهێنانی هێز دژ بەوانە پێویست بوویێت، چونکە خودا پاداشتی کەسێك دەداتەوە لە گوناهی گوناهکاران خۆشدەبێت و گوناهکارەکەش سزا دەدات، هەریەکەیان بەری کاری خۆی دەچنێتەوە، گەر چاکە بوو بە چاکە و گەر خراپە بوو بە خراپە، ئەمەش ئەو مانایەیە کە ئایەتەکەی دوای ئەو ئایەتە پێداگری لێ دەکات:﴿مَنْ عَمِلَ صَالِحًا فَلِنَفْسِهِ وَمَنْ أَسَاءَ فَعَلَيْهَا ثُمَّ إِلَى رَبِّكُمْ تُرْجَعُونَ﴾[2].

---

(١) سورة الجاثية:١٤.

(٢) سورة الجاثية:١٥.

بانگکەرانی نەسخ پێیانوایە نەسخکراوەتەوە و لەسەر نەسخکەرەکەی و هۆی دابەزینەکەی و مەکیبوون و مەدەنیبوونی جیاوازی لە نێوانیاندا هەیە، وتراوە بە ئایەتی شمشێر نەسخکراوەتەوە(ئایەتی پێنجەمی سورەتی "التوبة") وتراوە بە ئایەتی (٢٩)ی سورەتی "التوبة" نەسخکراوەتەوە، وتراوە بە ئایەتی (٣٦)ی هەمان سورەت(الجاثية)، وتراوە بە ئایەتی(٥٧)ی سورەتی "الأنفال"، وتراویشە بە ئایەتی (٣٩)ی سورەتی "الحج"

وتراوە ئایەتەکە مەکییە و نەسخکراوەتەوە، وتراویشە مەدەنییە و موحکەمە، وتراوە هۆی دابەزینەکەی ناکۆکی بووە لە نێوان "عبدالله بن أبي" و "عمر"دا، یەکەمیان جنێوی بە دووەمیان دا، دووەمیش ویستی بیکوژێت، وتراوە دەربارەی ئازاردانی پێغەمبەر(ﷺ) لەلایەن هاوەڵدانەرانەوە دابەزیوە، وتراویشە لەسەر ئازاردانی موسڵمانان دابەزیوە، هەروەها وتراوە لە غەزوەی "بني المصطلق"دا دابەزیوە بۆیە نەسخ نەکراوەتەوە[1]، ئەمانە ئیجتیهادگەلێکی تاکلایەنن شان لەسەر دەقی قورئان یان سوننەتی پێغەمبەر(ﷺ) یان ئیجماع دانادەن، چۆن قورئانێکی جێگیر بە جێگیربوونێکی یەقینی بە ئیجتیهاد نەسخ دەبێتەوە؟

**بانگەشەی نەسخ پووچ و بێبنەمایە بەم بەڵگانە:**

١-دەقێك لە قورئان یان فەرمودەی پێغەمبەر(ﷺ) یان لە ئیجماعی فەقیهان لە هاوەڵان یان فەقیهان لە شوێنکەتووان نابینرێتەوە ئاماژە بکات بە نەسخبوونەوەی ئایەتی(١٤)ی سورەتی "الجاثية"، بۆیە وتنی نەسخی تەنها ئیجتیهادە و لەسەر

---

(١) بۆ زانیاری زیاتر لەمەڕ ئەم جیاوازییە نامەنتقیانە گەڕانەوە بۆ ئەم سەرچاوانە دەکرێت: ابن حزم الاندلسي: ص٥٦، النحاس: ص٢١٨، ابن سلامة: ص١٦٨، كتاب الناسخ والمنسوخ في كتاب الله تعالى لقتادة بن دعامة السدوسي:ص٤٤، ابن الجوزي: ص٢٢٤-٢٢٥، ابن البارزي:ص٢٠٥، القرطبي: ١٦١/١٦، الزمخشري- الكشاف: ٥١٠/٣-٥١١، البيضاوي بلا رقم، الصاوي:١٩/٤، الطبري:٨٦/٢٤، الطبرسي:٧٤/٩، ابن العربي:١٦٨١/٤، الرازي:٢٦٤/٢٧، الكياالهراسي احكام القرآن:٣٧١/٤.

دژیەکی ئامێزگرانە بیناکراوە لە نێوان ئایەتە نەسخکەرەکە و ئایەتـە نەسـخکراوەکە، بە جۆرێك كۆكردنەوەی شیاو نەبێت، بەڵام ئەم دژیەکییە بوونی نییە لە دوو رووەوە:

یەکەمیان: جیاوازی بابەت، ئایەتی(١٤) پەیوەستە بـە پرسـە تاکەکەسییەکانەوە بۆ ئەو تاکانـەی رووبـەڕووی ئـازار دەبنـەوە لەلایـەن کەسـانی تـرەوە، بـەڵام ئایـەتی شمشێر بابەتەکـەی بریتییـە لـە دەسـتدرێژی بـۆ سـەر بەرژەوەندییـە زەرورییـەکانی موسڵمانان، بۆیە بابەتی دوو ئایەتەکە لەیەکتر جیاوازن.

دووەم: جیاوازی کات و رەوش، رەوشی ئابلۆقـەدار بـە ئایـەتی (١٤) جیـاوازە لـە رەوشی راگەیاندنی جەنگ و بەکارهێنانی هێز دژ بە دوژمن.

٢-ئەوەی لە ئایەتی(١٤)دا هاتووە لە سیفەتە چاکەکانی موسـڵمانانە کـە قورئـان فەرمانی پێکردوون لە زۆرێـك لـە ئایەتەکانیـدا لەوانـە ئایـەتی: ﴿الَّـذِينَ يُنْفِقُـونَ فِـي السَّرَّاءِ وَالضَّرَّاءِ وَالْكَاظِمِينَ الْغَيْظَ وَالْعَافِينَ عَنْ النَّاسِ﴾[1].

٣-گەر وا دابنـێین بەرهەڵسـتکاری بـوونی هەیـە لـە نێـوان ئایـەتی(١٤) و ئایەتـە نەسـخکەرەکەیدا ئـەوا بـە تایبـەتکردنی دووەم بـۆ گشـتاندنی یەکـەم هەڵـدەگیرێت، چونکە ئایەتی (١٤) گشتییە و ئەو ئازارانە دەگرێتەوە کە ناگەنە رادەی بـەکارهێنانی هێز و ئازاردانیان کە ئەوە پێویست دەکات[2]، ئایەتی شمشێر یان هـەر ئایـەتێکی تـر پێیانوایە نەسخکەرەوەی ئەو ئایەتەیە بریتییە لە تایبەتکەر بۆ ئـەو گشـتاندنە، بۆیـە وتنی نەسخ تێکەڵییەکە لە نێوان نەسخ و تایبەتکردندا.

٤-ئەوەی لە " ابن عباسﷺ والسدي وقتادة والضحاك "ەوە گوازراوەتەوە لە نەسخی ئایەتی(١٤) هەواڵی ئاحادە و قورئانی پێ نەسـخ ناکرێتـەوە، واتـە ناتوانرێت

---

(١) سورة آل عمران:١٣٤.

(٢) الـرازي التفسـير الكـبير:٢٦٤/٢٧، دەڵێـت: نـزیکتر ئەوەیـە بوترێـت هەڵدراوەتـە سـەر وازهێنـان لـە کێبـەرکێ لـە کـارە بضـووکەکاندا و لانەکردنـەوە بـەلای ئـەوەی لێیـان دەوەشێتەوە لە وشەی ئازاربەخش و شتانی تر.

بەڵگـەی پـێ بهێنرێتـەوە لەسـەر نەسـخی ئایـەتێکی جـێگیر بـە تـەواتور کـە جێگیربوونەکەی یەقینە، ئیجماع لەسەر ئەوەیە یەقین تەنها بە یەقین دەسڕێتەوە.

گەر وا دابنێین ئەو هەواڵە ئاحادانە سەنەدی شەرعین ئـەوا مەبەسـتیان بـە نەسـخ مانا گشتییەکەی بووە لای پێشین نەك مانا ئوسولّییە تایبەتەکەی لای پاشین.

٥-وتنی نەسخ پێویست دەکات بوترێت ئایـەتی(١٤) تایبەتـە بـەو ڕووداوەی لـە پێناویدا دابەزیوە، ئەمەش پێچەوانەیە بە کۆدەنگی زانایـان لەسـەر ئـەوەی پەنـد بـە گشتاندنی دەقەکەیە نەك بە تایبەتکردنی هۆیەکەی.

# نەسخی بانگەشەبۆکراو لە سورەتی "الأحقاف"دا

"ابـن حـزم الاندلسـي"[1] پێیوایـە سـورەتەکە مەکییـە و هـەموو ئایەتـەکانی موحکەمن جگە لە دوو ئایەت کـە ئایـەتی(٩ و ٣٥)ن، یەکـەمیان(٩) بـە ئایـەتی(٢)ی سـورەتی "الفـتح" نەسـخکراوەتەوە و دووەمیـان(٣٥) ماناکـەی بـە ئایـەتی شمشـێر نەسخکراوەتەوە، بەر لە ئەو لە "قتادة"ەوە[2] ئـەم بۆچـوونە گوازراوەتـەوە، "ابـن سلامة[3] و ابن البارزي"[4] و کەسانی تریش هەمان قسەیان کردووە.

﴿قُلْ مَا كُنْتُ بِدْعًا مِنَ الرُّسُلِ وَمَا أَدْرِي مَا يُفْعَلُ بِي وَلاَ بِكُمْ إِنْ أَتَّبِعُ إِلاَّ مَا يُوحَى إِلَيَّ وَمَا أَنَا إِلاَّ نَذِيرٌ مُبِينٌ﴾ (٩)

﴿فَاصْبِرْ كَمَا صَبَرَ أُوْلُوا الْعَزْمِ مِنَ الرُّسُلِ وَلاَ تَسْتَعْجِلْ لَهُمْ كَأَنَّهُمْ يَوْمَ يَرَوْنَ مَا يُوعَدُونَ لَمْ يَلْبَثُوا إِلاَّ سَاعَةً مِنْ نَهَارٍ بَلاَغٌ فَهَلْ يُهْلَكُ إِلاَّ الْقَوْمُ الْفَاسِقُونَ﴾ (٣٥)

---

(١) ص٥٦.

(٢) نصوص محققة في علوم القرآن الكرم تحقيق الدكتور حاتم صالح الضامن:ص٤٢.

(٣) ص١٦٩.

(٤) ص٢٠٥.

-ئایەتی(٩) ﴿قُلْ مَا كُنْتُ بِدْعًا مِنْ الرُّسُلِ وَمَا أَدْرِي مَا يُفْعَلُ بِي وَلاَ بِكُمْ إِنْ أَتَّبِعُ إِلاَّ مَا يُوحَى إِلَيَّ وَمَا أَنَا إِلاَّ نَذِيرٌ مُبِينٌ﴾[١]

بانگکەرانی نەسخ پێیانوایە کاتێك ئەم ئایەتە دابەزی هاوەڵدانەران و دووڕووان دڵخۆش بوون و وتیان: چۆن شوێنی پێغەمبەرێك بکەوین نازانێت چی بەسەر خۆی و بەسەر ئێمە دێت لە دواڕۆژدا، ئەو هیچ گەورەییەکی بەسەر ئێمەدا نییە، گەر ئەوەی داپهێناوە لە خودی خۆیەوە نەبوایە ئەوا ئەو کەسەی ئەوی رەوانە کردووە هەواڵی پێ دەدا چی بەسەر ئەو و ئێمەدا دێت، بۆیە ئەم ئایەتە نەسخکرایەوە بە ئایەتی: ﴿لِيَغْفِرَ لَكَ اللَّهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِكَ وَمَا تَأَخَّرَ وَيُتِمَّ نِعْمَتَهُ عَلَيْكَ وَيَهْدِيَكَ صِرَاطًا مُسْتَقِيمًا﴾[٢] خودا قسەی بێباوەڕانی بە دابەزینی ئەم ئایەتە پووچ کردەوە و هاوەڵان فەرموویان پیرۆزبایت لێ دەکەین ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) خودا بۆی رۆشن کردییەوە چی لەگەڵ تۆدا دەکات، خۆزگە دەمانزانی خودا چی لەگەڵ ئێمەدا دەکات(یان چیمان پێ دەکات) بۆیە ئایەتی پێنجەمی ئەم سورەتە دابەزی ئەوەش ئەم ئایەتەیە: ﴿لِيُدْخِلَ الْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَاتِ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِنْ تَحْتِهَا الأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا وَيُكَفِّرَ عَنْهُمْ سَيِّئَاتِهِمْ وَكَانَ ذَلِكَ عِنْدَ اللَّهِ فَوْزًا عَظِيمًا﴾[٣].

بانگەشەی نەسخبوونەوەی ئایەتی(٩)ی سورەتی "الأحقاف" پووچ و بێبنەمایە بەم بەڵگانە:

١-ئایەتەکە هەواڵە لە خوداوە و هەواڵی خوداش نەسخ نابێتەوە، ئەگینا وەردەگەڕێت بۆ درۆ، خوداش پاك و بێگەردە لەو سیفەتە، "النحاس"[٤] دەڵێت

---

(١) سورة الاحقاف:٩.

(٢) سورة الفتح:٢ الآية ائایەتی یەکەم، تیایدا:(انا فتحنا لك فتحاً مبينا).

(٣) سورة الفتح:٥، ينظر تفسير الصاوي:٤/٧٥، وابن سلامة ص١٦٩-١٧٠، نصوص محققة المرجع السابق ص٤٣.

(٤) الناسخ والمنسوخ ص٢١٩.

محالّە نەسخکەر و نەسخکراوی تێدا بێت لە دوو رووەوە:

یەکەمیان: ئایەتەکە هەواڵە.

دووەم: لە سەرەتای سورەتەکەوە تا ئەم بابەتە گوتارەکە روو بە هاوەڵدانەرانە و دژەبەڵگەیان بەڕوودا دەهێنێتەوە و سەرزەنشت و دەمکوتیان دەکات بۆیە پێویستە ئەمەش دیسان روو بە هاوەڵدانەران بێت وەك پێش خۆی و دوای خۆی، محاڵە پێغەمبەر(ﷺ) بە هاوەڵدانەران بفەرموێت نازانم خودا لە دوارۆژدا چی بە من و بە ئێوە دەكات، پێغەمبەر(ﷺ) لە سەرەتای ناردنی وەك پێغەمبەر(ﷺ) هەتا مردنی بەردەوام هەواڵی دەدا ئەوەی لەسەر بێباوەڕی مردووە لە ئاگردا بە هەتاهەتایی دەمێنێتەوە و هەرکەسیش لەسەر ئیمان و شوێنکەوتنی و گوێڕایەڵی ئەو بمرێت دەچێتە بەهەشتەوە، بۆیە پێغەمبەر(ﷺ) دەیزانی خودا –لە رۆژی دواییدا– چی بە ئەو و بە هاوەڵدەنەران دەكات، دروست نییە پێغەمبەر(ﷺ) بفەرموێت نازانم خودا لە دوارۆژدا چی بە من و بە ئێوە دەكات، چونکە ئەوانیش دەڵێن چۆن شوێنت بکەوین لە کاتێکدا تۆ نازانی بۆ نیعمەت و شادومانی دەڕۆین یان ئازار و سزا[1].

"القرطبي" لە "النحاس"ەوە ئەم قسەیە دەگوێزێتەوە لەدوای ئەوەی بۆچوونی بانگکەرانی نەسخ لەمەڕ نەسخی ئایەتەکە دەگوێزێتەوە و بوونی نەسخ لە ئایەتەکەدا رەد دەکاتەوە و دەڵێت:(ئایەتەکە نەسخ نەکراوەتەوە چونکە هەواڵە، "النحاس" دەڵێت: محاڵە لەمەدا نەسخکەر و نەسخکراو بوونی هەبێت لە دوو رووەوە تا کۆتاییەکەی[2].

٢–ئەوەی لە "انس بن مالك و ابن عباس وقتادة والحسن والضحاك، وعكرمة"ەوە گوازراوەتەوە لەمەڕ وتنی نەسخ مەبەست پێی رۆشنکردنەوەیە، ئەوەی کە دەڵێن ئایەتی (٢)ی سورەتی "الفتح" ئایەتی (٩)ی سورەتی "الجاثية"ی نەسخکردۆتەوە مەبەستیان بە نەسخ مانا گشتییەکەیەتی لەلای پێشین و لێرەدا

---

(١) الناسخ والمنسوخ في القرآن الكريم: لابي جعفر النحاس:ص٢١٩.

(٢) ينظر الجامع لاحكام القرآن: للقرطبي:١٦/١٨٦.

مەبەست پێی ڕۆشنکردنەوەیە "القرطبي" دەڵێت: ("الحسن" لەسەر تەفسیری ئایەتەکە دەڵێت: نازانم لە دونیادا خودا چی بە من و ئێوە دەکات، بەڵام لە دوارۆژدا- پەنادەگرین بە خودا- پێغەمبەر(ﷺ) زانیویەتی ئەو لە بەهەشتدایە کاتێک بەڵێنی لەناو پێغەمبەراندا لێ وەرگیرا، بەڵام دەڵێت نازانم لە دونیادا خودا چیم بەسەر دەهێنێت، ئایا دەردەکرێم وەک پێغەمبەرانی پێشوو دەرکران یان دەکوژرێم وەک چۆن پێغەمبەرانی پێش من شەهیدکران، ناشزانم خودا چی بەسەر ئێوە دەهێنێت، تا کۆتاییەکەی، پاشان دەڵێت: دەڵێم ئەمە مانای قسەکەی یەکەمە بەڵام ناوی نەسخیان لێناوە بە مانای ڕۆشنکەرەوە)[1] نادروستی وتنی نەسخی ئایەتی(٩)ی سورەتی "الأحقاف" لەلایەن "ابن الجوزي"ەوە[2] دووپاتکراوەتەوە.

- الآیە (٣٥) ﴿فَاصْبِرْ كَمَا صَبَرَ أُوْلُوا الْعَزْمِ مِنْ الرُّسُلِ وَلاَ تَسْتَعْجِلْ لَهُمْ كَأَنَّهُمْ يَوْمَ يَرَوْنَ مَا يُوعَدُونَ لَمْ يَلْبَثُوا إِلاَّ سَاعَةً مِنْ نَهَارٍ بَلاَغٌ فَهَلْ يُهْلَكُ إِلاَّ الْقَوْمُ الْفَاسِقُونَ﴾[3]

بانگکەرانی نەسخ پێیانوایە فەرمان کردن بە ئارامگرتن لەم ئایەتەدا بە ئایەتی شمشێر نەسخکراوەتەوە.

بانگەشەی نەسخ پووچ و بێبنەمایە لەبەر نەبوونی بەرهەڵستکاری لە نێوان دوو ئایەتەکەدا، خودا-سبحانە وتعالی- ڕووی گوتاری دەکاتە پێغەمبەرەکەی(ﷺ) و پێی دەفەرموێت ئارامبگرە لەسەر ئازاری هۆزەکەت وەک چۆن خاوەن عەزمان(ویستی مەزن) لە پێغەمبەران ئارامیان گرت، ئەو پێغەمبەرانەی دامەزراوبوون و لە تەنگەژە و

---

(١) الجامع لاحكام القرآن:١٦/١٨٧.

(٢) نواسخ القرآن:ص٢٢٧، تیایدا هاتووە(دەڵێم: وتنی نەسخی دروست نییە، چونکە گەر زانیاری شتێکی لێ شارایەوە و پاشان پێی ئاگادار کرا ناچێتە ناو نەسخکەر و نەسخکراوەوە)

(٣) سورة الاحقاف:٣٥.

ناڕەحەتییەکاندا دانیان بەخۆیاندا گرت، بۆیە پەلە مەکە لە دابەزینی سزا بۆ سەریان، چونکە هیچ گومانی تێدا نییە خودا دایدەبەزێنێتە سەریان، ئەمە بەڵێنێکە بە سزای دونیایی کە بریتییە لە جەنگان دژ بەوان، سەرباری سزای دواڕۆژ، هەروەها ئاماژەی ئەوەی تێدایە ئەو ڕۆژە دێتە بەرەوە فەرمان دەکرێت بە جیهاد دژ بەوانە، بۆیە بەرهەڵستکاری لە نێوان ئایەتی(۳٥)ی سورەتی "الفتح" و ئایەتی شمشێری سورەتی "التوبة"دا بوونی نییە تا دووەمیان یەکەم بسڕێتەوە بۆ هەڵگرتنی ئەم بەرهەڵستکارییە، گەر وا دابنێین بەرهەڵستکاری بوونی هەیە ئەوا بە تایبەتکردن هەڵدەگیرێت و هۆیەك بۆ نەسخ بوونی نییە، سەرباری نەبوونی بەڵگەیەك لە قورئان یان لە فەرموودە یان ئیجماعی هاوەڵان یان شوێنکەوتووان بەڵگە بێت لەسەر ئەم نەسخکردنەوە، بەڵکو تەنها ئیجتیهادێکی هەڵەیە، گەر گریمانەی ئەوەش بکەین ئیجتیهادێکی دروستە بەڵگەیەکی گومانئامێزە و ئەوەی بە یەقین جێگیر دەبێت بە گومان ناسڕێتەوە.

# نەسخی بانگەشەبۆکراو لە سورەتی "محمد"دا

﴿فَإِمَّا مَنًّا بَعْدُ وَإِمَّا فِدَاءً﴾ (٤)

﴿إِنَّمَا الحَيَاةُ الدُّنْيَا لَعِبٌ وَلَهْوٌ وَإِنْ تُؤْمِنُوا وَتَتَّقُوا يُؤْتِكُمْ أُجُورَكُمْ وَلاَ يَسْأَلْكُمْ أَمْوَالَكُمْ﴾ (٣٦)

"ابن حزم الأندلسي"[1] دەڵێت: جیاوازیان تیایدا هەیە ئایا مەکییە یان مەدەنی، هەموو سورەتەکە موحکەمە جگە لە یەك ئایەت کە بریتییە لە:﴿فاماً منا بعد واما فداء﴾[2] "المنّ والفداء" بە ئایەتی شمشێر نەسخکراوەتەوە.

هەروەها وتراوە: ئایەتی دووەم کە بریتییە لە ئایەتی(٣٦) نەسخکراوەتەوە بە ئایەتی(٣٧)، ئەم قسەیە بۆچوونی "ابن سلامة"یە، لەسەر نەسخی دوو ئایەتەکەیە[3] "النحاس"[4] دەڵێت: "قتادة" دەڵێت: نەسخکراوەتەوە بەم ئایەتە:﴿فَشَرِّدْ بِهِمْ مَنْ خَلْفَهُمْ﴾[5] "مجاهد" دەڵێت نەسخکراوەتەوە بەم ئایەتە:﴿فَاقْتُلُوا الْمُشْرِكِينَ حَيْثُ وَجَدْتُمُوهُمْ﴾[6] "عطاء" دەڵێت: هاوەڵدانەر

---

(١) ص٥٦.

(٢) سورة محمد:٤.

(٣) ص١٧٣.

(٤) ص٢٢.

(٥) سورة الانفال: ٥٧ تەواوی ئایەتەکە: (فاماً تثقفنهم في الحرب فشرّد بهم من خلفهم لعلّهم يذّكرون).

(٦) سورة التوبة: ٥.

ناکوژرێت بەڵکو منەت بەسەریدا دەکرێت و فیدیە دەدات گەر بە دیل گیرا، وەك خودا–عز وجل– دەفەرموێت:﴿فَإِمَّا مَنًّا بَعْدُ وَإِمَّا فِدَاءً﴾.

"ابن الجوزي"[1] دەڵێت: دوو قسەی لەسەرە:

یەکەم: ئایەتەکە موحکەمە و حوکمی "المن والفداء" دەمێنێتەوە و نەسخ نەکراوەتەوە، ئەمەش مەزهەبی "ابن عمر و الحسن و ابن سیرین و مجاهد و أحمد و الشافعي"یە.

دووەم: "المن والفداء" نەسخکراوەتەوە بە ئایەتی: ﴿فَاقْتُلُوا الْمُشْرِكِينَ حَيْثُ وَجَدْتُمُوهُمْ﴾ ئەمەش مەزهەبی: "ابن جريج والسديّ وابی حنيفه"یە.

"ابن البارزي" دەڵێت: دوو ئایەتی(٥ و٣٦) نەسخکراونەتەوە بەبێ ڕۆشنکردنەوەی هۆیەکەی.

بۆچوونی ئەهلی تەفسیر:

* "ابن العربي"[2] دەڵێت: خەڵکی لەسەر ئەم ئایەتە جیاوازیان هەیە ئایا نەسخکراوەتەوە یان موحکەمە، وتراوە نەسخکراوەتەوە بەم ئایەتە:﴿فَاقْتُلُوا الْمُشْرِكِينَ حَيْثُ وَجَدْتُمُوهُمْ﴾ "السدي" ئەم بۆچوونەی هەیە.

دووەم: ئایەتەکە نەسخکراوەتەوە، چونکە بتپەرستان عەهد و پەیمانیان نییە، وتراویشە بە ڕەهایی موحکەمە، "السديّ" ئەمە بۆچوونییەتی.

سێیەم: ئایەتەکە موحکەمە دوای هێز و دەسەڵات و دامەزران، "سعيد بن جبير" ئەم بۆچوونەی هەیە بەپێی ئایەتی﴿مَا كَانَ لِنَبِيٍّ أَنْ يَكُونَ لَهُ أَسْرَى حَتَّى يُثْخِنَ فِي الأَرْضِ﴾[3].

---

(١) ص٢٢٨.

(٢) احكام القرآن:٤/١٦٨٩.

(٣) "ثخن في الأمر": زیادەڕەوی کرد تیایدا، و "ثخن في العدو" زیادەڕەوی کرد و توندبوو لە کوشتنیان.

پاشان "ابن العربي" دەڵێت: دوای بەدواداچوونی دروست ئایەتەکە موحکەمە لە فەرمانکردن بە جەنگان.

* "الطبري"[1] دەڵێت: ئەهلی زانست جیاوازیان لەسەری هەیە: هەندێك دەڵێن نەسخکراوەتەوە بەم ئایەتە:﴿فَاقْتُلُوا الْمُشْرِكِينَ حَيْثُ وَجَدْتُمُوهُمْ﴾ هەروەها ئایەتی:﴿فَإِمَّا تَثْقَفَنَّهُمْ فِي الْحَرْبِ فَشَرِّدْ بِهِمْ مَنْ خَلْفَهُمْ﴾.

پاشان "الطبري"[2] دەڵێت: قسەی دروست لەلای ئێمە لەم بارەیەوە ئەم ئایەتە موحکەمە و نەسخ نەکراوەتەوە ئەوەش لەبەر ئەوەی سیفەتی نەسخکەر و نەسخکراو—لە چەندین شوێنی ئەم کتێبەمان ڕۆشنمان کردەوە— گەر حوکمی هەردووکیان کۆنەبێتەوە لەسەر یەك بار یان بەڵگە ڕاست نەبێتەوە لەسەر ئەوەی یەکێکیان نەسخکەری ئەویتریانە.

*الرازي دەڵێت: ﴿فَإِمَّا مَنًّا بَعْدُ وَإِمَّا فِدَاءً﴾ (إما) بۆ کورتهەڵهێنانە، بەڵام حاڵیان لەدوای بەدیلگرتن لە دوو بارەکەدا کورت نابێتەوە، بەڵکو کوشتنیان و بەکۆیلەکردنیان و منەتپێکردنیان و فیدیە لێوەرگرتنیان دروستە، وەك ئەوەی ئەمە پرسیارێك بێت "الرازي" بیخاتە ڕوو و وەڵامی دەداتەوە و دەڵێت: دەڵێین ئەمە ڕێنموونییە، بۆیە بارە گشتییە گونجاوەکە لە هەموو ڕەگەزەکاندا باس دەکات، بە کۆیلەکردن گونجاو نەبووە لە بەدیلگرتنی عەرەبدا، پێغەمبەر(ﷺ) لەگەڵ ئەوان بوو و باسی بەکۆیلەکردنی نەکردووە، بەڵام کوشتن ئاشکرایە لە مانای "المثخن"ەوە بە مانای زیادەڕەوی، هەروەها لەبەر ئەوەی کوشتن بە "ضرب الرقاب" باسکراوە، بۆیە تەنها دوو بار نەرێکرا[3] ئازادکردنی دیل یان وەك منەت و چاکە بەسەریەوە بەبێ بەرانبەر یان فیدیە لێوەرگرتن بەرانبەر بە دیلی موسڵمانان یان وەرگرتنی ماڵ و دارایی یان هەر ڕێکەوتنێکی تر لە نێوان بەجەنگهاتووەکاندا.

---

(١) جامع البيان في تفسير القرآن:٢٦/٣٦.

(٢) ٢٦/٣٧.

(٣) التفسير الكبير ومفاتيح الغيب:٢٨/٤٤.

الطبرسي[1] دەڵێت: (وتراوە حوکمی ئایەتەکە نەسخکراوەتەوە بەم ئایەتە: ﴿فَاقْتُلُوا الْمُشْرِكِينَ حَيْثُ وَجَدْتُمُوهُمْ﴾ هەروەها ﴿فَإِمَّا تَثْقَفَنَّهُمْ فِي الْحَرْبِ﴾ ئەمە ئەوەیە لە "قتادە والسدیّ وابن جریج" ریوایەتیان کردووە "ابن عباس والضحاك" دەڵێن: فیدیە نەسخکراوەتەوە، لە "ابن عمر والحسن وعگاو" دەڵێن حوکمی ئایەتەکە جێگیرە و نەسخ نەبووەتەوە، پاشان "الگبرسی" دیل بۆ دوو بەش دابەش دەکات، گەر لە کاتی جەنگدا بەدیلگیران ئیمام هەڵبژاردەی بۆ هەیە لە نێوان کوشتنیان و بڕینی دەستیان و لاقیان بە چەپ و راست و بەجێیان دەهێڵن تا خوێنیان لەبەر بڕوات، منەتکردن پێیان و فیدیە وەرگرتن لێیان گونجاو نییە، جۆری دووەم ئەگیرێن و دوای ئەوەی جەنگەکە تەواو بوو ئیمام هەڵبژاردەی بۆ هەیە لە نێوان منەتپێکردنیان یان فیدیە و بەکۆیلەکردن و لە گەردنداناین)

بە باوەڕی من ئەم ئیجتیهادە لە "الطبرسي"ەوە گەورەترین هەڵەیە کە لە ژیانیدا ئەنجامی دابێت، ئەوە قسەیەکە لەڕووی شەرع و ئەقڵەوە رەد دەکرێتەوە، شتێکی نامۆیە چۆن لە زانایەکی لەو جۆرە ئەم قسانە دەوەشێتەوە!

بەم برە لە گواستنەوە و خستنەڕووی بۆچوونەکان دەوەستم دەربارەی بابەتی مامەڵەی دیلی جەنگ.

دەڵێم: هەموو ئەوانەی وتوویانە ئەم ئایەتە نەسخکراوەتەوە لە ئیجتیهادەکەیاندا هەڵەیان کردووە بە هەڵەیەکی مەزن، هەرکەسیش "کوشتن و بەکۆیلەکردن"یان خستۆتە سەر "منەت و فیدیە" ئەوا هەڵەیەکی پێچەوانە بەو کورتهەڵهێنانەی لە ئایەتەکەدا هاتووە ئەنجام دەدەن، بە زۆرێك لە هۆ، لەوانە:

١.ئیسلام سیستمی ئازادکردنی مرۆڤی لە کۆیلایەتی هێناوە و بەندایەتی تەنها بۆ خودا بڕیارداوە، بۆیە فەرمانی کردووە بە مرۆڤ لە نوێژەکەیدا لە رۆژێکدا چەندین جار بڵێت: ﴿إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ﴾ تاکو هەست بە رێز و کەسایەتی و پایەداری

(١) مجمع البيان في تفسير القرآن:٩/٩٧.

خۆی بکات.

٢.خودا–سبحانه وتعالی– نەزان نییە و لەبیری نەچووە یان هەڵەی نەکردووە–پەنا دەگرین بە خودا– لە وازهێنان لە دوو ئەمرەکەی تر(کوشتن و بەکۆیلەکردن) کە بە ئیجتیهادی هەڵە خراونەتە پاڵ منەتپێکردن و وەرگرتنی فیدیەوە، خودا بە بەڵگەیەکی جێگیری رەوا ئەوانی سەرپشك نەکردووە بەو کارەیان.

٣.پێغەمبەر(ﷺ) تەنها دیلێکی نەکوشتووە لەبەر ئەوەی دیلی جەنگ بووە، گەر کەسێکیش کوژرابێت بەهۆیەکی تر بووە کە شایستەی کردووە بەو کوشتنە، وەك ئەوە رۆشنە بۆ هەر کەسێك ژیانی پێغەمبەری مەزن(ﷺ) بە وردی و بە ویژدانەوە بخوێنێتەوە، دوور لە دەمارگیری کوێرانە و قسەی خەڵکانی تر.

٩.ژێرمەندانی هەسارەی زەوی لە هەموو یاسا دانراوەکاندا کۆدەنگیان هەیە لەسەر حەرامبوونی کوشتنی دیل و سزادانی و سوکایەتی پێکردنی، هەروەها کۆدەنگیان هەیە لەسەر حەرامکردنی بەکۆیلەکردن، ئایا ئەوانە سۆز و بەزەییان بە مرۆڤبوونی مرۆڤ لە خودا–سبحانه وتعالی– زۆرتر و زیاترە کە لە زۆرێك لە ئایەتەکاندا دەفەرموێت: ﴿وَقُلْ رَبِّ اغْفِرْ وَارْحَمْ وَأَنْتَ خَيْرُ الرَّاحِمِينَ﴾[1]، واتە بڵێ پەروەردگار لێخۆش ببە و رەحم بکە، تۆ باشترینی رەحمکەرانی، هەروەها خودا خۆی بە دوو سیفەتی مەزنی بەزەیی وەسف دەکات و دەفەرمویت:﴿بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ﴾ بەردەوام زۆرێك لەوانەی بە شێوەیەکی دروست لە دین تێنەگەیشتوون و بەقووڵی لێکۆڵینەوەیان لە قورئان نەکردووە و لە دەمارگیری کوێرانە بۆ قسەی کەسانی تر رزگاریان نەبووە، ئەو کەسانەی زمانیان لە ئەقڵیان لێوەشاوەترە و قسەکانیان لە کردارەکانیان زۆرترن وا بانگەشە دەکەن بە کۆیلەکردنی مرۆڤ بۆ برا مرۆڤەکەی دروستە و دەگونجێ وەك دیلی جەنگ بکوژرێت.

---

(١) سورة المؤمنون:١١٨.

ئیسلام لەو جۆرە ئەقڵە دواکەوتووە چەقبەستووە دەمارگیرە بەرییە، چۆن وێنا دەکرێت شتێك مرۆڤ بە نەنگی و عار تەماشای بکات-کە بریتییە لە بەکۆیلەکردنی مرۆڤ بۆ برا مرۆڤەکەی- خودا-سبحانە وتعالی- بە پەسەندی بزانێت و موباحی بکات؟

- ئایەتی(٣٦) ﴿إِنَّمَا الحَيَاةُ الدُّنْيَا[١] لَعِبٌ وَلَهْوٌ وَإِنْ تُؤْمِنُوا وَتَتَّقُوا يُؤْتِكُمْ أُجُورَكُمْ وَلاَ يَسْأَلْكُمْ أَمْوَالَكُمْ[٢]﴾

بانگکەرانی نەسخ پێیانوایە ئەم ئایەتە نەسخکراوەتەوە بە ئایەتەکەی دوای خۆی کە بریتییە لە:﴿إِنْ يَسْأَلْكُمُوهَا فَيُحْفِكُمْ[٣] تَبْخَلُوا وَيُخْرِجْ أَضْغَانَكُمْ[٤]﴾.[٥]

بەو بەرپەرچدانەوەی "ابن الجوزي"[٦] بۆ ئەم بۆچوونە بێبنەمایە دەوەستم کە دەڵێت: (هەندێکیان پێیانوایە بە ئایەتی زەکات نەسخکراوەتەوە، ئەمەش پووچ و بێبنەمایە، چونکە ماناکەی بریتییە لە: داوای هەموو ماڵەکانتان لێ ناکات، "السدی" دەڵێت: گەر داوای هەموو ماڵەکانتان لێ بکات دەستنوقاویی نیشان دەدەن، هەندێ لە بێئاگایان لە گوازەرەوانی تەفسیر پێیانوایە نەسخکراوەتەوە بە: ﴿إِنْ يَسْأَلْكُمُوهَا فَيُحْفِكُمْ تَبْخَلُوا﴾) ئەمە قسەی لەگەڵ نییە).

سورەتی "الفتح و الحجرات" لە زمانیان و بانگەشەی نەسخ تیاندا سەلامەت بووە.

---

(١) واتە گواستنەوە تیایدا بەجۆرێك پشت هەڵدەکات لە جیهانی لە جیهانی مەعنەویات و دوارۆژ.

(٢) واتە توانای خەرجکردنی نییە بەسەر ئاتاجاندا.

(٣) واتە زیادەڕەویی دەکات لە داوایدا.

(٤) واتە بوخلی شاراوەتان دێتە دەرەوە، چونکە مرۆڤ لەسەر خۆشەویستی ماڵ و سامان راهاتووە.

(٥) سورة محمد:٣٧.

(٦) نواسخ القرآن:ص٢٢٩.

# نەسخی بانگەشەبۆکراو لە سورەتی "ق"دا

بانگکەرانی نەسخ پێیانوایە[1] لەم سورەتەدا دوو ئایەتی تێدایە لەڕووی حوکمەوە سڕاونەتەوە و لەڕووی خوێندنەوەوە ماونەتەوە، ئەو دوانەش ئایەتی(٣٩ و ٤٥)ن کە بە ئایەتی شمشێر نەسخکراونەتەوە.

﴿فَاصْبِرْ عَلَى مَا يَقُولُونَ وَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ قَبْلَ طُلُوعِ الشَّمْسِ وَقَبْلَ الْغُرُوبِ﴾ (٣٩)
﴿نَحْنُ أَعْلَمُ بِمَا يَقُولُونَ وَمَا أَنْتَ عَلَيْهِمْ بِجَبَّارٍ فَذَكِّرْ بِالْقُرْآنِ مَنْ يَخَافُ وَعِيدِ﴾ (٤٥)

-ئایەتی(٣٩):﴿فَاصْبِرْ عَلَى مَا يَقُولُونَ وَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ قَبْلَ طُلُوعِ الشَّمْسِ وَقَبْلَ الْغُرُوبِ﴾[2]

---

(١) ابن حزم الاندلسي:٥٧، ابن سلامة:١٧٤، ابن البارزي:٢٠٦، واورد النحاس الآية (٣٩) في كتابه الناسخ والمنسوخ:ص٢٢٣، بەڵام دەڵێت: دەگونجێ موحکەم بێت، لە کتێبی "الناسخ والمنسوخ"دا باس نەکراوە هەر بەو جۆرە لە "کتاب الله"ی "قتادە:ص٤٤، نەسخەکەی گواستۆتەوە بەڵام نەسخبوونەوەی سەرنەخستووە، "ابن الجوزی" خستوویەتە روو لە کتێبەکەیدا: نواسخ القرآن نسخ الآية (٤٥) ص٢٣٠.

(٢) سورة ق:٣٩.

**بانگەشەی نەسخ پووچ و بێبنەمایە بەم بەڵگانە:**

١-گەورە تەفسیرکەرانی قورئان ئەو قسەیان نەکردووە، لەوانە "الطبري[1] والطبرسي[2] والرازي[3] والقرطبي[4] والبيضاوي والكياالهراسي[5] وابن العربي[6] والصاوي"[7] ، "الزمخشري"[8] دەڵێت: وتراوە نەسخکراوەتەوە بە ئایەتی شمشێر، بەڵام ئەو پشتیوانی نەسخی نەکردووە.

٢-هیچ جۆرە بەرهەڵستکارییەك لە نێوان ئەم ئایەتە و ئایەتی شمشێردا بوونی نییە، ئارامگرتن لە رەوش و دۆخێکدا بەرهەڵستکاری ناکات لەگەڵ بەکارهێنانی هێزدا لە رەوش و دۆخێکی تردا کە ئەوە پێویست دەکات.

٣-تەواوکەری ئایەتەکە﴿وَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ قَبْلَ طُلُوعِ الشَّمْسِ وَقَبْلَ الْغُرُوبِ﴾ هەروەها ئەو ئایەتەی بەدوایدا دێت(٤٠)﴿وَمِنْ اللَّيْلِ فَسَبِّحْهُ وَأَدْبَارَ السُّجُودِ﴾ رێنموونی و ئامۆژگاری پێدانی رۆحی و دەروونییە بۆ مرۆڤ، هەرکات رووبەرووی تەنگوچەڵەمەکانی ژیان بوویەوە پەنا بۆ نوێژ دەبات، چونکە سوکنایی و ئارامییە و بە یادی خودا دڵ ئارام دەبێتەوە "النحاس"[9] لە تەفسیری ئایەتەکەدا دەڵێت:(هەندێ لە زانایان تەئویلی ئەمەیان کردووە گەر مرۆڤێك شتێك دڵتەنگی کرد پێویستە پەنا بۆ نوێژ ببات، "حذيفة" دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) گەر کارێك دڵتەنگی بکردبایە پەنای بۆ نوێژ دەبرد).

---

(١) جامع البيان في تفسير القرآن:١١٢/٢٤.
(٢) مجمع البيان في تفسير القرآن:١٥٠/٩.
(٣) التفسير الكبير:١٨٤/٢٨.
(٤) الجامع لاحكام القرآن:٢٤/١٧.
(٥) ٣٨٧/٤.
(٦) ١٧١٥/٤.
(٧) ١٢٢/٤.
(٨) الكشاف:١٢/٤.
(٩) الناسخ والمنسوخ: ص٢٢٤.

–ئایەتی(٤٥):﴿نَحْنُ أَعْلَمُ بِمَا يَقُولُونَ وَمَا أَنْتَ عَلَيْهِمْ بِجَبَّارٍ فَذَكِّرْ بِالْقُرْآنِ مَنْ يَخَافُ وَعِيدِ﴾[1]

بانگەشـەی نەسـخی ئـەم ئایەتـە پـووچ و بێبنەمایـە لەبـەر نـەبوونی هـیچ جـۆرە بەرهەڵستکارییەك لە نێوان ئەم ئایەتە و ئایـەتی شمشـێردا، هـەروەها لەبـەر ئـەوەی ئایەتی هەڕەشە و بەڵێنە و ئەو دوانەش ناچنە ژێـر بـاری نەسـخەوە هـەروەها لەبـەر چەندین هۆی تر پێشتر باسمان لەبارەوە کردوون.

(١) سورة ق:٤٥.

# نەسخی بانگەشەبۆکراو لە سورەتی "الذاريات"دا

بانگکەرانی نەسخ پێیانوایە[1] لەم سورەتەدا دوو ئایەت هەیە نەسخکراونەتەوە، ئایەتی(١٩) نەسخکراوەتەوە بە ئایەتی زەکات و ئایەتی(٥٤) نەسخکراوەتەوە بە ئایەتی(٥٥)ی هەمان سورەت.

﴿وَفِي أَمْوَالِهِمْ حَقٌّ لِلسَّائِلِ وَالْمَحْرُومِ﴾ (١٩)

﴿فَتَوَلَّ عَنْهُمْ فَمَا أَنْتَ بِمَلُومٍ﴾ (٥٤)

-ئایەتی(١٩)﴿وَفِي أَمْوَالِهِمْ حَقٌّ لِلسَّائِلِ وَالْمَحْرُومِ﴾[2]

بانگەشەی نەسخ پووچ و بێبنەمایە بەم بەڵگانە:

١-نەبوونی هیچ جۆرە بەرهەڵستکارییەك لە نێوان ئەم ئایەتە و ئایەتی زەکاتدا چونکە گەر مەبەست بە "حق" کە تیایدا هاتووە زەکات بێت ئەوا لەو ئایەتانەیە فەرمان بە زەکات دەکات بۆیە گونجاو نییە دوو ئایەت بوونی هەبێت فەرمان بە یەك حوکم بکەن و یەکێکیان ئەویتریان نەسخ بکاتەوە.

---

(١) ابن حزم الاندلسي:٥٧، ابن سلامة:١٧٤-١٧٥، وابن البارزي:٢٠٦-٢٠٧، وغيرهم من عشاق النسخ.

(٢) سورة الذاريات: ١٩.

گەر مەبەست بە "حق" صەدەقەی بەخشین و پێشکەش کردنی هاوکاری دارایی بە هەژاران و ئاتاجان بێت–هەر کەس بەپێ توانای دارایی خۆی– ئەوا ئەم حوکمە دەمێنێتەوە تا ژیان بەردەوام بێت، هاوکاری و دەستگرۆیی و هاریکاری ئابووری لە گرنگترین ئەرکەکانی سەر شانی مرۆڤە، ئیتر چۆن وێنا دەکرێت ئەم حوکمە نەسخ بووبێتەوە؟

٢–ئەم بانگەشە بێبنەمایە وەك بانگەشەی نەسخی ئەو ئایەتانە وایە فەرمان بە خەرجکردن دەکەن بە ئایەتی زەکات، پێشتر ئەوەندەی پێویست بێت بەرپەرچمان دایەوە بۆیە ئاتاج بە دووبارەکردنەوە نییە.

"ابن الجوزی"[1] دەڵێت: ("حق" لێرەدا مانای "النصیب"ی هەیە، دوو قسەی لەسەرە:

یەکەم: ئەوەی سیلەی رەحمی پێ بەجێدەهێنن یان میوانی پێ بەرێدەکەن یان کەسێکی بارکەوتووی پێ راست دەکەنەوە یان کەسێکی مەحرومی پێ بێنیاز دەکەن، ئەمە بریتی نییە لە زەکات، ئەمە قسەی "ابن عباس"ە.

دووەم: "حق" بریتییە لە زەکات، "قتادة و ابن سیرین" ئەمە دەڵێن.

دەستەیەك پێیانوایە ئەم ئایەتە پێویست دەکات بە داواکەر و مەحروم ببەخشیت، ئەوەش بە ئایەتی زەکات نەسخکراوەتەوە، بەڵام ئەوەی ئاشکرایە ئایەتەکە هانی بەخشین دەدات و نەسخ رووی لێ ناکات) [2].

– ئایەتی(٥٤) ﴿فَتَوَلَّ عَنْهُمْ فَمَا أَنْتَ بِمَلُومٍ﴾[3]

پێیانوایە ئەم ئایەتە نەسخکراوەتەوە بەو ئایەتەی بەدوایدا دێت کە بریتییە لە:﴿وَذَكِّرْ فَإِنَّ الذِّكْرَى تَنفَعُ الْمُؤْمِنِينَ﴾[1]

---

(١) نواسخ القرآن:ص٢٣٠.

(٢) المرجع السابق:ص٢٣١.

(٣) سورة الذاريات:٥٤.

ئەم بانگەشە بێبنەما تەنها عاشقانی نەسخ دەیخەنە روو و تەنها لە فەرهەنگی ئەواندا دەبینرێتەوە، ئەوەش پووچ و بێنەمایە بەم بەڵگانە:

١-چۆن وێنا دەکرێت خودا حوکمێکی شەرعی بەیان بکات و پاشان لە کەمترین ماوەدا بیسڕێتەوە و ئایەتێك بهێنێت راستەوخۆ لەگەڵ ئایەتەکەی تر بەرهەڵستی بکات؟!.

٢-لە نێوان دوو ئایەتەکەدا هیچ بەرهەڵستکارییەك بوونی نییە، ئەو دوو ئایەتە لەڕووی حوکمەوە پەیوەستی یەکترن جگە لەوەی ئایەتی(٥٤) لە دوای جێبەجێ کردنی حوکمی ئایەتی(٥٥) جێبەجێ دەکرێت، بۆیە کاری پێغەمبەران و ئەوانەی لە جێگەی ئەوان دادەنیشن بریتییە لە ئاراستەکردن و رێنموونی کردن و نیشاندانی رێگەی دروست و پێڕاگەیاندنی فەرمانەکانی خودا و نەهیلێکراوەکانی، گەر لایەنی بەرانبەر لەسەر گومڕایی و سەرلێشێواویی خۆی سوور بوو و رێنموونی و ئامۆژگاری سوودی پێ نەدەگەیاند ئەوا وەستان لەو رادە و سنوورەدا پێویستە، ئەمەش بۆ دوورخستنەوەی سەرئەنجامی نەرێنی لەسەر تاك و کۆمەڵگە بە ئایەتی:﴿وَذَكِّرْ فَإِنَّ الذِّكْرَى تَنفَعُ الْمُؤْمِنِينَ﴾ لەڕووی دەستپێشخەری بۆ سەر ئیمان پێش ئامۆژگاری و بەردەوامبوون لەسەری دوای ئامۆژگاری.

گەر یادخستنەوە سوودی بەوانە نەدەگەیاند بۆ ئیمان و رێگەی دروست ئاراستە دەکران ئەوا رۆڵی حوکمی ئایەتی دووەم دێتە بەرەوە کە بریتییە لە:﴿فَتَوَلَّ عَنْهُمْ فَمَا أَنتَ بِمَلُومٍ﴾ لەدوای جێبەجێ کردنی ئەرکی سەرشانت لە پێڕاگەیاندن نیشاندانی رێگە.

"ابن الجوزي"[٢] دەڵێت: دەستەیەك پێیانوایە نەسخکراوەتەوە پاشان لەسەر نەسخکەرەکەی جیاوازیان لە نێواندا هەیە، هەندێکیان دەڵێن نەسخکەرەوەکەی بریتییە لە ئایەتی شمشێر، هەندێکی تر دەڵێن نەسخکەرەوەکەی بریتییە لە

---

(١) سورة الذاريات:٥٥.

(٢) نواسخ القرآن: ص٢٣١.

ئایەتی: ﴿وَذَكِّرْ فَإِنَّ الذِّكْرَى تَنفَعُ الْمُؤْمِنِينَ﴾ ئەمەش هەندێ جار ئەندێشە دەکرێت ماناى: ﴿فَتَوَلَّ عَنْهُمْ﴾ بریتی بێت لە پشتهەڵکردن لە قسەکردن لەگەڵیان و نەکردنی قسە لەگەڵیان، لەمەدا دوورکەوتنەوە بوونی هەیە.

١-ئایەتی: ﴿فَتَوَلَّ عَنْهُمْ﴾ ماناکەی ئەوە نییە پشت لە جەنگان بکە گەر هۆیەك هەبوو ئەو جەنگانەی پێویست دەکرد، تا ئەمرەکە بە پشتهەڵکردن لە جەنگان جارێکی تر بە فەرمانکردن پێی نەسخ ببێتەوە.

# نەسخی بانگەشەبۆكراو لە سورەتی "الطور"دا

"ابن حزم الاندلسي"[1] دەڵێت: هەموو سورەتەكە موحكەمە جگە لە ئایەتێك كە بریتییە لە:﴿وَاصْبِرْ لِحُكْمِ رَبِّكَ فَإِنَّكَ بِأَعْيُنِنَا﴾[2] تیایدا "ئارامگرتن" بە ئایەتی شمشێر نەسخكراوەتەوە.

"ابن سلامه"[3] دەڵێت: (دوو ئایەتی نەسخكراوی تێدایە، یەكەمیان:﴿قُلْ تَرَبَّصُوا فَإِنِّي مَعَكُمْ مِنْ الْمُتَرَبِّصِينَ﴾[4] ئەوە بە ئایەتی شمشێر نەسخكراوەتەوە.

ئایەتی دووەم﴿وَاصْبِرْ لِحُكْمِ رَبِّكَ فَإِنَّكَ بِأَعْيُنِنَا﴾ بە ئایەتی شمشێر نەسخكراوەتەوە).

"ابن البارزي"[5] هاوڕایە لەگەڵ "ابن سلامة" لەو نەسخە باسكراوەدا، "النحاس"[6] دەڵێت: ئەوەی لە ئایەتی (٤٥) نەسخكراوەتەوە بریتییە لەم بەشەی ئایەتەكە:﴿وَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ حِينَ تَقُومُ﴾ پێچەوانەی ئەوانی تر كە دەڵێن نەسخكراوە بریتییە لە سەرەتای ئایەتەكە كە ئەمەیە:﴿وَاصْبِرْ لِحُكْمِ رَبِّكَ فَإِنَّكَ بِأَعْيُنِنَا﴾ بەبێ ئەوەی نەسخكەرەكەی باس بكات.

---

(١) الناسخ والمنسوخ:ص٥٨.

(٢) سورة الطور:٤٨.

(٣) ص١٧٥.

(٤) سورة الطور:٣١.

(٥) ص٢٠٧.

(٦) الناسخ والمنسوخ:ص٢٢٦.

"ابن الجوزي"[1] باسی ئەوە دەكات بانگكەرانی نەسخ پێیانوایە لە سورەتی "الطور"دا سێ ئایەتی نەسخكراو هەیە، ئەو سیانەش ئایەتی: (٣١ و ٤٥ و ٤٨)ن.

ئایەتی(٣١) ﴿قُلْ تَرَبَّصُوا فَإِنِّي مَعَكُمْ مِنَ الْمُتَرَبِّصِينَ﴾[2]
دەڵێن: بە ئایەتی شمشێر نەسخكراوەتەوە.
ئەم بانگەشەیە پووچ و بێبنەمایە بەم بەڵگانە:
١-ئایەتەكە هەڕەشەیە و ناكەوێتە ناو نەسخەوە[3].
٢-هیچ جۆرە بەرهەڵستییەك لە نێوان ئەم ئایەتە و ئایەتی شمشێردا بوونی نییە، چونكە لە ئایەتەكەدا هەڕەشەی ئاماژەی پیادەكردنی ئایەتی شمشێری بەسەریاندا تێدایە لە داهاتوودا، حوكمی ئایەتەكە نەهێكردن نییە لە جەنگان گەر پێویستی داوای بكات.
"ابن الجوزي"[4] دەڵێت: هەندێكیان پێیانوایە بە ئایەتی شمشێر نەسخكراوەتەوە، ئەمەش قسەیەكی راست نییە، چونكە دژیەكی لەنێوان دوو ئایەتەكەدا بوونی نییە.

-ئایەتی(٤٥) ﴿فَذَرْهُمْ حَتَّى يُلَاقُوا يَوْمَهُمُ الَّذِي فِيهِ يُصْعَقُونَ﴾[5]
"يصعقون" واتە "يموتون-دەمرن". پێیانوایە ئەم ئایەتە بە ئایەتی شمشێر نەسخكراوەتەوە.

---

(١) نواسخ القرآن:ص٢٣٢.
(٢) سورة الطور:٣١.
(٣) قال الصاوي:١٢٣/٤: ((قل تربصوا) فەرمانێكی هەڕەشەئامێزە لەسەر رادەی(اعملوا ما شئتم)) الرازي:٢٥٥/٢٨ دەڵێت: ئەوە ئەمر نییە، بەڵكو وەك قسەی سەردارێكی تووڕە وایە بە بەندەكەی: هەرچی دەكەی بیكە من لە تۆ بێئاگا نیم.
(٤) ص٤٣٢.
(٥) سورة الطور:٤٥.

بانگەشەکە پووچ و بێبنەمایە بەم بەڵگانە:

١-ئایەتەکە هەڕەشەیە هەڕەشەش بە کۆدەنگی فەقیهانی هاوەڵان و شوێنکەوتووان ناچێتە ناو نەسخەوە، "ابن الجوزي"[1] دەڵێت: هەندێکیان پێیانوایە ئەم ئایەتە بە ئایەتی شمشێر نەسخکراوەتەوە، گەر مانای "ذرهم" هەڕەشە بێت نەسخ رووی نەداوە.

٢-نەبوونی بەرهەڵستکاری لە نێوان ئەم ئایەتە و ئایەتی شمشێردا، چونکە فەرمان بە وازلێهێنانیان لەسەر کاریگەرنەبوونیان بە رێنموونی و رێگەنیشاندان و ئامۆژگاری باش و موجادەلە بە چاکە بیناکراوە.

"الرازي"[2] دەڵێت: واتە گەر رۆشنبوویەوە ئەوانە ناگەرێنەوە ئەوا وازیان لێ بهێنە تا دەگەن بە رۆژی خۆیان، پاشان دەڵێت: وتنی نەسخبوونەوەی ئەم ئایەتە و هاوشێوەکانی لاوازە لەبەر نەبوونی بەرهەڵستکاری، هەروەها دەڵێت: ئاماژەی تێدایە بەوەی ئامۆژگارییان سوودێکی نییە.

-ئایەتی(٤٨) ﴿وَاصْبِرْ لِحُكْمِ رَبِّكَ فَإِنَّكَ بِأَعْيُنِنَا وَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ حِينَ تَقُومُ﴾[3]

"ابن الجوزي"[4] دەڵێت: (هەندێ لە ئەهلی تەفسیر پێیانوایە مانای "ئارامگرتن" نەسخکراوەتەوە بە ئایەتی شمشێر، ئەوەش راست نییە چونکە دەگونجێ ئارام بگرێت لەبەر حوکمی پەروەردگاری و لەگەڵیشیان بجەنگێ، دژیەکی لە نێوان دوو ئایەتەکەدا بوونی نییە).

---

(١) نواسخ القرآن:ص٢٣٢.

(٢) التفسير الكبير:٢٨/٢٦٩.

(٣) سورة الطور:٤٨.

(٤) نواسخ القرآن:ص٢٣٢.

# نەسخی بانگەشەبۆکراو لە سورەتی "النجم"دا

"ابن حزم الاندلسي"[1] ئەم سورەتە مەکیيە و هەمووی موحکەمە جگە لە دوو ئایەت(٢٩ و ٣٩)، یەکەمیان بە ئایەتی شمشێر نەسخکراوەتەوە و دووەمیان بە ئایەتی(٢١)ی سورەتی "الطور" نەسخکراوەتەوە، "ابن سلامة[2]" وابن البـارزي"[3] لەو بانگەشە ئامـاژەبۆکراوەدا شـوێنی ئـەو کـەوتوون، "النحـاس"[4] لـە کتێبەکەیدا "الناسخ والمنسوخ في القرآن" بانگەشـەی نەسـخی ئایـەتی (٣٩)ی گواسـتۆتەوە، بەڵام ئایەتی (٢٩)ی نەگواستۆتەوە.

﴿فَأَعْرِضْ عَنْ مَنْ تَوَلَّى عَنْ ذِكْرِنَا وَلَمْ يُرِدْ إِلاَّ الْحَيَاةَ الدُّنْيَا﴾ (٢٩)

﴿وَأَنْ لَيْسَ لِلإِنسَانِ إِلاَّ مَا سَعَى﴾ (٣٩)

---

(١) ص٥٨.

(٢) ص١٧٦.

(٣) ص٢٠٧.

(٤) ص٢٢٧.

-ئایەتی(٢٩) ﴿فَأَعْرِضْ عَنْ مَنْ تَوَلَّى عَنْ ذِكْرِنَا وَلَمْ يُرِدْ إِلاَّ الْحَيَاةَ الدُّنْيَا﴾[١]
پێیانوایە بە ئایەتی شمشێر نەسخکراوەتەوە.

"الطبرسي" لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا[٢] دەڵێت: ئەی محەمەد(ﷺ) پشت لەوانە بکە دان بە یەکتاپەرستی ئێمەدا نانێن و ڕوویان لە دونیا و قازانجەکانی دونیا کردووە، واتە لەسەر کار و کردەوەکانیان ڕووبەڕوویان مەبەرەوە، خۆتبگرە و لەگەڵ ئەوەش بانگکردن و ئامۆژگارییان بۆ حەق واز لێ مەهێنە.

ئەمەش دەخەمە سەر قسەکەی "الطبرسي": پشتهەڵکردن مانای حەرامکردنی بەکارهێنانی هێز ناگەیەنێت دژ بە دەستدرێژکار هەرکات دەستدرێژی کردە سەر بەرژەوەندییەکی زەروری بەپێی ئایەتی:﴿فَمَنْ اعْتَدَى عَلَيْكُمْ فَاعْتَدُوا عَلَيْهِ بِمِثْلِ مَا اعْتَدَى عَلَيْكُمْ﴾.

بەرهەڵستکاری لە کوێی ئەم ئایەتە و ئایەتی شمشێردایە ئەی عاشقانی نەسخکردنەوە؟

-ئایەتی(٣٩) ﴿وَأَنْ لَيْسَ لِلْإِنسَانِ إِلاَّ مَا سَعَى﴾ [٣]
ئەم ئایەتە لە گرنگترین ڕێسا گشتییەکانی قورئانە بۆ ئەوەی هەموو مرۆڤێکی ژیر لەسەری بڕوات.

دەڵێن بە ئایەتی(٢١)ی سورەتی "الطور" نەسخکراوەتەوە: ﴿وَالَّذِينَ آمَنُوا وَاتَّبَعَتْهُمْ ذُرِّيَّتُهُمْ بِإِيمَانٍ أَلْحَقْنَا بِهِمْ ذُرِّيَّتَهُمْ وَمَا أَلَتْنَاهُمْ مِنْ عَمَلِهِمْ مِنْ شَيْءٍ[٤] كُلُّ امْرِئٍ بِمَا كَسَبَ رَهِينٌ﴾[١].

---

(١) سورة النجم:٢٩.
(٢) مجمع البيان في تفسير القرآن:٩/١٧٧.
(٣) سورة النجم:٣٩.
(٤) واتە پاداشتی ڕۆڵەکان لە کاروکردەوەکانیاندا کەم ناکەینەوە بەهۆی کەمی تەمەنیانەوە، هەر بەو جۆرە پاداشتی کاروکردەوەی باوان کەم ناکەینەوە بەهۆی کۆکردنەوەیان لەگەڵ منداڵ و نەوەکانیان.

"الـرازي"[٢] دەڵێـت وتـراوە ئـەم ئایەتـە:﴿لَـيْسَ لِلإنسَـانِ إلاَّ مَـا سَـعَى﴾ لـە شەریعەتەکانی پێشوودا هەبووە و پاشان لە شەریعەتی محەمەددا(ﷺ) خودا نەسخ کراوەتەوە، ئەوەی مرۆڤ هەوڵی بۆ دەدات و ئەوەی هەوڵی بۆ نادات خودا بۆی داناوە، ئەمەش قسـەیەکی پـووچ و بێبنەمایـە و پێویسـت بـەم زۆر لەخۆکردنـە ناکات دوای ئەوەی حەق رۆشنبوویەوە، مەبەست بە ئایەتەکە ئەوە نییە خودی شتەکەی بۆ هەیە بەڵکو مەبەست پێی پاداشتی ئەوەی هەوڵی بۆ داوە یان کرێی ئەوەی بۆی کۆشـاوە، یان دەوترێـت مەبەسـتەکە: ئـەوەی بـۆی کۆشـاوە بـۆی پـارێزراوە و لـە بێهیوابـوون بەدوورگیراوە.

بانگەشەی نەسخ بەم بەڵگانە پووچ و بێبنەمایە:

١–ئایەتەکە هەواڵە و هەواڵیش ناچێتە ناو نەسخەوە، "ابن الجـوزي"[٣] دەڵێـت: ئەو کەسەی دەڵێت ئەم ئایەتـە نەسـخکراوەتەوە هەڵەیـە، چونکە هـەردوو ئایەتەکـە هەواڵن و هەواڵیش نەسخی تێناچێت، پاشان گەیاندنی نەوەکان بە باوانیـان و چـوونە نـاو حـوکمی باوانیانـەوە بـەهۆی ئیمـانی باوانـەوە ئـەوان وەك بەشـێك وان بـۆ شوێنکەوتەی گشتێك، ئەوەش لـە بنەڕەتـدا بـۆ ئـەوان نییـە، بـەڵکو خـودا–سبحانە وتعالى– بە فەزڵی خۆی ئەوەی بۆ کـردوون، ئـەم ئایەتـە ئـەوە جـێگیر دەکـات مـرۆڤ تەنها ئەوەی بۆ هەیە خودا بە فەزڵی خۆی پێی دەبەخشێت.

٢–نەبوونی بەرهەڵستکاری لە نێوان دوو ئایەتەکەدا وەك چۆن رۆشنە بۆ کەسـێك کەمترین پەیبردنی بە حەقیقەتی دوو ئایەتەکە هەبێت، گەر وا دابنێین بەرهەڵستکاری بوونی هەیـە ئـەوا بـە تایبـەتکردنی گشـتاندنەکەی ئایـەتی(٣٩) هەڵـدەگیرێت و هـیچ پاساوێك بۆ وتنی نەسخ بوونی نامێنێت.

---

(١) سورة الطور: ٢١.

(٢) التفسير الكبير:١٦/٢٩.

(٣) نواسخ القرآن:ص٢٣٣.

# نەسخی بانگەشەبۆکراو لە سورەتی "القمر"دا

"ابن سلامة"[1] وابن البارزي"[2] و ئەوانەی شوێن ئەو دوانە کەوتوون پێیانوایە ئایەتی(٦)ی ئەم سورەتە بە ئایەتی شمشێر نەسخکراوەتەوە: ﴿فَتَوَلَّ عَنْهُمْ يَوْمَ يَدْعُ الدَّاعِي إِلَى شَيْءٍ نُكُرٍ﴾

هەریەك لە "ابن حزم الاندلسي[3] والنحاس"[4] لەگەڵ ئەم نەسخبوونەوەدا نین لەگەڵ ئەوەی هەردوو لە عاشقانی نەسخن لە قورئاندا، "ابن الجوزي"[5] رەدی نەسخبوونەوەی ئەو ئایەتە دەکاتەوە و دەڵێت:(دەستەیەك پێیانوایە ئەم ئایەتە بە ئایەتی شمشێر نەسخکراوەتەوە، پێشتر قسەمان کرد لەسەر هاوشێوەکانی و رۆشنمان کردەوە ئەوانە نەسخ نەکراونەتەوە).

دروستەکەی ئەوەیە بانگەشەی نەسخ پووچە لەبەر نەبوونی بەرهەڵستکاری لە نێوان دوو ئایەتەکەدا، بابەتی هەریەك لەو دوانە لەیەکتر جیاوازن، هەر بەو جۆرە رەوشی هەریەك لەو دوانە لەیەکتر جیاوازن، فەرمانکردن بە پشتهەڵکردن لێیان لەدوای سوودنەبینینیان لە پێراگەیاندن و ئاراستەکردن و رێگەنیشاندان بەرهەڵستی ناکات لەگەڵ بەکارهێنانی هێز لە کاتی پێویستدا و بەڵگە نییە لەسەر حەرامکردنی جەنگان دژ بە هەرکەسێك دەستدرێژی دەکاتە سەر بەرژەوەندی زەروری موسڵمانان.

---

(١) ص١٧٦.
(٢) ص٢٠٨.
(٣) ص٥٨.
(٤) ص٢٢٧ وما بعدها.
(٥) ص٢٣٤.

# نەسخی بانگەشەبۆکراو لە سورەتی "الواقعة"دا

سورەتی "الرحمن و الواقعة" لە زمانیان و بانگەشەی نەسخیان رزگاریان بووە، عاشقانی نەسخ هەموویان دان بەوەدا دەنێن ئەم دوو سورەتە نەسخیان تێدا نییە، بەڵام "ابن سلامة"[1] دەڵێت: هەموو ئەهلی تەفسیر کۆدەنگیان هەیە نەسخکراو و نەسخکەر لە سورەتی "الواقعة"دا بوونی نییە، جگە لە "مقاتل بن سليمان" ئەو دەڵێت ئەم ئایەتەی نەسخکراوەتەوە: ﴿ثُلَّةٌ مِنَ الْأَوَّلِينَ وَقَلِيلٌ مِنَ الْآخِرِينَ﴾[2] نەسخکەرەوەکەی بریتییە لە: ﴿ثُلَّةٌ مِنَ الْأَوَّلِينَ وَثُلَّةٌ مِنَ الْآخِرِينَ﴾[3] "الثلة" بریتییە لە کۆمەڵێکی زۆر گەورە.

"الفخر الرازي"[4]-خودا رەحم بە رۆحی پاکی بکات- دەڵێت: (ئەوەی ئاشکرایە ئەوەیە پێشینەکان لەوانەی پێش پێغەمبەر(ﷺ) لە پێغەمبەران و شوێنکەوتووانیان گەر کۆبکرێنەوە ئەوا زۆر زیاترن لە پێشینەکانی ئوممەتی محمد(ﷺ) لەسەر ئەمە وتراوە هاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ) کەمی ژمارەی خۆیان لەلا گران بوو بۆیە بەدوایدا ئەم ئایەتە دابەزی: ﴿ثُلَّةٌ مِنَ الْأَوَّلِينَ، وَثُلَّةٌ مِنَ الْآخِرِينَ﴾.

---

(١) ص١٧٧.

(٢) سورة الواقعة الأيتان:١٣ و١٤ وقبلهما الآيات (١٠ و١١ و١٢) (وَالسَّابِقُونَ السَّابِقُونَ، أُولَئِكَ الْمُقَرَّبُونَ، فِي جَنَّاتِ النَّعِيمِ).

(٣) سورة الواقعة الايتان: ٣٩ و٤٠.

(٤) التفسير الكبير:١٤٩/٢٩.

ئەمەش لە ئەوپەڕی لاوازیدایە لە چەندین رووەوە:

یەکەمیان: ژمارەی ئوممەتی محمد(ﷺ) لەو سەردەمەدا بەڵکو تا کۆتایی رۆژگار بەراورد بەوانەی تێپەڕیون لە ئەوپەڕی کەمیدایە، بۆیە نیعمەتێکی گەورەی خودایان بەسەرەوە بووە بەوەی فەزڵی داون بەسەر زۆرێك لە خەڵکانی پێش خۆیان، ئەمە هیچی تر نییە جگە لە تێکەڵییەکی نەشیاو.

دووەم: ئەم بۆچوونە وەك نەسخکردنەوە وایە لە هەواڵدا و ئەوەش ئەوپەڕی دوورە لە راستییەوە.

سێیەم: ئەوەی بەدوایدا هاتووە ئەم بۆچوونە هەڵئاگرێت چونکە "الثلة من الأولين" لێرەدا لە پێشبڕکێکەرانی پێشینەکانە، ئەمەش رۆشنە، چونکە ئوممەتی محمد(ﷺ) زۆربوون و خودا رەحمی پێکردن بۆیە لە کۆمەڵە شتێکیان بورا کە لەوانی تر پێی نەبوراوە، شفاعەتی بۆ پێغەمبەرمان(ﷺ) داناوە بۆیە ژمارەی رزگاربووان کە بریتین لە "أصحاب اليمين" زۆربوون، بەڵام ئەوانەی گوناهاوی نەبوون و تاوانی گەورەیان ئەنجام نەداوە لە ئوممەتی محمد(ﷺ) لە ئەوپەڕی کەمیدان کە بریتین لە پێشبڕکێکەران.

چوارەم: ئەمە ئەندێشەیە، پێویست بوو بەم ئایەتە دڵخۆشبوونایە، چونکە خودا دەفەرموێت:﴿ثُلَّةٌ مِنْ الأَوَّلِينَ﴾ پێغەمبەرانی دەچێتە ناو لەگەڵ دۆستانی خودا کە لە یەك پلەدان، ئەوەش نیعمەتێکە لە پای ئەواندا، لەوانەیە ئاماژەش بێت بە فەرموودەکەی پێغەمبەر(ﷺ) کە دەفەرموێت: (زانایانی ئوممەتەکەم وەك پێغەمبەرانی بەنی ئیسرائیلی وان) ئەم چوار لقە لە بەشەکانی رووی یەکەمن.

رووی دووەم:(مەبەست پێی پێشبڕکێکەرانی پێشینەکان لە کۆچکەران و سەرخەران، ئەوانە زۆربەیان لە پلەی بالآدان بەپێی ئایەتی: ﴿لاَ يَسْتَوِي مِنْكُمْ مَنْ أَنْفَقَ﴾الآية ﴿وَقَلِيلٌ مِنْ الآخِرِينَ﴾ ئەوانەی لە پاشینەکان بەوان نەگەیشتن، لەسەر ئەمە ئایەتی:﴿وَكُنتُمْ أَزْوَاجًا ثَلاَثَةً﴾ گوتارێکە روو بەوانەی لە کاتی دابەزینی قورئاندا هەبوون و رۆشنکردنەوەی پێشینەکانی تێدا نییە کە پێش

پێغەمبەرمان(ﷺ) ژیاون، ئەمەش ڕۆشنە چونکە گوتارەکە تەنها بۆ ئەوانەیە لەو سەردەمەدا بوون لە ڕووی گوزارەوە، کەسانی تریش دەچنە ناویەوە بە بەڵگەکە.

ڕووی سێیەم: ﴿ثُلَّةٌ مِنَ الأَوَّلِينَ﴾ ئەوانەی ئیمانیان هێنا و کاری چاکەیان ئەنجامدا بۆ خۆیان﴿وَقَلِيلٌ مِنَ الآخِرِينَ﴾ ئەوانەی خودا لەسەریان دەفەرموێت﴿وَاتَّبَعَتْهُمْ ذُرِّيَّتُهُمْ﴾بۆیە ئیمانداران و نەوەکانیان گەر لە "أصحاب اليمين" بوون ئەوانە لە زۆریدا یەکسانن، چونکە هەر منداڵێك دەمرێت یەکێك لە دایك و باوکی باوەڕدارە ئەوا لە "أصحاب اليمين"ە بەڵام گەر لە باوەڕدارە پێشبڕکێکەرەکان بوون ئەوا کەمجار منداڵەکەیان دەگاتە پلەی "پێشبڕکێکەران"، زۆرجاریش منداڵی باوەڕدار حاڵی باشتر دەبێت لە لە باوکێك بەهۆی کەمتەرخەمییەوە یان بەهۆی گوناه و یاخیبوونەوە کە لە کوڕە بچووکەکەدا ئەوانە بوونیان نییە، لەسەر ئەمە ئەمەی دەفەرموێت: ﴿الآخِرِينَ﴾ مەبەست پێی ئەوانی تر لە بچووکەکان کە شوێنیان دەکەون)[1].

ئەمانە ئەو لق و ئەگەرانەن کە "الرازي" وێنای کردووە لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا لە هەر هەموویدا خەڵتەی نەسخی تێدا نابینرێتەوە.

سوپاس بۆ خودا سورەتی "الحديد" ڕزگاری بووە لە تۆمەتی نەسخ.

---

(١) المرجع السابق:٢٩/١٤٩.

# نەسخی بانگەشەبۆکراو لە سورەتی "الحشر"دا

بانگکەرانی نەسخ دەڵێن نەسخکراوی تێدا نییە، بەڵام نەسخکەری تێدایە کە بریتییە لە ﴿مَا أَفَاءَ اللَّهُ عَلَى رَسُولِهِ مِنْ أَهْلِ الْقُرَى﴾[1] خودا بەم ئایەتە ئایەتی "الأنفال"ی پێ نەسخ کردۆتەوە کە دەفەرموێت:﴿يَسْأَلُونَكَ عَنْ الأَنْفَالِ﴾[2]الآيـة، لە سورەتی "الأنفال"دا رەدی ئەم بۆچوونەمان داوەتەوە.

---

(١) سورة الحشر:٧.

(٢) سورة الانفال:١.

# نەسخی بانگەشەبۆکراو لە سورەتی "الممتحنة"

یان (الإمتحان)دا

"ابن حزم الاندلسي"[1] دەڵێت: سێ ئایەتی نەسخکراوەی تێدایە، ئەوانەش ئایەتی(٨ و ١٠ و ٦٠)ن، "ابن سلامة"[2] دەڵێت: نەسخکراو تیایدا ئایەتی: (٨ و ١٠ و ١١)یە، "ابن الجوزي"[3] دەڵێت: نەسخ لەم ئایەتانەدایە(٨ و ٩ و ١٠ و ١١)، "النحاس"[4] باسی ئەوەی کردووە نەسخ لەم ئایانەدایە: (٨ و ١٠- و ١١ و ١٢)

﴿لاَ يَنْهَاكُمْ اللَّهُ عَنْ الَّذِينَ لَمْ يُقَاتِلُوكُمْ فِي الدِّينِ وَلَمْ يُخْرِجُوكُمْ مِنْ دِيَارِكُمْ أَنْ تَبَرُّوهُمْ وَتُقْسِطُوا إِلَيْهِمْ إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُقْسِطِينَ، إِنَّمَا يَنْهَاكُمْ اللَّهُ عَنْ الَّذِينَ قَاتَلُوكُمْ فِي الدِّينِ وَأَخْرَجُوكُمْ مِنْ دِيَارِكُمْ وَظَاهَرُوا عَلَى إِخْرَاجِكُمْ أَنْ تَوَلَّوْهُمْ وَمَنْ يَتَوَلَّهُمْ فَأُوْلَئِكَ هُمْ الظَّالِمُونَ﴾ (٨-٩)

﴿يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا جَاءَكُمْ الْمُؤْمِنَاتُ مُهَاجِرَاتٍ فَامْتَحِنُوهُنَّ اللَّهُ أَعْلَمُ بِإِيمَانِهِنَّ فَإِنْ عَلِمْتُمُوهُنَّ مُؤْمِنَاتٍ فَلاَ تَرْجِعُوهُنَّ إِلَى الْكُفَّارِ لاَ هُنَّ حِلٌّ لَهُمْ وَلاَ هُمْ يَحِلُّونَ لَهُنَّ وَآتُوهُمْ مَا أَنفَقُوا وَلاَ جُنَاحَ عَلَيْكُمْ أَنْ تَنكِحُوهُنَّ إِذَا (١٠)

---

(١) ص٥٩-٦٠.

(٢) ص١٨٠-١٨١.

(٣) نواسخ القرآن:ص٢٣٩-٢٤٢.

(٤) الناسخ والمنسوخ:ص٢٣٥-٢٥٠.

آتَيْتُمُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ وَلاَ تُمْسِكُوا بِعِصَمِ الْكَوَافِرِ وَاسْأَلُوا مَا أَنفَقْتُمْ وَلْيَسْأَلُوا مَا أَنفَقُوا ذَلِكُمْ حُكْمُ اللَّهِ يَحْكُمُ بَيْنَكُمْ وَاللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ﴾
﴿وَإِنْ فَاتَكُمْ شَيْءٌ مِنْ أَزْوَاجِكُمْ إِلَى الْكُفَّارِ فَعَاقَبْتُمْ فَآتُوا الَّذِينَ ذَهَبَتْ أَزْوَاجُهُمْ مِثْلَ مَا أَنفَقُوا وَاتَّقُوا اللَّهَ الَّذِي أَنْتُمْ بِهِ مُؤْمِنُونَ﴾ (١١)

-دوو ئایەتی(٨ و٩) ﴿لاَ يَنْهَاكُمْ اللَّهُ عَنْ الَّذِينَ لَمْ يُقَاتِلُوكُمْ فِي الدِّينِ وَلَمْ يُخْرِجُوكُمْ مِنْ دِيَارِكُمْ أَنْ تَبَرُّوهُمْ وَتُقْسِطُوا إِلَيْهِمْ إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُقْسِطِينَ﴾... ﴿إِنَّمَا يَنْهَاكُمْ اللَّهُ عَنْ الَّذِينَ قَاتَلُوكُمْ فِي الدِّينِ وَأَخْرَجُوكُمْ مِنْ دِيَارِكُمْ وَظَاهَرُوا عَلَى إِخْرَاجِكُمْ أَنْ تَوَلَّوْهُمْ وَمَنْ يَتَوَلَّهُمْ فَأُوْلَئِكَ هُمْ الظَّالِمُونَ﴾[1]

هەندێ لە بانگکەرانی نەسخ پێیانوایە[2] ئەم دوو ئایەتە بە ئایەتی شمشێر نەسخکراونەتەوە، هەندێکیشیان پێیانوایە[3] ئایەتی(٨) بە ئایەتی (٩) نەسخکراوەتەوە، جیاوازی کەوتۆتە نێوانیانەوە لە مانای مەبەستگیراو لە وشەی "الذين" لە ئایەتی (٨)دا، هەیانە دەڵێت ئەهلی هاوپەیمانی کە لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) هاوپەیمانیان بەست لەسەر وازهێنان لە جەنگان کە بریتی بوون لە "خزاعة"، هەیانە دەڵێت: ئەوانەی ئیمانیان هێنا لە مەکە[4] هەیانە دەڵێن خزمانی نزیکی موسڵمانان لە هاوەڵدانەران، هەشیانە دەڵێت ئەوانە بە رەهایی بریتی بوون لە هاوەڵدانەران[5] ئەوەش بەر لەوەی فەرمانیان پێبکرێت بە جەنگان دژ بە هاوەڵدانەران، پاشان بە ئایەتی شمشێر نەسخکرایەوە، هەیانە دەڵێت بریتییە لە ژنان و منداڵان، هەیانە

---

(١) سورة الممتحنة:٩،٨.

(٢) ابن سلامة:ص١٨٠، وابن البارزي:ص٢٠٩، دەڵێن: مانای دوو ئایەتەکە بە ئایەتی شمشێر نەسخ کراوەتەوە.

(٣) ئەمە ئەوەیە ابن حزم الأندلسي:ص٦٠ دەیڵێت.

(٤) الرازي:٢٩/٣٠٤-٣٠٥، الطبرسي:٩/٢٧٢.

(٥) الطبرسي:٩/٢٧٢، ابن العربي:٤/١٧٧٣، القرطبي:١٨/٥٩-٦٠.

دەڵێت دەربارەی "ئەسمای کچی ئەبوبەکر" دابەزیوە کاتێك دایکی(فتیلـة) هـات بـۆ لای و هاوەڵدانەر بوو، ئەو هەدیەی هێنا بوو، بـەڵام ئـەسما قبـوولّی نـەکرد و رێگـەی نەدا بێتە ژوورەوە، پێغەمبەر(ﷺ) فـەرمانی کـرد فـەرمووی لـێ بکـات و هەدیەکـەی قبووڵ بکات و رێزی لێ بگرێت[1] بەهـەمان شـێوە جیـاوازی لـە نێوانیانـدا هەیـە ئایـا ئایەتەکە موحکەمە یان نەسخکراوەتەوە.

بۆچوونی دروست:

دروست ئەوەیە ئایەتەکە نەسخ نەکراوەتەوە بەم بەڵگانە:

١-نەبوونی بەرهەڵستکاری لە نێوان ئایەتەکە و ئایەتی شمشـێردا، یـان لـە نێـوان ئایەتەکە(٨) و ئایەتی ژمارە(٩)دا کە بەدوایدا دێت.

"الطبري"[2] دەڵێت: (باشترین قسـەیەك لـە راسـتییەوە نزیـك بێـت ئـەو قسـەیە دەڵێت:﴿لاَ يَنْهَاكُمُ اللَّهُ عَنْ الَّذِينَ لَمْ يُقَاتِلُوكُمْ فِي الدِّينِ﴾[3] مەبەست پێی هـەموو جۆرەکانی ئایین و مەزهەبەکانە بەوەی چاکەیان لەگەڵ بکەن[4] و پەیوەندیان لەگـەڵ دامەزرێنن[5] و باش بن لەگەڵیان و لە مامەڵەدا لەگەڵیان دادپەروەر بن[6].

خودا-عز وجل- بە ئایەتی:﴿الَّذِينَ لَمْ يُقَاتِلُوكُمْ فِي الـدِّينِ وَلَـمْ يُخْرِجُـوكُمْ مِـنْ دِيَارِكُمْ﴾ هەموو ئەوانـەی گرتۆتـەوە ئـەو سـیفەتەیان هەیـە، هەندێکی پـێ تایبـەت

---

(١) الرازي:٢٩/٣٠٥.

(٢) ١٣/٢٨.

(٣) واتە لەپێناو ئاییندا، حەرف (في) بۆ "التعليل"ە وەك: "دخلت امرأة الفار في حفرة".

(٤) البرّ: زیادەڕەوی لە چاکەکاریدا.

(٥) سیلەی رەحم لە نێوان خزمان با لە هاوەڵدانەرانیش بن

(٦) دادپەروەری لە ئیسلامدا لەگەڵ دۆست و دوژمـن و لـە دوو بـاری جـەنگ و ئاشـتیدا واجبە، خودا دەفەرموێت:(وَلاَ يَجْرِمَنَّكُمْ شَنَآنُ قَـوْمٍ عَلَـى أَلاَّ تَعْدِلُوا اعْـدِلُوا هُـوَ أَقْـرَبُ لِلتَّقْوَى).

نەکردووە جیا لە هەندێکی تر، بۆیە مانایەك بۆ قسەی ئەو کەسە نامێنێتەوە پێیوایە نەسخکراوەتەوە[1].

٢–ئایەتی شمشێر تایبەتە بە رەوشی دەستدرێژکاری، بۆیە پێویستە هێز دژ بە دەستدرێژکار بەکاربهێنرێت لە باری دەستدرێژیکردندا گەر تەنها بە هێز دەتوانرا سنووری بۆ دابنرێت جا دەستدرێژکارەکە هاوەڵدانەر نەبێت یان موسڵمان، هاوپەیمان بێت یان نە.

٣–وتنی نەسخ پێویست دەکات بوترێت ئایەتی(٨) تایبەتە بە سەردەمی هاتنی پەیامی خوداوە، لە کاتێکدا ئایەتەکە رێسایەکی دەستووری گشتییە و بەسەر هەموو تاکێکی خێزانی مرۆڤایەتیدا جێبەجێ دەبێت لە هەموو کات و شوێنێکدا.

٤–لەبارێکدا وا دابنێین بەرهەڵستکاری بوونی هەیە لە نێوان ئایەتی(٨) و ئایەتی شمشێردا ئەوا بە تایبەتکردن هەڵدەگیرێت بۆیە هۆیەك نییە بۆ بوونی نەسخ.

٥–هیچ جۆرە بەرهەڵستکارییەك لە نێوان ئایەتی(٨) و ئایەتی (٩)دا بوونی نییە، تا ئایەتی دووەم ئایەتی یەکەم نەسخبکاتەوە، حوکم و بابەتی ئایەتی(٨) موباحکردنی هاوکارییە بە چاکە و دادپەروەری و مامەڵەکردن بە چاکترین شێوە لەلایەن موسڵمانانەوە بەرانبەر هەموو ئەوانەی لەسەر ئایین لەگەڵیان نەجەنگاون و بەشدار نەبوون لە دەرکردنیان لە زێد و نیشتمانی خۆیان، لە کاتێکدا ئایەتی دووەم چارەسەری حوکم و بابەتێك دەکات لە سروشت و لە هەلومەرجدا جیاوازە لەگەڵ حوکم و بابەتی ئایەتی(٨) وەك لە برگەی (٦)دا دێت.

٦–هیچ جۆرە بەرهەڵستکارییەك لە نێوان دوو ئایەتەکەی(٨ و ٩) لەگەڵ ئایەتی شمشێر بوونی نییە تا نەسخبکرێنەوە پێی لەبەر هەڵگرتنی بەرهەڵستکاری وەك هەندێ پێیانوایە[1].

---

(١) لمزيد من التفصيل راجع جامع البيان في تفسير القرآن–للطبري:٤٢/٢٨ وما بعدها.

نەبوونی بەرهەڵستکاری نێوان ئایەتی یەکەم و ئایەتی شمشێر کە لە خاڵی(٥) باسمان لەبارەوە کرد و بەرهەڵستکار نەبوونی ئایەتی(٩)ش بە ئایەتی شمشێر بە هەمان هۆ ڕۆشنە، چونکە حوکم و بابەتی ئایەتی(٩) بریتییە لە نەهیکردن لە هاوکاری موسڵمانان بۆ هاوەڵدانەران کە لەسەر ئایین لەگەڵیان جەنگاون و بەشداریان کردووە لە دەرکردنیان لە زێدی خۆیان، هەروەها حەرامکردنی بە دۆست کردن و بە سەرخەرکردنیان، هەرکەس بەو جۆرە مامەڵەیان لەگەڵ بکات دەچێتە ریزی ستەمکارانەوە و تاوان دەکات دژ بە ئیسلام و موسڵمانان، ئایا ئەم مانایە بەرهەڵستکاری دەکات لەگەڵ پێویستبوونی جەنگان دژ بە دەستدرێژکاران لە هاوەڵدانەران هەرکات دەستدرێژییان کردە سەر بەرژەوەندی زەروری موسڵمانان؟

ئایەتی(١٠): ﴿يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا جَاءَكُمُ الْمُؤْمِنَاتُ مُهَاجِرَاتٍ[٢] فَامْتَحِنُوهُنَّ[٣] اللَّهُ أَعْلَمُ بِإِيمَانِهِنَّ[٤] فَإِنْ عَلِمْتُمُوهُنَّ[٥] مُؤْمِنَاتٍ فَلاَ تَرْجِعُوهُنَّ إِلَى الْكُفَّارِ[٦] لاَ هُنَّ حِلٌّ لَهُمْ وَلاَ

---

(١) وەك "ابن سلامة" كە لە كتێبەكەيدا- الناسخ والمنسوخ:ص١٨٠ دەڵێت: (مانای دوو ئایەتەكە بە ئایەتی شمشێر نەسخ كراوەتەوە)، "ابن البارزي"ش لە نەسخی ئایەتی(٨) بە ئایەتی شمشێر لەگەڵی تەبایە، ينظر المرجع السابق ص٢٠٩.

(٢) ئەو ئافرەتانی پێشتر لە بێباوەڕان بوون و هاتنە ناو ئیسلامەوە و بوون بە بەشێك لە موسڵمانان لەدوای ئاشتەوایی حودەیبییە و لە مەكەوە-شوێنی هاوەڵدانان- كۆچیان كرد بۆ مەدینە ناوەندی موسڵمانان.

(٣) بەوەی ئیمان و ڕەغبەتیان بۆ وەرگرتنی ئیسلام و چوونە ناو ئیسلام دەسەلمێنێت و دەریدەخات بۆ مەرامێكی تر نەهاتوون.

(٤) واتە زاناترە بە حەقیقەتی ئیمانیان چونكە تەنها ئەو پەنهان و نهێنی مرۆڤ لەئەستۆ دەگرێت.

(٥) زانست لێرەدا بە مانای گومانی زاڵە، بۆیە یەقین بەمەرج ناگیرێت بەهۆی سەختی جێگیربوونییەوە.

(٦) سەرەڕای داوای مێردەكانیان و خزمەكانیان چونكە داوای گێڕانەوە لە ئاشتەواییەكەدا كە بە كاری پێغەمبەر جێگیر بوو بوو بەم ئایەتە نەسخ كرایەوە، یان گشتاندنەكەی بە ئایەتەكە تایبەتكرا و گێڕانەوەی ئافرەت ناگرێتەوە.

هُمْ يَحِلُّونَ لَهُنَّ[1] وَآتُوهُمْ مَا أَنفَقُوا[2] وَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ أَنْ تَنكِحُوهُنَّ[3] إِذَا آتَيْتُمُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ[4] وَلَا تُمْسِكُوا بِعِصَمِ[5] الْكَوَافِرِ[6] وَاسْأَلُوا مَا أَنفَقْتُمْ[7] وَلْيَسْأَلُوا مَا أَنفَقُوا[1] ذَلِكُمْ حُكْمُ اللَّهِ يَحْكُمُ بَيْنَكُمْ وَاللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ[2]﴾

---

(١) ئەمەش ئاماژەیە بۆ پچڕانی پەیوەندی ژن و مێردی بە موسڵمانبوونی یەكێك لە ژن و مێردەكە گەر عیدەكەی تەواو بوو بەبێ موسڵمانبوونی پیاوەكەی، بەڵام گەر پیاوەكەش هاتە ناو ئیسلامەوە و لە كاتی عیدەكەدا بوو ئەوا هاوسەرییەكەیان بە بەردەوام دادەنرێت.

(٢) ژنی پاشگەز بوو لە ئیسلام كە پەیوەندی بە بێباوەڕانەوە كردووە لە خانەی بێباوەڕی پیاوەكەی دەتوانێت داوای مارەییەكەی لە "بیت المال" بكات، هەروەها مارەیی ئەو ژنەی موسڵمان دەبێت و دەیخوازێت، گەر ژنەكە مێردیش نەكات لەسەر "بیت المال" پێویستە مارەییەكەی بۆ هاوسەرە بێباوەڕەكەی بگێڕێتەوە.

(٣) واتە كاتێك موسڵمان بوون و عیدەیان تەواو بوو بەهۆی حەرامبوونی هاوسەرگیری لەگەڵ ئافرەتی هاوەڵدانەر و ماوە لەژێر عیدەی كەسێكی تر، لە ئیسلامبوونییەوە عیدەی بۆ سەرژمێر دەكرێت.

(٤) واتە مارەییەكانیان، لەسەر ئەو كەسانەی ئافرەتە كۆچكەرە باوەڕدارەكان مارە دەكەن پێویستە مارەیی پێشووەكەی بدات بە هاوسەرە بێباوەڕەكەی، سەرباری مارەیی نوێ، گەر مێردی نەكردبێتەوە مارەیی مێردە پێشووەكەی لەسەر "بیت المال"ە.

(٥) كۆی "عصمە"یە، ئەوەش ئەوەیە لە هەر هۆیەك دەستی پێوەدەگیرێت، مەبەست لێرەدا گرێبەستی هاوسەرگیرییە.

(٦) الكوافر: كۆی "كافرە" وەك "ضوارب" كە كۆی "ضاربة"یە، واتە دەستمەگرن بە هاوسەرگیری ژنەكانتانەوە لە دوای موسڵمان بوونتان و ئەوان لەسەر هاوەڵدانان دەمێننەوە یان دەگەڕێنەوە بۆ ناو هاوەڵدانەران و لە ئیسلام پاشگەز دەبنەوە بەهۆی پچڕانی هاوسەرگیریتانەوە لەگەڵ ئەوان.

(٧) واتە داوای مارەیی ژنەكانتان بكەن كە پاشگەزبوونەتەوە و گەڕاونەتەوە بۆ خانەی بێباوەڕی، گەر دوژمن مارەییەكەی نەدا لەسەر "بیت المال" پێویستە مارەییەكە بدات، هەروەك چۆن بۆ بێباوەڕ هەیە كە ژنەكەی موسڵمان بووە و هاتووە بۆ خانەی موسڵمانان داوای مارەییەكەی لە موسڵمانان بكات یان داوای بكات لەو كەسەی ژنەكە مارە دەكات.

"ابن حزم الأندلسي"[٣] دەڵێت بە بەشێك لە ئایەتەكە نەسخكراوەتەوە ئەوەش ئەو بەشەیە كە دەفەرموێت:﴿فَلاَ تَرْجِعُوهُنَّ إِلَى الْكُفَّارِ﴾ هەروەها وتراوە نەسخكراوەتەوە بە ئایەتی یەكەمی سورەتی "التوبة"[٤]، "ابن سلامة"[٥] لەسەر ئەم قسەی دووەمەیە.

"ابن الجوزي"[٦] دەڵێت: "مقاتل بن سليمان" دەڵێت: ئەم چەند ئایەتە(٨ و ٩ و ١٠ و ١١) بە ئایەتی شمشێر نەسخكراونەتەوە.

وتنی نەسخبوونەوەی ئایەتی(١٠) پووچ و بێبنەمایە بەم بەڵگانە:

١–هۆی دابەزینەكەی لە "عروة"وە وتی: ئەوەی "سهيل بن عمرو" لە پێغەمبەر(ﷺ) بە مەرجی گرت لە رۆژی "الحديبية"دا: "هەر كەس لە ئێمە هات بۆ لای تۆ–با لەسەر ئایینەكەی تۆش بێت– دەبێت بۆمانی بگێڕیتەوە" تا خودا ئەوەی دەربارەی ئافرەتە باوەڕدارەكان (ئەوانەی كۆچ دەكەن بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ)) دابەزاند[٧].

"ابن عباس"[٨] دەڵێت: لە ساڵی حودەیبییەدا ئاشتەوایی لەگەڵ هاوەڵدانەرانی قورەیش كرا لەسەر ئەوەی هەر كەس لە ئەهلی مەكە بێت بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ)

---

(١) ئەوەی تایبەتە بەو رەوشە بە كۆتاهاتنی كۆتایی پێهاتووە، بۆیە نەسخ نییە، ئەوەش پێی تایبەت نییە دەمێنێتەوە و نەسخبوونەوەی جێگیر نەكراوە.
(٢) سورة الممتحنة:١٠.
(٣) ص٦٠.
(٤) ئەوەش ئایەتی: (بَرَاءَةٌ مِنْ اللَّهِ وَرَسُولِهِ إِلَى الَّذِينَ عَاهَدتُّمْ مِنْ الْمُشْرِكِينَ).
(٥) الناسخ والمنسوخ:ص١٢٨، وفيه (نسخها الله بقوله (بَرَاءَةٌ مِنْ اللَّهِ وَرَسُولِهِ) الآية.
(٦) نواسخ القرآن:ص٢٤٢.
(٧) القرطبي:٦١/١٨.
(٨) المرجع السابق.

بۆیانی بگێڕێتەوە، " سعیدة[1] بنت الحارث الاسلمیة[2] " هات و هاوسەرەکەی لە هاوەڵدانەران بوو کە بریتی بوو لە " صیفي بن الراهب" وتراویشە "مسافر المخزومي" بوو، وتی: ئەی محەمەد ژنەکەم بۆ بگێڕەرەوە تۆ ئەو مەرجەت قبوڵ کردووە و ئەمەش نموونەیەکی نووسراوەکەیە(نووسراوی ئاشتەواییەکە) هێشتا وشك نەبووەتەوە، بۆیە خودا ئەم ئایەتەی دابەزاند و کارەکەی پێغەمبەری(ﷺ) نەسخ کردەوە، پەیماننامەکە هاوتا نەبوو(واتە هاوسەنگ نەبوو) چونکە تیایدا هاتبوو لەسەر پێغەمبەر(ﷺ) پێویستە هەموو ئەوانەی لە هاوەڵدانەرانی ژن و پیاو پەیوەنی پێوە دەکەن ئیسلامیان وەرگرتبێت یان نە بیانگێڕێتەوە بۆ قورەیش، بەڵام هەموو ئەوانەی لە موسڵمانانی ژن و پیاو پەیوەندی بە قورەیشەوە دەکەن ئەوان پابەند نەبن بە گێڕانەوەیان یەکسانە پەیوەندیکردنەکەیان دوای پاشگەزبوونەوەیان بێت لە ئیسلام یان لەگەڵ پارێزگاری کردن لە بیروباوەڕی ئیسلام[3]

پێغەمبەر(ﷺ) وەڵامی گێڕانەوەکەی نەدایەوە تەنانەت پێش دابەزینی ئایەتەکە لەسەر ئەو بنەڕەتەی ئەو بەندەی لە پەیماننامەکەدا هاتووە تایبەتە بە پیاوان، لەسەر ئەم بنچینەیە ئایەتەکە هەماهەنگە لەگەڵ ئەوەی ڕێکەوتنی لەسەر کرابوو، ئایەتەکە وەك ڕۆشنکەرەوە هات نەك وەك نەسخکەرەوە، هەر کەس پێیوایە گێڕانەوەکە بۆ پیاوان و ژنانیش بووە پێیوایە ئایەتەکە سوننەتی پێغەمبەری(ﷺ) نەسخ کردۆتەوە لەوەی پەیوەستە بە ئاشتەوایی حودەیبییەوە تایبەت بە گێڕانەوەی

---

(١) لە زۆرێك لە تەفسیرەکاندا ناوی(سبیعة) بووە لە جێی "سعیدة" ئەوەی لە "القرطبي"دا هاتووە لە ڕاستییەوە نزیکە، چونکە پڕاوپڕە لەگەڵ ئەوەی لە کتێبی "اسد الغابة:٥/٧٤٥"دا هاتووە.

(٢) وتراوە یەکەمین ئافرەتێکە موسڵمان بووە و پەیوەندی بە موسڵمانانەوە کردووە و ئایەتەکە دابەزی، ئەو بریتی بوو لە: ام کلثوم بنت عقبة.

(٣) ینظر الکشاف للزمخشري:٤/٩٢، والطبري:٢٨/٤٥.

ئافرەتـان، بـەڵام لـەم بـارەدا ئایەتەکـە گشـتاندنی کـاری پێغەمبـەری(ﷺ) تایبـەت کردووە بۆیە ئافرەتانی لێ وەدەرناوە[1].

٢-ئـەو حوکمانـەی لـە ئایـەتی(١٠)دا هـاتوون هەیانـە تایبـەتن بـە بەنـدەکانی ئاشتەوایی حودەیبییە و ئەو رەوشانەی دەوری موسڵمانانی دابوو لە مامەڵەیان لەگەڵ هاوەڵدانەران، بۆیە بە کۆتایی ئـەو رەوشـانە کۆتاییـان پێهـاتووە، وەك پابەنـدکردنی "بيت المـال" بـە پێـدانی مـارەیی بـەو مێـردە هاوەڵدانـەر و بێباوەڕانـەی ژنـەکانیان موسڵمان بوون و پەیوەندییان بە خانەی ئیسلامەوە کردووە گەر شـوویان نـەکردبێت بە پیـاوێکی موسـڵمان، خـۆ گـەر مێردیـان کردبـوو ئـەوا لەسـەر پیـاوە موسـڵمانەکە پێویستە مارەیی ژنەکەی بدات، هەر بـەو جـۆرە ئایەتەکـە "بيـت المـال" و ئیمـامی موسڵمانان پابەند دەکات بـە پێـدانی مـارەیی ئـەو ژنانـەی مێردەکانیـان لـە ئیسـلام پاشگەزبوونەتەوە بە کۆدەنگی زانایان و ژێرمەندان.

بـەڵام حـوکمی گشـتی و گشـتگیر بـۆ هـەموو کـات و شـوێنێك لـە ئایـەتی(١٠)دا دەمێنێتەوە تا ژیـان مابێتـەوە، وەك جیابوونـەوەی هاوسـەرداری بـە موسـڵمانبوونی یەکێك لە دوو ژن و مێردەکە، گەر ژنەکە موسڵمان بوو و پیاوەکە موسڵمان نـەبوو تـا تەواوبوونی عیدەی ژنەکە لە بەرواری موسڵمانبوونیەوە ئەوا جیابوونەوەکە راوەسـتاو دەبێت بە ئەسەری گەڕاوە لە بەرواری موسڵمانبوونەوە، بەڵام گەر مێردەکە موسڵمان بـوو و ژنەکـە ئـەهلی کیتـاب بـوو ئـەوا هاوسـەرگیرییەکەیان دەمێنێتـەوە بـەبێ موسـڵمانبوونی ژنەکـە، گـەر ژنەکـە هاوەڵدانـەر بـوو ئـەوا هـەمان حـوکمی باسـکراو جێبەجێ دەکرێت لە موسڵمانبوونی ژنەکەدا.

---

(١) ئەمـە ئەوەیـە "ابـن العربـي- في احكـام القـرآن:٤/١٧٧٤" وتوویـەتی، تیایـدا هاتووە:(دەرچوونی نەسخ لـە پـەیمانی پێغەمبـەر(ﷺ) لـە ئاشـتەوایی حودەیبییـەدا بـریتی بـوو لـە تایبـەتکردنی گشـتی، نـەك نەسـخکردنەوەی هاوپەیمانێتییەکـە وەك هەندێ لە بێئاگایان ئەندێشەی دەکەن).

بۆیە ژنی ناموسڵمان گەر موسڵمان بوو بۆی هەیە شوو بکات بە هەر کەسێك دەیەوێت لەدوای تەواوبوونی عیدەکەی با مێردەکەشی تەڵاقی نەدات، ئەم جۆرە ئەحکامانە بە ئیجماعی فەقیهان دەمێننەوە.

٣-وتنی[١] نەسخبوونەوەی ئایەتەکە بە بەشێکی کە بریتییە لە:﴿فَلاَ تَرْجِعُوهُنَّ إِلَى الْكُفَّارِ﴾ شایستەی بەرپەرچدانەوە نییە، چونکە قسەیەکی پووچە و رەفزکراوە لەڕووی شەرع و ئەقڵەوە.

٤-قسەکەی "مقاتل بن سلیمان"[٢] و ئەوانەی لەگەڵی هاوڕان لە نەسخی ئایەتی(١٠) بە ئایەتی شمشێر پووچبوونەوەی بەڵگەنەویستە لەبەر نەبوونی هیچ جۆرە بەرهەڵستکارییەك لە نێوان حوکمە هاتووەکانی ناو ئەم ئایەتە و ئەحکامەکانی ئایەتی شمشێر، هەر ئایەتێك بابەتگەلێك چارەسەر دەکات جیایە لە بابەتەکانی ئەویتر.

٥-ئایەتی:﴿وَلاَ تُمْسِكُوا بِعِصَمِ الْكَوَافِرِ﴾[٣] هەندێك پێیانوایە[٤] نەسخکراوەتەوە بەم ئایەتە﴿وَالْمُحْصَنَاتُ مِنَ الَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ﴾ ئەم بۆچوونە پووچ و بێبنەمایە و تێکەڵکردنە لە نێوان نەسخ و تایبەتکردندا.

سەرباری ئەوەی باسمان کرد لە بەڵگەی نەسخ نەبوونەوەی ئایەتی(١٠) لەگەڵ ئەوەش بە سەرچاوەیەك دادەنرێت بۆ پابەندکردنی دەوڵەت بە قەرەبووکردنەوەی زیانی زیانپێگەیشتووان بەهۆی جەنگی هەڵگیرساوەوە لە نێوان ئەوان و دەوڵەتێکی تردا جا دەوڵەتەکە موسڵمان بێت یان ناموسڵمان.

---

(١) لەوانەی لەسەر نەسخبوونەوە: ابن حزم الأندلسي:ص٦٠.

(٢) نواسخ القرآن-لابن الجوزي:ص٢٤٢.

(٣) سورة الممتحنة:١٠.

(٤) "ابن الجوزي:ص٢٤١"، دەڵێت: (هەندێك پێیانوایە بە ئایەتی: (وَالْمُحْصَنَاتُ مِنَ الَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ) نەسخکراوەتەوە، ئەمە شتێك نییە، چونکە مەبەست بە "الكوافر" ئافرەتە بتپەرستەکانە، پاشان گەر بڵێین ئەوە بریتییە لە موباحکردنی ئافرەتی ئەهلی کیتابی بتپەرست ئەوا دەبێتە تایبەت کردن نەك نەسخ کردنەوە)

ئـەوەی پەیوەسـتە بـە حوکمـەکانی ئایـەتی(١٠)وە گـەر تەماشـای تەفسـیرە باوەڕپێکراوەکان بکرێت ئەوا یەکێك نابینیتەوە باسی نەسخبوونەوەی ئایەتی(٨ و ٩ و ١٠ و ١١)ی سورەتی "الممتحنة" بکات.

-ئایەتی(١١) ﴿وَإِنْ فَاتَكُمْ شَيْءٌ مِنْ أَزْوَاجِكُمْ إِلَى الْكُفَّارِ[1] فَعَاقَبْتُمْ[2] فَآتُوا الَّذِينَ ذَهَبَتْ أَزْوَاجُهُمْ مِثْلَ مَا أَنفَقُوا وَاتَّقُوا اللَّهَ الَّذِي أَنْتُمْ بِهِ مُؤْمِنُونَ﴾.

ئەم ئایەتە تەواوکاری حوکمەکانی ئایەتی(١٠)یە بەڵکو دڵنیاکـەرەوەی هەنـدێ لـە حوکمەکانییەتی، ئەو حوکمانە تایبەتن بە بەنـدەکانی ئاشـتەوایی حودەیبییـە و ئـەو ڕەوشانەی موسڵمانان تیایدا دەژیان و مامەڵەکردنیان لەگەڵ هاوەڵدانـەران لـە ئـەهلی

---

(١) واتە شتێك لە ماڵ و داراییتان لەدەستدا بەهۆی پەیوەندی کردنی ژنەکانتانەوە کە خانەی ئیسـلامیان بـەجێهێڵاوە و وەك پاشـگەزبوو پەیوەنـدیان کـردووە بـە خانـەی بێباوەڕییەوە، ئەوا ئەو زیانە لە غەنیمەتی جەنگ قەرەبوو دەکرێتـەوە گـەر هـەبوو، ئەگەر لە "بیت المال" یان لە مارەیی ئەو ژنە کۆچکەرانەی کە پێویست بـوو بـدرێت بە مێردە بێباوەڕەکانیان، چونکە بێباوەڕان کە لـە لای بەرانبـەری پەیماننامەکـەدان نایانەوێت مارەییەکە بدەن، بۆیە بەرانبەر ئەو زیانە دەبێ لێیان وەربگیرێتەوە، وەك چۆن موسڵمانان بەو کـارە هەڵدەسـتن و بەرانبـەر ژنـە کۆچـکەرە باوەڕدارەکـان لـە خانەی بێباوەڕییەوە بۆ خانەی ئیسلام مارەییەکەیان دەدەن.

(٢) "الزمخشري -الكشاف:٤/٩٤" دەڵێت: (ئەوەی حوکمی پێکراوە بەسـەر موسـڵمانان و بێباوەڕاندا لە پێدانی مارەیی ئافرەتی ئـەوان جارێـك و مـارەیی ئافرەتـانی ئـەمان جارێکی تر بە "نۆرە" شوبهێنراوە وەك چۆن دوو کەس لە وڵاخێکی سـواریدا نـۆرە دەکەن، ماناکەی سەرەی سزای ئێوە بۆ ئەوان دێـت لـە پێدانی مـارەیی، بۆیـە ئـەو کەسـەی ژنەکـەی لەدەستچـووە بـە چـوون بـۆ لای بێبـاوەڕان لـە مـارەیی ئافرەتـە باوەڕدارە کۆچکەرەکان هەمان مـارەیی پـێ بـدەن و مارەییەکـە مـەدەن بـە مێـردە بێباوەڕەکەی)، واتە بە هاوسەرە پیاوە موسڵمانەکە کە ژنەکەی پاشـگەز بووەتـەوە لە ئیسلام و ڕۆیشتووە بۆ ناو بێباوەڕان مارەیی ئەو ژنەی پێبدەن باوەڕی هێنـاوە و پەیوەندی بە موسڵمانانەوە کردووە لە جێگەی ئەوەی مارەییەکەی بدرێت بە مێردە بێباوەڕەکەی چونکە ئەوان نایانەوێت بە هاوتا و بەرانبەر مامەڵە بکەن.

ئاشتەوایی، ئەوانە بە کۆتایی هاتنی ئەو رەوشە کۆتاییان پێهاتووە، کۆتاهاتنی حوکم بە کۆتاهاتنی رەوشی تایبەتی یان کۆتاهاتنی مەرام کە حوکمەکەی بۆ تەشریعکراوە لە زاراوەدا پێیناوترێت نەسخ کە بریتییە لە سڕینەوەی حوکمی شەرعی پێشوو بە حوکمی شەرعی دواتر.

سەرەڕای ئەوەش "ابن حزم الأندلسي[1] ومقاتل بن سليمان[2] وابن سلامة"[3] و ئەوانەی شوێنی ئەوان کەوتوون لەم بۆچوونەدا پێیانوایە ئایەتی(١١) بە ئایەتی شمشێر نەسخکراوەتەوە.

ئەمەش هەڵەیەکی گەورەیە و تێکەڵکردنە لە نێوان کۆتاهاتنی حوکم بە کۆتاهاتنی رەوشەکەی و مەرامەکەی لەگەڵ نەسخدا بە مانای زاراوەییەکەی.

"سورة الصف وسورة الجمعة وسورة المنافقون وسورة التغابن وسورة الطلاق وسورة التحريم وسورة الملك"لە زمانی عاشقانی نەسخ سەلامەت بووە و دەڵێن: لەم سورەتانەدا نەسخکراو بوونی نییە، بەڵام لە هەندێکیاندا نەسخکەر بوونی هەیە وەك سورەتی: "المنافقون[4] و التغابن"[5].

"سورة الفجر، وسورة البلد، وسورة الشمس، وسورة الليل، وسورة الضحی، وسورة (ألم نشرح)" ئایەتەکانیان موحکەمن و لە بانگەشەی نەسخ سەلامەت بوون.

---

(١) الناسخ والمنسوخ:ص٦٠.

(٢) نواسخ القرآن–لابن الجوزي:ص٢٤٢.

(٣) الناسخ والمنسوخ.

(٤) نەسخکەر لەم ئایەتەدایە: (سواء عليهم استغفرت لهم او لم تستغفر لهم)

(٥) نەسخکەر (فاتقوا الله ما استطعتم).

# نەسخی بانگەشەبۆکراو لە سورەتی "التین"دا

هەندێك پێیانوایە[1] ئایەتی(8)﴿أَلَيْسَ اللَّهُ بِأَحْكَمِ الْحَاكِمِينَ﴾ بە ئایەتی شمشێر نەسخکراوەتەوە.

ئەمەش بۆچوونێکی پووچە و لە سنووری ماقووڵ بەدەرە و تاوانێکە بە سەر سنووری خودا، ئەم ئایەتە دایکی ئایەتەکانە و هیچ جۆرە نەسخێك قبوولْ ناکات لێکدانەوەکەی هەرچییەك بێت، و بەرهەڵستکاری لە نێوان ئەم ئایەتە و ئایەتی شمشێردا بوونی نییە[2].

"سورة القلم وسورة القدر وسورة (لم يكن) وسورة الزلزلة وسورة العاديات وسورة القارعة وسورة التكاثر" ئایەتەکانی ئەم سورەتانە موحکەمن و لە بانگەشەی نەسخ سەلامەت بوون.

---

(1) لەوانە: ابن حزم الاندلسي ص٦٦ وابن سلامة ص١٩٥.

(2) "السيوطي (الاتقان في علوم القرآن: ٢/٢٢" دەڵێت: (وتراوە لەو ئایەتانەیە بە ئایەتی شمشێر نەسخ کراوەتەوە، هەرچەند ماناکەی بریتییە لە فەرمان بە رادەستکردنی کاریان بۆ لای خودا و وازهێنان لە سزادانیان) هەروەها "ابن الجوزي(نواسخ القرآن ص٢٥٢) دەڵێت: (هەندێك پێیانوایە ماناکەی بە ئایەتی شمشێر نەسخکراوەتەوە، چونکە وا گومان دەبەن ماناکەی بریتییە لە "لێیانگەڕێ و وازیان لێ بهێنە" بەلام ئەمرەکە بەو شێوەیە نییە، بۆیە رووی نەسخ بوونی نییە) دەڵێم تەنانەت بەو تەفسیرەش-بەپێی گومانی تێکچوو- ئایەتەکە نەسخ قبوولْ ناکات.

# نەسخی بانگەشەبۆکراو لە سورەتی "العصر"دا

هەندێك[1] پێیانوایە[2] ئایـەتی (٢)﴿إِنَّ الإِنسَـانَ لَفِـي خُسْـرٍ﴾ نەسـخکراوەتەوە بەو هەڵواردنەی لە ئایەتی(٣)دا راستەوخۆ بەدوایدا هاتووە.

ئەم بانگەشەیە پووچ و بێبنەمایە و تێکەڵکردنە لـە نێـوان نەسـخ و تایبەتکردنـدا، تەنانەت بانگەشەکەرێکی وەك "ابن حزم الاندلسي" لـە سـەرەتای کتێبەکەیەکـەوە دەڵێت[3]: ((نەسـخ لـە ئـەمر و نەهیـدا روودەدات، دروسـت نییـە لـە هـەواڵی رووتـدا روویدات، هەڵواردنیش بریتی نییە لە نەسخ، هەندێك پێیانوایە هەڵواردن و تایبەتکردن بریتین لە نەسخ، بەڵام فەقیهان پێچەوانەی ئەوەن)).

"سورة الهمزة وسورة الفيل وسورة قريش وسـورة الـدين (المـاعون) وسـورة الكوثر" ئایەتەکانیان موحکەمن و لە بانگەشەی نەسخ کردنەوە سەلامەتن.

---

(١) الناسخ والمنسوخ في القرآن الكريم.

(٢) منهم ابن حزم ص٦٧ وابن سلامة ص١٩٧.

(٣) الناسخ والمنسوخ في القرآن الكريم ص٨.

## نەسخی بانگەشەبۆکراو لە سورەتی "الكافرون"دا

هەندێك پێیانوایە[1] لەم سورەتەدا ئایەتی (٦)﴿ لَكُمْ دِينُكُمْ وَلِيَ دِينِ﴾ بە ئایەتی شمشێر نەسخکراوەتەوە.

ئەم بۆچوونە پووچ و بێبنەمایە لەسەر دانپیادان بە ئایینیاندا لەڕووی ڕەوایی و دروستی و نەسخ نەبوونەوەی بە قورئان، ئەم مانایە دوورە، چونکە دانپیادانان لەم ئایەتەدا بۆ ئازادی هەستان بە سروتە ئایینییەکانی خۆیانە، قورئان لە زۆرێك لە ئایەتەکانیدا ئەم ئازادییەی ڕاگەیاندووە و پێغەمبەریش(ﷺ) لە ژیانیدا ڕێگەی پێداوە، بەڵام پێدانی ئازادی مانای نەسخ نەبوونەوەی شەریعەتەکانی پێشوو ناگەیەنێت لەو حوکمانەدا بەرهەڵستکاری دەکەن لەگەڵ شەریعەتی ئیسلامدا.

بۆیە بەرهەڵستکاری بوونی نییە لە نێوان نەسخکردنەوەی ئەو شەریعەتانە لەگەڵ ڕێگەدان بە ئەهلی کیتاب بۆ هەستان بە دروشمە ئایینییەکانی خۆیان لە وڵاتە ئیسلامییەکاندا، پاشان پەیوەندییەکانی نێوان گەلانی ئیسلامی و گەلانی نائیسلامی لەسەر دانان بە ئازادی جێبەجێ کردنی ئایینی بیناکراوە و دامەزراوە، سەرەڕای پێویستبوونی بانگکردنیان بۆ وەرگرتنی ئیسلام بە حیکمەت و ئامۆژگاری باش و گفتوگۆ لەگەڵیان بە باشترین شێوە، نەك بە سەپاندنی بیروباوەڕ لە ڕێگەی هێز و هەڕەشەوە.

سورەتی"النصر و تبت و الإخلاص و الفلق و الناس" ئایەتەکانیان موحکەمن و لە بانگەشەی نەسخ سەلامەتن.

---

(١) لەوانە: ابن حزم ص٦٨ وابن سلامة ص١٩٩.

# دەرئەنجام

هەموو خاوەن ژیرییەکی تەندروست کەمترین زانستی بە قورئان هەبێت لەم باسە و هاوشێوەکانی ئەم باسەوە -تایبەت بە بوونی نەسخ لە قورئاندا- ئەم سەرئەنجامانە هەڵدەگۆزێت:

**یەکەم/ نەسخ و رووداني نەسخ:**

١-نەسخ بریتییە لە سڕینەوەی وەحییەکی پێشوو بە وەحییەکی دواتر خوێنراوە یان نەخوێنراوە.

٢-جیاوازی نییە-بەڵکو پێویستە جیاوازی بوونی نەبێت- لە سڕانەوەی شەریعەتە خواییەکانی پێشوو تایبەت بەو حوکمانەی بەرهەڵستی لەگەڵ قورئاندا دەکەن، چونکە قورئان دوایین دەستووری خودایە و هەموو شەریعەتەکانی پێشووی هەمووارکردۆتەوە.

٣-جیاوازی نییە لە نەسخبوونەوەی سوننەتی پێغەمبەردا(ﷺ) بە قورئان، وەك نەسخبوونەوەی رووکردنە "بیت المقدس" کە بە سوننەتی پێغەمبەر(ﷺ) جێگیر بوو بوو بەو ئایەتەی فەرمان بە رووکردنە "بيت الحرام" کرد.

٤-جیاوازی لە نەسخبوونەوەی سوننەت بە سوننەت بوونی نییە، وەك نەسخی نەهیکردن لە سەردانی گۆڕستان بە فەرمان کردن پێی.

٥-جیاوازی نییە لە گونجانی رووداني نەسخ لە قورئاندا لەڕووی ئەقڵەوە، چونکە ئەگەری بۆ هەیە، خوداش زاڵ و بەدەسەڵاتە بەسەر هەموو شتێکدا.

٦–جیاوازی لە نەسخی حوکمی هەندێك لە ئایەتی ناو مەسحەفی "عوسمانی کوڕی عەفان"دایە لەگەڵ مانەوەی وشەکانیان و فەرمان بە خوێندنەوەیان(١).

**دووەم/ جۆرەکانی نەسخ: راشکاو و ئامێزگر:**

**أ.نەسخی راشکاو:**

نەسخی راشکاو لە قورئاندا بە کۆدەنگی زانایانی موسڵمانی کۆن و نوێ بوونی نییە، هەموو بەڵگەکانی جێگیرکردنی نەسخ لە قورئاندا بەڵگەن لەسەر روودانی لەڕووی ئەقڵەوە و بە شێوەیەکی ئامێزگرانە.

١–لە قورئاندا ئایەتێك بوونی نییە راشکاوانە بەڵگە بێت لەسەر ئەوەی فڵان ئایەت بە فڵان ئایەت نەسخکراوەتەوە.

٢–لە فەرموودەدا(فەرموودەی موتەواتیر) فەرموودەیەکی راشکاو نابینیتەوە بەڵگە بێت لەسەر ئەوەی فڵان ئایەت بە فڵان ئایەت سڕاوەتەوە.

٣–ئیجماعی فەقیهان لە هاوەڵان یان فەقیهان لە شوێنکەوتووان نابینیتەوە راشکاوانە بەڵگە بێت لەسەر نەسخبوونەوەی فڵان ئایەت بە فڵان ئایەت.

٤–ریوایەتێکی دروستی جێگیر بە تەواتور نابینیتەوە لە نووسەرانی(٢) وەحییەوە بەڵگە بێت لەسەر ئەوەی فڵان ئایەت بە فڵان ئایەت سڕاوەتەوە.

---

(١) جیاوازی هەیە لە خوێندنەوە لەگەڵ مانەوەی حوکم، هەروەها جیاوازی هەیە لە خوێندنەوە و حوکم پێکەوە.

(٢) ئەوانە چل و سێ نووسەر بوون، بەناوبانگترینیان: الخلفاء الاربعة وعبد الله بن مسعود وابو سفيان وابناه: معاوية ويزيد، وسعيد بن العاص وابناه: ابان وخالد، وزيد بن ثابت، والزبير بن العوام، وطلحة بن عبيد الله، وسعد بن ابي وقاص، وعامر بن فهيرة، وعبد الله بن الارقم، وعبد الله بن رواحة، وعبد الله بن سعد بن ابي السرح، وابيّ بن كعب، وثابت بن قيس، وحنظلة بن الربيع، وشرحبيل بن حسنة والعلاء بن الخضرمي، وخالد بن الوليد، وعمرو بن العاص، والمغيرة بن شعبة، ومعيقيب بن ابي

٥-ریوایەتێکی دروستی موتەواتیر نابینرێتەوە لە ئەندامانی لیژنـەی کۆکردنـەوەی قورئانەوە راشکاوانە ئاماژە بکات بەوەی فلان ئایەت بە فـلان ئایـەت سـڕاوەتەوە لـە سەردەمی دابەزینی پەیامدا و سەردەمی ئەبوبەکر و عومەر و عوسماندا-خوایـان لـێ رازی بێت-

لەناو بانگکەرانی نەسخدا کەسێکم نەبینییەوە لە یەکێك لەو هاوەڵانەی بەشـداری نووسینەوەی وەحی و کۆکردنەوەی قورئانی کردووە-بۆ نموونـە "زیـد بـن ثابـت" نووسەری وەحی بوو و بەشداری لە کۆکردنەوەی قورئاندا کردووە لە سەردەمی پەیام و سەردەمی خەلیفەکانی راشیدیندا- ریوایـەتێك بگوێزنـەوە ئامـاژە بێـت بـۆ ئـەوەی وتبێتی فلان ئایەت بە فـلان ئایـەت نەسـخکراوەتەوە، پەنـدێکی عـەرەبیش دەڵێـت: (خاوەن ماڵ شارەزاترە بەوەی لە ماڵەکەیدایە)

ب-نەسخی ئامێزگرانە:

ئەوەیـە دوو دەق بەرهەڵسـتی یـەکتر بکـەن بـەجۆرێك نـەتوانرێ کۆبکرێنــەوە و نەتوانرێ پارسەنگی یەکێکیان بدرێت بەسـەر ئەویتریانـدا، لەوێشـەوە ناتوانرێـت ئـەو بەرهەڵسـتکارییە هـەڵبگیرێت مەگـەر بـە دانـانی ئـەوەی دواییـان وەك تەشـریعێکی نەسخکەر بۆ ئەوەی پێشوویان.

ئــەم بەرهەڵســتکارییە لــەم بــارەدا یەکســانە بــە دژیــەکی بــەبێ پێچــەوانە هەمووەکییەکەیەوە(واتــە هــەموو بەرهەڵســتکارییەك دژیــەکی نییــە، بــەڵام هــەموو دژیەکییەك بەرهەڵستکارییە)، بەهۆی کۆکردنەوە و پارسـەنگدان لـە بەرهەڵسـتکاریدا نەك لە دژیەکیدا، ئەو مەرجانەمان باس کرد کە پێویستە فەراهـەم بـن تـاکو دژیـەکی راست ببێتەوە.

---

فاطمة الدوسي، وحذيفة بن اليمان، وحويطب بـن عبـد العزيـز العـامري. ينظـر تـاريخ القرآن للعلامة ابي عبد الله الزنجاني تحقيق احمد امين، طبعة بيروت ص٤٢.

سێیەم/ مەرجەکانی نەسخ لە قورئاندا:

مەرجەکانی نەسخ بە ئەقڵ و شوێنپێ هەڵگرتنی تەواو چوارن کە ئەمانەن:

١-جێگیربوونی قورئانیانەی هەریەك لە نەسخکەر و نەسخکراو بە تەواتور، هەرشتێك موتواتیر نەبێت قورئان نییە بەهۆی ئەو کۆدەنگییەی هەیە لەسەر ئەوەی هەر وشەیەك لە وشەکانی قورئان بە موتەواتیر جێگیربووە.

٢-جێگیربوونی دواکەوتنی نەسخکەر لە تەشریع و دابەزین لەدوای نەسخکراو بە تەواتور، بۆیە تەنها ئیجتیهاد و ریوایەتی ئاحاد بەس نییە، چونکە ئەوەی بە تەواتور جێگیر بووە تەنها بە تەواتور دەسڕێتەوە.

٣-قابیلییەتی حوکمەکە بۆ سڕانەوە، بۆیە ئەحکامە سەرەکییەکان وەك پێویستبوونی نوێژ و رۆژوو و زەکات و حەرامکردنی کوشتن و دزی و زینا قابیلی سڕینەوە نین بەهۆی باشی و چاکی لە خودی عیبادەتەکان و قەڵبی و خراپی لە خودی تاوانەکاندا.

هەر بەو جۆرە هەواڵ و بەڵێن و هەڕەشە قابیلی سڕینەوە نین، چونکە ئەو سڕینەوە سەردەکێشێت بۆ دانەپاڵی درۆ بۆ لای خودا-سبحانە وتعالی- و بەڵێن شکێنی و نەبردنە سەری هەڕەشە، ئەوەش محاڵە، چونکە خودا پاك و بێگەردە لە هەر نەنگی و ناتەواوییەك.

٤-راستبوونەوەی دژیەکی لە نێوان دوو ئایەتەکەدا، لەرووی ئەقڵ و کردارەوە محاڵە دوو ئایەت لە قورئاندا بوونیان هەبێت دژیەکی لە نێوانیاندا راست ببێتەوە بەجۆرێك کۆکردنەوە و هەڵگرتنیان پێکەوە محاڵ بێت.

ئەم راستییە لە واقیعدا جێگیر بووە، بەڵام زانینی داوای ئەقڵێکی تەندروست دەکات دووربێت لە چاولێکەری قسە و وتنەکان و ئاگاهییەکی وردی هەبێت بەسەر ئایەتەکانی قورئاندا، هەروەها شارەزاییەکی بەرینی لە زانستی مەنتق و ئوسوڵی فیقه و فەلسەفە و زانستی رەوانبێژی هەبێت، ئەو چوار زانستە ئامرازگەراییە پێویستن بۆ هەرکەسێك مامەڵە لەگەڵ دەقدا دەکات.

**چوارم/ سەرچاوەی هەڵەی وتنی نەسخ لە قورئاندا:**

هەڵەی ئەوانەی دەڵێن نەسخ لە قورئاندا هەیە بە تێگەیشتنی نویێ لای پاشینان لە ئوسوڵییەکان کە بریتییە لە هەڵوەشاندنەوەی حوکمێکی شەرعی پێشوو بە بەڵگەیەکی شەرعی دواتر دەگەڕێتەوە بۆ ئەم هۆیانە:

١-تێکەڵکردن لە نێوان نەسخدا بە مانای گشتی لەلای پێشینی چاکان لەگەڵ نەسخ بە مانای تایبەت لای پاشینان لە ئوسوڵییەکان، هەرکەس قسەی لە نەسخ کردووە -بە مانای نوێ- شانیداداوە لەسەر قسەی ئەوانەی بە مانای کۆنی گشتی بەکاریان هێناوە وەك "ابن عباس و قتادة و عکرمة و الضحاك" و کەسانی تریش لەوانەی قسەیان لە نەسخ کردووە لە قورئاندا بە مانای گشتی گشتگیر بۆ تایبەتکردنی گشتی و سنووردارکردنی رەها و رۆشنکردنەوەی پوختە و پلە بە پلە و روخسەت و هاوشێوەکانی ئەمانە، چونکە مەبەستیان بە نەسخ هەر گۆڕانێکە بەسەر رووالەتی دەقدا دێت لە هەر روویەکەوە بێت.

بینا لەسەر ئەمە تێکەڵی لە نێوان نەسخ بە مانای گشتی و نەسخ بە مانای تایبەتی بریتییە لە کارکەری سەرەکی بۆ حوکمێکی پووچ بەسەر ژمارەیەکی زۆر لە ئایەتەکانی قورئاندا بە هەڵوەشاندنەوەی کارکردن پێیان سەرەرای بوونیان لە قورئاندا کە ئەمڕۆ لەبەردەست موسڵمانانی جیهانی ئیسلامیدایە.

٢-تێکەڵی لە نێوان نەسخ و تایبەتکردن وەك لە وتنی نەسخبوونەوەی ئایەتی وەسێتی واجب بە ئایەتەکانی میرات، ئەو ئایەتە بەو ئایەتانە تایبەتکراوە نەك سڕابێتەوە.

٣-تێکەڵی لە نێوان نەسخ و سنووردارکردنی رەها وەك لە ئایەتی (٢٠)ی سورەتی "الشوری" لەگەڵ ئایەتی(١٨)ی سورەتی "الإسراء" کە پێیانوایە یەکەمیان بە دووەم سڕاوەتەوە.

٤-تێکەڵی لە نێوان نەسخ و روونکردنەوەی پوختەدا، وەك لە درێژەپێدانی ئایەتی فەرزی رۆژوو بەو ئایەتانەی راستەوخۆ بەدوایدا دێن، ئەو ئایەتانە پایەکان و

مەرجەکانی ڕۆژووی هاتوو لە ئایەتە پوختەکەدا(کتب علیکم الصیام کما کتب علی الذین من قبلکم)الآیة، ڕۆشن دەکەنەوە.

٥-تێکەڵی لە نێوان قۆناغبەندی(پلەبەپلەیی) و نەسخ، وەك لە ئایەتەکانی خواردنەوەی هەموو جۆرە مەستکەر و سەرخۆشکەرێکدا هاتووە، لەوانە ئارەق بە مانای تایبەتی عورفی، ئارەق بە مانا گشتییەکەی بە چوار قۆناغ حەرامکراوە، قورئان لە یەکێك لەو قۆناغانەدا دانی بە حەڵاڵبوونیدا نەناوە تا بە قۆناغەکەی دواتر ئەو حوکمەی پێشوو هەڵبوەشێنێتەوە، وەك بانگکەرانی نەسخ بۆیدەچن.

٦-تێکەڵی لە نێوان روخسەت و نەسخدا وەك لە دوو ئایەتی(٦٥ و ٦٦)ی سورەتی "الأنفال"دا هاتووە، حوکمەکە لە ئایەتی یەکەمدا(٦٥) بریتییە لە عەزیمەت کە دەفەرموێت: ﴿إِنْ يَكُنْ مِنْكُمْ عِشْرُونَ صَابِرُونَ يَغْلِبُوا مِائَتَيْنِ﴾ الآیة، بەڵام حوکمەکە لە دووەمدا روخسەتە کە دەفەرموێت: ﴿الْآنَ خَفَّفَ اللَّهُ عَنْكُمْ وَعَلِمَ أَنَّ فِيكُمْ ضَعْفًا فَإِنْ يَكُنْ مِنْكُمْ مِائَةٌ صَابِرَةٌ يَغْلِبُوا مِائَتَيْنِ﴾ الآیة، ئەم دوو حوکمە دەمێننەوە تا ژیان بەردەوام بێت لەسەر هەسارەی زەوی، دەشتوانرێت لە نێوان دوو ئایەتەکەدا کۆکردنەوە بکرێت بە پێچەوانەی کۆکردنەوەی نەسخکەر و نەسخکراوەوە ئەمەیان ناتوانرێت ئەنجام بدرێت بە تێگەیشتنی تایبەت بۆ نەسخ.

٨-تێکەڵی لە نێوان فەرمووده و قورئاندا وەك بانگەشەی نەسخبوونەوەی دە ژەم پێدانی شیر بە پێنج ژەم پێدانی شیر.

٩-تێکەڵی لە نێوان عورفی نەفامی و قورئاندا وەك لە (الشیخ والشیخة اذا زنیا فارجموهما البتة)دا، ئەمە عورفێك بوو پێش ئیسلام بوونی هەبوو بە کۆدەنگی مێژوونووسان، ئەوان پێیانوایە ئایەتەکە حوکمەکەی ماوەتەوە و سڕینەوەی سڕاوەتەوە بەبێ ئەوەی حیکمەت لەو کارە ناماقووڵە ڕۆشن بکەنەوە کە بریتییە لە سڕینەوەی ترسناکترین سزا لە ترسناکترین تاواندا لەڕووی ئەو وشانەی بەڵگەن لەسەر حوکمەکە و مانەوەی حوکمەکە بەبێ بوونی دەقێك بەڵگەبێت لەسەری.

١٠–تێکەڵی لە نێوان سڕینەوەی شەریعەتێکی پێشوو بە قورئان لەگەڵ نەسخی قورئان بە قورئان وەك سڕینەوەی ژمارەی تەڵاقی بێسنوور و سنووردارکردنی بە سێ جار و سڕینەوەی دانانی پشتتێکردن(الظهار) بە تەڵاق، و هاوشێوەکانی ئەمانە.

١١–تێکەڵی لە نێوان کۆتاهاتنی حوکم بە کۆتاهاتنی رەوشەکەی و مەرامەکەی لەگەڵ نەسخدا، وەك لە هەندێك لە حوکمە تایبەتەکانی ئاشتەوایی حودەیبییەدا هاتووە و پێشتر رۆشنمان کردەوە.

١٢–تێکەڵی لە نێوان بەرهەڵستکاری ئەندێشەکراو و بەرهەڵستکاری راستەقینەدا، پێشتر رۆشنمان کردەوە چەندین ئایەت هەیە بڕیار لە نەسخیان دراوە بینا لەسەر بەرهەڵستکارییەکی ئەندێشەکراوی نەبوو لە راستەقینە و واقیعدا.

١٣–تێکەڵی لە نێوان بەرهەڵستکاری و دژیەکی، پێیانوایە هەموو بەرهەڵستکارییەك بە نەسخ هەڵدەگیرێت وەك لە دژیەکیدا، لە کاتێکدا دوو بەرهەڵستکارەکە بەیەکتر هەندێ جار دەتوانرێت کۆبکرێنەوە وەك لە ئایەتی عیدەی مێردمردوودا، ئایەتەکە﴿وَأُوْلاَتُ الأَحْمَالِ أَجَلُهُنَّ أَنْ يَضَعْنَ حَمْلَهُنَّ﴾، کۆکردنەوەی نێوانیان ئەوەیە عیدەی ئافرەتی سکپڕی مێردمردوو بریتییە لە دوورترینی دوو ماوەکە لە چوار مانگ و دە رۆژ و لە دانانی سکەکەی، کامیان درێژتر بوو عیدەکەی پێ تەواو دەبێت، وەك چۆن دەتوانرێ بەرهەڵستکاری هەڵبگیرێت بە پارسەنگدانی کارکردن بە یەکێکیان وەك بەرهەڵستکاری نێوان گشتی و تایبەت، بە پارسەنگدانی کارکردن بە تایبەتەکە بەسەر کارکردن بە گشتییەکە بەرهەڵستکارییەکە نامێنێت.

١٤–تێکەڵی لە نێوان مەرجەکانی نەسخی قورئان بە قورئان و مەرجەکانی نەسخی سوننەت بە سوننەت یان بە قورئان، سەرچاوەیەکم نەبینییەوە جیاکاری بکات لە نێوان ئەو دوو جۆرەدا لە مەرج، پێشتر رۆشنمامان کردەوە مەرجەکانی نەسخ لە قورئاندا چوارن بە پێچەوانەی مەرجەکانی نەسخەوە جگە لە قورئاندا.

١٥–تێکەڵی لە نێوان یەقین و گوماندا لەوێشەوە بەفیڕۆچوونی(پێشێلکاری) ئەو رێسایە(ئەوەی بە یەقین جێگیر بووە تەنها بە یەقین دەسڕێتەوە) یان(ئەوەی بوونی

به تەواتور جێگیر بووە تەنها بە تەواتور سڕینەوەی جێگیر دەبێت)، ئەم تێکەڵییە کارکەری سەرەکی بووە بۆ حوکمدان بەسەر زۆرێك لە ئایەتی قورئانی جێگیر بوو بە تەواتور و یەقین بە کۆمەڵێك ئیجتیهادی تاکلایەنەی گومانئامێز وەك چۆن لە جێگەی خۆی ئەمەمان ڕۆشن کردەوە.

نەسخبوونەوەی یەك ئایەت بە قورئان یان بە سوننەتی موتەواتیر یان بە کۆدەنگی فەقیهان لە هاوەڵان یان کۆدەنگی فەقیهان لە شوێنکەوتووان جێگیر نەبووە، هەموو شتێك لە سەرچاوەی بنەڕەتی خۆی وەردەگیرێت نەك لە ئیجتیهادگەلێك ئەگەری ڕاست و هەڵەیان بۆ هەیە و تەنها گومان دەبەخشن.

١٦-کارکردن بە پێوەری تاکەکەسی نەك پێوەری بابەتیانە لە وتنی نەسخدا بە شاندادان لەسەر کەسایەتی ئەو کەسەی قسەکەی کردووە بەبێ وردبوونەوە لە بەهای زانستی وتەکەی بەو شێوەیە ڕێسای(تەماشای ئەوە بکە وتراوە تەماشای ئەو کەسە مەکە وتوویەتی) پێشێلکراوە[1].

١٧-کورتکردنەوەی ئیجتیهاد لە خەڵکانی رابردووی ئیسلامدا و حەرامکردنی لەسەر خەڵکانی ئێستا و داهاتوو، ئەمەش بەڵایەکە و یەکێکە لە هۆ سەرەکییەکانی دواکەوتنی ئەم ئوممەتە لە قافڵەی شارستانی مرۆیی، ئەگەرچی زانستەکەی بەسەر جیهاندا دەشەکایەوە لە سەردەمێکدا زۆربەی گەلانی جیهان یاسای دارستان فەرمانڕەوایی دەکردن.

١٨-ئەو قسە باوە بەربڵاوە هەڵەی کەسی چاولێکەری دەمارگیری کوێر کە دەڵێت "من لەگەڵ جمهورم"، بەبێ ئەوەی شوناسی ئەو جمهورە پێناسە بکات و بزانێت، ئایا جمهور بریتییە لە فەقیهانی هاوەڵان یان فەقیهانی شوێنکەوتوان یان ئەو چاولێکەرانەی قسەی خەڵکی دووبارە دەکەنەوە و هێزی دەقی پێدەدەن.

---

(١) لە هەر قسەیەکدا پێویستە تەماشای خودی قسەکە بکرێت بۆ هەڵسەنگاندن، جگە لە قسەی خودا و قسەی پێغەمبەر(ﷺ) ئەو دوو قسەیە تەماشای قسەکەرەکەیان دەکرێت، ئەمەش بەهۆی کەموکورتی ژیری مرۆیی بۆ ئابلۆقەدانی ڕەهەندەکانیان.

١٩-بەپیرۆزکردنی هەموو کۆنێك با بەهەڵەشدا چووبن و پووچکردنەوەی هەموو نوێیەك بە راستیش بکات و پێکابێتی.

٢٠-خۆپەرستی و داننەنانی مرۆڤ بە بۆچوونی ئەو کەسەی هاوچەرخی خۆیەتی و رەخنەلێگرتنی لە کاتی بزربوونی ئەودا و رووبەڕوونەبوونەوەی بە گفتوگۆی زانستی بۆ سەلماندنی حەق.

**پێنجەم/ ترسناکی وتنی نەسخ لە قورئاندا:**

وتنی بوونی ئایەتگەلێك لە قورئاندا کارکردن پێیان سڕابێتەوە، بەڵام خوێندنەوەیان مابێتەوە لە قورئاندا کۆمەڵێك ئەنجامی ترسناکی لێوە سەرهەڵدەدات، هەر بەو جۆرە سەرهەڵدانی محاڵبوونی ئەقڵی، وەك لەم رۆشنکردنەوەیەدا:

١-پێدانی تیشکی سەوز بە دوژمنانی ئیسلام بۆ تانەدان لە قورئان بەوەی بریتی نییە لە وەحی.

٢-ئەو کەسەی تەماشاکردنی ئەم حەقیقەتەی لا گرنگە با بگەڕێتەوە بۆ گۆڤاری "المنار"ی میسری ئەو ژمارانەی ساڵی ١٩٠٥ و ساڵەکانی دواتر دەرچوون کە پڕە لە وتاری زانایانی ئەزهەر لە بەرپەرچدانەوەی رۆژهەڵاتناسان، ئەوانەی تانەیان لە قورئان داوە بە ئایەتەکانی نەسخ و لە دانراوەکانیاندا دەڵێن: گەر قورئان وەحی بوایە لای خوداوە نەسخ تیایدا رووی نەدەدا، چونکە خودا بەسەر هەموو شتێکدا خاوەنی دەسەڵاتە و دەستەوسان نییە لەوەی حوکمێك بهێنێت گونجا و شیاو بێت لە هەموو کات و شوێنێکدا، هەموارکردنەوە و سڕینەوەی حوکمەکان لە خەسڵەتەکانی یاسای دانراوە کە مرۆڤ پێی هەڵدەستێت.

٣-وتنی بوونی ئایەتگەلێك[1] کارکردن پێیان سڕابێتەوە لە قورئاندا و خوێندنەوەیان مابێتەوە پێویست دەکات یان نەزانی یان گاڵتەجاڕی یان

(١) ژمارەیان لای: ابن حزم الاندلسي (٢١٤)یە لە کۆی (٥٠٠) ئایەتەکانی ئەحکام، (١٣٤) لای "النحاس"، (٢١٣) لای "ابن سلامة"، (٦٦) لای "عبدالقادر البغدادي"، و

دەستەوسانی یان چوونە ژێر باری گەشە و بەرەو پێشچوون بدرێتە پاڵ خودا یاخود بوترێت شەریعەتی ئیسلام شەریعەتێکی نەمر نییە، پێویست پووچ و بێبنەمایە بەڵکو محاڵە لەرووی ئەقڵەوە بە کۆدەنگی ژێرمەندانی کۆن و نوێ، پێویستکراو بۆ پووچ و بێبنەما پووچ و بێبنەمایە.

**رووی پەیوەستبوونەکە لەم رۆشنکردنەوەیەدایە:**

أ.گەر لە کاتی تەشریعی حوکمەکەدا خودا نەیزانیبێت ئەو حوکمە بۆ ئەو رەوشە ناشێت لە داهاتوودا دێت یان دەیزانی و دەبویست بەندەکەی تاقیبکاتەوە ئەوا دانەپاڵی نەزانی بۆ لای خودا لە هەردوو بارەکەدا پێویست دەبوو، چونکە تاقیکردنەوە کاتێکە کەسێك واقیع و راستەقینە نەزانێت، پێویست پووچ و بێبنەمایە بەڵکو محاڵە لەرووی ئەقڵەوە بە کۆدەنگی ژێرمەندان و زانایان هەر بەو جۆرە پێویستکراو.

ب-گەر خودا دەیزانی حوکمی یەکەم بۆ داهاتوو شیاو نییە و توانای ئەوەی هەبوو حوکمێك بهێنێت بۆ هەموو کات و شوێنێك شیاو و گونجاو بێت سەرەڕای ئەوەش حوکمەکەی راگەیاند و پاشان سڕییەوە لە کەمترین ماوەدا و حوکمێکی تری گونجاوی خستە جێگەی ئەوا هەستان بە کاری گاڵتەجاڕی بۆ پێویست دەبێت، خوداش-سبحانه وتعالى- پاك و بێگەردە لەوەی کاری گاڵتەجاڕی ئەنجام بدات بە کۆدەنگی زانایان و ژێرمەندا، بۆیە پێویست پووچ و بێبنەمایە هەر بەو جۆرە پێویستکراو.

ج-گەر خودا دەیزانی حوکمەکەی یەکەم بۆ داهاتوو گونجاو نییە، بەڵام نەیدەتوانی حوکمێکی تر بهێنێت گونجاو بێت بۆ ئێستا و داهاتوو ئەوا دەستەوسانی بۆ پێویست دەبێت، ئەو کات شان و شکۆی هەروەك ئەو کەسە وادەبێت یاسایەکی

---

(٢٠) لای "السيوطي" و (٥) لای "مصطفى زيد"، بەم جۆرە ژمارەکان بەپێی ئیجتیهادەکان دەگۆڕێن.

دانراو دادەنێت کە توانای ئەوەی نییە یاسایەك بهێنێت گونجاو بێت بۆ هەموو کات و شوێنێك، پێویست پووچ و بێبنەمایە بەڵکو محاڵە بە کۆدەنگی ژیرمەندان و زانایان هەر بەو جۆرە پێویستکراو.

د-وتنی سڕانەوەی هەندێك لە ئایەتی قورئان لەدوای تەشریعیان وەك مەداراتێك لەگەڵ ئەو گۆڕان و بەرەو پێشچوونانەی گونجاو نەبوون لەگەڵ ئەو ئایەتانەدا پێویست دەکات بوترێت ئەو گەشە و بەرەو پێشچوونانە بە پێچەوانەی ویستی خوداوە روویانداوە ئەگینا پێچەوانە بە دەستوورەکەی ئەو نەدەوەستانەوە، پێویست پووچ و بێبنەمایە بە کۆدەنگی ژیرمەندان و زانایان هەر بەو جۆرە پێویستکراویش.

هـ-گەر ئەو قسەیە راست بێت سڕانەوەی هەندێ لە ئایەتەکانی قورئان بەهۆی رەچاوکردنی گۆڕانی بەرژەوەندی مرۆییەوە بووە لە ماوەی (٢٣) ساڵی تەمەنی وەحیدا لە ژینگەیەکی سەرەتایی وەك تەواوی ژینگەکانی تری جیهانی ئەو کاتە ئەوا پێویست دەکات لە ئێستادا هەموو ئایەتەکانی قورئان بسڕێنەوە لەدوای ئەوەی بەرژوەندییەکانی مرۆڤایەتی سەد بەرانبەر گۆڕانیان بەسەردا هاتووە، پێویست پووچ و بێبنەمایە بە کۆدەنگی ژیرمەندان و زانایان هەر بەو جۆرە پێویستکراو.

سەرباری ئەوەی خودا لە قورئاندا نەمری ئەم شەریعەتە و گونجاوی بۆ هەموو کات و شوێنێك راگەیاندووە و سەروەرمان محمد(ﷺ) بووە بە کۆتا پێغەمبەر و قورئانیش بووە بە دوایین دەستووری خودایی نەمر کە شەریعەتەکانی تر هەموار دەکاتەوە و دەفەرموێت: ﴿مَا كَانَ مُحَمَّدٌ أَبَا أَحَدٍ مِنْ رِجَالِكُمْ وَلَكِنْ رَسُولَ اللَّهِ وَخَاتَمَ النَّبِيِّينَ وَكَانَ اللَّهُ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمًا﴾[1]، هەروەها دەفەرموێت: ﴿الْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ وَأَتْمَمْتُ عَلَيْكُمْ نِعْمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ الإِسْلاَمَ دِينًا﴾[2].

---

(١) سورة الاحزاب: ٤٠.

(٢) سورة المائدة: ٣.

**شەشەم/ لە قورئاندا نەسخ بە مانای تایبەت نابینرێتەوە:**

لە بەرهەمەکانی ئەم باسە دوای گەڕانەوە بۆ سەدان سەرچاوەی باوەڕپێکراو تەنها بەڵگەیەکی براوەم لە قورئاندا یان لە سوننەتی پێغەمبەردا(ﷺ) یان لە کۆدەنگی فەقیهان لە هاوەڵاندا یان فەقیهان لە شوێنکەتوواندا یان لە نووسەرانی وەحییەوە یان لە ئەندامانی کۆکەرەوەی قورئانەوە نەبینییەوە بەڵگە بێت لەسەر کارنەکردن بە ئایەتێکی دیاریکراو لە قورئان کە ئەمڕۆ لەبەردەستی موسڵماناندایە لەگەڵ مانەوەی خوێندنەوەی لە قورئاندا.

بەڵام هەندێ ئایەتی زۆر کەم هەن کارکردن بە حوکمەکانیان راوەستاوە لەسەر ئەو بنچینەی دەڵێت حوکم لەگەڵ هۆیەکەیدا بە بوون و نەبوون دەسوڕێتەوە وەك خەرجکردنی زەکات بۆ "مؤلفة قلوبهم"[1] یان لەسەر ئەو بنچینەی کە حوکمەکە تایبەتە بە خودی پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) یان بە رەوشێکی تایبەتەوە وەك هەندێ لە حوکمە شەرعییەکان تایبەت بە هەندێ لە بەندەکانی ئاشتەوایی حودەیبییە هاتووە بە مامەڵەکردنی پێغەمبەر(ﷺ) لەگەڵ هاوەڵدانەرانی مەکە وەك پێشتر باسمان کرد.

هەر بەو جۆرە چەند ئایەتێکی کەم لە قورئاندا دەبینرێتەوە کە حوکمەکانیان تایبەت بە مامەڵەکردن لەگەڵ کۆیلە و کەنیزەکدا هاتوون، پێشتر ئەوەمان سەلماند ئیسلام نیزامی کۆیلایەتی نەهێناوە و هەرگیزیش دانی پیادا نەناوە، پێغەمبەر هیچ کەسێکی لە ژیانی خۆیدا نەکردووە بە کۆیلە، بەڵام نەدەتوانرا بە یەك جار سیستمی کۆیلایەتی هەڵبوەشێنرێتەوە بە چەندین هۆ کە پێشتر باسمان کرد، بۆیە ئیسلام

---

(١) لە ئایەتی: (إِنَّمَا الصَّدَقَاتُ لِلْفُقَرَاءِ وَالْمَسَاكِينِ وَالْعَامِلِينَ عَلَيْهَا وَالْمُؤَلَّفَةِ قُلُوبُهُمْ وَفِي الرِّقَابِ وَالْغَارِمِينَ وَفِي سَبِيلِ اللَّهِ وَابْنِ السَّبِيلِ فَرِيضَةً مِنَ اللَّهِ وَاللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ) سورة التوبة: ٦٠، فەقیهان لە هاوەڵان لە سەردەمی خەلافەتی ئەبوبەکردا–خوا لێی رازی بێت– کۆدەنگیان هەبوو لەسەر راگرتنی پێدانی زەکات بە "مؤلفة قلوبهم" بەهۆی بێنیازبوونی ئیسلام لە راکێشانی دڵیان.

چەندین ڕێگەی داناوە بۆ کۆتاهێنان بە کۆیلایەتی، هەر بەو جۆرەش بوو کۆیلایەتی بۆ هەتاهەتایە کۆتایی پێهات، ئەوەی ڕۆشنە ئەوەیە کۆتاهاتنی حوکم بە کۆتاهاتنی هۆیەکەی یان مەرامەکەی پێی ناوترێت نەسخ بە مانای تایبەت لەلای ئوسولییەکان، بۆیە ئەو حوکمانەی مامەڵەکردنی لەگەڵ کۆیلەکان و کەنیزەکەکان ڕێکدەخست بۆ قۆناغێکی گوازراوە بوو و بە کۆتاهاتنی ئەو قۆناغە-کە ماوەکەی لە سەدەی یەکەمی کۆچی تێنەپەڕی- کۆتاییان پێهات.

لە کۆتاییدا زمانم کۆڵ و قەڵەمم کەموکورت بۆ هەستان بە شوکری خودا-عز وجل- کاتێك بە لوتف و بەزەیی خۆی کۆمەکی کردم بۆ پێشکەش کردنی ئەم خزمەتە کەمە بە قورئانی مەزن کە ژێری مرۆڤ دەستەوسانە لە ئابلۆقەدان بە ڕەهەندەکانی وەك چۆن دەستەوسانە لە ئابلۆقەدان بە گەردوون.

گەر پێکابێتم لە خوداوەیە، گەر بەهەڵەداچوویم لە منەوەیە، هەروەها لە شەیتانەوە، لە هەموو ئەگەرەکاندا -گەر خودا بیەوێت- خاوەنی پاداشتم، چونکە لە پێناوی خودادا بەم کارە هەستاوم، خودا شایەتە لەسەر ئەوەی کە دەیڵێم.

رَبِّ زِدْنِي عِلْمًا وَأَلْحِقْنِي بِالصَّالِحِينَ